جەمال نەبەز

کۆبەرهەم
(٣)
زنجیرەی سەمینارەکان و کۆڕە زانستی‌یەکان
-١-

# کوردستان و شۆرشەکەی

زنجیرە گوتارێکە ساڵی ١٩٧١ بە زمانی ئاڵەمانی لە بەرلین بۆ کورد و دۆستانی کورد خوێندراوەتەوە

ساڵی ١٩٧٢ لە لایەن نوکسەوە لە چاپ دراوە

«ئەم بەرهەمە پێشکێش بێ بە گەلانی چەوساوەی ئەم جیهانە»

**کوردۆ**

لە ئاڵەمانی‌یەوە کردوویە بەکوردی

ناوی کتێب: کوردستان و شۆڕشەکەی

نووسەر: جەمال نەبەز

شوێن: هەولێر: چاپخانەی منارە

ساڵ: چاپی یەکەم – سوید (ستۆکهۆڵم) ١٩٨٥

چاپی دووەم – ئەلکترۆنی (بەکوردی) ٢٠٠٣

چاپی سێیەم – کوردستان (هەولێر) ٢٠٠٧

ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٧٩)ی ساڵی ٢٠٠٧ پێی دراوە.

لەسەر ئەرکی نووسەر چاپکراوە

مافی چاپکردنەوەی تەنێ بەدەست نووسەرە

# پێشەکی وەرگێر

ئاشنایەتیم لەگەڵ نووسینەکانی هاوبیر نەبەز دا، دەگەڕێتەوە بۆ دە پازدە ساڵێک لەمەوبەر. ئەو دەمە وەکی لاوێکی سەودا سەرو تامەزرۆی بیرو ڕێبازی کوردایەتیی ڕاستەقینە، عەوداڵی نووسینەکانی بووم و گەلەک چێژم لێ وەردەگرتن. جگە لەو کتێب و نووسینانەی کە پێش هاتنە ئەورووپای لە وولات بلاوکرابوونەوە، جار جارە هەندە گوتارێکیشی لەگۆڤارێک یا ڕۆژنامەیەکدا بلاو دەکرانەوە. لەپاڵ ئەوانەشدا، هەندەک کتێب و نووسینی یاساغیشی بە قاچاغ دەگەیشتنە دەستمان.

هەر ئەو کاتانە دەمبیست کە گەلەک بەرهەمی بەزمانەکانی دیکەش لەسەر کورد و کێشەکەی نووسیوە(×). یەکێک لەو نووسینانەی کە زیاد باس و خواسی لەبارەوە دەکرا، ئەم کتێبەی لەمەڕ خۆمان بوو. ئاواتە خواز و بەهیوا بووم خۆی، یا خێرەومەندێکی دی ئەو بەرهەمەمان بۆ بکاتە کوردی، تا بزانین لەم یەکەیاندا چی گووتووە و چی نووسیوە.

ئەو دەمە هیچ بیرم بۆ ئەوەی نەدەچوو کە دەستی ڕۆژگار توورم دەداتە دوورە وولات و ئەو بەختەوەرە خۆم دەبم و ئاواتی خۆم و هەزارانی دیکە دێنمە دی و ئەرکی تەرجەمەی دەگرمە ئەستۆ.

پاش ئەوەی پەڕیدەی ئەورووپا بووم و هاوبیر نەبەزم لەنێزیکەوە ناسی و کەمێک ئاڵەمانی فێر بووم و زمانم پژا، خۆی دانەیەکی لەم کتێبە بەدیاری بۆ ناردم. پێم وایە هەر ئەمە یەکەم کتێبانێکە کە بەزمانی ئاڵەمانی لەسەر مەسەلەی کورد خوێندبێتمەوە.

دوای ئەوەی چێتر فێرە زمانەکە بووم وزۆربەی زۆری ئەو کتێبانەم خوێندەوە کە بە ئاڵەمانی لەسەر کورد ومەسەلەکەی، هەر لەکۆنەوە نوسراون، ئەوسا خولیای تەرجەمەی ئەم کتێبە، کەوتە سەرم. چونکە دیتم:

١- ئەمە یەکێکە لەو کتێبە دۆکۆمێنتارە بەنرخانەی، جگەرسۆزێکی دڵسۆزی میللەتەکەم، بە زمانێکی بێگانە نووسیویە و زۆر هورد و هێژایانە مێژووی سەردەم و قۆناغێکی تێدا تۆمار کردووە، کە دەتوانم بڵێم تا ئێستا شتێکی ئەوتۆ دەربارەی نەنووسراوە. ئاشکرایە خۆی وەک لێکۆڵەرەوەیەکی زانستکار و سیاسەتمەدارێک، لەگەڵ زۆری ڕووداو و بەسەرهاتەکاندا ژیاوە و دەورێکی گەشی تێدا دیتووە، بۆیە جار جارە

---

(×) بۆ سەرجەمی بەرهەمەکانی (نەبەز)، هەتا ساڵی ١٩٨٥ تکایە بڕوانە لاپەڕە(٢٦٢-٢٧٥).

وەکی گەواهێکی بە چاودیدە دێتە گۆ و ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە. پێم حەیف و جێگەی داخ بوو، خوێندەوارە ڕۆشنبیرە بە تەنگەوە هاتووە هێژاکانی نەتەوەکەم لەسەرچاوەیەکی ئاوها بێ بەش بن. بەتایبەت هەل و مەرجی نووسینی کتێبێکی لەم بابەتە و تۆمارکردنی ڕووداوە مێژووییەکانی بزووتنەوە و جووڵاندنەوەی سیاسی و چەکدارانەی میللەتەکەمان، پشت بەستوو بەصەدان بەڵگەنامە و بڵاوکراوە بە زمانە جۆر بەجۆرەکان، لەهیچ بەشێکی داگیر کراوی نیشتمانەکەماندا لە تواناندا نییە. بۆیە ئەویش لێ هاتووانە هەلو دەرفەتی هەڵکەوتووی ئەوروپای قۆزتۆتەوە و سەرپاکی بۆ مێژوو بۆ تۆمار کردووین.

٢- ئەم کتێبە یەکێکە لەو سەرچاوە بەنرخانەی بۆتە چاوگەی سەرجەمی ئەو کتێبانەی لەپاش ئەم کتێبە لەسەر مەسەلەی کورد بەزمانی ئاڵەمانی نوسراون. بەدەگمەن کتێبێک دەبینیت لەسەر مەسەلەی کورد نوسرابێت، سوودی لەم کتێبە وەرنەگرتبێت و پەنجەی بۆ ڕانەکێشابێت. هەتا هەندەک لەوانەی بێ ویژدانانە پەنجەشیان بۆ ڕانەکێشاوە، گەلەک جار دەربڕین و مەسەلە و ڕووداوی وا دەبینیت، دەقاودەق لەمەوە نەقڵ کراون. هەندێکی دیکەشیان زۆریان لێ گواستۆتەوە و تەنها لەیەک شوێندا پەنجەیان بۆ ڕاکێشاوە و لەئاستی زۆریەی دا گوێیان خەفاندووە. لەوەش زێتر، هەیە پوختەیەکی کتێبەکەی وەرگرتووەو کەمێک دەستکاری کردووە و بە نێوێکی دیکەوە بڵاوی کردووەتەوە(×).

٣- تەرجەمە کردنی سەرپاکی ئەو کتێب و لێکۆڵینەوەو گوتارانەی بەزمانە جۆربەجۆرەکان، لەسەر مەسەلەی میللەتەکەمان نوسراون، ئەرکێکی هەرە پیرۆز و پێویستی ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی بەتەنگەوە هاتووی نەتەوەکەمانە. بۆیە منیش بەنەوازشەوە، هەوڵم داوە بەپێی توانا و دەستەڵاتی کەمی خۆم، چمکێکی ئەم لایەنە بگرم و مەڵۆی هەژارانەم بخەمە سەر شارای پڕ ڕەونەقی لێ هاتوو و لێ وەشاوەکانی نەتەوەکەم، بەو هیوایەی لەو ڕێیەوە خزمەتێکی گچکەی مەسەلەی میللەتە زۆر لێ کراوەکەم بکەم.

---

(×) هەر بۆ وێنە سەرنجی کتێبی (Die Türkei) نووسینی (Jürgen Roth) و Kamil Taylan بدە کە لە ١٩٨١ دا بڵاوکراوەتەوە. بەراوردی لاپەڕەکانی ١١٣و١١٤و١١٨ی لەگەڵ لاپەڕەکانی ٧٥ - ٩٢ی کوردستان و شۆڕشەکەی بە ئاڵەمانی بکە. هەروەها بڕوانە ئەو کتێبەی (Heinz Gstrein) کە لە ١٩٧٤دا بەنێوی (Volk ohne Anwalt) (گەلێکی بێ پارێزەر)ەوە بڵاوی کردووەتەوە.

ئەوە بوو پاش یەک دوو جار خوێندنەوەی ئەم کتێبە و چەند جارێک گفتوگۆ و دەمەتەقێم لەگەڵ هاوبیر نەبەز دا، چ دەربارەی نێوەرۆک و چ دەربارەی تەرجەمەی، دیتم بە هۆی پڕکاری و سەرقاڵی بە زۆر نووسین و لێکۆڵینەوەی دیکەوە، کاری وا لەم دەمەدا بەخۆی ناکرێت. بۆیە تکام لێ کرد مافی تەرجەمە کردنی بە من بدات. وا پێ دەچوو ئەو کاتە باوەڕ نەکات کە کارێکی وا قەبەو گران، بە منێکی کەم توانا و فرەکار، رابپەڕێت. چونکە خۆی دەزانێت باری ناهەمواری خوێندکاریی و کرێکاری و پڕکاری و نەداریم، دەستیان بەستووم و لەم جۆرە خزمەتانەیان خستووم و لە گۆشەی بێ دەستەڵاتییان پەستووم و رێگەی گەلەک ئەرکی ئاوها پێویستیان لێ گرتووم. بۆیە بە بزەیەکی خۆی ئاساییانەوە گوتی: چاکە! ئیدی بێ دەنگ دەست بەکار بووم. جار جارە بەپێی هەل و دەرفەت لەپاڵ گەلەک ئەرک و فرمانی دیدا، بەشێکم لێ تەرجەمە دەکرد و کەنارم دەخست. تا هاوینی رابووردوو، کە لە سێهەمین کۆنگرەی (رێکخراوی خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد لە ئەورووپا) (SOKSE) دا لە ستۆکهۆڵم هاوبیر نەبەزم دیتەوە و بابۆڵەیەک پەڕە شڕی دەستنووسم لەبەردەست دانا و گوتم: دەفەرموو! چاوێکی پێدا بخشێنە و رای هاوبیرانە و برایانەی خۆتم پێ بڵێ. بەڵام تکایە رەپ و راست، بێ بەزەییانە و دوور لەسۆز، بزانە بەم پێ و دانگە، کەڵکی ئەوەم پێوەیە نیوەکەی دیکەشی تەرجەمە بکەم؟؟؟ وا دەرکەوت تا رادەیەک لێی رازی بێت، بۆیە گەلەک هانی دام و رێنوێنیی کردم کە بەردەوام بم!

هەر هاوینی پارەکە تەرجەمەیم تەواو کرد. خۆ دەرد و دووی چاپەمەنی کوردی گەر لە وڵات هێزو وزە هەڵچوڕێن بێت، ئەوا لەم ئەورووپایە بۆ نووسەرانی پەرێدەو کەم دەستی کورد هەر باس ناکرێت!!.

ئەرکی تایپ کردنیشی ئەستۆی خۆمی گرتەوە. نێزیکەی ساڵێکی رەبەقی پێوە خەریک بووم. لەبەرەوە، هەر جارە بەشێکی تەرجەمە چاپ کراوەکەم بۆ خۆی دەنارد، تا پێدا بچێتەوە و رای خۆیم بۆ بنووسێت. دیارە گەلەک هەڵەی بۆ هەڵگرتمەوە و زۆر رێنوێنی هاوبیرانەی کردم و دنەی دام، بۆیە بە پێویستی دەزانم سوپاسی بێ پایانی خۆمی پێشکەش بکەم.

دەبێت ئەوەش بڵێم، کە دەقی تەرجەمەکەم پیشانی چەند هاوبیر و دۆستێکی شارەزا داوە. ئەوانیش بەڵێ هاتوویی و شارەزایی خۆیان دەستگیرۆییان کردم و گەلەک پەڵەیان

بۆ سڕیمەوە و هەڵەیان بۆ هەڵگرتمەوە و زانیاری بەنرخیان پێدام و ڕێنوێنیی هاوبیرانەیان کردم. لەو بارەوە سەنا گۆیانم و لە کوڵی دڵەوە سوپاسیان دەکەم.

## نەبەز و نووسین و چەند ڕاستییەک

نەبەز یەکێکە لەو نووسەرە هەڵکەوتووانەی لە ڕووی چەندایەتی و چۆنیەتی‌یەوە بەرهەمێکی فرە و پڕ بایەخی پێشکەش بە کولتووری نەتەوەکەمان کردووە.

بەزمانەکانی کوردی‌ی، عارەبی‌ی، فارسی‌ی، تورکی‌ی، ئینگلیزی‌ی، فەرەنسی و ئاڵەمانی‌ی، گەلەک گوتار و نامیلکە و کتێبی دەربارەی کورد و مەسەلەی کورد، نووسیوە.

یەکێک لە دیاردە و خەسڵەتە دیارەکانی نووسینەکانی ئەوەیە کە لە خۆوە شت نالێت، بەبەڵگەنامەو دەقی نوسراو و ڕووداوی ڕاستەقینەوە دێتە گۆ. کوردانە و ڕاست گۆیانە دەنووسێت. پێداهەڵدان و مەرایی و خاتر و خۆتر تێ ناخوێنێتەوە و هیچ پردێک لەپشتی خۆوە ناهێڵێتەوە. ئەوەی لایەک بەلای کێشەی ڕەوای نەتەوەکەماندا بکاتەوە، ئافەرینی لێ دەکات، ئەوەش بە ناهەق لەمپەری دوژمنایەتیمان لێ بگرێت، نەفرینی لێ دەکات.

هەموو هەڵوێستێک، بەچاک و خراپی‌یەوە، دەکاتە ماڵ بەسەر خێوی‌یەوە. بێ هیچ دڵە ڕاوکەو سڵەمینەوەیەک، ئازاو نەترس و نەبەزانە، پارێزگاری لەهەڵوێست و ئامانج و ئاوات و خواستی نەتەوەکەمان دەکات. ئەو لای وایە گشت ڕێگەیەکی شەرعی‌ی، بۆ دەستخستنی ئەو خواستانە، ڕەوان. بەلای ئەوەوە میللەتەکەی هەمیشە لەسەر هەقە، چونکە لەپێناوی هەق و مافێکی سروشتی و خۆرسکدا دەکۆشن. داگیرکەران و دەسندەخۆران و چەوسێنەران، گشت ڕێگەیەکی ناشەرعی و ئەهریمەنانە وبێ شەرمانە ونا مرۆڤانە، بۆ بەرگرتن بەو هەق و مافە سروشت کردانە، وەبەر دەگرن.

هەر ئەمەیە وای لە نەبەز کردووە، ڕاستگۆیانەو بێ پەردە، هەڵوێستی ناتێگەیشتووانەی گشت لایەکیان لەقاو بدات و بۆیان تۆمار بکات، بێ پەروایە لەوەی چی پێ دەڵێن و چی نێو دەنێن.

ئەم هەڵوێستە مەردانە و ڕەق و ڕاستی پەرستانەیەیە، کە گێژاو و گەردەلوولی صەدان درۆ و بوختان و پێدا هەڵشاخان و نێوو نەتۆرەی ترسنۆکانی لەدەور هەڵستاندووە. بەڵام ئەو چ دەربەستە، ئەو بۆ مێژووی تۆمار دەکات و مێژووش بۆ ئەو.

چوار دەستە و تاقم، زۆر بەگەرمی و خەست و خۆڵی، دەیان ساڵە، بێ پەروا خەریکی بوختان و درۆ هۆنینەوەن بۆ نەبەز:

١- داگیرکەرانی کوردستان و خۆفرۆش و بەکرێ گیراوانی نێو خۆ، ئەوانەی لە نووسینەکانی نەبەزدا مەترسی و خەتەرێکی راستەقینە، بۆ سەر بەرژەوەندی‌یە گلاوەکانیان بەدی دەکەن.

٢- هەڵگرانی بیری دۆگماو ووشک هەڵهاتوو، ئەوانەی بوون و مانەوەیان لەسەر بەندی قرچۆکی درۆ بەندەو دەرخستنی هەر ڕاستییەک دژ بە بەرژەوەندی و بەردەوامی و مانەوەیانە.

٣- ئەو مێشک ژەنگ گرتووانەی تایەفەگەری‌ی حیزبایەتی، پەردەی بەسەر چاو و مێشک و ویژدانیان دا کێشاوە و خۆیان خاوەنی خۆیان و هەڵوێست و رای خۆیان نین. کوێرانە، بێ پێک گرتن و تێروانین و رامان و شی‌کردنەوە، خەریکی کاوێژی بوختان و درۆی هەڵبەستراون.

خۆی بۆ پێکەنین و نوکتەبازی، ئەو جۆرە کەسانە بە (گا مەسلەک) نێو دەبات.

٤- ئەو مامۆستا فش و فۆڵانەی، ساڵانێکی دوور و درێژە، بۆیان لواوە لەسەرخوێنی کورد هەڵئاوسێن و لە قەرسیلی صەوزی دۆلار دا بلەوەڕێن. چونکە خۆیان بەو هەموو توانا ماددی‌یە زۆرەی بەردەستیانەوە چ بەرو بووم و خێر و بێرێکیان نی‌یە و هیچ کارێکی پڕ سوودیان بۆ ئەو میللەتە لەدەست نایێت، ناچارانە لە لوتکەی کەسانی دیکە دا دەڕنن، تا نشێوی خۆیانی پێ پڕ بکەنەوە و عەیبەی خۆیانی پێ لێفە پۆش کەن.

نەبەز تەنها جارێک بەرامبەر ئەوانەو لەسەر خودی خۆی بەجەواب نەهاتووە. زمانی حاڵی هەمیشە بەیتە نایابەکەی حەزرەتی (مەحوی)یەو دەیلێتەوە: (لەسەر تۆم دوژمنە دونیا...)

## ئەم کتێبە

ئەم کتێبەی ئێستا لەبەر دەستی تۆی ئازیز دایە، لەراستی‌یدا بەنیازی کتێب نە نووسراوە، بەڵکە زنجیرە گوتارێک بووە بۆ سیمینارێک، کە یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا (NUKSE) رێکی خستووە و لەچەند ئێوارە کۆڕێک دا، لەساڵی ١٩٧١دا، لەبەرلینی خۆرئاوا، بۆ کوردە ئاوارەکان و دۆستانی کورد خوێندراوەتەوە. پاشان دەستێکی پێدا هێنراوە و لە ٩٧٢دا لەشێوەی ئەم کتێبەدا، لەسەر

ئەرکی هەمان ڕێکخراو چاپ کراوە. کتێبەکە بەزمانی ئاڵەمانی تێکڕا (٣٣٠) لاپەڕەی قەوارە بەتاڵی گرتۆتەوە. هەر بە چەشنی گوتارەکە چاپ کراوە و بەش بەش نەکراوە. هەر بەند و بابەتێکی نوێ بەرستەی (هاووڵاتیان و دۆست و برادەرە ئازیزەکان) دەست پێ دەکات. من وام بەچاک زانی بەش بەشی بکەم و هێندەی بشێت و بگونجێت، بۆ هەر بەندێکی سەردێڕێک دابنێم.

خودی گوتارەکە هەمووی (٢٤٤) لاپەڕەیە. پاشان وەکو پاشکۆیەک، ئەم بەشانەی خراوەتە سەر:

١- کوردستان، خاک و گەلەکەی.

٢- کورد لە گۆشەنیگا و باری سەرنجی بێگانەکانەوە. «کاتی خۆی گولبژێرێکی ئەم بەشەم کردە کوردی و لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری (خوێندکاری کورد)دا بڵاو کرایەوە».

٣- سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان.

٤- سروودی نەتەوایەتی کورد. خاتوو Doris Feyerabend ئەم سروودی (ئەی ڕەقیب)ەی هەر بەشیعر کردۆتە ئاڵەمانیی.

٥- نەورۆز، جەژنی نەتەوایەتی کورد.

٦- پرۆگرامی یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا (NUKSE).

٧- چەند سەرنجێک دەربارەی ئیملای ووشە ڕۆژهەڵاتی‌یەکان.

٨- زمان و ئەدەبی کوردی.

٩- ڕێکخراوە کوردی و دۆستەکان و داوو دەزگە کوردۆلۆژی‌یەکانی ئەوروپا.

١٠- بەرهەمەکانی نووسەری ئەم کتێبە.

١١- نێوەڕۆکی ئەم گوتارە.

١٢- هەندەک وێنە لە کوردستانەوە.

١٣- نەخشەیەکی کوردستان.

تەرجەمە کردنی هەموو پاشکۆکانم بە پێویست نەزانی. چونکە یا بەکوردی هەن، یاخود زانیاری‌یەکی سەرەتایین و زێتر بۆ بێگانەکان نووسراون.

جگە لە زنجیرە گوتارەکە، پاشکۆی یەکەمینم تەرجەمە کردووە. ئەو بەشەی پاشکۆی دووهەم کە لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری (خوێندکاری کورد)دا بڵاوکراوەتەوە، سەر لەنوێ لێرەشدا چاپم کردۆتەوە و بەشەکەی دیکەشیم تەرجەمە کردووە و خستوومەتە پاڵی. واتە

اشکۆی یەکـەم و دووهەم لێـرەدا بەتەواوی تەرجـەمـە و چاپ کـراون. پاشکۆی ژمـارە ۱۰)شم بە پێـویست زانی، تا خوێنەران لە سەرجەمی بەرهەمەکانی نووسەر ئاگادار بن. ؛یە بە یارمـەتـی و کـۆمـەکـی خـۆی بەشـێکی زۆری نـێـو و سـەردێڕی بەرهەمـەکـانیـمـان ،گەلەک لا کۆ کردۆتەوە و لێرەدا چاپمان کردن.

لە تەرجـەمـەی دا هەوڵم داوە دەست پاکـانە، کـرۆک و مـەبەسـتـەکـانی، بێ ڕتووش و ەستکاری‌یەکی ئەوتۆ، بەخوێنەر بگەیەنم. نەمویستووە خوێنەران فێرە ئاڵەمانی بکەم، ،ڵکە خواستوومە نێوەڕۆکی کتێبەکە و مەبەستەکانیان تێ بگەیەنم. سەردێڕی زۆربەی ـەرچاوە ئاڵەمانی‌یەکانم، بۆ خوێنەری کورد کردۆتە کوردی‌ی، تا بزانێت چی‌یان دەربارە ـوتووین. بەڵام چونکە بەشی هەرە زۆی خـوێنەرانی کـورد، تا ڕادەیەک ئینگلیـزی تێ ،گـەن، سـەردێڕی سـەرچاوە ئینگلیـزی‌یەکـانم تەرجـەمـە نەکـردووە. سـەرچاوە ،ەنسی‌یەکانیش هێندە نین و خۆشم توانا و شارەزایی تەرجەمە کردنیانم نەبوو.

لەهەر شـوێنێـک دا، هەڵەیەک یا مـەسـەلەیەکی نەگـونجـاوم هەست پێ کـردبێت، یاخـود ری سەرنجێکم بوو بێت، نیشـانەی (×)یکم داناوە و لە پەراوێزدا مەبەستی خۆم روون ـدۆتەوە ورای خۆم دەربڕیوە.

ئاشکرایە نـاتوانم بڵـێم خۆم پڕاوپڕ لەگـەڵ سەرجەمی راو بۆچوونەکـانی ئەم کـتـێبە دام، ڵام نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە ئەمە گوتارێک بووە و پێش ۱٤ ساڵ بەمەبەستی پاکانە پارێزگاری لەنێو و شۆڕەتی کورد و شۆڕشەکەی، بۆ ناسینی بە بێگانان نوسراوە. دیارە ۱ ساڵ تەمەنێکە و گەلەک گۆڕانکاری بەسەر باری کورد و نێوچەکە و جیهان‌دا هاتووە.

هێندە هەیە، ئەوەی بە ویژدانانە و پیـتـۆڵانە ئەم کـتـێبە بخـوێنێـتـەوە، تێ دەگـات چۆن ـەز وەک پارێزەرێکی دڵسۆز و بەتەنگەوە هاتووی میللەتەکەی، لەسەر گەلەک مەسەلە ـەنگ هاتووە و هەتا گـەلەک جار بە ئاگـایانە و دیبلۆمـاسی‌یانە پینەدۆزی‌یەکی چاکی ـدا کـردووە و بەر پەرچی هەمـوو تـاوانێکی نارەوای نـاحـەزان و دوژمـنانـی دڵ ڕەشی تەوەکـەمانی داوەتەوە و قەدر زانینی لە هەڵوێستی هەر لایەک کردووە، کە نەک تەنها ـستانە، بەڵکە گەر بێ لایەنانەش باسیان لێوە کردبێن.

خوێنەری ئازیز: ئەز پێم وایە تۆ چێترین دادوەرێک بیت، بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی وەڕۆک و بیر و بۆچوون و مەبەستەکـانی ئەم کـتێبە، کە خاوەنی راستـەقینەی، (نەبەز) ـیەتی.

تۆ هەر هەمان دادوەریشیت بەرامبەر ئەو ئەرکە گچکەیەی من. دڵنیام کارەکەم بێ هەڵ و بێ کەم و کووڕی نی‌یە، بەڵام چ بکەم لەوە زیترم لەدەست نەهات و هەر هێندەم لەبارد بوو.

سا بۆیە دەستەو داوێنی تۆ دەبم هەڵەم بۆ هەڵگریتەوە و لەناتەواوی‌یەکانم بە هۆش بێنیتەوە. بۆ ئەو مەبەستە، لاپەڕەکانی گۆڤاری (خوێندکاری کورد) بۆ گشت رەخنە و هەڵسەنگاندنێکی ئەم کتێبە ئاواڵەیە و خۆش ئامادەیی لەگشت قەڵەمێکی دڵسۆز وکورد پەروەر و خێر خواز و مرۆ ویست دەکەین. ئومێد دەکەین تۆش لەو بارەوە هاوکاریمان بکەیت و رای بێ پەردە و راستی پەرستانەی خۆت تۆمار بکەیت.

سەرکەوتنی گشت لایەک و سەرفرازی کورد، بە ئاوات دەخوازم.

کوردۆ

سالزبورگ ١٩٨٥/٧/٦

# پێشەکیی نووسەر

هاوبیری هێژا کاکە کوردۆ

بەبۆنەی وەرگێڕانی کۆمەڵە ووتاری "کوردستان و شۆرشەکەی"یەوە بۆ سەر زمانی کوردی، لەکانی دڵمەوە سوپاسێکی گەرموگوڕت دەکەم، و پیرۆزبایی‌یەکی جوان و خاوێنیشت لێ دەکەم. سوپاسەکەم هەر لەبەر ئەوە نی‌یە کە هەستی هەقناسانەی خۆت لە دەروونێکی پاکی پڕ لەویژدانەوە بەرامبەر بەم برایەت پێشان داوە و بەس، بەڵکو زۆرتر لەبەر ئەوەشە کە بە وەرگێڕانی ئەم نامیلکەیە، مێژووی دەسکاری نەکراوی سەردەمێکی گرنگی بزووتنەوەی کوردایەتیت خستووەتە بەردەم خوێنەرەوەی کورد، بەتایبەتی نەوەی نوێی ئەمرۆ کە لەبەر کەمی تەمەنی، ئاگای تەواوی لەبەسەرهاتەکانی ئەو حەلە نی‌یە. ئەوەی بە کەموکورتی و پچرپچریش پێی گەیوە، وەنەبێ لە دەست تێوەردان و ناخونک لێدان رزگاری بووبێ. پیرۆزبایی‌یەکەشم سەبارەت بەوەیە کە ئەو چەند سەد لاپەڕەیەت بەو شێوە شیرینە رەوانە بێ گرێ و گۆڵە، کە تایبەتکارێکی خۆتە، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و گیانێکی خۆماڵیی وات بەبەر ووشەکاندا کردووە، ئەوی بیخوێنێتەوە پێی وایە هەر لەبنەڕەتەوە بەکوردی نووسرابێ. هەزاران چەپکە گوڵی ئافەرینت پێشکێش بێ.

کۆمەڵە ووتاری "کوردستان و شۆرشەکەی" وەنەبێ هەر بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی کوردستان و رۆژهەڵاتی نێوەراست شایانی سەرنج لێدان بێ و بەس، بەڵکو لاپەڕەیەکی گەشیشە لە مێژووی تێکۆشانی هاوبیرە کۆنەکانت لە دەرەوەی وڵات لە پێناوی چێکردنەوەدا بۆ بیری ئازادی و یەکسانی. بەڵێ... باوەڕنامەیەکی خەباتی چاو نەترسانەی چرا بە دەستانەی " یەکێتی نەتەوەیی‌ی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا" (نوکسە)یە، کە لە نێوەڕاستی شەستەکانەوە دەستی پێکرد و تا کۆتایی هەفتاکان لەتێکۆشانێکی بێ وچاندا بوو. یادێکی ئەو رۆژە پروچڕانەیە کە چەند هاوبیرێکی دەربەدەرت، بە ژمارە کەم بەدەست کورت و لە نێوان بێشەیەک لەناحەزدا، دەیانویست لەم دوور وولاتەوە و سەرەڕای هەموو تەگەرە وبەرهەڵستێک، جەماوەری لەخشتە براوی گیرفان براوی کورد بیری پشت بەخۆبەستن بکەن و بەتاموچێژی بیرکردنەوەی سەربەخۆی بابەتانە رایان بهێنن، لالانی بێگانەش لەراستی‌ی مەسەلەی کورد بگەیەنن و زاتیان بنێنەبەر بۆ بەسەرکردنەوەی مافی پێشێلکراوی ئەم گەلە بەشخوراوە گەلەکۆمە لێکراوە. ئەوەتا – یەک خۆت دەبینیت هیممەتی ئێوەی بەڕێز لەگەڵ هیممەتی ئەو هاوبیرە کۆنانەدا جارێکی

دی یەکیان گرتەوە و ڕێ نەدرا بەوەی تەمی تەووژمی ڕابوردوو برەوێتەوە و لەبەردەوامیی کۆن و یەکدگیری دا لەگەڵ تازە؛ ئەم بزووتنەوە پوختە ڕێکوپێکە خاوەن جەماوەرەی (سۆکسە)ی لێ دەرچوو کە تۆی خۆشەویست شانازی نوێنەرێتیت بەهەق پێ سپێردراوە.

بێگومان تا ئەم بەرهەمە دەگاتە بەردەستی خوێنەرەوانی (١٥) ساڵێک تێپەڕ دەبێ بەسەر پێشکێش کردنیدا بە زمانی ئەڵەمانی. دیارە پانزە ساڵ، وەک خۆشت گوتووتە - تەمەنێکە بۆ خۆی و لەم ماوەیەدا گەلێک گۆڕانکاری رووی داوە و ئێمەش خۆمان گەلێک شتی تازەی دیکە فێر بووین و ئەگەر بهاتایە و ئەم ووتارانەم ئەمڕۆ بخوێندایەوە ئەوا، چ لەباری نێوەڕۆک و چ لەباری شێوەوە- ئاوێتەی ئەو تاقیکردنەوانەم دەکرد. دیارە هەموو بۆچوون و سەرنج گرتن و بڕیار دانێکیش پەروەردەی باوەشی تاقیکردنەوە تایبەتی و گشتی‌یەکانن، بە دەوڵەمەند بوونی ئەو تاقیکردنەوانە شێوەی دەربڕینیش دەکەوێتە بەر تەزوو و تاویان. بەڵام هەر وەک خۆشت پەنجەت ڕاکێشاوە بۆی، مەبەستی سەرەکی ئەم ووتارانە تەنێ بەرەنگاربوونەوەی پەلاماری دەستدرێژکەران و بەرپێچدانەوەی بوختان و درۆ و دەلەسەی ناحەزان و بەکرێگیراوان بووە، کە لەو ڕۆژەدا شووڵیان لێ هەڵکێشابوو. ئەمجا بەرەنگاربوونەوەیەکی نەک هەر بەقسەی زلی پف هەڵدراوی بێ سەروپێی گوێ ئاگردان، بەڵکو بە کوتەکێکی زانستانەی وا کە مرۆ بتوانێ دوژمنێکی زۆرزانی دەمهەراشی پێ‌ییخ بدات. ئەم ووتارانە کاتی خۆی و بۆ چەند ساڵێک زریانێکی سەختی وایان هەڵکرد کە تەنانەت ڕۆژنامە نووسی ئەڵەمانی Karl Grobe لە هەفتاکاندا لە ڕۆژنامەی Frankfurter Rundschauدا نووسی بووی؛ ئەم کتێبە فیلیپیکایەکە بۆ خۆی، واتا "نامیلکەیەکی بەربەرە کانێ"یە بە قەڵەمی جەمال نەبەز، یەکێک لەو کوردە چەپڕەوانەی کە نازانن ماندو بوون چی‌یە". بەڵێ ڕاستە... کتێبەکە "بەرگری نامە"یەک بوو و بۆ لە رووادا وەستانەوەی ئەو دار و دەستانە نووسرابوو کە نێویان برا. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە شێوەی کتێبدا نی‌یە و تۆش کارت ڕاست بێ هێناوتەتە سەر شێوەی کتێب و بەجۆرێکی ڕێکوپێک بەندەکانیت لەیەکدی جیاکردووتەوە و ڕیزت پەیدا کردووە پێ‌یان و پێرستت داناوە بۆیان، ماڵت ئاوابێ.

راستی‌یەکەی؛ هەوڵدان بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەی کورد بۆ ئەورووپایی‌یەکان ١٥-٢٠ ساڵێک لەمەوبەر، وەک ئەمڕۆ نەبوو. کەم کەس هەبوو کە نێوی کوردستانی بیستبێ. کە دەیانپرسی لێمان خەڵکی کوێین و دەمانگوت "کوردستان"، دەستبەجێ وەرامیان دەدایەوە

ا... ئا... پاکستان. دەمانگوت نە بابە پاکستان نا کوردستان، ئەمجارەیان بێ دەنگ دەبوون و سەریان سووڕدەما، یا دەیانگوت "تورکستان". بەکورتی دەبوو هەموو جارێک باسی رۆمانەکەی کارل مای بکەین بۆیان کە بە نێوی "بەنێو کوردستانی دڕندەدا" لەسەدەی رابوردوودا نووسراوە. ئەوجا قاقا پێ دەکەنین و بەگاڵتەوە دەیانگوت "ئەی باشە خۆ ئێوە هیچتان لەدڕندە ناچن"- جا ئەوەتە ئەمڕۆش - وەک هەموومان دەزانین - مەسەلە جۆرێکی دیکەیە...

دیارە هەوڵو تەقەلای ئەم بیست ساڵە دەوری خۆی تا ئەندازەیەک دیوە. بەڵێ، ئەو دەمە خەڵکەکەی ئەوروپا لەبارەی کوردەوە زۆر کەمی دەزانی و ئەوەی دەشی بیست لەرێی رۆژنامە و ویستگە و رادیۆکانەوە بوو، کە بە زۆری باری سەرنجی ناڕاستی سەربە داگیرکەرانی کوردستانیان دەخستە ڕوو. بۆیە بە پێویستی سەرشانی خۆمم زانی، وەک مرۆڤێکی ئازادیخواز بکەومە خۆم و بێمە زمان و لەسەر هەق بکەمەوە. نەک لەبەر ئەوەی بە ڕێککەوت لەکوردستاندا هاتوومەتە جیهان، بەڵکو لەبەر ئەوەی پێم وابووە و پێم وایە مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی هەقە و بەدەنگ هاتن لەسەری، پێویستی سەرشانی هەموو مرۆڤێکی هەق پەروەرە نەک هەر کوردەکە خۆی. ئەگەنا ئەوەتا هەر لەم ووتارانەدا لەسەر گەلێک نەتەوە و گەلی ژێر دەستە و کۆمەڵی بەشخوراوم کردووەتەوە کە هیچ کوردیش نین.

دیارە لەم ووتارانەدا برێک ناتەواوی و کەموکورتی هەیە. لەبەر ئەوە زۆرم پێخۆش بوو کە دیم لەپەراوێزەکاندا هێندێک هەڵەت ڕاست کردبووەوە و هێندێک سەرنج و بیروڕای خۆتت دەربڕیبوو. دەستت خۆش بێ و زۆر سوپاس(×) بێگومان هەر کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەک کە کەوتبێتە دوو توێی ئەم کارەوە لەکەم تەرخەمییەوە نەبووە، بەڵکو لەوەوە هاتووە کە ئەو رۆژە هەر هێندەم لەدەست هاتووە. بێجگە لەوەش کۆکردنەوەی ووتارەکان و سەرپەرشتی کردنی چاپەکەی بەچاودێری من نەبووە. سەرەڕای ئەوەش گەلێک قۆرتی ناهەموار لەبەردەمدا قوت بووبوونەوە. هەر لەدەستکورتی و دەربەدەری و پرکاری خۆمەوە بگرە هەتا دەگاتە خراپەکاری و دوژمنایەتی و چاڵ هەڵکەندن بۆم لەلایەن گەلێک لاوە کە هێندێکیشیان خۆت دەستت خستووەتە سەریان و منیش نامەوێ بکەومە وێزەی یەک بەیەکیان. هێندە بەسە بۆ سەربەرزی و شانازی من کە بە درێژایی ژیانم و

---

(×) هێندێک لەو سەرنجانەی وەرگێڕ کە لێدوانیانم بە پێویست زانی؛ وان لە لاپەڕە II دا.

لەتەنگاوترین کاتدا، تەشی ڕێسی هیچ زۆردارێک و ماستاو ساردکەرەوەی هیچ ملهوڕێک و نانخۆری هیچ کەسێک نەبووم. ئەوەتەی بیرم کردووەتەوە و خۆم ناسیوە جێی خۆم لەتەنیشت هەژاران و لێ قەوماوان و زۆرلێکراوانەوە دیاری کردووە. لەم ڕووەشەوە هیچ کاتێک چاوەڕوانی ئەوە نەبووم و نیم کە لەسەر حسێبی بیروباوەڕم پێم بڵێن "کوڕی باش"، چاویشم لەوە نەترساوە و ناترسێ کە لەسەر پاراستنی بیر و باوەڕم ببمە نیشانەی تیروتانە و توانجی خۆبژێن و پاشڵ پیس و جاش. پێم وایە ڕۆژگار منیش و ئەوانیشی بۆ خەڵک دەرخستووە. لەبەر ئەوە پتر لەسەری ناڕۆم و دەڵێم هەر خۆیان بەخۆیان بن. هونەریش ئەوەیە ئێمە لەسەر کاری بابەتانەی خۆمان بڕۆین و هەمیشە بەرەی ژێر خۆمان لەبەرەی هەلپەرست و کوڕی ڕۆژ و هەڵمەتەکاسە دوور بخەینەوە و هەردەم چاوێکی رەخنەگرانەی ڕیزپێتەوکەرانە بە کارەکانماندا بخشێنینەوە و نەسەرکەوتن خوتووکەی فیزمان بدا و نەژێرکەوتنیش وورە بەربدات پێمان. چونکە هیچ سەرکەوتنێک نی‌یە بەرگە بگرێ، ئەگەر تێکۆشانێکی سەرومڕ ڕای نەگرێ، و هیچ ژێرکەوتنێکیش زۆر ناخایەنێ، ئەگەر زاتێکی پۆلایین و ویستنەیەکی نەگۆڕی بێ پسان هەوڵی ڕاستکردنەوەی باری لاسەنگی بدات. کەواتە باهەمووماں پێکەوە و هەر یەکەش بەپێی توانستی خۆی لە پێناوی مان و سەرکەوتنێکی هەمیشەیی بەرەی ئازادی و یەکسانی و تەفروتوونابوون و ژێرکەوتنێکی یەکجارەکی بەرەی تاریکی‌دا لەسەر ڕێی ڕاست و چەند جار تاقیکراوەی خۆمان بمێنینەوەو ئەوەش بخەینە بەر چاومان کە سەرکەوتنی هەموو بزووتنەوەیەک لەبەردەوامی‌ی، واتە کۆڵ نەدانی ئەو بزووتنەوەیە دایە. لەم ڕووەوە سەرکەوتنی تۆ و هەموو هاوبیرێکی دی ئاواتە خوازم و بەرە و ئامانج...

بەرلین ١٩٨٥/٩/١١

جەمال نەبەز

**اوولاتیان و دۆستە ئازیزەکان:**

زۆر شادم کە ئەم ئێوارەیە لەگەڵتاندا کۆ دەبمەوە. چاک دەزانم کە هێندێکتان بەو نیازە اتوون، پەرە بەو زانیاری‌یەتان بدەن کە تائێستا لەبارەی کوردەوە هەتانە. بەهیوام بتوانم ێندێک راستی‌ی نوێتان لە لا ئاشکراکەم، کە تا ئێستا لەتاریکی دا ماونەتەوە.

ئێوارەیەکی سالّی ١٩٧١ی بەرلین

## کورتەیەکی پێویست

لەو رۆژهەلاتی نێوەڕاستەدا ١٠-١٢ ملیۆنێک[*][×] مرۆڤ هەن کە بە کورد ناسراون.

---

*) سەرژمێرێکی تەواو دەربارەی ژمارەی هەموو کورد نی‌یە. ئەو وولاتانەی کوردستانیان بەسەر دا بەش کراوە، یا کورد لەگەڵ دانیشتووەکانی دیدا پێکرا سەر ژمێر و تێکەڵ دەکەن، یاخود ژمارەی راستی‌یان ئاشکرا ناکەن. مرۆ دەتوانێت بەلای کەمەوە بەم جۆرە بیخەملێنێت: تورکیا ٤، ئێران ٣، عێراق ٢، سوریا ٥ر ..، شووردوی٢٥ر..، لەوولاتانی دیدا ٥ر . ملیۆن.

×) هەر چەندە راستە کە ئامارێکی تەواو دەربارەی ژمارەی کورد نی‌یە، بەلاّم پێم وایە. بۆ سالّی ١٩٧١ (١٠-١٢ ملیۆنێک) ژمارەیەکی کەم بێت.

خاتوو (هانەلۆرە کیوشلەر) لەنامەی دوکتۆراکەی دا، لەپەراوێزی ژمارە ٢٠ی لاپەڕە (٥٣٥)دا، ئاوها دەنووسێت:

(بەپێ‌ی یاسایەکی دیمۆگرافی، نەتەوەکان، هەر بە بیست ساڵ، ژمارەیان دەبێتە دووقاتی خۆی... تاد)[+] بەوپێ‌یە گەر کەمترین ژمارەی کورد لەبیستەکان دا وەربگرین، لە پێنج ملیۆن ناشێت کەمتر بووبێت. دەنا بەو حسێبە بێت، (٢٠-٣٠) ساڵێک پێش بیستەکان، ژمارەی کورد لەژێر سفرەوە بووە!!! پارتی (خۆیبوون) لەکۆتایی ١٩٢٠دا نامیلکەیەکی بە ناوی: (The Case of Kurdistan against Turkey)ەوە بلاوکردۆتەوە لەو نامیلکەیەدا سەرجەمی ژمارەی کورد بە (٥.٤) ملیۆن دانراوە، کە ژمارەیەکە عەقڵ قەبوڵی دەکات. کەواتە بەپێ‌ی ئەو یاسایەی خاتوو (هانەلۆرە) دیاری‌ی کردووە، بەلای کەمەوە ژمارەی کورد لە حەفتاکاندا لە ٢٠ ملیۆن تێپەڕ دەکات.

(+) Hannelore Küchler: "Eine theoretisch - methodologische Betrachtung und eine exemplarische Untersuchung zum Selbstverständnis der Kurden", Frei Universtät Berlin, 1978.

ئەم نامەی دوکتۆرایە، یەکێکە لەو کارە زانستانە نایابە کەمانەی تا ئێستا دەربارەی کورد نووسراوە. سەرجەمی نامەکە ٦٦٠ لاپەڕەیە. لەپاڵەوە جار جارە کەمێکم لێ تەرجەمە کردووە. بەنیازم گەر هەل و دەرفەتی تەواوم بوو، سەر و مڕ دەست بە تەرجەمەی بکەم و پێشکەش بەوانەی بکەم کە سەوداسەری زانیاری‌ی زانستانەی زێترن، دەربارەی کێشەی رەوای نەتەوە دیل کراوەکەمان.

لەووڵاتێکدا دەژین کە نێوی کوردستانە. رووپێوەکەی نێزیکەی دووهێندەی رووپێوی ئاڵەمانیای رۆژئاوا دەبێت. نەتەوەی کورد، یەکەیەکی ئێتنی پێک دێنێت و یەک مێژوو یەک زمان و جوگرافیای هەیە. بەڵام لەقەوارەیەکی سیاسی بێ بەشە. خاکی کورد بەزۆ بەسەر ووڵاتانی تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا و شوورەویدا بەش کراوە[١]. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم نەتەوەیە رۆڵێکی گەش و دیاری لەمێژووی رۆژهەڵات دا دیتووە[٢]، بەڵا هێشتا کورد لە دونیادا کەمتر ناسراوە. هۆکەشی ئەوەیە ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیا بەسەردا بەخشراوەتەوە، بەیارمەتی، یاخود بەخۆ لێ گێل کردنی زل هێزەکان، لەترسی ویستەی ئازادیخوازانەی ئەم نەتەوەیە، هەتا ئەورۆ هەموو راستیەکیان یا شاردۆتەو یاخود پێچەوانە کردۆتەوە. لەم سەدەیەدا بەهیوای سەرفرازی و ئازادی لەکۆتی ئە دەوڵەتانە، زنجیرەیەک راپەرینی میللی و شۆڕشی ئازادیخوازانەی کورد بەرپا بوون، بەڵا هەموویان بەیارمەتیی زل هێزەکان بەدڕندانەترین و چەپەڵ ترین شێوە سەرکوت کراون بێ ئەوەی رای گشتی جیهانی پێ بزانێ، یاخود بتوانێ ئاگادار بێ.

لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ەوە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێرانەی بەهێز لە کوردستانی عێراقدا بەرپا بووە. ئەم شۆڕشە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە بە فڕۆکەی مێک و بۆمبای ناپاڵم و گازی کوشندە بەرەنگاری دەکرێت، ئەم بارەی کوردستان بەشێوەیەکە کە دەتوانی بەراستی بەڤێتنامی دووهەم نێوی ببەین. سەرەڕای ئەوەش لەجیهانی رۆژئاوادا هێشت کەم لەبارەیەوە دەزانرێت. ئەم پێ نەزانینە بەتایبەت لە ئاڵەمانیادا لەهەموو لایەک زێترە گەر شتێک دەربارەی کوردستان بزانرێت ئەوا لەرێگەی ئەو رۆمانەوەیە "بەنێو کوردستانی دڕندەدا"، سوپاس بۆ کارل مای (١٨٤٢-١٩١٢)[*].

ئەرکی یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا (نوکسە) ئەوەیە کە خۆی ب مەسەلەی عادیلانەی نەتەوەکەی تەرخان بکات. بۆیە من لەلایەن (نوکسە)وە بەرپرسیا کرام ئەم کارە لە ئەستۆ بگرم و ئەم گوتارە پێشکەش بکەم. ئەم گوتارەم لەراستیید

---

(*) زۆر پێ دەچێت کە گەشتنامەکەی زێرینگەری باڤاریی (Johann Schiltberger ١٣٩٤-١٤٢٧) کۆنترین سەرچاوەیەکی ئاڵەمانی بێت کە نێوی کوردی تێدا هاتبێت. یەکێک لەدێرینترین سەرچاوەی ئەورووپایی کە باس لەکورد و کوردستان بکات رەنگە ئەو هەواڵەی (Thomas von Wiering) بێت کە لە ژمارە ٣٨ی رۆژنامەی: "Türckis - Estats - und krieges - Bericht" دا لە هامبورگ لەشوباتی ١٦٨٤دا بڵاو کراوەتەوە.

بەپلەی یەکەم دەربارەی ئەو خەتەرانەیە کە بوونی نەتەوەکەمانیان خستۆتە مەترسییەوە، ئەو قۆرتانەی کە دوژمنانمان لەبەردەم بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەکەماندا قوتیان کردۆتەوە. لێرەدا هەوڵ دەدەین هەموو روویەکی ئەو خەتەرانە بەکورتی ئاشکرا بکەین. مێژووی نەتەوەکەمان بەچاوی رەخنەوە بتوێژینەوە. بۆیە هەوڵ دەدەین هۆی راستەقینەی ئەم بارە نالەبارە بدۆزینەوە، دواییش چارەسەرێکی بۆ دەست نیشان کەین. چارەسەرێکی وا کە کۆتایی بەنەهامەتی و کولەمەرگی لە وڵاتەکەماندا بهێنێت. جارێ دەبێت ئەوە بڵێم من گلەیی و گازندە و رەخنە نەلەم چارەنووسەی خۆمان و نەلە نەتەوەکەمان قووت نادەمەوە. من پێم وایە ئێمەی کورد دەبێت لەگەڵ خودی خۆماندا زۆر رەق و راستگۆ و سەر راست بین. باترسمان لەرەخنە نەبێت، ئەو کەسانەی یەکسەر رەخنە رەت دەکەنەوە و لێی دەترسن لەبەر ئەوەی دژی هەڵوێستێک یا بەرژەوەندییەکی خۆیانە نەفام و گێلن. من ئاخ بۆ کەسێک هەڵناکێشم کە نەخۆشە و دەچێتە لای پزیشکێک بۆ چارە سەریی، بەڵام لەترسی ئەوەی نەبا نەخۆشییەکەی پێویست بە نەشتەرگەریی بکات ناوێرێت هەموو نیشانەکانی نەخۆشیەکەی بڵێت. ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە مردن چاوەڕوانیانە. پەندە کوردییەکەی خۆمان چەند شیرینە کە دەفەرموێت: "ئەوەی بترسێ ناخەلەسێ".

یەکێک لەو بەڵا گەورە دەرەکییانەی ئەورۆ رووبەڕوومان بۆتەوە ئەوەیە کە دوژمنانی بزووتنەوە ئازادیخوازەکەمان لەڕووی چەک و رێکخستن و پڕوپاگاندەوە کۆکن و خۆیان تەیار کردووە. داگیر کەرانمان توانای فرە و دەستەڵاتی دەوڵەتییان لەبەردەستدایە، سوپای مودێرنیان هەیە. بەدڕندانەترین شێوە بەرەنگاریی نەتەوەکەمان دەکەن. هەوڵی لەنێوبردنمان دەدەن، بەنیازن قڕمان کەن. کە ئەمەیان بۆ ناچێتە سەر، کاتێک ناتوانن کڵپەی شۆڕشەکەمان دامرکێننەوە، ئەوجا هەوڵ دەدەن سووک و چرووک و ریسوامان کەن. دەست دەکەن بەبوختان و باڵۆرە رێکخستن. نێومان لێ دەنێن: جەردە، رێگر، قاچاغچی، بێ رەوشت، نازی، کۆمۆنیست، یاخیی، جوداخواز، بەکرێ گیراو، زایۆنیست، ماوی، داردەستی ئیمپریالیزم... تاد. ئێمەی کوردیش خۆشە بووین، گوێ نادەینێ و گاڵتەمان پێ دێت، زۆر جاریش بەو جنێو و باڵۆرە خەنداوییانە بزەمان دێتێ. بەڵام بەداخەوە، ئەمانە گاڵتە نین، ئەمانە تۆمەتی زەرەر بەخشن و زیانی زۆرمان پێ دەگەیەنن.

زۆربەی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا بەش کراوە و حوکمی دەکەن لەلایەن کەسان و پارتی راست رەوی رادیکالەوە بەڕێوە دەبرێن. ئەمانە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە

ئێمەی کورد لەراستی‌یدا"بەشێک" ین لەگەلەکانیان، بۆیە هیچ شەرم نایانگرێ و جار جارەش بە "برا کوردەکان" یان نێومان دەبەن. ئەم بەنێو "برایەتی"یە بەلای ئەوانەوە، یانی ئەوەی ئێمە بۆمان نەبێت خاوەنی خۆمان بین، بۆمان نەبێت مافی مرۆڤانەی خۆمان بەکاربهێنین. ئەمە وەکو بەسەرهاتی ئەو کورە کلاویازەیە کە پاش مردنی بابی بەبراکەی دەگوت: "برا ئازیزەکەم ماڵەکەمان بەش دەکەین، لەعەردەوە تا بنمیچەکە بۆ من و لەسەر بانیشەوە تا ئاسمان بۆ تۆی برا و خۆشەویستم".

هەر لەگەڵ جولاینەوە و داوای کیانی خۆمان کرد، دەست بەجێ مۆری جودا خوازی لەتەوێڵمان دەدەن. نکۆڵی لەوە ناکەین کە ئێمەش وەکو هەموو نەتەوەیەکی دی هەقی ئەوەمان هەیە داوای مافی چارەنووسی خۆمان بکەین و وولاتێکی سەر بەخۆمان هەبێت. دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کە داگیرکەرانمان بە "جوداخوازی‌ی" نێوی دەبەن، نەلەم بار و دۆخەدا لەتوانادایە و نەبۆتە داخوازی بزووتنەوەکەی ئەورۆشمان. ئەوەی داوای دەکەین تەنها "مافی چوون یەکی"یە. تەنها لەرێگەی ئەو چوون یەکی‌یەوە دەتوانین خۆمان بۆ مەسەلەکەی خۆمان تەرخان بکەین. داگیرکەرانمان ئەو راستی‌یە چاک دەزانن، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە تۆمەتی "جوداخوازی‌ی" دەدەنە پالمان. بێگومان هەر رۆژێک ویستمان وتوانیشمان دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنین، ئەوا ناتوانرێت بەهیچ شێوەیەک بەهەوڵێکی جوداخوازانە نێو بهێنرێت. کوردستان لەوەتەی هەیە نیشتمانی خۆمانە و ئێمە بەزۆر لەرێگەی هێزەوە بەش بەش کراوین. کەواتە یەکگرتنەوە و سەربەخۆیی کوردستان مافێکی سروشتی‌ی خۆمانە و جودا خوازی‌ی نی‌یە.

## هەڵوێستی پارت و کۆمەڵە چەپی‌یەکانی وولاتە داگیرکەرەکانمان

مخابن هەتا پارتە چەپی‌یەکانی ئەو وولاتانەش کە حوکممان دەکەن، بە تەواوی دان بەمافە رەواکانی ئێمەدا نانێن. هەڵوێستیان بەرامبەر خواستەکانی ئێمە، بەپێی کات و شوێن و توانا و هێزیان لە گۆراندایە. زۆری ویست تا پارتی کۆمۆنیستی عێراق تێگەیشت کە ئێمەی کورد کەمە نەتەوەییەک نین، بەڵکە نەتەوەیەکین و هەقی ئەوەمان هەیە مافی چارەنووسی خۆمان بەدەست خۆمان بێت(٣).

لەسەردەمی قاسمی دیکتاتۆردا پارتی کۆمۆنیستی عێراق هەڵوێستێکی تەواو ئۆپۆرتونیستانەی بەرامبەر شۆرشەکەمان هەبوو(٤).

پارتی کۆمۆنیستی سوریا لەدەستەلاتدارێتیدا هاوبەش بوو، کاتێک حیزبی بەعس

نەخشەی سیاسەتی "پشتێنی عارەبی"ی بەگەڕ خست. ئەو سیاسەتەی پلانی نەهێشتنی کوردی لەبەشە داگیرکراوەکەی کوردستانی سوریادا کێشاوە(٥).

هەروەها "پارتی کرێکاران"ی تورکیا (işçi Partisi) هەڵوێستێکی سۆسیالیستانەی راستەقینەی بەرامبەر مەسەلەی کورد نییە. لەگەڵ ئەوەشدا نکۆڵی لەوە ناکەین کە ئەم پارتە بەشێوەیەکی گشتیی روونتر دەڕوانێتە مەسەلەی میللەتەکەمان. بەڵام لەچوارهەم کۆنگرەیدا کە لە ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٠دا بوو ئەوجا دانی بەوەدا نا کە "لە رۆژهەڵاتی تورکیادا میللەتێکی کورد دەژی "کە" فاشیستە دەستەڵاتدارەکانی چینە فەرمانڕەواکان هەر لەسەرەتاوە و کات لەدوای کات، بەشاڵاوی خوێناوی، سیاسەتی زۆر لێ کردن و تیرۆر و تواندنەوەیان لەدژ بەکار دێنن". ئاشکرایە ئەم بڕیارەی ٢٩ی ئۆکتۆبەریش هیچ لەبارەی "مافی چارەنووسی" ئەو کوردە ژیاوانەی رۆژهەڵاتی تورکیاوە ناڵێت.

هەندێ چەپی تورک خۆیان لەباسی چەوساندنەوە و چەرمەسەری کوردی تورکیا دەبوێرن. بیانویان ئەوەیە گوایە هەندێ "دەستەوتاقمی بۆرژوا" کە لەگەڵ ئەم چەپییانە دژی رژێمی عەسکەرییی هاریکاری دەکەن، رەنگە باس کردنی کورد بە تەحەدا تێ بگەن، بۆیە گەر کۆمەک و هاوکاری ئەم بۆرژوایانەیان بوێت دەبێ دەمی خۆیان بگرن. کەواتە ئەمە یانی "بەداخەوە" پیاو دەبێت بازرگانی بە بەدبەختییی کوردەوە بکات.

کۆمەک و پشتگیری "چەپییەکانی فارس"(*). لە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەکەمان لەسنووری چەند بەیاننامەیەک تێناپەڕێت، بێ گومان هەندێک لەوانەش تەنها لە ئەورووپادا بلاو دەکرێنەوە. تەنها لە ئەڵەمانیای رۆژئاوا دا زیاد لە هەزار پزیشک

---

(*) مەبەست لە "چەپییەکانی" فارس تەنها لایەنگرانی پارتی "تودە"یە بێ روانینە رێڕەوە جۆر جۆرەکانی. بۆ نموونە "لایەنگرانی توفان" هەڵوێستێکی شۆڤێنانەی هەلپەرستیان بەرامبەر کێشەی کورد هەیە. بڕوانە: "مسألهء ملی و اوپورتونیزم توفان" لەگۆڤاری "تودە" ارگان سازمان انقلابی حزب تودهء ایران در خارج از کشور"، شماره ١٨، فروردین -اردیبهشت ١٣٤٩، ص٣٣-٤٠."سازمان انقلابی حزب تودهء ایران درخارج از کشور "لەگەڵ دوژمنانی شۆڕش و جاشەکاندا هاوکاریی دەکەن. بڕوانە: "جنبش مسلحانه در کردستان ایران" لەگۆڤاری "تودە"دا، شماره ١٩ تیرماه ١٣٤٩. (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسەدایە). بەڵام لایەنگرانی (مصدق) چەپیی نین. ئەمانە نوێنەری ووردە بۆرژوا راست رەوەکانی ئێرانن. ئەمانە زێتر بەلای شۆڤێنیستی و ئۆپۆرتونیستییدا دایدەشکێن. ئەمانە خەتەرێکی گەورەن، نەک تەنها لەبەردەم بزووتنەوەی کورددا، بەڵکە لەبەر دەم هەموو گەلانی ئێران دا. یەکێک لە لایەنگرانی ئەمانە (م. ماکان) نێوێکە کە کابرایەکی زۆر دەوڵەمەندە و=

و پزیشکی ددانی فارس هەن، زۆربەشیان بەخێریێ خۆیان بە پێشکەوتنخواز دادەنێن. کەسێکیان لەماوەی ئەم دە ساڵەی شۆڕشی کورد دا قرۆشێکیان بەکورد نەداوەو یەکێکیان نەچۆتە کوردستان پێشمەرگەیەکی زامدار تیمار بکات.

شایانی باسە کەسەرپاکی پارتە چەپی‌یەکانی ئەو وولاتانەی دەمانچەوسێننەوە ناچنە ژێر ئەوەی دان بەوەدا بنێن کە سیاسەتی دەوڵەتەکانیان بەرامبەرمان سیاسەتی کۆلۆنیالیستێکە بەرامبەر کۆلۆنی‌یەک، جا ئیدی ئەمە یا لەترسدایە، یاخود تێڕوانینێکی هەلپەرستانەو شۆڤێنانەیە، ئێمە ئەمانە دەڵێین تەنها بۆ ئەوەیە کە راستی‌ی بارەکەمان بخەینە روو، دەنا ئێمە نامانەوێت ئەو چەپی‌یانە لەگەڵ راست ڕەوە رادیکالەکان رست کەین. بە پێچەوانەوە، هەوڵ دەدەین پێوەندی‌یەکی دۆستانەیان لەگەڵ سازدەین، بۆیە پێویستە راستی‌یەکان چۆنن وایان پێش چاوخەین. بەڵام ئەمە بەر بەوە ناگرێت دۆستانە رەخنە لەو هەڵوێستە چەواشانە بگرین. جگە لەوە ئەوان نابێت گوتەکەی (لینین) فەرامۆش کەن کە لە "نامەی ئاشتی"یدا دەربارەی بەزۆر پێوە لکاندنی نەتەوەکان گوتوویەتی:

"ئەگەر نەتەوەیەک لەرێگەی زۆرەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی دی خزێنرا، بەڵام ئەو نەتەوەیە رێگەی گەل پرسی‌یەکی ئازادانەی پێ نەدرا (ئەویش پاش کشانەوەی سوپای نەتەوە بالادەستە داگیرکەرەکە، یانی بۆ ئەوەی زەبر و زۆر لەو دەنگدانەدا دەوری نەبێت). ئەمە لەکاتێکدا ئەو نەتەوەیە لەرێی بلاوکراوەو ئەنجومەنی گەل و بڕیاری حیزبەکانی‌یەوە، یا لەرێی شۆڕشی چەکدارانەوە ئارەزووی ئازادی‌ی خۆی نیشان دابێ، ئەو دەمە لکاندنی ئەو نەتەوەیە بەدەوڵەتە داگیرکەرەکەوە تەنها پێوە نووساندنە، واتە داگیرکردن و زۆر لێ کردنێتی"(*).

---

= ئیتالیا دەژی، بە کۆمەکی رژێم بلاوکراوەیەکی گچکەی بە نێوی (افسانە‌ء خلقهای ایران"، بنگاه انتشارات مزدک، شمارە ٩)وە بلاو کردۆتەوە. لێرەدا هەموو راستی‌یەکی پێوەندی یداری بە مێژوو زمانی کوردەوەی شێواندووە دەڵێت زمانی کوردی "ئیمپریالیزم دایهێناوە!". هەروەها زمانی ئازەری‌ی کە لقێکە لەگروپی زمانە تورکی‌یەکان "زاراوەیەکی فارسی‌یە!!". (بروانە ل١٤و ١٥ی هەمان سەرچاوە)." نەتەوەی کورد بە پێوانەی لینیتیستەکان نەتەوە نی‌یە!!" ل ٣١. ئای زانستی زمانی قوڕ بەسەر، لەویش قوڕ بەسەرتر لینین!!!

(*) بروانە: رۆژنامەی "پراڤدا"، ژ. ١٧١، ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٩١٧.

## هەڵوێستی هێزە زەبەلاحەکان

ئەمانە نموونە بوون بۆ باری کورد لەو وولاتانەی کوردستانیان بەسەردا بەش کراوە. ئایا دەوڵەتە گەورەکان هەڵوێستیان بەرامبەرمان چۆنە؟

گەر دەوڵەتە گەورەکان راستەوخۆ دژمان نەبن، ئەوا بێ گومان ناڕاستەوخۆ دژمان دەوێستنەوە. ئاشکرایە ئەوان تەنها مشەی بەرژەوەندیی خۆیان دەکەن و لەخەباتی ئازادیخوازانەی نەتەوەکەماندا دەست کەوتنی ئەو بەرژەوەندییانە نابینن. ئێمەی کورد دەوڵەتمان نییە تا پێوەندیی دیبلۆماسی یا نادیبلۆماسییانەیان لەگەڵ ببەستین. خۆ ناتوانین بنکەی سوپاییشیان لەخاکەکەماندا بۆ دابمەزرێنین، ئابوورییەکی سەربەخۆ و توندو تۆڵمان نییە تابازاڕی بازرگانییان لەگەڵ ئاڵ و گۆڕکەین. ئەوان نەوت و مادە خاوەکانی کوردستانیان دەویست تا رەوڕەوەی پیشەسازییان خێراتر ببزوێت. بۆ ئەوەش ئەوان ئێمەیان پێویست نییە، دەتوانن ئەو ئامانجانە یەکەو راست لەگەڵ دەستەڵاتە داگیرکەرەکانمان بهێننە دی. ئەوان لەگەڵ ئاغاکانمان دەدوێن نەک لەگەڵ ئێمەی رووتە. جگە لەوانە، ئێمە هێشتا نەبووینەتە مەترسییەکی راستەقینە و رێگرێک لەبەردەم بەرژەوەندیەکانیاندا. جا ئیدی چ پێویست دەکات بایەخ بە ئێمە بدەن. لای دەوڵەتە گەورەکان مەسەلەیەک بە نێوی "مروڤایەتی" یا "پاداشتی خودایی" یەوە نییە. ئەوان لەنرخی نەتەوەکەماندا چەک و ئامرازی قڕکردن دەدەنە داگیرکەرانمان، ئەوانیش بۆ لە نێو بردنی کورد بەکاری دێنن. ئەمە یاسای دەوڵەتە گەورەکانە (بێ هێز دەبێت بەمردن سزا بدرێت!!!).

ئەی رای گشتیی جیهانیی چییە؟ بۆ لەگەڵ ئێمەدا نین؟

زۆر دەربارەی نەتەوە زۆر لێ کراوەکانی دی گوترا: بیافرا، ڤێتنام، پیرۆ، باسک... تاد. خۆپێشاندانیان بۆ دەکرێت، پارەیان بۆ کۆدەکەنەوە و هاوکارییان دەکەن. ئەو هاوکارییە لەراستیدا چییە و تا چ رادەیەک سوودیان پێ دەگەیەنێت، مەسەلەیەکی دییە و نامەوێت لێرەدا دەمەتەقێی لەسەر بکەم. پرسیارەکە ئەوەیە: بۆ تا ئێستا هیچ شتێکی لەو بابەتە بۆ ئێمەی کورد نەکراوە؟ رای گشتیی جیهانیی لە کێشەکەی ئێمە شارەزان و خۆی لێ گێل دەکەن؟ یا هەر لێی بێ خەبەرن؟

لە راستییدا شتێک نییە بەمانای ووشە نێوی رای گشتیی جیهانیی بێت. ئەم ووشەیە بۆ فریودانە. ئەوەی رای گشتیی جیهانیی پێ دەگوترێت، شتێک نییە لە

تێکەڵەیەکی پروپاگەندەیی راوبۆچوونی جۆرەها پارت و رێکخراو زێتر. ئەو رێکخراوە جیاجیایانەی رای گشتیی جیهانیی پێک دێنن هەمە چەشنەن وهەریەکەش لەئاشی بەرژەوەندیی خۆی دەکات. زۆریان لەئاستی دان پێدانانی مافی ئێمەدا خۆ بێ دەنگ دەکەن، یاخود راستەوخۆ بەگژماندا دێنەوە، تا بەرژەوەندییەکانیان نەکەوێتە مەترسییەوە. بۆنموونە لە کاتێکدا قاسمی دیکتاتۆر پلانی لەنێوبردنی کوردی دادەنا، پاپا یوحەنای بیست وسێ هەم لە ١٩٦٢/٦/٢١دا پێشوازی وەفدێکی رەسمیی عێراقی دەکرد. "باوەی پیرۆز" دیارییەکی قاسمی کورد کوژی لێ وەرگرتن و لەژێر وێنەی قاسم دا نوێژی تەمەن درێژیی بۆ دیکتاتۆر دەکرد.

ئەمە هەڵوێستی ئەو کاتەی "پێوەندی کەری نێوان ئاسمان و زەمین بوو"(*).

ئەز لە ١٩٦٦/٥/١٧دا، لە (مۆنیخ)ەوە بە نێوی نوکسەوە، نامەیەکم بۆ پاپا پاولی شەشەم نووسی. پەردەم لەسەر بەد بەختی و بێ چارەیی کورد و دیانەکانی کوردستان هەڵدابووەوە. نێزیکەی پێنج مانگ دواتر وەرامێکم لە بێشۆفایەتی مۆنیخ و فرایسینگەوە بەم ژمارە و رۆژە پێگەیشت: (ژ- ٢/ ١٠٠٢٠، ٣١/ ١٠/ ١٩٦٦)و لەنوێنەرایەتی پاپاوە لە ئەڵەمانیا راگەیەندراوە کە "نووسراوەکەم دەربارەی کەمە نەتەوەیی کورد لەعێراقدا گەیشتە شوێنی پیرۆزی خۆی". تا ئێستاش کە کۆتایی (١٩٧١)ە هیچ سەر ئەنجامێکی دیکەمان لەو شوێنە پیرۆزەوە پێ نەگەیشتۆتەوە.)

بەهەر حاڵ رێکخراوانێک هەن کە لە روانگەی بیرو باوەڕیانەوە، یاخود هەندێ جار وەکی تاکتیکێک سۆزیان بۆ مەسەلەکەمان دەبزوێت. بۆ نموونە وەکی هەندێک (رێکخراوی چەپی ئەوروپایی یا ئەمریکایی). بەڵام بەداخەوە زۆربەیان خراپ و ناڕاست لە مەسەلەکەمان تێ گەیشتوون. ئەو کەمە زانیارییەی دەربارەی کێشەکەمان هەیانە لە دوژمنەکانمانیان بیستووە. دیارە ئەوانیتر تا درۆ ویستا بێت بەلای راستییدا ناچن. ئێمەی کورد تا ئێستا هێندە خۆمان رێک نەخستووە و بەرنامەیەکی هورد و چەسپاومان پێش چاو نەگرتووە تا بەر بەو ماڵ وێرانییە بگرین (جگە لەوە هێشتا زۆر کەسانی بێ توانا و هەلپەرست لەنێو سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورددان) دیارە ئەم بارە نالەبارە هەلێکی وای بۆ دوژمنانمان رەخساندووە بێ بەرگری، ئاسانتر ژاری درۆ و بوختان

---

(*) بڕوانە رۆژنامەی "العهد الجديد"، بغداد، ١٩٦٢/٧/٢٩. لەکۆتایی ئەو سەردانەدا پاپا وێنەیەکی لەپاڵ وێنەی قاسم دا گرتووە.

دژمـان بـلاو بکەنەوە. بەتایبـەت رژێمـانـی وەکـو تورکـیـا و ئـێـران هەوڵ دەدەن کـورد لای گەلانی دی بێ بایەخ نیـشـان بدەن. گەر بێگانەیەک ئارەزووی چوونی کـوردسـتـان بکات بەصەدان درۆی شاخدار زەندەقی دەبەن. کـورد "چەتەن". پیـاو پێـویسـتـە چەقـۆیەک بخـاتە گیرفانیەوە ئەوجا بچێتە کوردستان.

(هەردوو رژێم دەسندە خۆرانی خۆیان دەنێرنە کوردستانەوە تا دەستە و تاقمی تلیاک و حەشیـشە فرۆش رێک بخەن و وا نیـشـان بدەن کە کوردەکان هەر ئەوە پیشـەیانە. لەگەڵ ئەوەدا زۆر کەسانی ناسراو و بەشۆرەتی ئەو دەوڵەتانە خۆیان ئەو کارانە دەکەن(*) بەرتیل دەدەنە هەندێ رۆژنامەنووسی بێگانەو دەمیان چەور دەکەن تا شتی ناڕاست و هەڵبەستراو دەربارەی کورد بنووسن).

## هەڵوێستی هێندێک رۆژنامە و رۆژنامەنووسان و سیاسەتمەداران

رێژبێـسـیـۆرو رۆژنامـەنـووسی ئاڵـەمـانـی (Maxim Osward) روون و ئاشکرا دەڵێت کـە "مەسەلەی کورد بەلایەوە مەسەلەیەکی زۆر سەرنج راکێشە". بەڵام وەکـو "ئەوروپاییەک" ناتوانێت هیچ هەنگاوێک هەڵنێت کە" لاوازیی بەهێزترین شەریکی ناتۆ"، کەتورکـیایە، بەدەرخـات. لەنامـەیەکی دا بۆ ئەندازیاری خـاوەن دیبلۆم بەڕێز (Hans - Werner Paetz)ی سـەرۆکی (کـۆمـەڵەی دۆسـتـایەتیی کـورد و ئاڵەمـان) ئەوەی سـەرەوەی دەربڕیبـوو، زێـتـر لەوەش گـوتبـووی دەتوانێت لەرێگەی مەکـتـەبی هێـلـی ئاسـمـانـی تورکییەوە هەمـیـشـە بە "خۆڕایی" سەفەر بکات[٦]. سا ئیـتـر چ پێـویسـت دەکات خۆی بە راستیی چەوساندنەوەی کـوردەوە خـەریـک بکات؟ رژێمی تورکـیـا و دەوڵـەتانی دی ئەندامـی ناتۆ هێندەی دەدەنێ بەدڵی خۆی! کوردی هەژار دەتوانن چی بۆ بکەن؟

شتێکی هەروا رێکەوت نییە کە رۆژنامە نووسێکی وەکو (رۆلف. ف. شلۆس) بچێتە ئیـسـرائیل و ببێـتـە پەیامنێری رادیۆی (بایەر)ی ئاڵەمانی و لەبەر خـاتری "چاوی کاڵی" وڵاتانـی ناتۆ ژاراو و زەرداوی قـیـنـی بەسـەر کـورد دا بڕژێنێ. لەگـوتارێکی دا بەنێـوی "خـەتەری کـوردەوە"[٧] جەنابی (شلۆس) هەوڵ دەدا بە ڕسـتـێـک درۆی هەرزان سـەراپای خاک و نەتەوەکەمان بە "پێنجەم کۆڵۆنی شوورەوی" لەقەڵەم بدات و ژەنەراڵ بارزانی بە

---

(*) بڕوانە رۆژنامـەی: "Süddeutsche Zeitung", Nr. 58, München, 10. März 1972, S.48.
"سیناتۆرێکی تورک بەهۆی قاچاغچێتی تلیاکەوە دەدرێتە دادگا".

"بەکرێ گیراوێکی شوورەوی‌ی" نێو زەد بکات و فشە ئۆتۆنۆمی‌یەکی کورد لە عێراقدا بە "بۆمبایەکی دەستی شوورەوی‌ی نیشان بدات کە لەکاتی پێویستی‌دا پردی پەیمانی سەنتۆ تورکیا و ئێران و پاکستانی پێ هەڵتەکێنێت". کەواتە بەپێی گوتەی (شلۆس) پێویستە ئێمە لەبەردەم هێزە داگیرکەرەکانماندا خۆمان هەروا بە زۆر لێ کراوی و چەوساوەیی بهێلینەوە، بەبێ بەشی‌ی لە هەموو مافێکی مرۆڤ، تا پردە "پیرۆزەکەی" سەنتۆ زیانێک نەهێنێت.

خۆش لەوەدایە ئەم درۆ شاخدارانە هەر لەلایەن دوژمنەکانمانەوە بەتاڵ کراونەوە. کاتێک (شلۆس) و هەندێکی دی بەو هەڵبەستراوە تاوانبارمان دەکەن کە گوایە شوورەوی‌ی پشتگیریمان دەکات و بارزانی بەکرێگیراوێکی سۆڤیەتە، ڕۆژنامەی (العهد الجدید)ی زوڕناژەنی ئەو کاتەی قاسم دەنووسێت کە بارزانی (بەکرێگیراوێکی ئەمریکایە)[٨].

ڕۆژنامەی ئینگلیزی‌ی (The Observer Weekend Review) لە (٥)ی کانوونی دووهەمی ١٩٦٤دا دەنووسێت گوایە "زۆر لە کۆمۆنیستەکان لەنێوچە ئازاد کراوەکانی کوردستاندا گیراون، چونکە چاپکراوی کۆمۆنیستانەیان بلاوکردۆتەوە".

ڕۆژنامەی (الثورة)ی عیراق دەڵێت گوایە "ڕایۆنیستەکان" یارمەتی کورد دەدەن[٩].

(Erich Helmensdorfer) لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/١٣دا لە ڕۆژنامەی (Frankfurter All-gemeiner Zeitung) دا دەنووسێت گوایە شیرکەتی نەوتی (ئای. پی. سی) بە پەنهانی کۆمەکی ماددی بە سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان دەکات.

(David Adamson) بە پێچەوانەی ئەمانەوە وەکو گەواهێکی بە چاودیدە لە ١٩٦٢دا دەنووسێت: کوردەکان تەنها چەکی سووکیان هەیە و کۆمەکی دەرەکی‌یان پێ ناگات"[١٠].

شاهێدێکی دی (Herbert O. Glattauer) لە ڕیپۆرتاژێکدا دەڵێ: سەر وەختێک بارزانی‌یان نێو نابوو مەلای سوور، لەبەر ئەوەی ماوەیەکی لەشوورەوی‌ی بەسەربردووە، وەکی زۆر جار گوتراوە وانی‌یە، لەهیچ فێرگەیەکی سوپایی سۆڤیەت نەیخوێندووە، بەڵکە زۆرترین کاتی لەگرتووخانەدا بەسەر بردووە. ئێستاش کوردەکان بەدەگمەن یارمەتی شوورەوی‌یان دەگاتێ. لەکاتێکدا شوورەوی‌ی چەکی زۆری بەقەرز داوەتە عێراق، لەوانە فڕۆکەی (مێک)یشی تێدایە"[١١].

ڕۆژنامەی (The Sunday. Telegraph) دەربارەی بارزانی‌ی دەنووسێت: لەگەڵ ئەوەشدا کە بارزانی‌ی بەمەلای سوور نێو دەبرێ بەڵام ئەوانەی ئەم پیاوەیان دیتووە بۆیان

.ەرکەوتووە کە کۆمۆنیست نی‌یە[١٢]. پێچەوانەی بوختانەکانی (شلۆس)و هاوکارەکانی
ە گوتارێکدا لە ژێر سەردێڕی" شۆڕشی بێ کۆتایی کوردەکان" لە گۆڤاری
(Christ und Welt) ژمارە ٣٤، سالّی پازدەهەم، رۆژی ١٩٦٢/٨/٢٤دا و لەرۆژنامەی
(Stuttgarter Zeitung) رۆژی ١٨ی ئابی ١٩٦٢، ل ٤دا بەدەر دەکەون.

هەروەها لە رۆژنامەی (Die Zeit) دا مرۆ پێچەوانەی درۆکانی (شلۆس)وچکە بەدی
ەکات کاتێک دەڵێت: "ئایا بارزانی‌ی هاوپەیمان و هاورێی شوورەوی‌یە؟ دوازدە ساڵ
ەرکردەی کوردەکان لەشوورەوی پەنابەر بوو، تا قاسم رێگەی گەڕانەوەی پێدا. بەڵام بەو
وازدە ساڵە نەتوانرا بکرێتە باوەڕ پێ کراوی سۆڤیەت. ئێستاکە بێ کۆمەکی شوورەوی‌ی
ژی عیراق دەجەنگێت"[١٣].

گوتاری (Eva Lorenz) لەرۆژنامەی (AZ)ی ڤیەننادا، جارێکی دی بەد مەبەستی‌ی
شلۆس) و هاوشانەکانی ئاشکرا دەکات:"مەلای سوور کەواتە ژەنەراڵی کورد بووە نەک
ەنەراڵی لەشکری سوور، وەک هەمیشە نێوی دەبەن بەو نێوە"[١٤].

بەدرۆ خستنەوەی زێتری بوختانەکانی (شلۆس) لەو گووتارەی (Wolfgang Köpker) دا
ەدیترێ کە لە ژێر سەردێڕی ئاشتی کوردەکان؟" لەگۆڤاری (Christ und Welt)دا تاکتیکی
رزانی‌ی چاک شی کردۆتەوە: هەرکەسێ بارزانی‌ی بە دەسکەلایەکی رۆژئاوا یا
ۆژهەلات دابنێت، خۆی فریو دەدات. سەرداری کوردەکان چێترین هەل و مەرجی لەبار بۆ
ـوەندی و مسۆگەرکردنی کۆمەک دەقۆزێتەوە[١٥]. کەواتە پاش چاو خشاندن بەم
استی‌یانەدا دەتوانین بڵێین شتێکی هەروا خۆبەخۆ و رێکەوت نەبوو کە تەلەفزیۆنی
ڵەمانی‌ی لە سالّی ١٩٦٨دا فلیمێکی دەربارەی کوردستانی ئێران پیشان داو بەشی
ری ئەو فلیمە دەربارەی دەروێشی یاڵ و پرچ درێژی کورد بوو. هەر بەو هاندەرە سیاسی
، تەلەفزیۆنی ئاڵەمانی‌ی لە ١٩٧٠/١١/٢٩دا[١٦] قاچاغچی‌یەکی حەشیشەی
ـشاندا و رایگەیاند گوایە کوردە. دەهەمان کات ئەو وێزگەی تەلەفزیۆنە لەئاستی
ـڵوێستی نامرۆڤانەی دەوڵەتە جۆرا و جۆرەکانی دژ بەکورددا کەڕ و کوێرە.

گۆڤارێکی کۆنەپەرستی وەکو (Publik) کە بە دوژمنکاری‌ی کورد ناسراوە، لە گوتارێکی
بە شان و باڵی ژەندرمەی تورک‌دا هەڵدەدات و ژەندرمەی تورک لەکوردستانی تورکیادا
ر بە "میوان دۆست" و بە "خزمەت گوزاری بێگانە" لە قەڵەم دەدات. لەوە تاڵتر ئەوەیە
گەڵ ئەو پیاهەڵدان و "میوان دۆستی‌یە"ی ئەواندا، گۆڤاری (Publik) لەبیری ناکات

گەلی کوردی ئێمەش بە "کڵێسە و دێر تاڵان کەرەکان" و"گوند و کێڵگە وێراز کەرەکان"[17] تاوانبار بکات، تا خانەخۆی میوان دۆستەکانی سەری سوپاسی بۆ بلەقێنن.

یەکێکی دی لەوانەی کەبوختان بە بارزانی و نەتەوەکەمان دەکات (Jean Lartéguy)یە لەو کتێبەیدا بەنێوی (Les Murailles d'Israel) پاریس ١٩٦٧، دەنووسێت: "ئیسرائیل پێوەندی‌یەکی چاکی لەگەڵ بارزانی دا هەیە" و "گوایە ئیسرائیل کۆمەک بە شۆڕشگێڕانی کورد دەکات". بەو پێیە ئێمە بەکرێ گیراوی زایۆنیستەکانین. بەڵام پێویستە ئەوە بزانێ کە (Lartéguy) بەپێی بوختانە جۆر جۆرەکانی درۆی جۆر جۆریشی لێ دەرکەوتووە. ئەوەتا ١٩٦٧ بەکرێ گیراوی ئیسرائیل بووین، بە پێچەوانەی ئەوەوە ساڵی ٩٦٢ کردبووینی بەکرێ گیراوی شوورەوی‌ی. وا پێدەچێت (Lartéguy) لەگەڵ بەساڵدا چوونی تەمەنی د بیری کۆڵ بووبێت، دەنا چۆن لەکتێبەکەی ٩٦٧یدا گوتارێک لەژێر ئەم سەردێرەد دەنووسێت "سەرکردەی کوردە یاخی‌یەکانم بەبەرگی سوپایی ژەنەراڵی سۆڤیەتی‌یەو دیت"[18]. پەندە کوردی‌یەکەی لەمەڕ خۆمان چەند لەبارە کە دەفەرموێت (درۆزن دەبێت بیری تیژ بێت).

ڕۆژنامە نووس (Heinz Gstrein) شتێکی تەواو نوێ باس دەکات: "بەکۆمەکی ئاشکرای تاران و خۆ بێ دەنگ کردن و چاوخەفاندنی قاهیرە و دیمەشق، مستەفا بارزانی‌ی دووهە جەولەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی‌ی کورد ڕێبەری دەکات". بەگوتەی (Gstrein) سەرهەڵدانەوەی ڕاپەڕینی سیاسی و ڕۆشنبیرانەی کورد جێی خۆی لە ریزی هەوڵدانی یەکخستنی عارەب و ووریابوونەوەی ئیسلامی‌دا دۆزیوەتەوە. ئەوەتا لەگەڵ هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی میسر و سوریا و ئێراندا لەیەک سەنگەردان"[19]. بڕوانە ئە کوردە سەر سەختانە چەند ڕوویان هەیە! لەیەک کاتدا کۆمۆنیستن، زایۆنیستن، هاوپەیمانی عارەب و موسڵمانن!

سەرنووسەری گۆڤاری (Orient)، ئۆرگانی نێوبراو بە (ئینستووتی ڕۆژهەڵات) ل هامبورگ، (Dr. E. A. Messerschmidt) دەڵێت گوایە ئێمەی کورد لەگەڵ ئیسرائیل ئێراندا یەک سەنگەرمان دژی عارەب گرتووە. (Messerschmidt) لە (Orient)ی ژمارە ٦؛ ١٩٦٧دا دەنووسێت: "ناردنی ئاشکرای چەک و تەقەمەنی بۆ کوردەکان (بەلای کەمەو بەدان بەخۆدا گرتنی هێزەدەرەکی‌یەکان) ئەوە ئاشکرا دەکات کە لە شۆڕشی کورد ، بەرژەوەندی‌یەک دەور دەبینێت کە پەی بە مرۆڤایەتی و مەردایەتی نابات...

ئایا ئینگلتەرا و ئێران و میسر و شوورەوی چ رۆڵێک دەبینن یا دیتوویانە... پلان تا کوێ دانراوە، وا ئێران و ئیسرائیل و کورد دژی عارەب دەخەنە سەنگەرێکەوە؟"

هەر کوردێک رابوردووی (Messerschmidt) بزانێت و وەکو کۆنە ئەفسەرێکی پێشینی نازیی بیناسێت، چاوەڕوانی بوختان و شێواندنی راستی‌ی زێتری لێ دەکات. (مێسەر شمیدت) لە دڵسووتانی بۆ گەلانی عارەب نی‌یە "پشتگیری‌ی" لەعارەب دەکات. ئەوەی ئەو پارێزەری‌یان لێ دەکات رژێمە دیکتاتۆرەکانی وولاتانی عارەبە. خەباتی ئێمەش دژی ئەوانەیە. ئێمەی کورد دژی نەتەوەی عارەب ناجەنگین. بەڵکو دژی دیکتاتۆری‌ی، فاشیستێتی‌ی، دەستەڵاتە خۆ سەپێنە گەندەڵەکان دەجەنگین. بۆیە سەیر نی یە گەر مێسەر شمیدت قاپیمان بگرێت.

زۆر پێویستە ئاشکرا بە دوژمنانی وەکو (ئۆسفارد)، (شلۆس)، (تیما)، (لارتێژی)، (مێسەر شمیدت) و ئەوانی دی بڵێین، ئەوانەی لەلایەن داگیرکەرانمانەوە دابەستراون ودەلەوەڕێنرێن، بڵێین بوونمان وەکو نەتەوەیەک بێ چەند و چوونە و بەهەر رێگەیەی هەڵسووڕێ و لەبەردەستا ئاسان بێت، بەهەموو شێوەیەک پارێزگاری‌ی لێ دەکەین. هێز نی‌یە لەم دونیایەدا بتوانێت رێگەی مافی چارەنووسمان لێ ببەستێتەوە یاخود لێ‌ی کەم بکاتەوە.

ئەو نموونە زەق و پڕ رق و درۆ و بوختانانەی پێش چاومان خستن هەروا خۆبەخۆ نەڕسکاون، بەڵکە پلانیان بۆ دانراوە و پێشەکی نەخشەیان بۆ کێشراوە. گەر مرۆ بەووردی بڕوانێتە باری ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان پێوە لکاوە، بەراشکاوی رژێمانێکی دیکتاتۆری، گەندەڵی، گەل برسی‌ی، دژ بەهەموو داب و نەریتێکی مرۆڤانە دەدیترێن. دە لەو بارەوە زۆربەی رۆژنامەکانی وولاتە رۆژئاوایی‌یەکان قڕو قەپیان کردووە.

تا بتوانین ئەم بارە لارە راست کەینەوە و دڕ بەو درۆو بوختانانە بدەین و پووچیان کەینەوە، پێویستە بەخۆدا بچینەوە و خۆمان تەواو رێک خەین و ریزەکانمان لەگێلە پیاو و هەرزە گۆو هەلپەرست و خۆشباوەڕ و کۆلکە سیاسەتمەدارانی لێ نە هاتوو پاکژ کەینەوە.

لەگەڵ بەردەوامی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا گەلەک گوتاری جۆرا و جۆر لە رۆژنامەکانی ئەورووپای رۆژئاوا بە گشتی و ئاڵەمانیای رۆژئاوا دا بەتایبەتی، لەبارەی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردەوە دەنووسران. تا رادەیەک بابەتانە بوون. بەڵام وەنەبێت هەموویان لەخۆشەویستی و لایەنگیری‌ی ئێمە نووسرابن، بەڵکە زۆربەیان لەدژایەتی و

دوژمنایەتی عێراق بوون، چونکە ماوەیەک عێراق سیاسەتی دەرەوەی خۆی بەرامبەر ڕۆژئاوا و ئاڵەمانیاش گۆڕی. دەنا ئەوەتا هەر ئەو ڕۆژنامانە ئەوساش و ئێستاش لە ئاستی دڕندایەتی و دژایەتی ڕژێمی تورکیادا بەرامبەر نەتەوەکەمان، نقەیان لێ نایەت. گەر بوختانمان بۆ هەڵنەبەستن ئەوا زۆر بێ دەنگن. لێرەدا تاقە نموونەیەک پێش چاو دەخەم:

ڕۆژنامەی (Frankfurter Allgemeine Zeitung) چەندین ساڵ بەشێوەیەکی بابەتانە هەواڵەکانی جەنگی کوردستانی عێراقی رادەگەیاند. هەندێ جار بۆ داخوازی ئۆتۆنۆمی پشتگیریشی لێ دەکردین. بەڵام ئەمە تەنها لەعێراق. لەو کاتەوە ڕژێمە عەسکەرییە دیکتاتۆرەکەی تورکیا فەرمانڕەوان، (FAZ) ئاوازێکی دی دەخوێنێت و لەئاشێکی دیکە دەکات. ئەوەتا لەژمارە ١٦٦ی ڕۆژی ٢٢ی تەموزی ١٩٧١دا لەژێر سەردێڕی "قەدەغە کردنی پارتەکان لە ئەنقەرە"دا، لە پاڵ هێرش بردنە سەر" پارتی کرێکارانی تورکیا" بوختان بە ئێمەش دەکات. (FAZ) وا دەردەخات کە پارتی کرێکارانی تورکیا گوایە کێشەی کورد وەکو "بۆمبایەک" بەکار دەهێنێت تا" ئەو وولاتەی کەمال ئەتاتورک بنیاتی ناوە، کوت کوتی کەن". ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی "پارتی کرێکاران" گوتوویە کە "لە ڕۆژهەڵاتی تورکیادا میللەتێکی کورد دەژین"، هەقە ئەم میللەتەش "مافی مرۆڤانەی خۆی هەبێت"(*).

(FAZ) ئەم داوا سادە و ئاساییە بە"لەبەر یەک هەڵوەشاندنەوەی تورکیا" نێو دەبات و هەمان کات سەری ڕەزامەندی بۆ هەڵوێست و ڕەفتاری فاشیستانەی ڕژێمی تورکیا بەرامبەر پارتی کرێکاران دەلەقێنێت:

"دادگەی دەستوور لە ئەنقەرە لە چوارچێوەی ئەرکەکانیدا کارێکی بەجێی کرد کە ئەم ڕێکخراوە مارکسییەی لەئەنجومەنی نیشتمانیی بەدەرنا".

(FAZ) ئەوە لەبیر دەکات کە خۆی پێشان پشتگیری لەخەباتی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عێراق دەربڕیوە. ئێستا ئەو خەباتە بە "جوداخوازی" و "ماڵ وێرانی" نێو دەبات هەڕەشەشمان لێ دەکات کە گوایە تورکیا دەتوانێت خۆی لەو "وەیشوومە" بپارێزێت: پیاو پێویست ناکات بیر لە بیافرا بکاتەوە تا تێ بگات جەنگی جوداخوازی چەندە دەردناکە، نموونەی کورد لەعێراقدا لە پێش چاوانە. کەسێک سەرژمێری کوژراوەکانی جەنگی

---

(*) بڕوانە ل ١٩ی ئەم کتێبە.

شاخەکانی عیراقی نەکردووە (بڕوانە FAZ خۆی لەنێوهێنانی ووشەی کوردستان دەپارێزێت -نەبەز-) بەڵام گەر بگوترێت ئەم جەنگە لەهەر سێ جەنگەکەی عارەب و ئیسرائیل قوربانی زێتری خواستووە، زێدەڕەوی نییە. بۆیە تا ئێستا بۆ ڕژێمی تورکیا لواوە خۆی لەچەرمەسەریی وا بپارێزێت و ڕێگە نەدات جەنگێکی وەکو ئەوەی سەرووی عێراق لەنێوچە کوردییەکانی تورکیادا روو بدات[٢٠].

FAZ هەر خۆی لەژمارەیەکی دواتری دا گەواهیی نادیموکراسیێتی ڕژێمی تورکیا دەدات کاتێک دەنووسێت: "لەتورکیادا ڕژێمە ناچارییەکەی ئێریم پێی وایە بۆ ڕاگرتنی باری ئاڵۆزی تورکیا، هەڵوێستی توند و تۆڵ تری گەرەکە وەک لە کابینە بەد بەختەکەی "دێمیریل". بێ گومان ئەم ڕژێمە لەگەڵ مەسەلەی ئۆتۆنۆمیی کوردەکانی تورکیادا نییە"[٢١].

(FAZ) رەخنە لەرژێمانی ئێران و پاکستان دەگرێت، بەڵام مانەوەی ئەو رژێمانەشی پێ باشە: "بەروخاندنی ڕژێمەکانی ئێران و پاکستان و تورکیا تەنها رایدیکالەکان جڵەوی کار دەگرنە دەست"[٢٢]. سا کەواتە بە باوەڕی (FAZ) دەبێ ئەو ڕژێمانەی کورد شەلاڵی خوێن دەکەن، ڕژێمی ڕادیکال نەبن و ڕژێمی نموونەیی بن!

پێمان ڕاست نییە تەنها گلەیی و گازندە لەرۆژنامەکان بکەین لەبەر ئەو هەڵوێستە دوژمنکارانەیان، ئەوان پاشڕەوی سیاسەتی چەوت و دوژمنانەی حکوومەتەکانیانن، ئەوانەش ڕژێمە جۆر بەجۆرەکانی جیهانن، کە بەهۆی جۆراو جۆرەوە کۆمەک بە داگیرکەرانمان دەکەن.

ئەمانە چەند نموونەیەکن:

لەتەموزی ١٩٦٦دا (Schröder)ی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئاڵەمانیا چووە تورکیا و لەگەڵ ڕژێمی تورکیا دا لەبارەی کۆمەکی سوپایی و ئابووریەوە گفتوگۆی کرد[٢٣] لە ١٩-٢٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٠ وە ژەنەراڵ (جەودەت سۆنای) سەرەک کۆماری تورکیا لەلایەن بەرەی یەکگرتووی سۆسیالیستی لیبراڵەکانەوە بەرەسمیی داوەتی ئاڵەمانیا کرا. ئاڵەمانیا ٧٩ ملیۆن دۆلاری خستە بەردەست سوپای تورکەوە[٢٤]. چینە دەستەڵات دارەکەی ئاڵەمانیا (لەگوێی گادا نەنووستوون) وەک مەسەلە کوردییەکەی لەمەڕ خۆمان دەڵێت. سەرکردەکانی سۆسیال دیمۆکراتی ئاڵەمانیاو دەستگای ڕاگەیاندنیان کێشەی کورد چاک شارەزان. ئاگادارانە و بەهۆش و گۆشەوە هەڵوێستی وا دەنوێنن. چاکیش

دەزانن ئەو چەکانە لە پاشە ڕۆژدا بۆ لەخوێندا شەلاڵ کردنی نەتەوەکەمان بەکار دەهێنرێن. (Klaus Jungfer) ئەندامی پەرلەمان کە خۆی لەسۆسیال دیمۆکراتەکانە ئەم راستی‌یەی ئاشکرا کردووە. لەنامەیەکی ڕۆژی ۳/۱/۱۹۷۱دا بۆ هەڤاڵی حیزبەکەی و ئەندامی پەرلەمان (Wenzel Bredl) دەنووسێت(۲۵): "لەو زانیاری‌یانەی کە لە راپۆرتەکەوە(۲۶) دەستم کەوتوون ترسی راستەقینەم لێ نیشتووە کە ئەو کۆمەکە (۲۰۰ ملیۆن مارک)یەی لیژنەی بەرگری‌ی پەرلەمانی ئاڵەمانیا پێشکەشی رژێمی (دیمیرێل)ی کردووە، بۆ سەرکوت کردن و سیاسەتی چەوساندنەوەی کەمە نەتەوەیی کورد لەپارێزگەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا دا بەکاری بەرن".

ڕووداوەکان ئاوها بوون و سیاسەتمەدارانی سۆسیال دیمۆکراتی ئاڵەمانیاش هەردوک چاویان لەئاستی‌یدا دەنووقاند. خۆیان گوتەنی مەسەلەکان بەپێی داب و نەریتی نێو دەوڵەتان دەپێون وهەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن، بەڵام هەندێکیشیان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان.

ئەمە ڕێ لەوە ناگرێت هەموو نەتەوەیەک هەوڵی خۆ چەسپاندن و قایم کردنی جێ پێی خۆی بدات، بەڵام نابێت ئەمە لەسەر حسێبی گەلانی دی بێت. مەخابن لە مێژووی نەتەوەکەماندا گەلەک جار، زۆر نەتەوەو وولات بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیان لەسەر حسێبی ئێمەی کورد هەڵچنیوە. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە ئێمەش لایەک بەلای بەرژەوەندی‌یەکانی خۆماندا بکەینەوە و بەرەنگاری بەرژەوەندی‌یە گلاوەکانی داگیرکەران و چەوسێنەرانمانی پێ بکەین.

(Willy Brandt)ی سەرەک وەزیرانی ئاڵەمانیا لە ۱۰/۱۱/۱۹۷۰دا دەربارەی هەڵوێستی رژێمەکەی بەرامبەر رەفتاری درندانەی رژێمی تورکیا لەکوردستاندا بۆ (کۆمیتەی هاریکاری لەگەڵ شۆڕشی کوردستاندا) لە (بەرلینی ڕۆژئاوا) ئاوها دەنووسێت: "تکاتان لێ دەکەم و بەڵام بەهیوام تێ بگەن، کە دەوڵەتی ئاڵەمانیا ناچارە یاساو داب و نەریتی نێو دەوڵەتان رەچاو بکات، کە خۆ هەڵقورتاندنی لە کاروباری نێو خۆی دەوڵەتان قەدەغە کردووە". زۆر جوانە جەنابی سەرەک وەزیران! کۆمەک و دەستگیرۆیی رژێمی دیکتاتۆر و نا دیموکراسی‌یانەی تورکیا بە پارە و چەکی قورس تا نەتەوەیەکی پێ قڕ بکات " خۆ هەڵقورتاندن" نی‌یە لە" کاروباری نێو خۆی "تورکیا. بەڵام بە ئاگا هێنانەوە و ووریاکردنەوەی تورکیا بۆ پێڕەوکردنی گفتەکانی خۆی لەپەیمانی لۆزانی

۱۹۲دا، که دەستەبەری دەکات رێز لەمافی مرۆڤانەی "کەمە نەتەوەییەکان"ی وولاتەکە گرێت "خۆ هەڵقورتاندنە لەکاروباری نێو خۆ!".

بەداخەوە جەنابی سەرەک وەزیران، خودی خۆتان ئەو کاتە وەزیری دەرەوە بوون ،کۆمەکی سوپایی (۹٦ ملیۆن مارک)یتان لە ۱۹٦۹دا پێشکەش بەتورکیا دەکرد. دیارە ،مە بەلای بەرێزتانەوە "خۆهەڵقورتاندن" نی‌یە لە "کاروباری نێو خۆ"ی تورکیا، وا بۆت ستووینە نێوان دوو کەوانەوە و تکامان لێ دەکەیت (تێ‌بگەین)!!!

نموونەی هەڵوێستی دوژمنکارانە، یاخود بەلای کەمەوە ناتێگەیشتوانەی حکوومەتی ڵەمانیا بەرامبەر کورد، بە راشکاوی لە رەت کردنەوەی مافی پەنا بەریی کوردە ەڵهاتووەکاندا دەدیترێت. ئەوەتا باوەڕپێکراوی حکوومەت بۆ مەسەلەی پەنابەران پێ ،سەر ئەوە دادەگرێت کە نە لەعێراق و نە لەسوریا دا کوردەکان و دیان و چەرکەسەکان و ،مە نەتەوەییەکانی دی بەهۆی جوداوازی رەگەزی و ئاینی و سیاسی‌یەوە راونانرێن و ،زرەبە نادرێن. مەخابن، باوەڕپێکراوی حکوومەت سەرچاوەی ئەم زانیاری‌یە "وورد و ،نرخەی" دەست نیشان نەکردووە! بەپێچەوانەی ئەوانەوە ئێمە هەموو کات دەتوانین بە ،ڵگەی رەسمی‌یەوە راستی مەسەلەکەیان بۆ بە ئیسپات بگەیەنین.

زۆر وولاتی دی هەمان هەڵوێستی یەک لۆنەی وەکو ئاڵەمانیایان بەرامبەر کێشەی کورد ،یە. لەهاوینی ۱۹٦۷دا نەمسا رێگەی خوێندکارانی کوردی نەدا، لەڤیەننا کۆنگرەیەکی سایی بگرن. هەر لەبەر ئەوەی پێوەندی‌ی دیبلۆماسی و بەرژەوەندی‌ی ئابوری‌یان لەگەڵ ێراقدا زیانێکی پێ نەگات[۲۷].

ژەنەراڵ دیگۆل لە ۱۹۳٦دا وەکو ئەفسەرێکی باڵادەستی لاو راپۆرتێکی ۸۰ لاپەڕەیی ،اکی لەسەر کێشەی کورد نووسیبوو[۲۸]، پشتگیری‌ی لێ کردبوو. ۱۹٦۸ هەمان دیگۆل ۆر بە گەرمی‌یەوە پێشوازی سەرەک کۆماری عێراق و خوێنرێژی کورد (عبدالرحمن ،ارف)ی کرد[۲۹]، فەرەنسا ۷۷ فرۆکەی جەنگی بە عێراق فرۆشت کە ۵۰ دانەیان میراج ،ون[۳۰]. جگە لەوە فەرەنسا لە ۹۷۰‌دا ۲۰۰ تەن تەقەمەنی بەتایبەت (گوللە تۆپ)ی ،عێراق فرۆشت[۳۱]. ئەمانەیان هەموو پێدان چونکە عێراق بۆنی نەوتی دا بە لووتی یگۆل و سەرمایەدارانی فەرەنسا دا. کاتێک دیگۆل لە ۲۵-۳۰ی ئۆکتۆبەری ۱۹٦۸دا ،ووە تورکیا، هەلی ئەوەی لەکیس نەدا بەرەسمی و رێزێکی زۆرەوە لە ۲۹ی ئۆکتۆبەردا ،ەردانی پەیکەری ئەتاتورک بکات و لەبەری‌دا بچەمێتەوە.

تاکتیکی سیاسی ئاوایە. بەداخەوە لەسیاسەت دا نە دۆستایەتی هەتا سەر و نەدوژمنایەتی هەتا سەر هەیە. هەموو پێوەندییەکان کاتین. دیگۆل لە ١٩٦٣/٧/٣دا بەگاڵتە نەیگوتووە (پەیمانەکان وەکو شەنگە کچ و گوڵ وانە). ئێمەی کوردیش پێویستە ئەو راستییانە تێبگەین و لێوەی فێر بین. سیاسییانە نەک سۆزبازانە و هەتا هەتاییانە هەڵس و کەوت بکەین.

هەروەها رێکخراوی (ئەمنستی ئینتەرناسیۆنال) مەرکەزی لەندەن ئەوەی رەت کردەوە شتێک بۆ کورد بکات. ئەم رێکخراوە "دەزانێت" ئێمەی کورد "دەچەوسێنرێینەوە"، بەڵام "ناتوانێت" یارمەتیمان بدات چونکە "یاخی بووی چەکدارین"(٣٢)!!!

کەواتە لە ئێستا بەدواوە هەر کوردێک مشووری "دەنووک"ێک بۆ خۆی بخوات، تا بتوانێت ژیانی خۆی لە بۆمبای ناپاڵم پێ بپارێزێت!! ئێمە لەم "ئەمنستی ئینتەرناسیۆنال"ە دەپرسین ئاخۆ ئەو کوردانەی لەتورکیا لەسەر نووسینی ئەلفو بێیەکی کوردیی لەزیندان توندکران چەک دار بوون؟؟(٣٣) دیارە نەخێر. ئەی بۆ "ئەمنستی" بۆ ئەو تاوانە نەبزواو لەنجەیەکی بۆ نەکرد؟؟؟

ئەو زانیارییانەی لە جیهانی رۆژئاوادا لەسەر کورد نوسراون گەلەک هەژارانە وبێ کەڵکن. زۆربەی ئینسکلۆپیدیا و لێکسیکۆی رۆژئاوا یا گێلانە و ساکارانە، یاخود دەستکاری کراو و تێکدراو دەربارەی کوردیان نووسیوە(٣٤) بەداخەوە لە بڵاوکراوە گشتی و تایبەتییەکاندا کێشەی کورد و کوردۆلۆژی زۆر کەم بایەخ و بێ نرخ تێیان دەڕوانرێت.

## هەڵوێستی هێندێک رێکخراوی چەپی ئەورووپایی

بە پێویستی دەزانین کەمێکیش دەربارەی هەڵوێستی رێکخراوە چەپییەکانی جیهانی رۆژئاوا بدوێین:

لەم وڵاتانەدا ساڵانێکی زۆرە کۆمۆنیست هەن، کە لە رێبازی سیاسییاندا بەدەگمەن لە پارتی کۆمۆنیستی شوورەوی دوور دەکەونەوە. ئەم پارتانە جار جارێک پشتگیری بزووتنەوە ئازادیخوازەکەمانیان کردووە، یانی مەعنەوی، لەرێگەی گوتار نووسین لە رۆژنامەکاندا. لەپاڵ ئەم پارتانەدا چەند ساڵێکە هەندێ رێکخراو هاتوونەتە کایەوە کە بە (بزووتنەوەی چەپیی) دونیای رۆژئاوا نێو دەبرێن. ئەمانە بەتایبەت لە ئاڵەمانیای رۆژئاوادا گوڕ و هێزێکیان هەیە. سەرکردایەتیی ئەم بزووتنەوانە بە پلەی یەکەم بەدەست

خوێندکارانی زانستگەکان و هەندێ کەسانی ئەکادیمیەوەن. ئاشکرایە هۆی گرنگی ڕاپەڕینی خوێندکاران کە سەرەتای هاتنە کایەی ئەم بزووتنەوەیە بوو، دژ وەستاندنەوەی جوداوازی‌ی پلەی دەستەلاتی کاربەدەستانی ئەو کاتەی زانستگەکان بوو کە لە پایەی مامۆستای کورسی‌یدار ڕەنگی دەدایەوە و دەبایە بت پەرستانە ڕەفتاریان لەگەڵ کرابا.

بەرۆگرانی ڕاپەڕینی خوێندکاران، یانی "چەپی‌یەکان"، زۆر دەربارەی "شۆڕش"، "سۆسیالیزم"، "پرۆلیتاریا"، "تێکۆشانی چینایەتی‌ی"... تاد دەدوێن. هەر چەندە کاری ئێمە ئەوە نی‌یە ستراتیژ و تاکتیکی ئەمانە هەڵسەنگێنین، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە زۆربەی زۆری ئەم خوێندکارانە سەرەڕای نیازچاکیشیان، فریان بەسەر سۆسیالیستی و بەسەر شۆڕشگێڕێتی‌یەوە نی‌یە. ئەمەش زۆر ئاسایی‌یە. کەسێکی بۆرژوایانە گۆش کراو، دوور لە واقیع و بۆن و بەرامەی شۆڕشگێڕێتی‌یەوە ناتوانێت لە پڕێک هەر بە قاڵەی دەم ببێتە شۆڕشگێڕ و ناشتوانێت لافی مامۆستایەتی بەسەر پرۆلیتاریا دا لێ بدات وەک ئەمانە نا پرسیارانە و نەفامانە ئەو لافە لێ دەدەن. گفتار و کردار یەکەیەکی لێک نەترازاون. بە پێ‌ی بیر و باوەڕی مارکسیزم ڕێبەران و پەیڕەوانی پرۆلیتاریا دەبێت لە نێو ئەم چینە خۆیەوە هەڵقوڵێن و سەرجەمی لێوەشاوەیی سیاسی‌یان لە ئاکامی خەباتی چینایەتی‌یەوە سەر چاوە هەڵگرێت. جگە لەوە ئەم چەپ ڕەوانە بەزۆری دژ بە "دەستەلاتداریتی" دەوەستن. ئەمەش مانای وایە کە ئەمانە خۆیان بە دیاردەیەکی لاتەنیشتی هێزی مۆنۆپۆلەوە خەریک دەکەن، کەچی هێزە مۆنۆپۆلەکە خۆی پشت گوێ دەخەن.

بەکورتی‌یەکەی دەیانەوێت (کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستانە) لە ژێر ڕەشماڵی (سەرمایەداریتی)دا بهێننە کایەوە. بۆ نموونە هەوڵ دەدەن و گەرەکیانە (خوێندەواری‌یەکی سۆسیالیستانە) لەو زانستگایانەدا پێڕەو بکرێت کە خۆیان تانە و تەشەری سەرمایەداریتییان لێ دەدەن.

ئەم هەڵوێستە دیماگۆکی‌یە بەرامبەر سەرمایەداریتی‌ی، بێ شک بەرەو ئۆپۆرتونیزمی سیاسی‌ی سەر هەڵدەگرێت. ئاشکرایە ئۆپۆرتونیزم ڕۆڵەی جگەر سۆزەی سەرمایەداریتی‌یە. بۆیە دەبێت بەداخەوە بڵێین زۆری ئەم چەپی‌یانە تەنها بەدووکەوتوون و لە بنەچە زانستی‌یەکانی تیۆری زانست نەگەیشتوون.

هەندێکیان پێ‌یان وایە بە پرچ و پاڵی درێژ هێشتنەوە و شڕە لەبەرکردن و پاتە

کردنەوەی چەند جوێنێکی وەکو "ڕێڤیزیۆنیست"(×) "کون فش"، "گوو"(××) یا بە جوێن دانی هەرزان بە شوورەویی دەبنە شۆڕشگێڕ. وەکو زۆربەی بیر بۆرژواکانیش تارادەیەک لووت بەرز و خۆ بە پیتۆڵ زان و هەڵەشە و قسە زل و سەر جوقەن.

لەکاتی قسەکردن لەگەڵ خەڵکی سادەو کرێکاراندا گوێچکەیان بە ووشەی قەبە و ئاڵ و والای بێگانە دەئاخنن(×××).

گەلەک بەختەوەرن کە لە نووسیندا ووشەی قەبە و بریقەدار و سەختی وا بەکاردێنن کە تەنها خۆیان سەری لێ دەردەکەن. هەر چەندە بە کردەوە ئیسپات بووە کە سەرکەوتووترین و بەتواناترین رێبەر و فەیلەسوف ئەوانەن کە بە ڕستەی سادە و ڕەوان و هاسان بیریان دەردەبڕن. هەندێک لەو بەنێو (چەپی)یانە پێیان وایە بەبێ ئەدەبی دەبنە "سۆسیالیست". ئەوان وا تێ دەگەن کە ئەدەب و ڕێز، داب و نەریتی "بۆرژواکانە". بە پێچەوانەوە، ئێمە لامان وایە کە ئەدەب و ڕێزی ڕاستەقینە کە لە دڵەوە هەڵدەقوڵێت و پیرۆزی مرۆ نیشان دەدات، تەنها کاروکردەی سۆسیالیستانەیە. ئەو ئەدەبە ڕۆتینییە فشەیەی بۆرژواکان وەکو "تکایە"، "سوپاس"، "بەداخەوە"، لەگەڵ ئەدەب و ڕێزی ڕاستەقینە دا وەکو ووشەی (میوان)ی (میوان دۆستیی) زمانی ئاڵەمانی وایە و هێندە یەکانگیرن! کە گوتت "میوان"یانی لەسەرچاوانە و دەبێت لەدڵەوە ئامێزی بۆبکەیتەوە، بەلام ووشەی "میوان" لە ئاڵەمانیدا کلاشە دەکات، وەکو "میوانخانە"، "نەفەری میوان"، "ژووری میوان"... تاد. کەچی میوانی قوربەسەر دەرووتێننەوە و دەبێت کیسەکەی خاڵی کاتەوە. ئەوە لە چارە ڕەشیی (کرێکاری میوان)ی ئاڵەمانیا هەر نادوێم(××××).

شایانی باسە کە سۆسیالیستە ڕاستەقینەکانی ئاڵەمانیا ئەرکێکی هێجگار سەخت و دژواریان لە ئەستۆدایە. چینی کرێکاری ئاڵەمانیا بە تەلەفزیۆن، ئۆتۆمۆبێل، خانوو،

---

(×) تحریفی. (××) ئەم دوو ووشەیە (Arschloch, Scheiße) لەلایەن گەنجانی ئەو ولاتانەوە کە بە ئاڵەمانی دەدوێن زۆر بەکاردێن.

(×××) بە پێویستمان نەزانی ئەو ووشانەی بەنموونە پێش چاوی خستوون بیکەینە کوردی. چونکە لە کوردیدا ئەو مانایانە نادەن و ئەو ڕەفتارانە لە کۆمەڵگەی کوردەواریشدا فرەن.

(××××) بەزمانی ئاڵەمانی بەمیوان دەگوترێت (Gast) ئەو ووشانەی لەکەوانەدا نووسیومانن بەو ووشەیە دەست پێ دەکەن. هەروەها بەکرێکاری بێگانە دەڵێن (Gastarbeiter) یانی (کرێکاری میوان)، بەلام زۆر نامرۆڤانە مامەڵەی ئەو میوانە بەدبەختانە دەکەن.

بەکورتی بەفشە ژیانێکی هوردە بۆرژوایانە کوێر کراون. جگە لەوە سەرمایەدارانی وولاتە پیشەسازی‌یەکان ئامرازێکی نوێ و پیلانێکی ئەهریمەنانەیان بۆ خەفە کردن و لەت کردنی چینی پرۆلیتاریا گرتۆتە بەر. تەنها سۆسیال دیمۆکراتەکان وەکو دیاردەیەکی ئۆپۆرتونیستی لەرێگەی حیزبە بۆرژواکانی گوایە "کرێکاران"ەوە داو و پیلانی شەیتان چنانەی وایان لێ دەوەشێتەوە. ئەمە خەیاڵ پڵاو و هەوای دەم نی‌یە و لە گیرفانی خۆم دەرم نەهێناوە، بەڵکە لە تەجرەبەوە دەڵێم. لەو دە ساڵەی رابوردوودا ناچار بووم جار جارە لە جۆرەها کارگە و شیرکەتدا کرێکاری بکەم. یەکەم شتێک کە سەرنجی راکێشام ئەوە بوو کە لە هەر بەشێکدا کرێکارێکی دەست نیشان کراو هەیە کە "سەرکار"ی پێ دەڵێن. ئەم کرێکارە هیچ جوادییەکی نی‌یە ئەوە نەبێت کە چەند قرۆشێک زێتر لە کرێکارە هاوچین و هاوشانەکانی وەردەگرێت. لەبەر ئەو چەند قرۆشە و لەبەر نازناوی "سەرکار"، دەبێت لە کرێکارەکان راپەڕێت و لێیان جودا بێتەوە. بۆ ئەوەی پارێزگاری ئەو بەرژەوەندی‌یە تەسکەی خۆی بکات، دەبێت برا هاوچینەکانی خۆی زێتر و زێتر بۆ سەرمایەداران برەتێنێت. کرێکاری چەواشە کراویش ناتوانێت لە "سەرکارەکەی" بەولاوە ببینێت. دەبینێت ئەویش وەکو خۆی کرێکارە و دەشیچەوسێنێتەوە. بەو جۆرە مل ملانێکە لەگەڵ سەرمایەدارەکە دوور دەکەوێتەوە و لەبریتی وی دەبێتە مل ملانێ لەنێوان سەرکار و کرێکاردا، کە هەردووکیان هەر کرێکارن.

ئەم حاڵەتە تەنها حاڵی کرێکاران نی‌یە، بەڵکە حاڵی کارگەرانی هەر دەستگایەکە کە سەرمایەداری‌ی باڵی بەسەر دا کێشا بێت.

بۆیە دەڵێم سۆسیالیستە راستەقینەکانی ئاڵەمانیا و وولاتە ئەوروپی‌یەکانی دی و ئەمریکا ئەرکێکی گرانتریان لەسەر شانە، تا بتوانن پەیامی خۆیان رابگەیەنن و بە ئامانج بگەن. دەنا بە "کون فش" و "گوو" ئەم ووشە بێ سەروپایانە سۆسیالیستی نایەتە کایەوە و ناچەسپێت.

مرۆڤی شۆڕشگێڕ، دەبێت بێ فیز و خۆنەویست و دڵ و دەروون فراوان و یارمەتیدەر بێت. شۆڕشگێڕ کەسێکە کە هەمیشە رەخنە لەخۆ دەگرێت و سنگ فراوانە و لە کەسانی دی خۆش دەبێت. شۆڕشگێرانە بیر دەکاتەوە و هەست دەکات و مامەڵە دەکات. سەرکەوتن لووتی پێ بەرز ناکاتەوە و بە سەر سەردا کەوتنیش وورەی ناڕوخێنێت. لە جەماوەرەوە فێر دەبێت و جەماوەریش فێر دەکات. هەمیشە نموونەیی و بەرچاو روون و خۆ ڕاگر و دڵ پڕ لە هیوایە.

شۆڕشگێڕ ئاوهایە. تەنها بەردێن بەردانەوە پیاو نابێتە شۆڕشگێڕ و سۆسیالیست. پەندە کوردی‌یەکە دەفەرموێت (گەر بەرِیش دەبوو، بزن رێبەر دەبوو).

لەگفتو گۆمدا لەگەڵ زۆربەی ئەو زرە (سۆسیالیست) و فشە (شۆڕشگێڕانە)دا دەربارەی کێشەی کورد، بۆم دەرکەوتووە کە زۆربەیان کورد بە میللەتەکەی (کارل مای)(×) دەزانن. دەربارەی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد و کێشە رەواکەی هەر هیچ نازانن.

هەموو کۆمەڵگەیەک بەیەک کێشانە و پێوانە دەپێون، کە پێوانەی وولاتانی پیشەسازی‌ی گەشە کردوو سەرمایەداریتی‌یە. کۆمەڵگەی پێش سەرمایەداری و پیشەسازی‌ی بەلایانەوە تەواو نامۆیە. دەبێت هەموو کەسیش بە "پێوانەکەیان" رازی‌ی بێت، دەنا بە دواکەوتوو و کۆنەپەرست حسێبی دەکەن.

بەو هۆیانەوە یا گەلێ هۆی دی‌یەوە هەندێکیان جۆرە لا لووتی‌یەکیان بەرامبەر کێشەی کورد پیشان داوە. هەندێکیان بەکردەوە دوژمنایەتی و بەرهەڵستیان کردووین، کاتێک زانیویانە ئامادە نین سەر بۆ گەوجێتی‌یەکانیان بلەقێنین. وەکو پاشخانێکی ئەو لا لووتی و دوژمنایەتی‌یە بوو کە "لیژنەی برەو پێدانی پلانەکانی" زانستگەی ئازادی بەرلین لەساڵی ١٩٧٠دا بڕیاری دامەزراندنی (مامۆستایەک بۆ زمان وکولتوری کوردی)یان رەت کردەوە کە بەشی (فەلسەفە و زانستەکانی کۆمەڵ ناسی‌ی) بڕیاریان لەسەر دابوو(*).

تێڕوانینی ئەم زرە سۆسیالیستانە بۆ مەسەلەی زانست، هەڵوێستی هەلپەرستانەیان بەدەر دەخات. بەشانازی‌یەوە خۆیان بە مارکسی لەقەڵەم دەدەن. هەمان کاتیش نادیارانە بانگی پلورالیزمی زانست هەڵدەدەن.

---

(×) نووسەری رۆمانی (بەنێو کوردستانی درِندەدا) بڕوانە: ل١٦ی ئەم کتێبە.

(*) زرە سۆسیالیستێک کە چەند سمستەرێکی کەمی سۆسیۆلۆجی خوێندووە بەخاترانە لە پایەیەکی بڵند دا دامەزرێنراو مووچەی لە (پرۆفیسۆر) زێتری بۆ براوبۆوە تا بتوانێت یاری بە چارەنووسی چەندین زانای بەشە جوداکانی زانست بکات، کە کەمترین زانیاری دەربارەیان نەبوو. ئێمە ئەم هەنگاوە بە هەڵوێستێکی کۆنەپەرستانە و دوژمنکارانە بەرامبەر کوردۆلۆژی و لێکۆڵینەوەی زانستی دەزانین. بە تایبەت لەکەسانێکەوە کە بانگاشەی ئەوە دەکەن گوایە بۆ (چارەسەری باری زانستگەکان) و (گەشە پێ‌کردن)ی هەوڵ دەدەن و خۆیان بۆ (دیمۆکراسیەتی) و (ئازادی) تەرخان دەکەن. کە لە راستیدا تەواو بە پێچەوانەوە رەفتار دەکەن. بەلای ئەم "سۆسیالیستانەوە" بودجە بەشی ئەوەی تێدا نابێت مامۆستایەک بۆ (زمان و کولتوری کوردی) دابمەزرێنێ! بەلام هەر سمستەرێک صەدان هەزار مارک بێ سەر و حسێب تەخش و پەخش دەکرێت، پارە هەیە.

گەر پیاو مارکسیزم وەک پێوەرێک پەسەند بکات، ئەوا بیرو بۆچوونی ئاوا هەر ڕێڤیزیۆنیزمی لێ شین دەبێتەوە. مارکسیزم لەسەر بنچینەی ماتریالیزمی دیالێکتیک دامەزراوە و بەهیچ شێوەیەک پلورالیزم وەکو کالآیەکی پڕ بە بالآی زانست پەسەند ناکات. بە بۆچوونی مارکسیزم، پلورالیزم وەکو خەسلەتێکی زانستانە لە پۆزیتیڤیزمەوە سەری هەلداوە. ماتریالیزمی دیالێکتیک لەگەل بەحیزبی کردنی زانست دایە. یانی زانست سەر بە حیزبە و بەو پێیەش کە لینین دەلێت هەر حیزبێک "کرۆکی چینێکە"، کەواتە ئاشکرایە زانستیش ئاکاری چینێکە. واتە پلورالیزم، پۆزیتیڤیزم و... تاد بە پێی بیری مارکسیزم (بیر و بۆچوونی بۆرژوایانەن).

نابێت وا تێ بگەین کە ئەو زڕە سۆسیالیستانە لە ڕاستڕەوە ڕادیکالەکان چاکترن. نەخێر! هیچیان دۆستمان نین. لە تێک گیربوونی هەردوولادا دەبێت ئێمە هەلوێستێکی بێ لایەنانە بگرین. دەبێت ئێمە هەلخەلەتاوە بەدوو کەوتووەکانی هەر دوولا وەدۆزین و ڕاستی‌یان بۆ ڕوون کەینەوە.

## هەلوێستی تاکە کەسان

تا ئێرە هەلوێستی هێزە زەبەلاحەکان و پارت و ڕێکخراوەکان و هەندێ سیاسەتمەداری وولآتانمان هەلسەنگاند. ئەی تاکە کەسان چۆنن؟ ئەوان هەلوێستیان چی‌یە؟؟

جارێک مامۆستایەکی ئالەمانی بەشی ڕۆژهەلآتناسی‌ی پێی گوتم کوردەکان "دڕندەن"، "سەرەتایی"ن، گەلێکی "بێ مێژوو" و "بێ کولتور"ن. لێم پرسی ئاخۆ خۆی هیچ کات چۆتە کوردستان و ئەمانەی بە چاوی خۆی دیتووە؟ گوتی نەخێر، بەلآم گەلەک جار چوومەتە ئەستەمول و دۆستە تورکەکانم زۆریان دەربارەی کورد بۆ گێڕاومەتەوە"!

لێم پرسی ئاخۆ هیچ کات خۆی لەگەل زمان و وێژەی کورد دا خەریک کردووە؟ بەر پەرچی دامەوە کە ئارەزووی ئەو شتانە ناکات.

گوتم چاکە، دۆستە تورکەکانت چی‌یان لەبارەی کوردەوە بۆ گێڕاویتەوە"؟ گوتی "نا، خۆ ئاشکرایە، کورد هەموو جەردەن و قاچاغچی حەشیشەن".

تۆ بلێیت ئەم کابرا ئەکادیمی‌یە هێندە نەفام بێت نەزانێت لەهەموو دونیادا نەتەوەیەک نی‌یە بێ مێژوو بێت؟ هەتا قەرەجەکان و هیندی‌یە سوورەکانیش مێژوویان هەیە، (ئەگەر نەنوسراوەش بێت)! تۆ بلێیت باوەڕ نەکات کە ئێمەی کورد وێژەیەکی خەملآو و گەشە

کـردوو، مـۆسـیـقـایەکی شـیـرن و هونەرێکی مـیللی پێـشـکەوتوومـان هەیە؟ نازانێت چەتەگەرییەکی یەکە یەکە و لێرە و لەوێی سەدەکانی پێشوو نابێت بکرێتە پێوانەو پێناسەی ڕەوشت و خووی نەتەوەیەک لەم سەدەیەدا؟ ئەگەر جەنابی (پرۆفیسۆر) لەبانک بڕین و پەلاماردان و لاقەکردنی ژنان و کوشتن و رووتکردنەوە و بازرگانی تلیاکی رۆژانەی نێو وولاتەکەی خۆی لاخەبەرە، باش وایە تەنها جارێک رۆژنامەکانی ,(Abendzeitung) (Bildzeitung) یاخود (Morgenpost) ی بەرلینی بخوێنێتەوە. هەتا رۆژنامەکان لە ئابی ۱۹۷۱دا نووسیبوویان تاقمێک بانک بڕ لەمۆنیخ هەموو شاریان تۆقاندووە. جەنابی (پرۆفیسۆر) هەقە بزانێت کە لە (زانستگەی ئازادی بەرلین)دا، نەک لەکوردستانی "درندە"دا، پالتۆ و چەترەکەی منیان دزی! لەگەڵ ئەوەشدا ئەز تەنها دزەکان تاوانبار دەکەم، نەک هەموو گەلی ئالەمان(۳۵). تۆ بڵێیت جەنابی (پرۆفیسۆر) نەزانێت کە لە نێو هەموو نەتەوەیەکدا، لەسەر وەختێکی گەشەکردنیدا، چەتە و رێگری باو بووە؟ لە ئەورووپا دا (بەتایبەت لەنێو جەرمانەکاندا) شان بەشانی پووکانەوەی کۆمەڵگەی سوارچاکی، جەردەیی هاتە کایەوە. گەلەک دەستە و تاقمی بەگزادە گچکەکان تەنها لەسەر رێگری ژیاون(۳٦).

ئەگەر ئەم راستیانە لای جەنابی (پرۆفیسۆر) ئاشکرانین و سەریان لێ دەرناکات، دیارە شایانی ئەوە نییە کە مامۆستای (سەرەتایی)ش بێت چ جای زانستگە. بەڵام بڕوام نییە هێندە ساویلکە و ساکار بێت. وا پێ دەچێت مەبەستێکی لەم دیماگۆگێتییە هەبێت. کورد واتەنی ئەم ماستە بێ موو نییە!

جەنابی (پرۆفیسۆر) گەلەک جار سەردانی تورکیا وئێران دەکات، دیارە بەڤیزەی داگیرکەرانمان. کاربەدەستە کۆنەپەرستەکانی تورکیا و ئێران بەوپەڕی تاسە و تامەزرۆیییەوە ئامێزی بۆ دەکەنەوە و دەیلاوێننەوە. ئیدی چ پێویست دەکات راستی دەربارەی باری ئێمە ئاشکرا کات. چۆن تەحەدای ئاغاکانمان دەکات کە خانەخوێی خۆیین. ئێمەی کورد تۆزمان لێ هەڵناستێ و چ سوودێکمان بۆی نییە! مەخابن لە پەشم و تووڕەییشمان هیچ زیانێک ناهێنێت.

لەبەر ئەوە هەروا رێکەوت و خۆبەخۆ نییە کە زۆر ئەورووپایی بەتایبەت ئەو ئەکادیمییانەی خەریکی رۆژهەڵات ناسین، دژوێن ترین دوژمنی کوردن.

کە (Herbert Rittlinger) ویستی سەردانێکی کوردستان بکات. یەکێک لەو

ڕۆژهەلاتناسانە نەسیحەتی کردبوو کە نەچێت، چونکە کوردەکان (سەرەتایی)ن[٣٧] بەلام (ریتلینگەر) ترس دای نەگرت! شادین کە گەشتنامەکەی گەواهی‌یەکی دی بوو، چووە پاڵ دەنگی هەق و راستی پەرستەکانی دی‌یەوە و قورێک بوو بەو دەمانەدا درا کە بوختانیان بەبا دەدا[٣٨].

یەکێکی دی لە نوێنەرانی ئەو "ئەکادیمی"یانەی کە هەوڵیان لنگە و قوچ کردنەوەی راستی‌یەکانە دەربارەی کورد، (دوکتۆر د. مەکەنزی)یە. لەگوتارێکی دا دەربارەی "رەچەڵەکی کورد"[٣٩]. هەندێک وورێنەی کردووە و دەفەرموێت: (کوردەکان سەریان لە مێژوو دەرناچێت. زانیویانە (میدیٚ)کان بێ وەچە ماونەتەوە، هەوڵ دەدەن خۆیان بکەنە نەوەی ئەوان)[٤٠].

مەکەنزی لە کلاورۆشنەی بیر و بۆچوونی جیهانی ئیمپریالیزمەوە کوێرانە تاوان بە گشتی دەبەخشێتەوە، دەڵێت: (کوردەکان" واتە هەموو کوردەکان، هەتا زاناکانیشیان-نەبەز-" سەریان لە مێژوو دەرناچێت)! دەیەوێت وا نیشان بدات کە خۆی زانایە!

هەر چەندە گەر مێژوونووسی راستەقینەبایە دەیزانی، کە تەنها کوردەکان نا، بەڵکە ڕۆژهەلاتناسی بە نێوبانگی جیهانیش (فلادیمیر مینۆرسکی) لە بیستەهەمین کۆنگرەی ڕۆژهەلاتناسی اساندا لەساڵی ١٩٣٨دا لە برۆکسل گوتی: (رەچەڵەکی کوردەکان هەر دەتوانرێت بگێڕدرێتەوە سەر میدییەکان)[٤١].

ووشەی (کورمانج) کە (ووشەیەکی رەشۆکی‌یە بۆ نێوی کورد) و دەچێتەوە سەر رەگی ووشەی (کورد ماد) "کوردە مادەکان" لەلایەن مینۆرسکی‌یەوە شی کراوەتەوە[٤٢]. پاشان منیش زمانەوانانە زێتر توێژیمەوە[٤٣].

ڕۆژهەلاتناسی فەرەنسەیی (Darmesteter) بوو، نەک (کوردەکان) کە ئیسپاتی کرد (زمانی کوردی پاشەڕۆکەی زمانی میدی‌یە)[٤٤].

دوا کات بۆ ئێمە نابێتە مایەی ماڵ وێرانی و بەدبەختی گەر لەبەرەبابی میدی‌یەکانیش نەبین. بەلام دژواری‌ی خۆ ڕەتاندنی مەکەنزی لەوە دایە کە ناڕاستەوخۆ هەوڵ دەدات ئێمە وەکو کۆمەڵێکی بێ بەش لە خەسڵەتی نەتەوایەتی پێناسە بکات. تا بتوانێت لەو ڕێگەیەوە چەکێکی کاریگەرتر بداتە دەست داگیرکەرانمان، ئەوانیش لە بۆتەی نەتەوەکانی خۆیاندا زێتر و زێتر بمانتاوێننەوە و قرمان کەن.

جگە لەوە مەکەنزی چاک دەزانێت کە تا ئێستا هیچ تێکستێکی میدی نەکەوتۆتە بەر

دەست. بەو پێیە ناتوانرێت لەگەڵ زمانی کوردی‌یدا بەراورد بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ووشە میدی‌یە خواستراوانەی لەتێکستی هەندێ زمانی دیدا بۆمان ماونەتەوە، بەڵگەکانی مەکەنزی پووچ دەکەنەوە. زانای رووسی‌ی (Marr) ٦٣ حاڵەتی کوردی و میدی پێک گرتووە کە لەرووی لێکسیکۆلۆژی‌یەوە چوون یەکن و پێچەوانەی فارسین(٤٥). کەواتە پێوەندی‌ی نێوان کورد و مادەکان، لەلایەن زانایان و زمانەوانانی بە نێوبانگی جیهانەوە شی کراوەتەوە و ئاشکرا کراوە، نەک لەلایەن (کوردە مێژوو نەزانەکان)ەوە!

کەواتە دوژمنمان زۆرن. راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ!

دەی سا چی بکەین؟؟

واز لە کوردێتی خۆمان بهێنین؟ خۆمان بتوێنینەوە؟ کۆڵ بدەین و واز لەو داوایەمان بهێنین کە ئێمەش نەتەوەیەکین، هەموو خەسڵەتێکی نەتەوایەتیمان تێدایە و مافی خۆمانە ئازادانە و سەربەست بژین؟ کوردستان بەجێ بهێڵین و قەرەج ئاسایی گەرد بخۆین و هەر رۆژە لەشوێنێک هەوار هەڵدەین؟ یاخود هەر لە کوردستاندا بمێنینەوە و بەدیلی و نۆکەری و وەکی مرۆڤی دەرەجە دوو بژین، وەکو رۆژنامەنووسی ئاڵەمانی‌ی (Rolf W. Schloss) بێ شەرمانە پێشنیازمان بۆ دەکات؟(*) دەست بەرداری هەموو شت ببین؟ یاخود لە پێناوی مافی رەواماندا تێ بکۆشین؟

پێم وایە زەحمەتە کوردێک هەبێت کە نەیەوێت بەکوردێتی بمێنێتەوە. بەهەمان جۆر هیچ کوردێکیش نییە بە ژیانی نۆکەری‌ی، یا قەرەج ئاسایی رازی بێت. کەواتە تەنها و تەنها تاکە رێگەیەکمان لە پێشە، خەباتی بێ پسانەوە، بێ کۆڵدان، تا ئاواتەکانمان دێتە دی. ئێمەی کورد دەرفەتی دیکەمان نی‌یە، رێگەیەکە و نابێتە دوو.

تا بتوانین بەرگە بگرین و خۆ راگرین، دەبێت خۆمان بەهێز کەین. هێندە هێز کۆ وەکەین کە داگیرکەرانمان ناچارکەین مل بۆ داوا رەواکانمان بدەن.

بە پێچەوانەی وورێنەی دوژمنانمانەوە کە کوردستانێکی ئازاد بە (خەون و خەیاڵ)

---

(*) بروانە لاپەرە (٢٣و٢٤)ی ئەم کتێبە.

لەگفتو گۆیەکدا لەگەڵ ئەندازیاری خاوەن دیبلۆم بەرێز (هانز ڤێرنەر پێتس)ی سەرۆکی (کۆمەڵەی دۆستایەتی کورد و ئاڵەمان)دا (شلۆس) گوتوویە ئەو گوتارە ئەو نەینووسیوە. حەکایەتی هەزار و یەک شەوەیە!!!

لەقەڵەم دەدەن، دەبێت بۆ ئەوانیش و خۆشمانی بە ئیسپات بگەیەنین کە سەرکەوتنمان حەتمی‌یە. بۆ پیادەکردنی ئامانجەکانمان هەل و دەرفەتی زۆرمان لە پێشە. هێندە هەیە دەبێت ستراتیژ و تاکتیکی خۆمان تەواو دەست نیشان بکەین.

نەتەوەیەکی روخاونیین، بە پێچەوانەوە، خۆڕاگرتوو و بەهیمەتین، جەنگاوەر و تێکۆشەرین[٤٦] گەلەک بێگانە، خودی دوژمنەکانمان، کەواهی‌ی ئەم راستی‌یەیان بۆ داوین[٤٧].

نیشتمانەکەمان هەڵکەوتێکی جوگرافی زۆر گرنگ و ستراتیژی هەیە. جگەلەوە دینگەی فەلسەفەی تێکۆشانمان زۆر پتەوە، دینگەیەکی زۆر بەتین و بەهێزە (فەلسەفەی نابووت و لات)ان. دەوڵەتمان نی‌یە، شیرکەت و کارگەی گەورەمان نی‌یە، زانستگەی خۆمان نی‌یە، ژیانێکی شیرین و هێمنمان نی‌یە، بۆمان نی‌یە زمانی زگماکی خۆمان بەکار بەرین. پڕاوپڕی مانای ووشە (لات)ین، پەندێکی کوردیمان هەیە دەفەرموێت" لات پاڵەوانی خودایە"[٤٨].

لە بارو دۆخێکداین پاڵەوانانە ملی پێوە نێین. هیچمان نی‌یە لەدەستی دەین. لەبەر ئەوە لەتێدا چوونیش باکمان نی‌یە. بەڵام ئەمە مانای وانی‌یە دۆنکیشوتانە بیگرینە بەر. نەخێر! نابێت هیچ کات هێز و توانا و چەپەڵی‌ی دوژمنەکانمان فەرامۆش بکەین. چێترین ستراتیژ ئەوەیە، کە مرۆ هێز و توانای دوژمنەکەی تەواو هەڵسەنگێنێت و کات و فرسەتی دەست پێشکەری وشوێن پەلامار پێش چاو بگرێت و بۆ خۆی دەست نیشان بکات. چونکە گەر دوژمنەکەت ئەو دەمکات و شوێنانەی بەر لەتۆ پێش گرت و رەچاوی کرد، ئەو دەمە ئیحتمالی دۆڕاندنت زۆرە.

## پێوەندی‌ی ستراتیژ و تاکتیک

دەمەوێت لێرەدا راستی‌یەکی گرنگ پێش چاو خەم، کە تا ئێستا لە لای ئێمە ئەو بایەخەی پێ نەدراوە. ئەویش پێوەندی‌یە دیالێکتیکە سروشتی‌یەکەی جیهان و ژیانە.

یاسایەکی سروشتی هەیە دەڵێت (هەموو هێزێک بەرپەرچ دانەوەی هەیە، بە هەمان شێواز و بە پێچەوانەی رێ روویەوە)، پێ بەپێ‌ی ئەم یاسا دیالێکتیکە سروشتی‌یە، دەبێت هەموو زیانێک سوودێکیش لەگەڵ خۆیدا بەکێش کات. بۆ نموونە هەر هەنگاوێکی سیاسی‌یانەی دروست، سوودێکی سیاسی‌یانەی گونجا و بەدەستەوە دەدات. ئەمەش

لەمەودای تاکتیکێکی ڕاست و لەباردا دێتە دی. هەروەها هەر هەنگاوێکی سیاسی‌یانەی چەوت، زیانێکی سیاسی‌یانەی بەدەمەوەیە. ئەمەش لەڕێی تاکتکێکی نالەبار و پڕ هەڵەوە دێتە بەرهەم. لێرەدا پرسێک خۆی دەسەپێنێت: کێ بەرهەمی سوودەکە و کێ بەری زیانەکە دەدرووێتەوە؟

بزووتنەوەی سیاسیانەی خاوەن ئیدیۆلۆژی‌یەکی راستەقینە ئەوەیە کە دەست بەجێ بەسەرکۆنە و رەخنەی نیان و لەبارەوە دەستبەرداری تاکتیکە چەوتەکە دەبێت و ئامبازی تاکتیکێکی راست تر و گونجاوتر و چەسپاوتر دەبێت. بەو جۆرە دەتوانێت بۆ ئامانجی خۆی، لەزیان سوود بەبەرهەم بهێنێت. لەگەڵ ئەوەدا جوداوازی کردن لەنێوان ستراتیژ و تاکتیک دا پێویستی‌یەکی بێ چەند و چوونە. ستراتیژ بەنیسبەت تاکتیکەوە چەسپاو و نەگۆڕە و لە چەقی بزووتنەوەکەدایە. تاکتیک بە پێچەوانەوە، بزۆز و جوڵاوە، بەڵام تەنها لە چوارچێوەی ستراتیژێکی دەست نیشان کراودا دەبزوێت. (وەکو لەم کلێشەیەدا بەدەر دەکەوێت).

ئەگەر (S) بەستراتیژی بزووتنەوەیەکی دیاری کراو دابنێین، ئەوا (H, G, F, E, D, C, B, A) ئەو شوێنە جۆر بە جۆرانەی سەر چێوەی بازنەکەن کە رەنگە تاکتیکی لێ هەڵنیشێت. بەڵام دووریان لەستراتیژی (S)ەوە هەمیشە هێندەی درێژی‌ی نیوە تیرەی بازنەکەیە. کەواتە پێویستە دووری (r) هەرگیز نەگۆڕ بێت، تا بزووتنی تاکتیک بێ گۆڕان لە خزمەتی ستراتیژ دا بێت. ئەم بۆ چوونە بە هەمان شێوەی یاسای خۆر و ئەستێرەکانی دەورێتی. ئەستێرەکان دەخولێنەوە وجێگەی خۆیان بە هەمیشەیی دەگۆڕن بەڵام هەرگیز لە خولگەی خۆر دەرباز نابن. گەر لەو مەودایە دەرچوون، فریان بەسەر کۆمەڵەی خۆرەوە نامێنێت.

تاکتیکیش بەهەمان جۆر گەر دووری خۆی پارێزگاری پێوە نەکرد، ئیدی پێوەندی بەو ستراتیژەوە نامێنێت.

لەسیاسەت دا هەڵچوون و داچوونی تاکتیک بە نیسبەت ستراتیژەوە چەندین جۆر ئۆپۆرتونیستی دەخولقێنێت. هەمان کات بیر و ئامانجی ئەو ستراتیژە هەڵدەقرچێنێ و ئاکامەکەی نا بە کامی دەبێت.

مەخابن زۆرکەس هەن گومان لە راستی ئەم بۆ چوونە دەکەن. پێیان وایە هەندەک زیان سوودی تێدا نی‌یە. بەڵام ئەو گومانانە بێ بنچینەن. هەر بەڵایەک، هەر ماڵ وێرانی‌یەک، کە لە لایەکەوە زیانێکی پڕ مەترسی‌ی تێدایە، لە لایەکی دی‌یەوە سوودێکی لەگەڵ دایە. چۆن ئەو سوودە دەقۆزرێتەوە مەسەلەیەکی دی‌یە. با بە نموونەیەکی هاسان تر روونی کەمەوە.

کاتێک پارتێکی سیاسی چەند ئەندامێکی لەزەبر و زەندی دژەکەیدا لە دەست دەدات، گومانی تێدا نی‌یە ئەمە خەسارەت و زیانێکە. بێ شک ئەو زیانە سوودێکیشی لە نێو خۆیدا حەشارداوە. لێرەدا دوو ئیحتیمال هەیە: یا ئەو پارتە زیان لێ‌کەوتووە لە سەر تاکتیکە چەوتەکەی خۆی بەردەوام دەبێت و ئەو هەلە لەکیس دەدات سوود لەهەڵە وەربگرێت و زیانەکەی بەسوودی دوژمنەکەی دەگەڕێتەوە، یاخود تاکتیکە گێرەکەی خۆی راست دەکاتەوە و بەخۆیدا دەچێتەوە و ئەو زیانە رق ئەستوور تری دەکات و بەسوودی دەشکێتەوە. ئەم سوودەش خۆی لە خۆیدا زیانی لەگەڵ دا پێکەڵ پێکە، کە رەنگە بەملی دوژمنەکەیدا بکەوێتەوە ئەگەر ئەمیش هوشیار و لێهاتوو نەبێت و تاکتیکی خۆی نەگۆڕێت.

بۆ نموونە لە دووهەم جەنگی جیهانی‌دا شەش ملیۆن جوولەکە قڕ کران. ئەمە زیانێکی جەزرەبەکێش بوو لێ‌یان کەوت. بەڵام هەندێ کوڕ و کۆمەڵیان توانیان سوود لەم زیانە هەڵهێنجن. توانی‌یان هەلی ئەم ماڵ وێرانی‌یەیان بکەنە بیانویەک بۆ سەرنج راکێشان و مسۆگەر کردنی پشتگیری رۆژهەڵات و رۆژئاوا تا لە فەلەستین دا دەوڵەتێکیان بۆ دابمەزرێنن. ئەم سوودەی جووەکان، بەهۆی خۆ فرۆشی و دەسەنەخۆری و شل و پەیتی سەرانی عارەبەوە، بووە ماڵ وێرانی و چەرمە سەری‌یەک بۆ عارەبەکان. عارەبەکانیش گەر تاکتیکێکی راست و دروستیان هەبایە، دەیانتوانی ئەو زیانە لە خۆیان دوورخەنەوە و لە بریتی ئەوە بەسوود بۆیان بشکایەتەوە، بۆ نموونە یەکیان بگرتایە... ئیدی بەو جۆرە.

بەکورتی‌یەکەی ئێمەی کوردیش دەبێت لە زیاندا سوود برسکێنین. ئەمەش تەنها بەتاکتیکی لەبار و گونجاو بەدی دێت. ئاشکراشە تاکتیک بێ ستراتیژ نابێت. بۆیە پێویستە پێشان ستراتیژێکی روون و ئاشکرا بۆ خۆمان دەست نیشان کەین.

دەبێت ئەوەش بڵێم کە زۆر کەسان و سەران و دەستەی بۆرژوای رۆژئاوا ئێمەی کورد بە (سەختگیر) و (شێت) حسێب دەکەن. تانەمان لێ دەدەن: ئەها! هیچتان نی‌یە لەدەستی

بدەن؟ چۆن نیتانە؟ بەنرخترین سەرمایەتان لە دەست دەدەن، کە ژیانتانە!

ئێمە گەرەکمانە بەم دار و دەستە بۆرژاوایانە بڵێین، کە سەختگیری بەمەبەستە دزێو و بەد فەسالەکەی لە ملمان دەئاڵێنن، مێژوو بە ئیسپاتی گەیاندووە مرۆ تەنها بە (سەختگیری) و (سووربوون) بە ئامانج گەیشتووە.

ئەو پزیشکەی (پەنسلین)ی دۆزییەوە گەر (سەختگیر) و (قیرسیچمە) نەبایە و دوای چەند تەجرەبەیەکی بێ ئاکام کۆڵی بدایە، ئەو خزمەتە مەزنەی پێ نەدەکرا. گەلەک پزیشک لەرێگەی بە ئامانج گەیشتنیاندا گیانیان بەخت کرد. پاش سەرکەوتنیان مرۆ سەری رێزی بۆ نەوی کردن.

چارە و چارەسەری نیوە و ناچڵ، خاو و خلیچکی و خۆلستنەوە، زۆر بیر و بزووتنەوەیان بەرەو چاڵی نەمان راپێچ داوە.

گرنگ ئەوەیە ئێمە جوداوازی لە نێوان (سەختگیری کوێرانە) و(سەختگیری بینایانە)دا بکەین. (سەختگیری کوێرانە) بەرەو تێدا چوون و ماڵ وێرانی سەر هەڵدەگرێت. بەڵام (سەختگیری بینایانە) بەرەو رۆخی هێمنی و خۆش بەختی پەلکێشت دەکات.

بۆیە ئێمە بەدڵ ودەروونێکی ئاوالەوە هەنگاو هەڵدەنێین. ئێمە ئامانجی پیرۆز ودیاری کراومان لە پێشە. رێگە نادەین وەکی مرۆڤی پلە خواروو دەرەجە دوو مامەڵەمان لەگەڵ بکرێت. جێ پێ دیاری دەکەین، ئەوجا هەنگاوی بێ گەڕانەوە وبێ دڵە راوکە هەڵدەگرین.

راستە زۆرمان گیان لە دەست دەدەین، بەڵام ئەمە (شێتێتی) و (یاری بە ئاگر) کردن ناگەیەنێت. نەخێر! جوتکارانی کورد کە دەساڵ زێترە چەکی شەرەفیان بەڕووی زۆر و زۆرداریدا بەرز کردۆتەوە، نە (شێتن) و نە (گێل). ئەوان ئامانجێکیان لە پێشە، گەش بین و دڵ پڕ لە هیوان. کەس حەز بە مردن ناکات. بەڵام ڕێڕەوی ژیان وایە. بەختەوەریی بێ خەبات و قوربانی دان نایەتە دی. ئەو کوردەی بخوازێت کەرامەتی خۆی و نەتەوەکەی بپارێزێت دەبێت فەلسەفەی ژیان و تێکۆشان تێ بگات. دیارە ئەم راستییانە بەمێشکی زرک و پووتی بۆرژوا و سیاسەتمەدارانی خۆ بژێن دا ناچێت.

بە پێویستی دەزانم سەرنجتان بەلای رووداوێکدا رابکێشم، تا تێبگەن و بزانن چ جۆرە کەسانێک ئێمە بە (سەختگیر)" بێ گومان بە بارە دزێوەکەیدا" لەقەڵەم دەدەن:

لەکۆبوونەوەیەکی (کۆڕی لێکۆڵینەوەی زانستانە)ی ئاڵەمانیادا، کە سیازدەهەمین

:انیشتنی تایبەتی بوو لە (Göttingen) لە ڕۆژی ٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٧١دا. یەکێک لە ئامادەبوان پێشنیازی کرد کەمنیش بخرێمە لیژنەی تایبەتی لێکۆڵینەوە و هاریکاری‌یان بکەم. ڕۆژهەلات ناس پرۆفیسۆر (Bertold Spuler) دەست بەجێ پەنجەی ڤیتۆی بەرز کردەوە و گوتی: نا! نا! نەخێر! شتی وا نابێت! نەبەز ناتوانێت زانستانە کارمان بۆ بکات، چونکە کوردێکی (سەخت گیرە).

کاتێک دیتی هیچ کەس پشتگیری لێ نەکرد، ناچار بوو دەمی داخات. چاکە! شک ەوە دا نی‌یە بۆچوونی (Spuler) بۆ زانست و بۆ چوونی ئێمە بۆ زانست، دووباری سەرنجی جوداوازن. هەر بۆ نموونە ئێمە پێمان وایە زانستی مێژوو ئەوە نی‌یە بنووسیت فلان پاشای فارس، یا فیسارە سوڵتانی عوسمانی کەی لە دایک بووە و چۆن و کەی و لە کوێ سەری ناوەتەوە، بەلای ئێمەوە ئەم بابەتە فریان بەسەر زانستەوە نی‌یە.

تاکو ئەم پرۆفیسور (شپولەر)ە بەرێزەی من بە (سەختگیر) نێو دەبات چێتری بناسن، ئەمە هەمان ئەو (شپولەر)ەیە کە لە نۆڤەمبەری ١٩٦٧دا، لەزانستگەی هامبورگ، لەهۆڵی (Audi Max)، لە ئاهەنگی گۆڕینی سەرەکی زانستگەدا لە خوێندکاران زیز بوو، بە دەنگی بلند فەرمووی "سەرپاکتان بۆ ئەوە چاکن بخرێنە کوورەی گازی کوشندەوە"(*). بۆ بڕوانە پاش بیست و دوو ساڵ لە سەرنگوم بوونی ڕژێمی ئابڕوو تکاوی نازی‌ی، کەچی هێشتا خڵتەی بیری فاشستی‌ی لە مێشکیدا ماوە! ئیدی ئەوجا کام لە ئێمە (دەمارگیر)ین، وەرامی ناوێت! پێم وایە ئاشکرا بێت.

من مرۆڤێکم ئازادی‌ی، برایەتی‌ی و چوون یەکی و هاوسانی هەموو نەتەوەکان ئاواتی هەرە بەرزمە. بۆیە ڕەخنەی (شپولەر)ان ڕەت دەکەمەوە و بەیتە نایابەکەی (المتنبی) دەڵێمەوە:

وإذا اتتك مذمتي من ناقصٍ
فهي الشهادة لي بأني كاملٌ

---

(*) بڕوانە ڕۆژنامەی: "Abendblat", Nr. 269, 20. Jahrg. , Hamburg, 17.11.1967, S.1
"Professor Spuler Suspendiert"(پرۆفیسۆر شپولەر هەڵدەپەسێردرێت)

هەروەها بڕوانە گۆڤاری: "Der Spiegel":"Muff im Talar", Nr. 48, 27. Jahrg,Hamburg 20.11. 1967.

# ئاوڕێکی پاشەوە

ئێمەی کورد خەباتێکی سەخت و دوور و درێژمان کردووە، قوربانی زۆرمان داوە، بەڵام هێشتا نەگەیشتووینە هەواری ئازادی! بۆ؟ پێویستە وەرامێکی بەجێ بۆ ئەم (بۆ)یە بدۆزینەوە. بۆرەها کردن و سانا کردنی وەرامێکی وا، پێویستە ئاوڕێکی پاشەوە بدەینەوە. یانی دەبێت مێژوومان زانستانە و رەخنە ئامێزانە هەڵسەنگێنین.

ئێمە کێین؟؟

لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکانی زمانەوانەکان ئەوە دەردەخەن کە کورد نەتەوەیەکی هیند و ئەوروپایی‌یە ولقی ئاریی[٤٩] گروپە ئێرانی‌یەکانە. داگیرکەرانمان هەوڵ دەدەن ئەم راستی‌یە بشێوێنن. ئەمەش شتێکی تازە کوورە نی‌یە. مێژوو نووسە کۆنەکانی عارەب[٥٠] تەواو وەکو عارەبە داگیرکەرەکانی ئەورۆ کوردیان بۆ سەر "رەچەڵەکی عارەب" گێڕاوەتەوە[٥١].

رەگەز پەرستانی تورک بە پێچەوانەی ئەمانەوە دەمانگێڕنەوە سەر (بنەچەی تورک) و زۆر بە هاسانی نێوی (تورکی شاخاوی)یان لێ ناوین[٥٢].

دەستەڵات دارانی ئێران کەمێک بە نەزاکەت ترن و دەستی رێزیان لێ ناویون و دەفەرموون (لە پاکترین نەژادی فارس)ین[٥٣]. زمانەکەشمان (زاراوەیەکی شیرن و کۆنی فارسی)یە[٥٤]!

لەوانەش بێ شەرمتر ئەو ووڕێنانەی کە گوایە لە (زار و زیچی جنۆکەکانی حەزرەتی سلێمان) کەوتووینەوە، یاخود (بێچووە شەیتانین)[٥٥]. سا کەواتە بەم پێیە بێت، ئێمە هەموو شتێکین، تەنها کورد نەبێت!!!

(گەزنەفۆن)ی مێژوونووسی یۆنانی لە (ئەنا باسیس)[٥٦]ە کەیدا، کە باسی گەڕانەوەی سوپای یۆنان لە جەنگی ئێران دەکات، لە ٤٠٠ - ٤٠١ی پ. ز. دا، لەنەتەوەی (کاردۆخ)ی‌یەکان و قارەمانێتی‌یان دەدوێت.

دوژمنەکانمان سوورن لە سەر ئەوەی کە هیچ پێوەندی‌یەک لە نێوان (کاردۆخ)یەکان و کورد دا نی‌یە! هەروەها دەڵێن ئەو نێوە مێژووییانەی لە کۆنەوە مێژوو تۆماری کردوون و لەگەڵ ووشەی کورد دا نێزیکی‌یەکی تەواویان هەیە، وەکو کۆرد و ئێنی، گۆردیئێنی، کیرتی‌ی، کورتیئۆی... تاد فریان بەسەر کوردەوە نی‌یە.

گەر ئاوها بێت، دەبێت زمانەوانی ئینگلیزی بە نێوبانگ (Driver)یش بە هەڵەدا

چوویێت. (Driver) زمانەوانانە بە ئیسپاتی گەیاندووە کە ئەو نێوانە لەگەڵ ووشەی کوردی ئەورۆکەدا یەک ڕەگیان هەیە(٥٧). دەبێت ڕۆژهەلات ناسی بە نێوبانگی جیهان (مینۆرسکی)یش هەڵە بووبێت کە گوتوویە (کوردەکان هەردەبێت نەوەی میدییەکان بن).

بەلای دوژمنانمانەوە ئەمانە هەموو هەڵەن. دیارە درایڤەر و مینۆرسکی و چەندین زانای دی کە لە بنەچەی کورد کۆڵیونەتەوە، کورد بەرتیلی داونەتێ و دەمی چەور کردوون.

ئا بەو بەڵگە بێ گیان و سیس و لاوازانە دوژمنانمان دەیانەوێت صەدان لێکۆڵینەوەی زانستانە پووچ کەنەوە. گەرەکیانە بێ ڕەچەڵەکمان کەن. کە ئاوها بێ ڕەگ و ریشەین، دەبێت قارچک بین هەڵتۆقیبین.

بۆ دوژمنەکانمان ئاوها بە پەرۆشن بەڵگەی زانستانەی بنەچە و ڕەچەڵەکمان، بوون و ژیانمان، بخەنە بەر گەرداوی گومانەوە و هەڵی وەشێننەوە؟ ئاشکرایە ئەوان لایان وایە مەسەلەی کورد شتێک نییە پێوەندی بە زانستەوە بێت، مەسەلەی هێز و زۆر و دەستەلاتە، مەسەلەی سیاسەتی تواندنەوە و تۆو بڕ کردنە.

نامانەوێت لێرەدا ئەو هەموو شەڕە دەنووک و چەلە حانێیانەی لەسەر ڕەگەز و بنەچەمان کراون هەڵیان تەکێنین و هەڵیان سەنگێنین. گرنگ ئەوەیە خۆمان بەنەتەوەیەکی خاوەن خەسڵەتی تایبەتی و زیندوو لە سەر پێ وەستاو دەزانین و ئەو هەستەشمان هەیە. هەقیشمانە، چونکە یەک زمان و یەک مێژووی تایبەت بە خۆ و یەک خاکمان هەیە.

بۆیە دەربارەی بنەچەمان دوام، تا ئەوە لە یاد نەکەین کە دوژمنانمان لەم دواییانەدا، لە ڕێگەی هەندێک ئەکادیمی ئەوروپاییەوە هەوڵی شێواندنی مێژوومان دەدەن. هەندێک ئەکادیمی هەن کە چەند ووشەیەکی کوردی دەزانن و سەریان لە چەند زمانێکی دی ئێرانی دەردەچێت، ئیدی خۆیان بە "زمانەوان" لەقەڵەم دەدەن و"گوتار" دەربارەی کورد و زمانەکەی دەنووسن. دەیانەوێت لەرێگەی ئەم "لێکۆڵینەوە زانستانە قووڵانەیان"ەوە خۆیان بە "زانا" لەقەڵەم بدەن! لەو ڕووەوە کە ڕەچەڵەک و کولتور و زمان و تایبەتمەندێتی نەتەوایەتیمان دەخەنە بەر ڕێژنەی گومانەوە، زیانی زۆرمان پێ دەگەیەنن. داگیرکەرانمان خزمەتیان دەکەن و دنەیان دەدەن، تا لەسەر ئەو "کارە زانستانە!!" پڕ هەڵانەیان بەردەوام بن. ئەمانە وەک بەکرێ گیراوێک بەکار دەهێنن و هەڵیاندەسووڕێنن. بەڵگە بێ بناغەکانیان، دەکەنە ئامرازێک بۆ پیادەکردنی سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەکەمان.

بەداخەوە زۆر خوێندکاری کورد بە نیاز پاکی و دڵپاکی کۆمەکیان بەم ئەکادیمی‌یە بە دوژمنکراوانەمان کردووە. بە خۆڕایی فێرە زمانی کوردی‌یان دەکەن و لەو ڕێیەوە بواری ئەوەیان بۆ دەڕەخسێت کارە چەپەڵەکانیان نەخشە کێش کەن. بێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە ئەمانە پاشان زیانیان پێ دەگەیەنن.

ئەم ڕاستی‌یانەم وەک نموونەیەک پێش چاو خست و دەمەوێ بڵێم ئەرکی پێویستی ئێمە ئەوەیە، ئەم جۆرە دوژمنانە کە خۆشبەختانە تا ڕادەیەک گەوج و نەزانن، هەر بە چەکی زانست ئاوەڕووتیان کەین.

ئەم ئەرکە تەنها لە ڕێگەی زانستەوە بە ئەنجام دەگەیەندرێت. بۆیە پێویستە خۆمان زمانەوان و مێژوونووس پێ بگەیەنین، تا زمان و مێژووەکەمان زێتر و چێتر بتوێژنەوە.

جێگەی ئەوپەڕی ڕەزامەندی و شادیمانە کە زانا و زمانەوانی نێودارمان کۆلۆنێل (توفیق وەهبی) بەو شێوە زانستانە نایابە "بەڵگە" زمانەوانی و مێژوویی‌یەکانی (مەکەنزی) بەرپەرچ داوەتەوە. ئەو بەڵگە ساختانەی کە ڕەچەڵەکمان هەڵدەشێوێنێت و هەڵیدەوەشێنێتەوە(*).

لەبەر ئەم هۆیانە و لە دڵسوزتانم بۆ زانستی کوردەوانی بوو، کە دەستبەرداری تەرخانی پێشینم (ئیسلامەوانی و فیزیا) بووم و چەندین ساڵی ژیانم بۆ زمانەوانی و مێژوو تەرخان کرد، تا ئەو شەرەفەم پێ ببڕێت کە بەشێک لەو ئەرکە پیرۆزە لە ئەستۆ بگرم.

بەداخەوە دەبێت ئەوەش بڵێین کە زۆربەی ئەو خوێندکارە کوردانەی ڕوو لە ئەورووپا دەکەن، بیر لە کوردۆلۆژی ناکەنەوە و تەکنیک و پزیشکی دەخوێنن. ئەو بەشانەش زۆر پێویستن، بەڵام ڕەوا نی‌یە زانستی کوردەوانیش پشت گوێ خرێت. لەو کاتەوە لە (بەرلین) لە زانستگەی ئازاد دا زمان و کولتوری کوردی دەگوترێتەوە، ئەرکی هەموو لایەکە بە دڵ پشتگیری و پشتیوانی ئەم هەوڵە بکەن.

لە پاڵ ئەو ئەکادیمی‌یە پووچ فرسەتانەدا کە خزمەتی داگیرکەرانمان دەکەن، هەندێکی دی هەن کە نیازپاکیمان بۆ نێو و نێوبانگ پەیداکردنی خۆیان دەقۆزنەوە. ئەمە لە ئەزموون و تەجرەبەی تایبەتیمەوە دەڵێم. ساڵی ١٩٦٧ لە زانستگەی (Würzburg) بووم. لەوێ

(*) کۆلۆنێل توفیق وەهبی: "The Origins of the Kurds and their Languages" لە گۆڤاری "کوردستان"ی ئۆرگانی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا)دا، ژ. ٩و١٠، تەموزی ١٩٦٥، ل ٢٣-٢٨.

پرۆفیسۆری بەڕێز (Wilhelm Eilers)م ناسی. لە ماوەی ئەو ساڵەدا کە لەوێ بەسەرم برد، گەلەک جار لەگەڵ ئایلەرسی بەڕێزدا پێک دەگەیشتین. (ئایلەرس) زۆری پرسیار دەربارەی زمانی کوردی لێ دەکردم. بەتایبەت زۆر پرسیاری ووردی دەربارەی زمانی فەرهەنگە" کوردی و ئینگلیزی[٥٨]یەکەی زانایان تۆفیق وەهبی و میستەر ئەدمۆنس لێ دەکردم و تێبینییەکانی بەنووسین تۆمار دەکرد. ١٩٦٩ ئایلەرس رەخنەیەکی دەربارەی ئەو فەرهەنگە نووسی[٥٩]. لەو نووسینەدا بە نێزیکە سەرپاکی زانیارییەکانی منی دووبارە کردبۆوە. بەلام بەداخەوە زۆربەیان ناتەواو بوون. بەکورتی ئەمە وەکو ئەوە وایە من بە نیازپاکی چاکەتەکەی خۆمم پێ دابێت و ئەو بەردو پشت و ئاوەژوو و پێ نەزانانە لەبەری کردبێت.

بۆ نموونە فەرهەنگە کوردی - کوردییە نێودارەکەی خاڵ[٦٠]ی بە فەرهەنگێکی عارەبی - کوردی لەقەڵەم دابوو[٦١]. تێناگەم لەبەرچی! رەنگە تەنها بەو هۆیەوە کەخەتەکەی عارەبییە. زۆر هەڵەی رێنووسیی[٦٢]. نا شارەزایی لە فۆنەتیکی زمانەکەدا بەدەر دەخات. شارەزایی ئەو لە بنەماکانی رێزمانی کوردی[٦٣]و ووشەناسیی کوردی[٦٤] بەشی هێندە ناکەن ئەو بابەتە رەخنانە بنووسێت. جگەلەوە بەشی هەرە زۆری رەخنەکەی، شی کردنەوەیەکی ئیتیمۆلۆژی هەندێ ووشەی ئێرانی بوون، کە زۆر جار بەر لەو دەمەتەقێیان لە سەرکراوە.

هەرچەندە پرۆفیسۆر (ئایلەرس)ی بەڕێز چوست و چالاکە و خۆی زۆر ماندوو دەکات تا بەرهەمەکانی فرەتر بکات، بەلام زۆر جار سەرکەوتوو نیە، چونکە ئایلەرس هەمیشە پەلەیەتی(×). فەرهەنگە ئاڵەمانی- فارسییەکەی نموونەیەکی رۆشنە بۆ ئەوە(*). جارێک لە زانایەکی (فارس)م پرسی ئاخۆ رای بەرامبەر فەرهەنگەکەی ئایلەرس چییە؟ لە وەرامدا گوتی: لە راستیدا ویستم رەخنەیەکی لەسەر بنووسم، بەلام پەشیمان بوومەوە، چونکە دیتم دەبێت فەرهەنگێکی نوێ بنووسم.

---

(×) ئەم رستەیە لە ئاڵەمانیدا یاری کردنێکی زیرەکانە و بەتام و چێژە بەووشەکان.ووشەی (Eilers) کەنێوی خانەوادەی پرۆفیسور (ئایلەرس)ە، بەواتا فەرهەنگییەکەی بەمانای (پەلەکەر) دێت. بۆیە مامۆستا نەبەز خۆش هەڵیگێراوەتەوە و پێکەوە گونجاندوونی. یانی ئەگەر رستەکە بە تەواوی بکەیتە کوردی دەبێتە (چونکە پەلەکەر هەمیشە پەلەیەتی).

(*) Eilers, Wilhelm: "Deutsch - Persisches Wörterbuch Band I, A-D, Otto Harrassowitz Wiesbaden, 1967.

حەز دەکەم سەرنجتان بۆ لاباسێکی دی راکێشم، لە ئەوروپا و زۆر جێی دیدا زۆر کەس دێنە لامان و خۆیان بە (دۆستی کورد) نیشان دەدەن. گوایە دۆستایەتی و پێکەوە کارکردن ئارەزوو دەکەن. لەم حالآنەدا چاک وایە تێفکرین، بزانین مەبەست و هۆی ئەم دۆستایەتی‌یە چی‌یە. هەق نی‌یە سۆزمان بە هەڵەماندا ببات. دوژمنانمان گەلەک جار لە ژێر چارشێوی دۆستایەتی دا زیانیان پێ گەیاندووین. دوای ئەو هەموو تەجرەبانە، کەمێک خانە گومان و خەڵک هەڵسەنگێن بین. هەقە بێ تاقی کردنەوە بروای تەواو بەکەس نەکەین. چونکە هەندێک جار زۆر کەسی بۆرژوایانە گۆش کراوی وولاتانی پیشەسازی، بە یارمەتی‌یەکی گچکە دەمی پیاو چەشە دەکەن، تا بتوانن بۆ مەبەستی خۆیان دایدۆشن. لووت بەرزی و بە خۆنازینی بۆرژوایانەیان هانیان دەدات زاتی ئەوە بکەن پێمان بڵێن: ئێمەی کورد توانا و لێهاتوویی ئەوەمان نییە کاری خۆمان بەدەستی خۆمان ئەنجام دەین. یانی چاو لەدەست و دووکەوتووی ئەوانین.

لە کۆبوونەوەیەکی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (POGROM)(*)دا لە ١٩٧١/٢/٦دا، کە نوێنەرێکی (نوکسە)ش تێیدا بەشدار بوو، یەکێک لەو "دۆستانە" گوتی: کوردەکان هێندەیان لە باردا نی‌یە خۆ بۆ کێشەی خۆیان تەرخان بکەن. فەرمایشتی ئاوهای هەندێک "دۆست"، مێژوو دەری دەخات تا چەندە راستە. بە هەر حاڵ گەوجێتی‌یەکی خەندە هێنەرە.

ئێمە بە نێوی (نوکسە) و هەموو رێکخراوە کوردی‌یەکانی دی‌یەوە دەڵێین "هەموو یارمەتی‌یەک- چەندە گەورەش دەبێت با ببێت- رەت دەکەینەوە، گەر هەست بکەین ئەو یارمەتی‌یە بە مەبەستی پابەند کردن و پاشکۆیی پێشکەش دەکرێت. ئێمەی کورد دەمانەوێت خۆمان بەرێ کەوین و چارەنووسی خۆمان بەدەستی خۆمان دیاری کەین، لە هەموو کۆمەکێکی خێرخوازان خۆش ئامادەیی دەکەین. ئەوەش کە کۆمەکمان پێ دەکات دەبێت سەربەستی و ئازادی هەڵس و کەوتمان دەستەبەرکات".

بە پێویستی دەزانم جارێکی دیش سەرنجتان بەلای ئەو مەترسی‌یەدا رابکێشم کە پێشتر لێی دوام، ئەویش پروپاگەندەی ژەهراوی دوژمنانمانە. دوژمنانمان تەنها بەچەکی مرۆ قرکەر بەربەرەکانیمان ناکەن، بەڵکە بە پروپاگەندە ودرۆی هەڵبەستراویش. ئەم

---

(*) (POGROM) نۆرگانی (کۆمەڵەی پاراستنی ژیان و پاشە رۆژی ئەو نەتەوانەی کە لە خەتەردان)، لە هامبۆرگ دەردەچێت.

ڕێگەیەیان بەشێوەیەکی بەر بڵاو پێش گرتووە. لە وولاتانی سەرمایەدار دا قاوی ئەوە دادەخەن گوایە ئێمە "کۆمۆنیست"ین. هەمان کات بە "کێوی"، "دڕندە"، "شەڕانی"، "ڕەمەکی و کۆچەر" نێومان دەڕزێنن. وەکو کۆمۆنیستێتی و کێوێتی و دڕندەیەتی پێکەوە بلکێن و هاوشانی یەک بن.

لەوولاتانی بەرەی ڕۆژهەڵات بە پێچەوانەوە، دەمانکەنە "بەکرێ گیراوی ڕۆژئاوا"، یاخود "کۆنەپەرست" ین. کە بە موسڵمانێک دەگەن، دەکرێینە کافر" و "دژی موسڵمان" و "فەرمەسۆن" و "مەسقۆفی" و "بێ ڕەوشت". لەوەش زێتر پێی لێ هەڵدەبڕن و هەندێ کۆڕ و کۆمەڵی وەکو (کاکەیی یەکان) بە "کۆمەڵەیەکی سێکسی" پێناسە دەکەن. یاخود بە "شەیتان پەرست" و"مەجوسی" نێومان دەبەن. بەڵام گەر بیانەوێت بە (دیان)ێکمان بناسێنن، بە "موسڵمانی زۆر دەمارگیر" نێو زەدمان دەکەن. ڕووبەڕووی خۆشمان هەوڵ دەدەن دژی یەکدی هانمان دەن و بەگژ یەکدیاندا بکەن... تاد، کەواتە بە پێی کات و شوێن و پێویستی بۆیاخمان تێ هەڵدەسوون و هەر دەمەی بەڕەنگێک. بۆیە پێویستە زۆر ووریا و هوشیارانە هەڵس و کەوت بکەین و ئەم ڕاستی‌یانە پێش چاو بگرین:

١- دەبێت بزانین دوژمنان و ناحەزانمان هیچ کات بە چاکە باسمان ناکەن، هەر پیایاندا هەڵداین دەبێت دڵنیا بین هەڵەیەکمان کردووە و لەبەرژەوەندی ئەوان بووە. بۆیە پێویستە بەردەوام لەبەر ڕۆشنایی پرۆپاگەندەی ئەواندا بە هەڵوێستەکانماندا بچینەوە.

٢- هەر کات حەزیای قین و ژەهراوی کینەیان بە سەرماندا ڕشت، دەبێ بزانین:

أ- کارێکمان کردووە زیانی پێ گەیاندوون، بۆیە چاک وایە لەبەرامبەریدا شاد بین نەک خەمناک.

ب- بەدووی هۆو ماکی ئەو پرۆپاگەندە هەڵبەستراوانەدا بگەڕێین و دەست بەستراو دانەنیشین. دوای دۆزینەوەی ماک و سەرچاوەکەی بەر پەرچیان بدەینەوە. بەڵام بە هەمان شێواز و ئوسلوبی درۆ و کڵاوبازی خۆیان نا، بەڵکە بەژیری و ژیر بێژانە و زانستانە بەریان پێ بگرین و وەرامی گورچووبڕیان بدەینەوە.

با بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی یارمەتی و کۆمەک کە لە لایەن بێگانەکانەوە بەردەم دەخرێت. نابێت تەنها لە تاکە کەسان خانە گومان بین، بەڵکە هەتا لە ڕێکخراوانێک و دەوڵەتانێکیش کە هەندێ جار ئەو ڕووە نیشان دەدەن. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئیدی دڕدۆنگ و گوماناوی لە هەموو هەڵوێستێک بڕوانین. نەخێر! پێویستە ئامێز بۆ هەموو

یارمەتی‌یەک ئاوەڵەکەین و لە ئاستیدا سەناگۆ بین. بەڵام وەک گوتمان پێویستە سەرچاوە و هاندەرەکەی هەڵسەنگێنین. دەبێت گومانمان هەمیشە گەش بینانە بێت. هەتا واش پێویست دەکات تەنها سلاوێکی دۆستانەش بقۆزینەوە و بیکەینە دۆستایەتی‌یەکی بەرابەر و هەمیشەیی. دەبێت لەدڵەوە پشتگیری دۆستانمان بکەین. پەندە کوردی‌یەکەی خۆمان دەڵێت: (دونیا گوڵێکە خۆت بۆنی کەو بیدەرە دۆستانت). جگە لەوە چاکیش وایە جوداوازی‌یەک لە نێوان ئەوانەدا بکەین کە لە هەندێ رووەوە کۆمەکمان پێ دەکەن و دۆستی راستە و خۆشمان نین، لەگەڵ ئەوانەی هەمیشە هەڵوێستی دوژمنکارانەیان بەرامبەرمان هەبووە. وەکو نموونەیەک ئاڵەمانیای رۆژ هەلات دێنمەوە. دوای ئەوەی عێراق و سوریا دانیان بە (کۆماری ئاڵەمانیای دیمۆکرات)دا نا، لەو وولاتەدا جموجۆڵی رێکخراوە کوردی‌یەکان کپ کرا. هەندێ خوێندکاری کورد لە بەرلینی رۆژهەلات بەیاننامەیان دژی رژێمی کورد کوژی عێراق بلاو دەکردەوە لە ٢ی ژونی ١٩٦٩دا لەلایەن پۆلیسەوە گیران.

هەرەشەیان لێ کرا گەر دەست لەو رەفتارانە هەڵنەگرن، تەسلیمی عێراقیان دەکەنەوە[٦٥]. ئاڵەمانیای رۆژهەلات بۆمبای (ناپاڵم)ی بۆ عێراق دەنارد و ئەوانیش دژی نەتەوەی بێ دەرەتانی کورد بەکاریان دەهێنا[٦٦]. ئاڵەمانیای رۆژهەلات لە کاتێکدا ئەمەی دەکرد کە کۆمۆنیستەکانی عێراقیش رژێمی عێراقیان بەدیکتاتۆر و خوێنرێژ دەناساند[٦٧]. ئاڵەمانیای رۆژهەلات ئەم هەڵوێستە دوژمنکارانەیەی بەرامبەرمان دەنواند چونکە دان پێدانانی عێراق بەلایەوە لە دۆستایەتی کورد و بزووتنەوە ئازادیخوازەکەی گرنگتر بوو. ئەمە راستی‌یەکی رەق و تەقە(Walter Ulbircht) خۆی لە رۆژنامەکانی عێراق دا ئاشکرا لەرۆژی ٢٣/ ٢/ ١٩٧٠دا دەڵێت: (رایەڵ کردنی پێوەندی دیبلۆماسی لە نێوان کۆماری ئاڵەمانیای دیمۆکراتی و کۆماری عێراقدا، بەرەی دژ بە ئیمپریالیزم و کۆڵۆنیالیزمی نوێ پتەو تر دەکات)[٦٨].

دە هەمان کاتدا دەبێت ئەوەش لە یاد نەکەین کە ئاڵەمانیای رۆژهەلات چەندین زەماڵەی بە خوێندکاری کوردی هەژار داوە. بێ ئەوەی ئاوڕ لەوە بداتەوە کە ئەوانە وەکو کورد لە عێراق و سوریا دا حەز لە چارەیان ناکرێت. ئەمەشی دەکرد و چاکیشی دەزانی ژمارەیەکی کەم لەوانە کۆمۆنیستن[٦٩]. ئاڵەمانیای رۆژئاوا بە پێچەوانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ عێراق و سوریا دا پسا بوو، بەڵام زەماڵەی بە کورد نەدەدا.

بیانویان ئەوە بوو گوایە کورد (دەوڵەت)یان نی‌یە، ئاڵەمانیای رۆژئاوا زەماڵە تەنها بە (هاونیشتمانی دەوڵەتان) دەدات و بە تاکە کەسانی نادات. بە کوردی‌یەکەی یانی (زەماڵە) بۆ ئاڵ و گۆڕکردنی بازاڕە لەگەڵ دەوڵەتان و ئێمەی کوردی هەژار کەڵکی بازرگانیمان پێوە نی‌یە. ئاڵەمانیای رۆژئاوا چاک دەزانێت گەر زەماڵە بە دەوڵەتی عێراقیش بدات، تاکە یەکێکی بە خوێندکارێک نادرێت کە لە رەگەزی کورد کەوتبێتەوە.

ئاڵەمانیای رۆژئاوا تەنها لە زەماڵە دا دەستی بە روومانەوە نەناوە، بەڵکە هەندێک دەستەو تاقمی رەسمی و باڵا دەستیان، هەڵوێستی نا جۆر و ناشایستە و دڵ تەزێنیان بەرامبەر کورد نیشان داوە. ئەمەش بۆ دڵ نەوایی تورکیای دۆست و شەریکی ناتۆیان بووە. بەتایبەت پاش رێکەوتنەکەی ئازاری ۱۹۷۰ی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و رژێمی عێراق، گەلەک کورد لە ئاڵەمانیا دا لەلایەن کاربەدەستانی ئەو وولاتەوە لە رووی نەفسی و جەسەدی‌یەوە خراپ مامەڵە دەکران.

وەک نموونەیەک ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێڕمەوە کە هەموو کاتێک دەتوانرێت لەراستی و دروستی بکۆڵرێتەوە:

رۆژی ۱۰/۲/۱۹۷۰ لە کاژێری ۸ی ئێوارەدا، ژنە خاوەن ماڵەکەی کرێکارێکی کوردی تورکیا کە نێوی (E) بوو، ئاگاداری کردم کە لەو رۆژەدا پۆلیسی ئیجرام (E)یان لە پێخەف و جێگەی نەخۆشی‌دا دەرهێناوە و پێشیان داوە و بڕیار وایە سبەی بەیانی زوو لە ئاڵەمانیا بەدەری نێن. هۆکەشیان بەم شێوەیە بە خاوەن ماڵەکەی راگەیاندووە: "(E) توانا و کەڵکی کارکردنی پێوە نەماوە، بۆیە جێگەی (بار)ی وا لە ئاڵەمانیادا نەماوە". هەمان ئێوارە سێ قۆڵی، من و ژنەی خاوەن ماڵ و دۆستێکی دی چووینە پۆلیسخانەی (Revier Gothaerstr.19). (E) لەوێ دەست بەسەر و لەژێر چاودێری‌ی پۆلیس‌دا بوو. زۆر چاوەڕوانمان کرد بەڵام رێگە نەدراین بیبینین، بەوەش رازی نەبوون هەتا بە تەلەفۆنیش لە گەڵی بدوێین. رۆژی دوایی (E) رەوانەی تورکیا کرایەوە بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە ئەو مرۆڤە بە گەواهی دوکتۆر حاڵی پەرێشانە و زۆر ناساغە. هەتا چاوەڕوانی نەشتەرگەری دەکرد. بێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە ئەم کابرایە نە پارە و نە کەل و پەل و نە ئەوراقی پێویستی پێ نی‌یە. بە دەرنانی ئەم مرۆڤە نموونەیەکی هەڵس و کەوت و مامەڵەی بێ ویژدانانەیە لە گەڵ کرێکارانی بێگانەدا. هەتا ئێستاش هەر ئاڵەمانی‌یەکی خێرخواز، کە من بیناسم و ئاگاداری ئەو بەسەرهاتە بوو بێت، خۆی بە شەرمەزاری رەفتاری وا

دەزانێت.

گەر پیاو رەگ و ریشە و هۆکاری ئەم بەدەرنانە شەرم هێنەرە بزانێت، سەری دەماسێت. دەبێت کوردێکی لێ قەوماو چی بێت وا بکرێتە تۆپە پەڕۆی نێو دەوڵەتان؟؟

ئەو کوردە ١٩٦٣ هاتۆتە بەرلین. لە کارگەیەکدا دەستی کردۆتە کارکردن، تا لەسەر کارەکەی تووشی بەدبەختی‌یەک هاتوو بڕ بڕەی پشتی تێدا شکا. هەر لەبەر ئەوەی کورد بوو (ئەگەر چیش خۆی لەسیاسەت نەگەیاندووە) بەڵام ئەمە بۆ نوێنەرانی رژێمی تورک بەسە کە لەسەری بەدەنگ نەیەن و لایەکی لێ نەکەنەوە. بەهۆی گوێ تەپاندن و خۆ کەڕ کردنی کاربەدەستانی نوێنەری دەوڵەتی تورکیاوە ئەو چەرمە سەری‌یەی بەسەر هاتوو چوار ساڵیش پاش ئەوە پێوەی تلایەوە. لە پشت شکاندنەکەوە تووشی نەخۆشی گەدە و گورچیلەش بوو. کاتێک بەدەر نرا ئیدی بۆ هەتا هەتایە توانای کارکردنی لێ بڕا بوو. کەسێک نەیپرسی‌ی بۆ وا پەک کەوتە بووە! بە پێچەوانەوە ئەم نەهامەتی‌یە بووە هۆی ئەوەی وەک (صەگ) مامەڵەی لەگەڵ بکەن و بەدەری نێن. بێگومان مەبەستم (صەگ)ێکی رۆژهەڵاتە. ئێمەی کورد چ رێ‌یەکمان دەکەوێت بە (صەگ)ی ئاڵەمانیای رۆژئاوا بین! دەبێت حەسوودی بە صەگەکانیان بەرین!

ئەم سیاسەتە لەگەڵ کرێکارانی بێگانەدا لە کاتێکدا بەبەر دەگیرێت کە سەرمایەداری ئاڵەمانیا، پابەندی هێزی دەست و بازووی کرێکارانی بێگانەیە. وەک رۆژنامەی (Frankfurter Allgemeine Zeitung) دانی پێدا نابوو: "گەر لەیەک کاتدا هەموو کارکەرانی بێگانە وولاتەکەمان بەجێ بهێڵن، نەهامەتی‌یەک دەقەومێت و لە دە جێ جێ‌یەک لە کارخانەکاندا بە چۆڵی دەمێنێتەوەو (ئاڵەمان)ی وا نی‌یە بتوانێت جێگەیان پڕ کاتەوە[*].

هەڵوێستی دوژمنکارانەی هێندێک لە کاربەدەستانی ئاڵەمانیای رۆژئاوا هەتا هەندێ کەسانی باڵا دەستی رژێمەکە سەری کردووە. «هەڵوێستی کەم نموونەو مەردانەی سەرەک کۆماری بەرێز (HEINEMANN) لەم حاڵە بەدەرە. لەدڵەوە سوپاسی دەکەین».

وەک نموونەیەک بەرێز (Dr. Günther Nollau)ی پاڵێوراو بۆ (سەرکردایەتی پاراستنی یاسا) دەهێنمەوە. کاتێک جەنابی (نۆلاو) لە "بەشی (پاراستن)ی گشتی‌ی سەر بە وەزارەتی نێوخۆ" دا بوو، لەگەڵ بەرێز (Hans Jurgen Wiehe)ی هەڤاڵی دا چوونە تورکیا و

---

[*]Thron, Wilhelm: "Die Ausländer unter uns", "Faz" ,Nr. 186, 14. August 1971.

ئێران و ئەفغانستان. پاش گەڕانەوەیان لە چاپخانەی (Wissenschaft und Politik) "زانست و سیاسەت" لە ۱۹٦۳دا کتێبێکیان بە نێوی (Rote Spuren) "جێ پێی سوور" ەوە بڵاو کردەوە. لەو (جێ پێ سوور)انەیان دا بێ پەروا هەوڵیان داوە بە چەندین بوختانی هەرزان کە بەپێی بەڵگەنامە مێژوویی و سیاسی و جوگرافییەکان دژ بە یەکن، تاوانبارمان بکەن. لە لاپەڕە ٦٤دا "ژەنەراڵ بارزانیی" بە (بە کرێگیراوێکی کۆمۆنیست) لەقەڵەم دەدەن. لە لاپەڕە ٦٥دا دەنووسن: "لە ۱۹۲۷دا شوورەوی بە نیاز بوو کۆمارێکی چکۆلانەی کوردی سەربەخۆ لەخاکی شوورەوییدا دابمەزرێنێت، دەیانویست ئەمە بکەنە نموونەیەک تا کوردەکانی تورکیا و عێراق و ئێران چاویان لێ بکەن و ببێتە هاندەرێک بۆ خەباتیان لە پێناوی سەربەخۆییاندا". ئەمە درۆیەکی پەتییە، هیچ کات شوورەوی بەنیاز نەبووە رێگەی کورد بدات "کۆمار"ێک دابمەزرێنن. هەڵگێڕانەوەی راستییەکان بەو جۆرە، هیچ خزمەتێکی دۆستایەتی کورد و ئاڵمان ناکات.

لە لاپەڕە ۷۰دا بە رەوتێکی دی هەڵمان دەپەڕێنن، دەنووسن: "کینە و رقی زۆربەی کورد بەرامبەر هەموو شتێکی سۆڤیەتیی لەهەموو هەڵوێستێک زەق ترە".

قەت ناهێڵین ئەم قسە هەلەق و مەلەقانە بەسەر ئێمەی کورددا تێپەڕێنن وبە دژی شوورەوییمان لەقەڵەم بدەن. تۆ بڕوانە چەند لاپەڕەیەک پێشتر بارزانیی "بەکرێگیراوێکی شوورەویی" بوو!

ئێمە هەر چەندە کۆمۆنیست نین، بەڵام ئەمە رێی ئەوەمان لێ ناگرێت کە رێز و دۆستایەتیمان بۆ شوورەویی دراوسێی بەتوانا و بە دەستەڵات و سەرکەوتوو پێشکەوتوومان دەربڕین.

کەواتە هەڵوێستی ئاڵمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا لەگەڵ یەکدیدا نایەنە بەراورد کردن. ئێمە وەک نا کۆمۆنیستێک سوپاسی بێ پایانمان پێشکەش ئاڵمانیای رۆژهەڵات دەکەین بۆ ئەو کەمە کۆمەکەیان. هەرچەندە، هەندێ جار ئەو هەڵوێستەیان گۆڕیوە و نادۆستانە رەفتاریان لەگەڵ کردووین. هەمان کات بە هیواین ئاڵمانیای رۆژئاواش بە هۆش دا بێتەوە و دەستبەرداری دوژمنایەتیمان ببێت و بارەکەمان تێ بگات. ئێمە حەزمان بەو دژمنایەتی و بوختان پێکردنانە نەکردووە. ئێمەی کورد بایی پێویست لە پێوەندی و بەرژەوەندی نێو دەوڵەتان تێ دەگەین و چاکەی گشت نەتەوەیەکمان خواستووە. ئاڵمانیش یەکێکە لەوانە و یەکێتی خاک و نەتەوەکەیان ورژێمێکی دیموکراتی ئاڵمانی

به ئاوات دەخوازین.

دەربارەی هەڵوێستی کڵێسەی کاتۆلیکی لەسەردەمی پاپا یوحەنای بیست و سێهەمدا دواین. بەپێویستی دەزانم چەند ووشەیەکیش لە هەڵوێستی کڵێسەی پرۆتستانتی لە ئەڵەمانیای رۆژ ئاوادا، بە خەسار بدەم. پێش دوو ساڵ کڵێسەی پرۆتستانتی لە بەرلین، کۆمەکێکی مانگانەی زۆر کەمی بۆ چەند خوێندکارێکی کورد بڕی‌یەوە. هەر چەند ئەم یارمەتی‌یە بە پێ‌ی یاسا و داب و نەریتێکی چەسپاو و نەگۆڕ نەبوو، بەڵکە ئارەزوو و دۆستایەتی شەخسی دەوری تێدا دەبینی. لەگەڵ ئەوەشدا بە پێویستی دەزانین کە سوپاسی خۆمان پێشکەش بکەین. ماوەیەکە کەللە شەقی و دەست رژدی و چۆڕبڕینی ئەو دەستگیرۆیی‌یە بە هەڵوێستی هێندێک لە کاربەدەستانی کڵێسەوە ئاشکرایە. چەند خوێندکارێکی کورد کە لە بەشی نێو خۆیی خوێندکارانی سەر بەم کڵێسەیە لە بەرلینی رۆژئاوا لە (Leibnitzstr. 55) دەژیان، دەنگ دران کە چۆڵی کەن. لەگەڵ ئەوەدا ئەم خوێندکارانە زۆر دەست کورت و رووت و رەجاڵ بوون، ژووری دیکەشیان وەگیر نەدەکەوت، چونکە بێگانە لە ئاڵەمانیای رۆژئاوادا بۆ جێگە پەیدا کردن زۆر دەست بەڕوویەوە دەنرێت، لەبەر ئەوە هیچ دەرەتانێکیان نەبوو، بە ناچاری هەر لە وێدا مانەوە. بۆ ئەوەی ناچاری بارکردنیان بکەن لە تووشترین و تۆف ترین شەوی ساردی زستاندا کارەبایان لێ برین و زۆپاکانیان لێ کوژاندنەوە. ئەم رەفتارە "مەسیح!"انەیە هەرگیز لە یاد ناکەین.

بە پێچەوانەی ئەوانە هەموویەوە، شوورەوی‌ی لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆمەکێکی فرەی بە عێراق و سوریا کردووە و لە کاتی جەنگی کوردستاندا بەچەک و تەقەمەنی درێغی‌ی لێ نەکردوون[٧٠] جار جارەش لە رێگەی رۆژنامە و رادیۆوە پشتگیری لە شۆڕشەکەی کوردستانی عێراق دەربڕیوە. نەسیحەتی عێراقی کردووە بەشێوەیەکی ئاشتی‌یانە چارەسەری کێشەکە بکات[٧١]. جگە لەوە شوورەوی‌ی زەمالەی زۆری پێداوین. لێکۆڵینەوەی کوردەوانی لەشوورەوی‌ی لە پێشکەوتندایە. ئەو کوردانەی لە شوورەوی‌ی دەژین هەرچەندە بە ژمارەش کەمن، مامەڵەی خراپ ناکرێن.

ئیمپریالیزمی ئەمریکی و وولاتانی رۆژئاوا تەنها کۆمەکیان بە داگیرکەرانمان کردووە و دژی ئێمە وەستاونەتەوە. بۆیە بە پێویستی دەزانین سوپاسی تایبەتیمان پێشکەشی شوورەوی‌ی بکەین. ئومێدەوارین ئەو هاوسێ بە هێز و توانایەمان پتر و چێتر لە ویستەی

ئازادیی نەتەوە خەباتکەر و کۆڵنەدەرەکەمان بگات.

چاک وایە ئەوەش بڵێین کە گەلەک جار لەدار و دەستە و بەکرێ گیراوانی رۆژئاوا دەبیسترێت کە گوایە (شوورەویی) ئەو کۆمەکانەمان لە خۆشەویستی پێ ناکات. بەڵکە بۆ (فریودان) و پروپاگەندەیە. وا پێ دەچێت کە هێزەکانی رۆژئاوا هێندە (بەرەوشت) بن چاویان بەرایی نەیەت کورد (فریو) بدەن!!! بۆیە تکایان لێ دەکەین زۆر لە خۆ نەکەن و خۆ نەرەتێنن!! ئەگەر ئەوە (فریودان)ە با ئەوانیش بفەرموون و بەو شێوازە (فریو)مان دەن!!!

دەربارەی دۆستایەتی بێگانەکان و وولاتان و رێکخراوەکان دواین. ئێستا دەمەوێت دەربارەی جۆرێکی دی لە دۆستایەتی بدوێم، ئەویش دۆستایەتی تایبەتی و کەسی‌یە. لەم ساڵانەی دواییدا زۆر کورد بەمەبەستی خوێندن یا کارکردن روویان لە ئەورووپا کردووە. ئەمانە دۆستایەتی لەگەڵ کیژە ئەوروپاییەکاندا پەیدا دەکەن و زۆریان مارەیان دەکەن. لە سەرژمێرێکدا کە رۆژنامەنووسێکی ئاڵەمانی کردوویە، ئەوەی دەرخستووە کە لە سێ بەش بەشێکی ئەو کوردانەی لە ئاڵەمانیا دەژین، کیژە ئاڵەمانیان مارە کردووە(*). چاکە! دژی ئەوە نین خزمایەتی و تێکەڵی لەگەڵ گەلانی دیدا دروست بێت، بەڵام چاک وایە هەموو کوردێک بە ووردی بیر لەو هەنگاوە بکاتەوە. زۆربەی کیژانی ئەوروپایی بۆرژوایانە گۆش کراون، (بالە خانەوادە خانەدانەکانیش نەبن!) وەک ئاڵەمان خۆیان دەڵێن! هەڵوێست و تێڕوانینی ئەوانە لەنەتەوەکانی دی، خواست و ئاواتیان و باری سەرنجیان بۆ ژیان و ئومێدیان، لەژێر تاو و تینی ئەو پەروەردە بۆرژواییی‌یەدایە. ئەو کیژانە بەو ژیانە رەق و ووشک و پڕ چەرمەسەری و تەنگ و چەڵەمەیەی ئێمەی کورد رانایەن. تا بە هیوا پیرۆز و مەزنەکەمان دەگەین کە ئازادی کوردستانە رێگایەکی دوور و درێژ و پڕ دەردی سەریمان لە پێشە.

دیارە ئەو جۆرە ژنانە بواری ئەو جۆرە تێکۆشانەمان لێ دەتەنن، چونکە ئەوان بە ژینێکی تێر و تەسەل و پڕ ناز و نیعمەت راهاتوون. جگە لەوە گەر بێنە کوردستان شازادانە لێ دەخورن. ئەو جۆرە ژنانە رێگری خۆتەرخان کردن و خەباتی سەر و مڕ دەبن.

---

(*) "Zehnter Kurden-Kongress in Berlin, 17-23. August 1965"

دەهەمین کۆنگرەی کوردان لە بەرلین، ١٧-٢٣/٨/٩٦٥ لە:

"Hamola", Pressedienst GMBH, Orient Press,Nr. 26, Hamburg, 13.8.1965,S.2.

من چاک له حاڵ و بارەکەتان دەگەم! تەنهایی لەفەرهەنگی ژیانی کورد دا نی‌یە، مەسەلە کوردی‌یەکەی خۆمان دەڵێت (تەنهایی هەر بۆ خودا باشە). بەڵام پێشەکی بە کاوەخۆ بیری لێ بکەنەوە. دەبێت هاوسەرانێک هەڵبژێرن کە دۆستی راستەقینەی بزووتنەوە ئازادیخوازەکەمان بن و بە ئەمەک و وەفا بن و توانای ئەو لە خۆ بوردنەیان هەبێت. ئێوە خۆتان دەردی سەریتان کەم نی‌یە، ئێدی بۆچ هی دی بۆخۆتان دەسازێنن؟ جگە لەوە نیشتمانەکەی خۆتان پڕە لە کیژۆڵەی شیاو و شەنگ و ناسک و نازدار، بە تاسەوە چاوەڕوانی ئێوە و هاوسەریتانن.

دەبێت ئەوەش بڵێم کە داوو دەزگای پڕوپاگەندەی وولاتانی سەرمایەدار ئافرەت هەڵخەڵەتێنەر و لەخشتە بەرن. ئافرەتان بەوە دەست خەڕۆ دەکەن کە گوایە لە ئەورووپادا لەگەڵ پیاواندا (مافی چوون یەک) یان هەیە و ژنانی رۆژهەلات و جیهانی سێهەم بە پێچەوانەوە، وەک مرۆڤی دەرەجە دوو رەفتاریان لەگەڵ دەکرێت.

بوختانی وا هەرزان ئاسان پووچ دەکرێتەوە، بۆ نموونە: ژنانی وولاتێکی وەکی سویسرا، هەمووی چەند مانگێکە مافی هەڵبژاردنیان پێ دراوە. لە ئاڵەمانیادا بۆ هەمان کار و هەمان کات، ئافرەتان مووچەی لە پیاو کەمتریان پێ دەدرێت. گەر پیاوێکی ئاڵەمانی ژنێکی بێگانە مارە بکات، ژنە دەستبەجێ جنسیەی ئاڵەمانی پێ دەدرێت. بەڵام گەر ژنێکی ئاڵەمانی شوو بە پیاوێکی بێگانە بکات جنسیە بەو مێرەدی نادەن! ئەمانە هەندێک راستین کەس ناتوانێت رەتیان کاتەوە. ژنان مینیژۆبەکەیان چەند کورت بێت و شەوانە تا کاژێری چەند بۆیان هەبێت لە سەماخانە بمێننەوە، بەڵگە نین بۆ چوون یەکی و هاوشانی‌یان لەگەڵ پیاواندا. ژنانی وولاتانی سەرمایەداری تەنها ئەو جۆرە ئازادی‌یەیان هەیە کە سەرمایەداری فراوان تر بکەن و پەرەی پێ بستێنن. تا چ رادەیەک ژنانی ئەورووپا بەختەوەرن، مەسەلەیەکە پرۆتۆکۆلەکانی تەلاق نامە بە ڕوونی دەری دەخەن!!!

## بەرکوتێکی مێژوویی

شی کردنەوەیەکی زانستانەی مێژووی میللەتەکەمان هۆی ئەم بارە نالەبارەی ئەوڕۆکەمان ئاشکرا دەکات. ئێمە پێمان وایە (ئاین) لە کۆندا هۆیەکی کاریگەر بووە بۆ یەکخستنی نەتەوەیەک یا چەند نەتەوەیەکی جوداواز. (ئاین)ێک توانیویەتی چەند نەتەوەیەکی جودا لەژێر ئاڵاکەیدا کۆ کاتەوە و یەکیان خات و پێکەوەیان بلکێنێت. ئەو نەتەوەیەی خاوەنی راستەقینەی ئاینەکە بووە زۆرجار بۆتە نەتەوەی باڵا دەست و

نەتەوەکانی دی لە بۆتەی کولتوری نەتەوەیی خۆیدا تواندۆتەوە. بۆ نموونە عارەبەکان توانییان پاش بە ئیسلام کردنی سوورییەکان و میسرییەکان زمانەکەیان و لەو ڕێگەیەشەوە کولتورەکەیان لە قەوارە و بۆتەی عارەبدا هەڵشێلن و پاشان بیانتوێننەوە.

کلێسەی کاتۆلیکی، لە کۆندا، بە نێوی ئاینی عیساییەوە زۆر نەتەوەی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و هەوڵی دا زمان و کولتوری لاتینییان بەسەر دا بسەپێنێت.

لەمێژوودا پێچەوانەی ئەوانەشمان پێش چاو دەکەوێت. یانی کولتوری هەندێک نەتەوە لەڕێگەی کەرت بوونی ئاینێکەوە و هاتنە کایەی چەند ئاینزایەکەوە لەبەر یەک هەڵوەشاون و کەرت بوون. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی دوو گەلی جوداواز دروست بکەن. بەش بوونی زمانی سریانی بۆ دوو زاراوەی سەرەکی و کەرت بوونی سریانەکان بۆ (یاقوبی) و (نەستۆری) پاش ئەو پێکدا پژانەی عیساییەکان لەسەدەی پێنجەمدا، نموونەیەکی دیارن(*).

ڕووداوی دیکەی مێژوویی هەیە دەری دەخات کەنەتەوەیەک لە نێو کۆمەڵە نەتەوەیەکی دیدا کە یەک ئاین کۆی کردوونەتەوە، سەرکردایەتی ئاینەکەیان لە چنگی خاوەنە ڕەسەنەکەی دەرکێشاوە و خۆیان گرتوویانەتە دەست.

بەو شێوەیە تورکەکان توانییان خەلافەتی ئیسلام لە چنگی عارەب دەربهێنن. ئەوە بوو توانییان لە ساڵی ١٥١٧دا خەلافەتی ئیسلامی لە خەلیفە (المتوکل علی الله) بۆ خۆیان بستێنن و بە نێوی ئیسلامەوە نەریت و زمانی تورکی بەسەر نەتەوەکانی دیدا بسەپێنن.

بە پێی ئەو ڕاستییانە دەتوانین بڵێین کە ئاین لە کۆندا تەنها ئەرکە چارەسازییەکانی کۆمەڵگای نەگرتۆتە ئەستۆ، بەڵکە (بە ئاگایانە)، یان (نائاگایانە)، ڕۆڵێکی نەتەوەییانەی گێڕاوە. ئاینی ئیسلام بوو سەرەتای یەکێتییەکی زمان و کولتوری عارەبی هێنایە کایەوە و ڕێگە خۆشکەرێک بوو بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی عارەب.

لە (ئاگایی)ەوە یا خود لە (نائاگایی)یەوە، بزووتنەوە چارەسەر سازییەکەی (مارتن لۆتەر ١٤٨٣-١٥٤٦) ڕێگەی بۆ نەتەوەی ئاڵەمان خۆش کرد، زمانێکی یەکگرتوو دابمەزرێنن. هەروەها جودابوونەوەی کلێسەی (ئۆرتۆدۆکسی) بووە هۆی ژیاندنەوەی زمانی یۆنانی.

جودا بوونەوەی کلێسەی بولگاری لە کلێسەی ئۆرتۆدۆکسی نموونەیەکی دیکەیە.

(*) Brockelmann, Carl:"Syrische Grammatik",VEB Verlag Enzyklopädie, Leipzig, 1965,S.3.

با حاڵ و باری کورد لەبەر ڕۆشنایی ئەو نموونانەدا شەن و کەو بکەین:

پێش هاتنە کایەی ئاینی ئیسلام(*) کوردەکان پێڕەوی ئاینی زەردەشتی‌یان دەکرد. بەشێکیشیان (دیان) بوون. تا ئێستاش زۆرجار تانەی ئەوە لە کورد دەدرێت کە باپیرەکانیان (مەجوسی) بوون[٧٢]. ئاینی زەردەشتی‌ی لەسەردەمی (داریۆش)ی پاشای (هەخامەنشی)یدا کرایە ئاینی ڕەسمی وولات[٧٣]. لەبەر ئەوەی لەو سەروەختەدا فەرمانڕەوایی و دەستەڵات بەدەست فارسەکانەوە بوو، هەر دوو نەتەوەش یەک ئاینی‌یان هەبوو، کوردەکان بە ناچاری زمانی دەستەڵاتدارانیان لە کاروباری ڕەسمی دا بە کاردەهێنا. باوەڕی ئاینی هاوبەش ڕێ‌ی ئەوەی لە کوردەکان بەستەوە کە بەسەرە و کاری سەربەخۆیی خۆیانەوە خەریک بن.

کاتێک ئیسلام لە ساڵی ١٨ھ (٦٣٩ز)دا گەیشتە کوردستان، کوردەکان ماوەیەکی دوور و درێژ دژی ئەم ئاینە نوێیە جەنگان. تا ئەوڕۆش گەلەک گۆڕستان لە کوردستاندا

---

(*) ئیمپراتۆرێتی (ماد) کە کوردستانی ئەوڕۆی دەگرتەوە لە ساڵی ٥٥٠ی پێش زایندا لە لایەن (هەخامەنشی)یەکانەوە روخێنرا. دوو صەد ساڵ پاشان ئەم نێوچەیە لە لایەن ئەسکەندەری گەورەوە داگیر کرا، دوای ئەوەی بەسەر (کۆرش)ی پاشای فارسدا زاڵ بوو. کوردستان تا چارەکی یەکەمی سەدەی دووهەمی زاینی لە ژێر دەستەڵاتی یۆنانی‌یەکاندا بوو. پاشان ئەرمەنی‌یەکان سەرووی کوردستانیان داگیر کرد. لە چارەکی دووهەمی سەدەی دووهەمی زایندا (لۆلۆبوس)ی سەرکردەی رۆمانی ئیمپراتۆرێتی ئەرمینیای داگیر کرد کە کوردستان بەشێکی بوو. لە ساڵی ٥٣دا لە لایەن (پارثی)یەکانەوە داگیر کرا. پاشان جەنگێکی زۆر لە نێوان (پارثی) و (رۆمانی)یەکاندا لە کوردستانی ئەوسادا رووی‌دا. ساڵی ١١٥ز. رۆمانی‌یەکان نێوچەی شارەزووریان خاپوور کرد کە خوارووی کوردستانی ئێستا دەگرێتەوە.

لە ١٢٢ز.دا (پارثی)یەکان و (رۆمانی)یەکان پەیمانێکیان بەست و نێوەڕاستی (فورات)یان بەسنووری نێوان هەردوولایان دەست نیشان کرد. لە ١٦١ز.دا جەنگ لە نێوانیاندا هەڵگیرسایەوە و تا ساڵی ٢٢٤ز. بەردەوام بوو. ئەو کاتە (ئەردە شێری پاپەکان)ی دامەزرێنەری ئیمپراتۆرێتی (ساسانی) دەوڵەتی (ئەشکانی)ی رووخاند. کوردستان بووە بەشێک لە ئیمپراتۆرێتی ساسانی‌یەکان. لە ساڵانی ٢٥٨ تا ٢٦٦ گەلەک جەنگ و کوشتار لە نێوان رۆمانی و ساسانی‌یەکاندا لە کوردستاندا رووی دا. لە ٦٢٢دا کوردستان بووە پێخوستی شەڕی نێوان (هەرقل)ی پاشای بیزەنتی‌یەکان و ساسانی‌یەکان. ٦٢٧ ساڵی قەلاچۆی کوردان بوو. بیزەنتی‌یەکان تا ساڵی ٦٣٩ لە کوردستاندا مانەوە. ئەوجا موسڵمانەکان لە ژێر ئاڵای (الله اکبر)دا لە بیابانی عارەبی‌یەوە هاتن و هەردوو ئیمپراتۆرێتەکەیان لە نێو برد.

هەن، کە هەندێکیان بە گۆڕستانی ئەسحابە و هەندێکی دییان بە هی کافران نێو دەبرێن(٧٤).

مێژوو ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کوردەکان لە زۆربەی راپەڕین و شۆڕشەکانی دژ بە دەستەلاتداریێتی دەوڵەتی ئیسلامییدا بەشدارییان کردووە(٧٥).

بەشداری کوردەکان لە شۆڕشەکانی (خوارج)(٧٦). (٦٥٧-٦٩٢)، (یعقوب الصفار) (٨٦٧-٨٧٩) و شۆڕشی (الزنج)(٧٧). لە سالانی (٨٦٨-٨٨٣)دا هەندێ نموونەن.

میرێکی کورد کە نێوی (میر جەعفەر حەسەن داسنی)ی بوو شۆڕشێکی زۆر بە هێزی لە ساڵی ٨٣٩-٨٤٠ دا لە چیاکانی (داسنی) (نێوچەی یەزیدییەکانی نێزیکی موسڵ)دا دژی خەلیفەی ئیسلام (المستعصم بالله) (٨٣٣-٨٤٢) بەرپا کرد(٧٨).

بەهێزترین شۆڕشی ئیدیۆلۆژیی دژی ئیسلام لە لایەن (بابەکی خورەمی)یەوە(٧٩). سەرکردایەتی کرا، کە ٨١٦/٨١٧-٨٣٧ درێژەی کێشا. ژمارەیەکی زۆر لە هێزە کوردەکان بەشدارییان تێدا کرد(٨٠). بابەک لە پێناوی کۆمەڵگەیەکی ئازاد و یەکسانی دوور لەژێر دەستەیی عارەبدا خەباتی دەکرد. بە هۆی خیانەت و خۆفرۆشی و هەلپەرستی هەندێ لە سەرکردەکانییەوە، خەلیفەی ئیسلام توانی بە سەریدا زاڵ بێت و لەنێوی بەرێت.

سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر ئیمپراتۆرێتی فارس و کوردی ژێر دەستەیدا، بەهۆی چاکی دیسپلین و پتەوی رێک خستن و کاریگەری ئیدیۆلۆژی نوێی عارەبە موسڵمانەکانەوە بوو. بە پێچەوانەی ئەو سیستێمە خراپ و بۆگەنەی لە قەڵەمڕەوی پاشانشینی فارسدا پێڕەوی دەکرا. لایەنە گەش و چاکەکانی ئاینی زەردەشتی لەسەردەمی ساسانییەکانەوە شێوێنرا بوون. بۆ نموونە (زەردەشت) بانگی چوون یەکی و مامەڵەی چاکی ژنانی هەڵدەدا، کەچی لەسەردمی ساسانییەکاندا ژنان بە ناجۆرترین و پەست ترین شێوە رەفتاریان لەگەڵ دەکرا و هیچ مافێکیان لە ئاستی پیاودا نەبوو(٨١).

یاسای باج (باجی سەر و زەوی) لەسایەی ئیسلام دا هێند گران بوو، کە کوردەکانی ناچارکرد ببنە موسڵمان، چونکە بەشی زۆری کوردەکان جوتکار بوون و هەرکەسیش ببایەتە موسوڵمان، باجی لەسەر هەڵدەگیرا و زەوییەکەی دەبووە موڵکی خۆی.

لەگەڵ بوونە موسوڵماندا، کوردەکان ناچاربوون زمانی عارەبی بۆ کاروباری ئاینی و رەسمی بەکار بهێنن. هەمان کاتیش بوونە بەشێک لەو دەوڵەتە نوێ عارەبییە

ئیسلامی‌یە. شایانی باسە کە ووشەی (عارەب) و (ئیسلام) لەو سەردەمەدا هاو واتای یەک بوون[٨٢].

کوردەکان لەگەڵ ئیسلام بوونیشیاندا هیچ کات تایبەتمەندێتی خۆیان لەدەست نەداوە. هەرچەندە هەوڵی ئەوەشیان نەداوە کە ڕێچکەیەکی فەلسەفی، یا ئاینی تایبەتی سەربەخۆیان داتاشن تا لە عارەبەکان دابڕێن و سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن و پاشان ببێتە ڕێ خۆشکەرێک بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی.

بە پێچەوانەی کوردەوە، فارسەکان پاش کۆچی دوایی پەیامبەر لە ٨ی حوزەیرانی ٦٣٢دا، توانیان هەلی ڕەخساوی شەڕ و پێکدا پژانی سەرۆک هۆزەکانی عارەب لەسەر خەلافەت وجێگری بقۆزنەوە و وورده وورده ڕێچکەی شیعەیەتی بگرنە دەست و خۆیان بکەنە بەرۆگری. گرتنە بەری ئەم ڕێبازە هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندن خۆیان لە عارەب هەڵبوێرن.

فارسەکان توانیان بە کۆمەک و یارمەتی کوردەکان خەلافەتی شۆڤینیستی ئەمەوی ٦٦١-٧٥٠ بەسەرکردایەتی شۆڕشێگێڕێکی کورد کەنێوی (ئەبو موسلیمی خۆراسانی) بوو لە ساڵی ٧٥٠دا بڕوخێنن و خەلافەتی عەبباسی لە شوێنی دابمەزرێنن. هەرچەند کوردەکان سوودیان لە لاوازی ڕژێمی عەبباسی (٧٥٠-١٢٥٨) وەرگرت و توانیان چەند میرنشینێکی سەربەخۆ و بەهێزی وەک (میرنشینی حەسنەوی ٩٥٠-١٠٩٥)(*). میرنشینی (شەدادی ٩٥١-١١٦٤) لە ژووررووی ئازربایجان و خوارووی ڕۆژئاوای قەوقازدا، میرنشینی (فەزلەوی‌ی ٥٤٣-٨٢٧ ھ)... تاد دابمەزرێنن، بەڵام زمانی ڕەسمی‌ی ئەم میرنشینانە بەهۆی پاشکۆیی و هاوبەشی‌ی ئاینزای سوننی‌یەوە هەر بە عارەبی مانەوە. دەستەڵاتدارانی عارەب ئاینزای هاوبەشی سوننی‌یان کردە ئامرازێک بۆ گەیشتن بە ئامانج و بەرژەوەندی خۆیان. بەو جۆرە کوردە سوننی‌یەکان هەمیشە لە خزمەتی ئەو وولاتە عارەبانەدا بوون.

---

(*) ئەم میر نشینە لە لایەن میر (حەسەن بەرزیکانی)یەوە لە نێوچەی شارەزووردا دامەزرا. پایتەختەکەی (دینەوەر) بوو کە دەکەوێتە سەرووی کرماشانەوە. قەڵەمڕەوی لە (نەهاوەند)ەوە تا شارەزوور بەر فراوان بوو. بڕوانە: "Fuad,Kamal: Kurdische Handschriften in der BRD"
"دەستنووسە کوردی‌یەکانی ئاڵەمانیای ڕۆژئاوا"
Franz Steiner Verlag, Wiesbaden, 1970, S.XVI.

میرێکی کورد کە پاشان بە (صەلاحەدینی گەورە ١١٣٧-١١٩٣) نێوی دەرکرد، توانی دەوڵەتی عارەب لە هێرش و پەلاماری خاچپەرستان بپارێزێت و لە روخاندن قوتاری کات. جوامێری و سۆز و بەزەیی و هەڵوێستی مەردانەی صەلاحەدین بەرامبەر دوژمنی کەنەفت و لاواز، نموونەیەکی زەقی عەقڵیەتی کوردە.

کاتێک تورکە مەغۆلەکان لە ساڵی ١٢٥٨دا لەژێر فەرماندەی هۆلاکۆدا بەغدایان داگیر کرد و دەوڵەتی عارەبی ئیسلامی‌یان رووخاند، ئاینزای شیعە لە ئارادابوو، بەڵام تەنها لە نێوان فارسەکاندا رەواجی هەبوو. زۆربەی زۆری کوردەکان سوننی بوون. واتە هەمان ئاینزای دەوڵەتی عارەبیان لەنێودا باو بوو.

لەسەر ئەنجامی ئەو هێرشە تورکی‌یە مەغۆلی‌یەدا ژمارەیەکی زۆر تیرەی تورک هاتنە ئاسیای گچکەوە. ئەوەبوو (ئاق قۆینلۆ ١٣٧٨-١٥٠٢) و(قەرە قۆینلۆ ١٤٠٤-١٤٤٧) رژانە کوردستانەوە. وولاتەکەیان تاڵان کردو بە نیاز بوون میللەتەکەش تۆو بڕ کەن.

بوونە ئیسلامی تورکەکان و ئەو سەرکەوتنە سوپایی‌یانەی بە نێوی ئیسلامەوە لە ئاسیای گچکەدا بەدەستیان هێنا، رێی بۆ ئەوە خۆش کرد لە کۆتایی سەدەی دوازدەهەم دا، دەوڵەتێکی تورکی- ئیسلامی بەنێوی عوسمانلی (عوسمانی)یەوە دامەزرێنن، کە لە نێوی باپیرانی خانەوادە دەستەڵات دارەکەوە وەرگیرابوو. لە رۆژی ٢٩ی مایسی ١٤٥٣دا تورکەکان توانی‌یان (قوستەنتینی‌یە) داگیر بکەن و کۆتایی بە ئیمپراتۆرێتی بیزەنتی‌یەکان بهێنن. ئەم دەوڵەتە تورکی‌یە تازە دامەزراوە پاشان فراوان بوو، بووە ئەو دەوڵەتەی لە مێژوودا بە (ئیمپراتۆرێتی عوسمانی) نێوی دەرکرد.

سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی ١٥١٧دا بە فێڵ و تەڵەکە خەلافەتی ئیسلامی لە چنگی عارەبەکان دەرکێشا و لە دونیادا بانگی سەرکردەیی سوننی ئیسلامی‌ی بۆ خۆی هەڵدا.

بە پێچەوانەی ئەمانەوە، فارسە شیعەکان خۆیان کردە بەرۆگری ئاینزانی شیعە و لە سەردەمی (شا ئیسماعیلی صەفەوی ١٥٠٢-١٥٢٤)دا ئەم ئاینزایە کرایە ئاینی رەسمی‌ی وولات. بەو جۆرە سەرەتای کێشمەکێشمێکی خوێناوی بۆ دەستەڵات گرتنە دەست، لە نێوان فارس و تورک دا، بە نێوی (شیعە) و (سوننە)وە دەستی پێ کرد و بە هەزاران قوربانی لەسەر هەردوولا کەوت.

ئەو کوردانەی پاش رووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی چەندین میرنشینی سەربەخۆی وەکو

میرنشینی (بەتلیس لە دەوروبەری ١٤١٧)دا، میرنشینی (ئازیزان)یان لە جەزیرەدا دامەزراندبوو، بە هۆی هاومەزهەبی‌یەوە، دایانە پاڵ تورکەکان. بەو جۆرە تورکەکان توانی‌یان شەڕی چارەنووس سازی چاڵدیران لە ١٥١٤دا. بە کۆمەکی کوردەکان ببەنەوە و بەسەر فارسەکاندا سەرکەون. سوڵتان سەلیمی تورک بە بەرتیل(*) و دەم چەورکردن وای لە زانای کورد (ئیدریسی بەتلیسی) کرد کەبەهۆی پلەو پایەی ئاینی‌یەوە کاریگەری و تین و تاوی زۆری لەسەر میرنشینە کوردەکان هەبوو، هەموویان هان بدات لەدەوری ئیمپراتۆریتی تورکی عوسمانی خڕ ببنەوە و پشتگیری لێ بکەن. سیاسەتی دڕندانە و شێتگیرانەی صەفەوی‌یەکانیش لە کوردستاندا(٨٣). یارمەتی دەرێک بوو بۆ سەرخستنی ئەو پیلانەی (بەتلیسی)(٨٤). ئیدریسی بەتلیسی‌ی لەلایەن کوردەکانی ئەوڕۆوە بە (ئیبلیسی بەتلیسی) نێو دەبرێت. نێوی وەکو خۆفرۆشێک و خایەنێک لە مێژووی کورد دا تۆمار کراوە.

هەر چەندە کورد و تورک لە پەیمانی یەکێتی ٩ی ئابی ١٥١٥دا لە سەر ئەوە رێک کەوتن کە سەربەخۆیی و ئازادی نێوخۆی میرنشینەکان بپارێزرێت(٨٥). بەڵام سوڵتانە تورکەکان هیچ کات گوێ‌یان بەو رێکەوتننامەیە نەداوە(٨٦). هەمیشە پایەی ئاینی‌ی خۆیان بۆ بەگژ یەکدا کردنی میرنشینەکان بەکار هێناوە.

لە ساڵی ١٦٣٩دا تورک و فارس سەرەڕای ئەو دوژمنایەتی‌یە مەزهەبی‌یەیان، پەیمانی (زەهاو)یان مۆر کرد و بەو پێ‌یە کوردستانیان لە نێو خۆیاندا بەش کرد(٨٧). بەڵام ئەم بەش کردنە تەنها بەنێو بەش کردن بوو، دەنا میرنشینە کوردەکان زۆرترین کات پابەندی هیچ لایەکیان نەبوون و سەربەخۆ فەرمانڕەوایی خۆیان کردووە.

میرێکی وەکو (میری کۆرە) توانی وولاتێکی سەربەخۆ بەنێوی (سۆران)ەوە(٨٨) دابمەزرێنێ. (میر بەدرخان)یش نێوچەیەکی بەرفراوانی بەنێوی (بۆتان)ەوە ئازاد و سەربەخۆ فەرمانڕەوایی دەکرد.

سوڵتانە تورکەکان جارێکی دیش چەکی ئاینیان بەگەڕ خستەوە و گیانی حەسادەت و چاوپێک دا هەڵنەهاتنی میرەکانیان قۆزتەوە و توانی‌یان یەک لەدوای یەک بیانفەوتێنن.

---

(*) ئەو بەرتیلە لەو نامەیەی سوڵتان سەلیم دا بەدەر دەکەوێ کە بۆ (بەتلیسی‌ی) ناردووە. بڕوانە دەقی نامەکە لەو سەرچاوە تورکی‌یە عوسمانی‌یەدا: خواجە سعدالدین: "تاج التواریخ"، جـ ٢، استنبول ١٢٧٩/ ٨٠هـ، ١٨٦٢/٦٣ز، ص٣٢٢.

ئەوەبوو لە ١٨٣٦دا سـۆران ولە ١٨٣٧ دا بادینان ولە ١٨٤٧دا بۆتان و لە ١٨٥١دا بابان و بەمەش دوا میرنشینی کوردیان ریشەکێش کرد.

لەسـەدەی نـۆزدەهەم دا زنجیـرەیەک شـۆڕش و راپەڕینی کـوردانە دژی ئیـمـپـراتۆریـتی عـوسـمـانی بەرپا کـران. وەکـو شـۆڕشی ئەورەحـمـان پاشـای بابان لە ١٨٠٦دا، شـۆڕشی بلباس ١٨١٨، شۆڕشی بەدرخان ١٨٤٣-١٨٤٧، شۆڕشی یەزدان شێر ١٨٥٣-١٨٥٥، شـۆڕشی نەهری ١٨٨٠ و راپەڕینی هەکـاری ١٨٩٥[٨٩]. بەهەمـان چەکی ئاینی و چەواشە کردن، دەستەڵاتدارە تورکەکان توانیان ئەو شۆڕشانە سەرکوت کەن.

پاشـاکـانی فـارس بێ پەروا لە هەوڵی ئەوەدا بوون کـە کـوردە شیـعـەکان بەلای خـۆیاندا راکێشن. بەڵام نەیانتوانیوە هەموو کات میرنشینە سوننی‌یەکان بکەنە دۆست و داردەستی خـۆیان. بۆ نموونە مـیـرنشـینی ئەردەلان ١٦١٢-١٨٦٧ کـە پایتـەختـەکـەی (سنە) بوو، نیوچەیەکی زۆر فراوانی سەربەخۆ فەرمان ڕەوایی دەکرد.

وەک دیتـان، یەکـێک لە نەهامـەتی‌یەکانی کورد، نـەبوونی ئاینزایەک یا قـوتابخانەیەکی فـەلسـەفی بوو. واتە نەبوونی ئیـدیـۆلۆژی‌یەکی تایبـەت بەخـۆ. رەنـگە گـەر شـتـێکی لەو بابەتەی هەبایە، بیـتـوانیـبـا هەمـوو کـورد یەک خـات، وەک چۆن شیـعـەگـەری هەمـوو فارسەکانی کۆ کردەوە و بەرەو ئامانجێک جماندنی. لەبریتی ئەوە کوردەکان بوونە پاشکۆ و پابەندی تورک و فـارسەکـان و قـەزا وەگێری دەوڵەتەکانیـان[٩٠]. بەم هۆیانەوە کوردەکان زمـان و کـولتـوری خـۆیان پشت گـوێ خـست و فـەرامـۆشـیـان کـرد[٩١]. زۆربەی زانا هەڵکەوتووەکانی کورد سەرمایەی زانستـی خۆیان لەو وولاتە بێگانانەدا بەهەدەر دا[٩٢]. بەهەر حاڵ چەند زانایەکی کەمیش هەبوون کە بەرهەمیـان بەکـوردی دەنووسی و گـازندە و گلەییـان لە میللەتەکەیان دەکرد کـە بەو شێوەیە کەلەپوری خـۆیان پشت گوێ خـسـتـووە. یەکێک لەوانە شاعیر و زانای بلیمەت (ئەحمەدی خانی ١٦٥٠-١٧٠٦)بوو، نووسەری رۆمـانە بە نێـویانگەکـەی (مـەم و زین)[٩٣]. ئەو شـاکـارەی شـان لەشـانی شـاکـارە جیهانی‌یەکان هەڵدەسوێت.

بەرمـاندنی میرنشـینەکـان، ئەوجا کورد بە هۆشدا هاتنەوە و گـومـانیـان لە راسـتـێتی ئەو (برایەتی ئیـسـلام)ە پەیدا کـرد و چەند شـۆڕش و راپەڕینێکیـان بەرپا کـرد. بەڵام ئەم شۆڕشانە (بۆ نموونە شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە ساڵی ١٨٨٠دا)، شتێک نەبوون لە پەلە قـاژێی مـەرگ زێتـر. هەمـوو هەڵچـوون و هەژانـێکی لەپڕ و نارێکخـراو

بوون. بۆیە سەرپاکیان لەلایەن هێزە دەستەڵاتدارەکانی تورکەوە یا بەزەبری ئاین یاخود لەڕێی فەند و فێڵ و فریوەوە خامۆش کراون. ئەم شۆڕشانە ئیدیۆلۆژی‌یەکی جەماوەری و ڕەگ داکوتاویان نەبوو، پاش مردن و لەنێوچوونی سەرکردەکانیان، شۆڕشگێڕان بڵاوەیان لێ کردووە و لەسەر ژیانی ئاسایی خۆیان بەردەوام بوون.

(تا ئێستا هیچ بزووتنەوەیەک نەیتوانیوە بێ ئیدیۆلۆژی‌یەکی چەسپاو و گونجاو بەردەوام بێت. بزووتنەوەی سیاسی وەکو گیان لەبەرێک وایە، بەردەوام پێویستی بەخۆراکێکی ڕوحی هەیە. هیچ شۆڕشێکی چەکدارانە بەبێ دەست لە ملانێ قەڵەم و تفەنگ سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت).

لە پاڵ ئەوانەدا هۆیەکی دیکەی ئەو بارە ناهەموارەی کورد لەسەدەی پێشوودا، دەست تێکەڵ کردن و جموجۆڵی ئیمپریالیزمانە بوو. سیخوڕ و بەکرێ گیراوانی ئەورووپایی و ئەمریکایی بەنێوی (مژدەدەرانی عیسایی)یەوە ڕوویان لە کوردستان دەکرد، تا بەپەنهانی گیانی دوژمنایەتی و دژایەتی کورد پەرە پێ بدەن. ئیمپریالیزمەکان بەهەموو جۆر و شێوەیەک کنەی ئەوەیان دەکرد بەهانەی وا پەیدا بکەن کە بتوانن لە ڕێگەیەوە دەست لە کاروباری نێو خۆی ئیمپراتۆرێتە شرۆڵەکە وەردەن. بۆ ئەوە چارشێوی (برایەتی عیسایی)یان پەیدا کردو لە ژێری‌یەوە دەستیان تێکەڵ کرد.

چونکە ئەم بە کرێ گیراوانە فڕیان بەسەر گیان و باوەڕی ڕاستەقینەی عیسایی‌یەوە نەبوو، ئەم فەندە فێڵە، گوڕ و تاو و کاریگەری‌یەکی ئەوتۆی پێ نەبەخشین و نەیانتوانی گوتەکانیان بەکردار تەرجەمە بکەن. سا بۆیە نەیانتوانی تاقە کوردێکی موسڵمان قەناعەت پێ بکەن و بۆ مەرامی چەپەڵی خۆیان هەڵیسووڕێنن. لە داخ و کینە و بێ هیوایی دا کەوتنە دنەدانی کەمایەتی‌یە عیسایی‌یەکان دژی برا موسڵمانەکانیان، بە جۆرێک کڵپەی قینی هەردوولایان هەڵایسان، کە پێکدادانی پەیڕەوانی هەردوو ئاینەکە بسازێت.

ئەم هەوڵانەی (مژدە دەرە عیسایی)یەکان لە کوردستاندا لەلایەن تورکیا و ئێرانیشەوە چوون یەک پشتگیری لێ دەکرا. هەریەک بە هۆیەکەوە. هەردوو وولات ترس وپەژارەی ئەوەیان لێ نیشتبوو ئەو سێ نەتەوە برایە: کورد و ئەرمەن و ئاسوری، برایانە پێکڕا وەخۆ کەون. دیارە بەو یەکێتی‌یە سەراپایی‌یە دەیانتوانی بە ئاسانی ئازادی خۆیان وەدەست بێنن. شایانی باسە هەتا پێش جەنگی رووس و عوسمانی ۱۸۲۸، کورد و ئەرمەنەکان

ئاشتی‌یانه و دۆستانه و هێمنانه پێکەوە دەژیان[٩٤].

هەر بۆ نموونە کاتێک میر بەدرخان بە مەبەستی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، لەسالانی ١٨٤٣-١٨٤٧دا دژی ئیمپراتۆریتی عوسمانی راپەڕی، بە نیاز بوو مافی ئۆتۆنۆمی بەهەمـوو گـەلە نامـوسـلمـانەکـان بدات، بەتایبـەت بە ئەرمـەن و ئاسووری‌یەکان[٩٥].

بەدرخان بوو ئەو یاسا شەرم هێنەرەی تورکی لابرد، کە عیسایی‌یەکانی دانیشتووی تورکیای ناچار دەکرد بۆ نموونە (لەبەر هەر موسلمانێک کە رادەبورد بەرزە پێ هەلسن. یا جلکێکی تایبەتی بپۆشن!!)[٩٦]. مژدە دەرە عیسایی‌یەکان خۆیان گەواهی ئەو راستیانە دەدەن[٩٧]. لەگەل ئەوەدا دنەدانی بەردەوامی فەرمانبەرانی تورک[٩٨] و بەکرێ گیراوە ئەوروپایی‌یەکان وایان لەبرا ئاسوری‌یە نەستۆری‌یەکان کرد کەسەرپێچی بکەن و چیدی باج بە بەدرخان نەدەن. ئەمە بووە هۆی پێکداپژان. ئیمپریالیزمی ئەوروپاییش کردیانە بیانو و بەهانەیەک تا بە نێوی (پاراستنی دیان)ەکانەوە بێنە نێوەوە و دەست تێکەل کەن[٩٩] و تورکیایان ناچار کرد هەندە ئیمتیازاتێکیان پێ بدات. لەو رێگەیەوە ئیمپریالیزمی رۆژئاوایی مافی ئەوەیان گیرکەوت کە دەست لە کاروباری نێو خۆی تورکیا وەردەن. تورکەکانیش ئەمەیان کردە بە هانەیەک بۆ لێدانی کوردەکان[١٠٠].

هەروەها (شێخ عوبەیدوللای نەهری»یش کاتێک بەرووی خوێنرێژی و دڕندەیی رژێمی فارسدا[١٠١] راست بووەوە و شۆڕشی بەرپا کرد، هەلوێستێکی مەردانە و شەرەفمەندانەی بەرامبەر (دیان)ەکان هەبوو. (نەهری) خواست و ئامانجی شۆڕشەکەی لە نامەیەکدا بەدەر دەخات، کە لە ١٨٧٨دا بۆ کونسولی ئینگلیزی لە (ورمێ) نووسیوە:

(... کورد نەتەوەیەکی قارەمان و ئازادیخوازن. تایبەتمەندێتی‌یەکی پڕ بایەخ و داب و نەریتێکی سەربەخۆیان هەیە. لەگەل ئەوەشدا دوژمنەکانیان هەول دەدەن بە خوێنرێژو دڕندە نێویان بزڕێنن. سەرکردە کوردەکانی تورکیا و رووسیا و ئێران یەک هیواو مەبەستیان هەیە. بۆیە وا پێویست دەکات چارەسەرێکی لەبار بۆ کێشەکەیان بگیرێتە بەر، دەنا خۆیان چارەسەری گونجاو پەیدا دەکەن. ناتوانن چیدی لەبەردەم سیاسەتی قڕ کردن و زۆردارانەی دوژمنانیان دا دان بەخۆدا بگرن. ئێمەی کورد هەرگیز ئەو ئاواتە پیرۆزەمان وەلا نانێین. هەرچی شک دەبەین لەمال و ژیانەوە تا دوا تنۆکی خوێنمان لە پێناوی شۆڕش و چۆک پێ دادانی تورکیا و ئێران و بەدەست هێنانی ئازادیمان دا بە خەرجی دەدەین)[١٠٢].

(ئەهری) خۆش ئامادەیی لە کۆمەکی ئینگلیز و ئەمریکا دژ بە رژێمانی ئێران و تورکیا دەکات[١٠٣]. بەڵام ئەمە ڕێ لە پیلانی مژدە دەرەکان نابەستێتەوە. هەر زوو هەستیان کرد (ئەهری) ئەو کەسە نی‌یە و ئامادەنی‌یە ببێتە داردەست و بەکرێ گیراویان تا بۆ ئامانجی خۆیان هەڵی سووڕێنن.

بۆیە ئیمپریالیزمی رووسی و ئینگلیزی، هاوئاهەنگ دژی (ئەهری) کنەیان دەکرد. توانی‌یان تورکیا رازی بکەن تا لەگەڵ ئێران دا یەک کەویت و پێکرا دژی کورد دەست بە کار بن[١٠٤]. ئەستۆری‌یە سادەکانیشیان لێ راست کردەوە، (ئەهری)یان ناچار کرد بەخۆی و ٢٠ هەزار جەنگاوەرەوە لە شەڕی برا کوژی و لاوەکی‌یەوە بگلێت. هەمان کات رێبەرێکی عیسایی ئەمریکایی کە نێوی (Dr. Joseph Cochran) بوو لەگەڵ رژێمی فارسدا[١٠٥] سەرگەرمی تەون کردنی پیلانێک بوو لە دژی ئەهری، کە پاشان بووە هۆی هەرەس پێ هێنانی بزووتنەوەکەی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەهری هیچ هەڵوێستێکی تۆڵە ئامێزی بەرامبەر (دیان)ەکان نەگرتە بەر. ئەم هەڵوێستە لە لایەن مینۆرسکی‌یەوە بە (نایاب ترین هەڵوێستی مێژوویی) نێو براوە[١٠٦]. هەتا کوڕەکانیشی. پاشان تۆڵەیان لە (Dr. Co- chran) نەکردەوە[١٠٧]. ئەم راستی‌یانە ئەوڕۆکە دیبلۆماسی ئەمریکایی (Eagelton) دەیانگێڕێتەوە[١٠٨].

بەڵام (Eagelton) بێ شەرمانە هەڵوێستی (Cochran) بەم جۆرە هەڵدەسەنگێنێت (ئەم دوکتۆرە باشە هەوڵی پاراستنی «دیان»ەکانی نێوچەکەی دەدا، کە لەبەردەم مەترسی تاڵانی و کوشتن و بڕینی کوردە دڕندەکاندا بوون)[١٠٩]. لەم فەرمایشتەوە پیاو تێدەگات کە (ئیگلتن)یش سەوداسەرێکی بەرژەوەندی‌یەکانی ئیمپریالیزمی ئەمریکی‌یە. بەڵام جێگەی داخە (سیاسەتمەدارێکی!) کوردی وەک جەلال تاڵەبانی هێندە (ساکار و ساویلکە) بێت (ئیگلتن) بە (دۆست و لایەنگری) بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد تێ بگات[١١٠].

ژمارەیەکی زۆر کتێب دەبینین کە لە سەدەی پێشوو و ئەم سەدەیەدا لەلایەن (گەڕۆکەکان!)ەوە، دەربارەی کورد نوسراون. زۆربەی ئەم (گەڕۆکانە) بەگوێ بیست کوردیان ناسیوە. ئەم نووسەرانە بە (دیان کوژ) و (جەردە) نێویان بردووین[١١١]. هەوڵیان داوە بە بوختان و درۆی بێ جێ راستی‌یەکان لنگەو قوچ کەنەوە. زانای رووسی‌ی (خالفین) دەربارەیان دەڵێت: (بەشێکی زۆر لەو سەرچاوە رۆژئاواییانەی کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەربارەی کورد نووسیویانە، کورد بە (دز و جەردە) نێو دەبەن، بەڵام ئەم جۆرە نێو و ناتۆرانە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ راستی‌دا یەکانگیر نابن)[١١٢].

کاتێک ڕژێمی تورکی لە ١٩١٥ و١٩٢٣دا قەتڵ و عامی نەتەوەی ئەرمەنی برامانیان دەست پێ کرد، ئەم (پارێزەری دیان)انەی ئەوروپا، نەک هەر فریایان نەکەوتن و لایان بەلادا نەکردنەوە، بەڵکە بەرژەوەندیی ئابووری‌یە ئیمپریالیزمی‌یەکانیان لەگەڵ تورکیادا بەتین تر کرد. چارەنووسی ئەرمەنی‌یەکانیان دایە دەست ویژدانی تورک. بە پێچەوانەی ئەوانەوە جوتکارە هەژارەکانی کورد لەکاتی قەتڵ و عامەکەی ١٩١٦ دا دالدەی ئەرمەنی‌یەکانیاندا[١١٣]. ئەم ڕاستی‌یانە لای برا ئەرمەنی‌یەکانیشمان ئاشکران. زانای ئەرمەنی‌ی (Arshak Safrastian) لەو کتێبەی‌دا کەدەربارەی کورد و کوردستان نوسیویە[١١٤]. ئەوەی ئاشکرا کردووە کە خودی ڕژێمی تورکیا هەموو تاوانێکی لێک کەوتنی هەردوو گەلی برای کورد و ئەرمەنیان[١١٥](×) لەئەستۆ دایە، نەک کوردەکان[١١٦].

ئێمە بە نێوی (نوکسە) و هەموو ڕێکخراوە کوردی‌یە پێشکەوتنخوازەکانی هاوشانی‌یەوە، پشت بەستوو بە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەکەمان، ئاشکرای دەکەین کە هەموو کات ئامادەی سەنگەر یەکخستنین لە پێناوی بەدەست هێنانی مافی چارەنووسی نەتەوەی ئەرمەنی برادا بۆ پتەو کردنی یەکێتی تێکۆشان و هاریکاری‌یەکی هاوسان و هاوشانی هەردوو گەلی کورد و ئەرمەن.

گەلی ئاسوری‌ی برا ئەم ڕاستی‌یانەیان چاک لا ئاشکرایە، لە ماوەی ئەو پەنجا ساڵەی دەردی سەری ژێر دەستەیی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌دا زۆر ڕاستی‌یان بۆ ڕوون بووەوە. لەسەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ی کوردەوە تا ئەوڕۆ، برا ئاسوری‌یەکان ڕۆڵێکی درەوشاوە و گەشیان لە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی میللەتەکەماندا دیتووە. دەزانن هەردوو گەلی برا، یەک خاک و یەک چارەنووسمان هەیە. سیاسەتمەدار و برای ئازیزم بەهەشتی (یوسف مەلەک) هەموو ژیانی خۆی بۆ خزمەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد و قبرص تەرخان کرد. گشت کوردێکی ڕاستەقینە بە

---

(×) ئەو کوردانەی ئەو تاوانانەیان بەرامبەر ئەرمەن کرد بەهیچ شێوەیەک ناشێت لەسەر کورد حسێب بکرێن، چونکە ئەوانە هەندێ خۆفرۆش و بەکرێ گیراوی کورد بوون کە لە نێو کوردستاندا بە (جل خوارەکان) ناسرابوون و دەوڵەتی عوسمانی نێوی (سوارەی حەمیدی) لێ نابوون. ئەوانە تەنها دژی ئەرمەن نە دەجەنگان، بەڵکە بە هەمان شێوەی جاشەکانی ئەم سەردەمەی خۆمان، بۆ سەرکپ کردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی خودی نەتەوەی کوردیش بە کار دەهێنران. - (کوردۆ)

هەڵوێستی (مەلەک) و هەڵوێستی زاناو سیاسەتمدار و بیشۆف (پۆلۆس بداری) و پاڵەوانێکی وەکی (مارگرێت جۆرج) کەنێوی ژاندارکی کوردستانی لێ نرابوو، سەربەرزن و شانازی دەکەن.

## کورد لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، ژووررووی کوردستان

بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی پێش یەکەم جەنگی جیهانی گەلانی هاوسێ کاریان لەنەتەوەی کورد کرد. لە شۆڕشی ١٩٠٥ی رووسیا ئاگادار بوون[١١٧]. لە شۆڕشی ئێرانی ١٩٠٥دا کە بە (مەشروطیەت) ناسراوە بەشداری دیار و راستەوخۆیان کرد. لە ئازربایجان لە بەرەنگاری‌ی هێرشی سوپای رووسدا بەشداری‌یان کرد[١١٨]. شۆڕشەکەی ١٩٠٨ی تورکیا کە لەپێناوی دەستوور و یاسایەکی دیمۆکراتی‌یانەدا بوو کاری تێ کردن.

لەو دەمەدا کوردەکان بۆ یەکەم جار بەڕاستی هەوڵی خۆڕێکخستنیان دا. چەند پارتێکیان دامەزراند[١١٩] و چەند رۆژنامەیەکیان دەرکرد[١٢٠]. ئەم کۆششانە زێتر خانەوادەی (بەدرخان)یەکان دەست پێشکەری بوون. بەڵام جەماوەری و سەراپایی نەبوون، چونکە کایەی چالاکی‌یان زێتر ئەستەمول بوو، رێبەران و لایەنگرانیان لە خانەوادە دەست رۆیشتووەکان بوون. لە گەڵ ئەوەشدا بارێکی هەژاوی وا هاتە گۆڕێ کە رێگە بۆ شۆڕشی بەتلیسی ١٩١٣ خۆش بکات[١٢١]. ئەم راپەڕینە زۆری نەخایاند، داگیرکەرانی تورک بە نێوی (غەزا)وە شالاوی دڕندانەیان بۆ هێنا. (شێخ سەلیم)ی سەرکردەی شۆڕشەکە ناچار بوو هەڵبێت و پەنا بەرێتە بەر بارەگای کونسوڵی رووسەوە. لەوێدا تا سەرەتای یەکەم جەنگی جیهانی خۆی حەشاردا. ئەو کاتە تورکەکان پەلاماری بارەگای کونسوڵیان دا و (شێخ سەلیم)یان دەستگیر کرد و کوشتیان.

سەردارانی خانەوادەی بەدرخان ساڵی ١٩١٦ لە تفلیس پێوەندی‌یان بە (دۆق نیقۆلا)ی رووسەوە کرد و داوای پشتگیری و کۆمەکیان لێ کرد[١٢٢].

بەڵام ئەو کاتە رووسەکان هەڵوێستێکی روون و ئاشکرایان بەرامبەر کوردستان نەبوو، یارمەتی کوردیان نەدا[١٢٣].

١٩١٧ پارتی ئیستیقلالی کوردستان پەیوەندی بە رووسە تەزارەکانەوە کرد، بەڵام شۆڕشی ئۆکتۆبەر رژێمی تەزاری‌ی سەرنگون کرد و هەموو پلانەکانی هەڵوەشاندەوە.

جەنگی یەکەمی جیهانی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی هەڵتەکاند. دەوڵەتە سەرکەوتووەکان

ویستیان بە پێی بەرژەوەندی خۆیان کەلاکی ئیمپراتۆریتەکە بەش بکەن.

ڕێکخراوە کوردی‌یەکان ژەنەراڵ شەریف پاشای کۆنە باڵوێزی عوسمانی‌یان لە ستۆکهۆڵم، کردە نوێنەری خۆیان و ناردیانە پاریس. شەریف پاشا لە ڕۆژی ١٩١٩/٣/٢٢دا بیرخەرەوەیەکی دایە (کۆنگرەی ئاشتی‌ی)و داوای سەربەخۆیی کوردستانی کرد[١٢٤]. لە ١٩٢٠/٣/١دا شەریف پاشا لەگەڵ (بۆگوس نۆبار پاشا)ی نوێنەری گەلی ئەرمەنی برادا بیرخەرەوەیەکی هاوبەشیان دایە (ئەنجومەنی باڵای دەوڵەتە سوێندخۆرەکان)، کە داواکاری‌یەکانی هەردوو گەلی برای تێدا پێش چاو خرابوو.

پەیمانی سیڤەر لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠دا مەرجەکانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ کورد و ئەرمەن دیاری کرد[١٢٥]. بەڵام نەبوونی پارتێکی خاوەن ئایدیۆلۆژی‌ی کوردی‌ی بارێکی وای هێنایە گۆڕێ کەسەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردایەتی بکەوێتە دەست کەسانی بۆرژواو فیۆداڵی بێ توانا و ڕاڕاو هەلپەرست. هەرچەندە هەندێکیان بۆ کوردستانێکی ئازاد دەکۆشان، بەڵام بەهۆی بیر و مەوقعێکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی‌یانەوە، لەلایەن جەماوەرێکی بەربڵاوەوە پشتگیری نەدەکران. خۆشیان بە گفتی صەوز و سووری وڵاتە ئیمپریالیزمەکان لە لایەک و بەڵێنی ئەتاتورک و پیاوەکانی لە لایەکی دی، فریویان خوارد. سوێند خوارەکان کوردیان وا تەفرە دا کە بێ قرە و هەڵا بمێننەوە و پشت بە بەزەیی وویژدانی هێزە زەبەلاحەکان ببەستن.

(ئەتاتورک)یش دەرفەتی نەبوونی ئایدۆلۆژی‌یەک و نەشارەزایی و کەم توانایی و سادە و ساکاری سەرکردەکانی کوردی قۆزتەوە و بە نێوی ئیسلامەوە چەواشەی کردن و هێزە داگیرکەرەکانی لە وڵاتەکەی پێ ڕاماڵین(*).

جگە لەوە دەوڵەتە سوێند خۆرەکان لە نێو خۆدا یەک نەبوون. فەرەنسا و ئیتالیا لە دژایەتی یۆنان و ئینگلتەرەی هاوپەیمانی پشتگیری تورکیایان دەکرد. دواکات سوپای یۆنان لەبەرەی بەرامبەر تورکیادا تەنها مایەوە. لە ئەیلولی ١٩٢٢دا هێزەکانی یۆنان ڕاماڵدران، تورکەکان دەستیان بە قەتڵ و عامی ئاسووری و یۆنانەکان کرد.

سوێندخۆران چیدی بەری سەرکەوتنەکانی ئەتاتورکیان پێ نەگیرا، لە گەڵی ڕێک کەوتن و لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٢٣دا پەیمانی (لۆزان)یان لەگەڵ مۆر کرد. لەمەدا باسی

---

(*) بڕوانە ئەو گوتارەی (میشال الحلوة) لە ڕۆژنامەی: لسان الحال" دا، ژ. ٢٠٤١٩، بیروت، ١٠ تموز ١٩٦٦.

دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە ئارادا نەما. هەمان کات دەستەڵاتدارانی تورکیا لەگەڵ پێوە لکاندنەوەی کوردستاندا ئامبازی سیاسەتی بە تورک کردنی کورد بوون. ئەو بەندانەی لە لۆزان دا دەمیان لە مافی (کەمە نەتەوەییەکان)ەوە ژەند بوو لە لایەن تورکەکانەوە پشت گوێ خران(*).

پاش ئەو نائومێدی و هیوا ڕمانە، ڕۆشنبیران و سەردارانی کورد کەوتنە خۆ، بەو هیوایەی بە زۆر لە ڕێگەی ڕاپەڕینی چەکدارانەوە مافی خوراوی میللەت بەدەست بهێنن. ژەنەراڵ (خالید جەبران) بە پەنهانی شۆڕشێکی چەکدارانەی ڕێکخست. بڕیار وابوو لە ٢١ی ئازاری ١٩٢٥(×)دا کە ڕۆژی نەورۆز دەکات، بەرپا بکرێت. بەڵام هێزێکی سوپای تورک لە ٧ی ئازاردا پەلاماری گوندی (پیران)یان دا، کە شێخ سەعیدی پیران (نەقشبەندی) لێ دەژیا و یەکێک لەسەرکردەکانی ئەم شۆڕشە گەلاڵە کراوە بوو. بەهۆی ئەم شاڵاوە ناکاوەوە شۆڕشەکە لە هەمان ڕۆژدا و پێش کاتی دیاری کراوی هەڵگیرسا. ژەنەراڵ جەبران و گەلەک کاربەدەستانی سوپایی دیکەی کورد لەوێ بوون. ڕژێمی تورکیا دەستگیری کردن و بێ هیچ دادگا و لێ پرسینەوەیەک گوللەبارانی کردن.

(نەقشبەندی) سەر فەرماندەیی شۆڕشەکەی گرتە دەست. بەڵام هیچ زانیاری‌یەکی

---

(*) بەندی ٣٨ی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣ دەڵێ: "ڕژێمی تورکیا بەرپرسیارە لە پاراستنی ژیان و دەستەبەر کردنی ئازادی هەموو دانیشتوانی تورکیا بێ ڕوانینە جوداوازی نەتەوایەتی، زمان، ڕەگەز و ئاینیان.

بەندی ٣٩: هیچ هاونیشتمانی‌یەکی تورکیا، ڕێگەی ئازادی‌ی بەکارهێنانی هیچ جۆرە زمانێکی لێ ناگیرێت، چ لە کاروباری ئاینی دا بێت یاخود لە چاپەمەنی و بلاوکراوە و کۆڕ و کۆبوونەوە گشتییەکان دا بێت... تاد.

لەبەندی ٣٧ دا تورکیا خۆی بەر پرسیار دەکات کە:

لەدەستووورە بنچی‌یەکانی وولات دا دان بە بڕیارەکانی بەندی ٣٨-٤٤دا بنێت و هیچ یاسا و دەستوورێکی ڕەسمیی دەست لەم بنەمایانە وەرنەدات و پێچەوانە و دژیان نەوەستێتەوە. بڕوانە:

Nouveau receuil de traites, Martens, ser.3,t.XIII, PP.338-390, Leipzig, 1924.

(×) لەو پێشەکی‌یەدا کە مامۆستا (یەحیا خەشاب) بۆ تەرجەمە عارەبی‌یەکەی شەرەفنامەی مامۆستا (محەمەد عەلی عەونی)ی نووسیوە و مامۆستا هەژاری موکریانی لەشەرەفنامە کوردی‌یەکەیدا لەلاپەڕە (سەتو چل و نۆ)دا کردوویە بە کوردی، دەڵێت: (بڕیار درا ڕۆژی ٢٦ی مارسی ١٩٢٥ ئەو شۆڕشە دەست پێ بکرێ......). (کوردۆ)

دەربارەی ڕێکخستن و شۆڕشی چەکدارانە نەبوو و سەری لێ دەرنەدەکرد. هەر چەندە کوردەکان زۆر شاریان ئازاد کرد، بەڵام ئەمە هەڵەیەکی ستراتیژی بوو، چونکە لەجەنگی پارتیزانی دا نابێت شارانێک ئازاد بکرێن کە قوربانی و ماندوو بوونی زۆر دەخوازێت. بەڵکە دەبێت تەنها مەڵبەندە ستراتیژی‌یە پڕ سوودەکان دەست بەسەردا بگرن. یاسای دەست وەشاندن و خۆ بزر کردن، چێترین ڕێگەیەکە بۆ هێز لێ بڕین و توانا داچۆڕینی دوژمن.

شەڕی بەرەیی، دژی پڕچەکی و پڕتوانایی سوپای تورک، بەو کەم چەکی و نا ڕێکخراوی‌یەی کوردەوە، قوربانی‌ی زۆری خواست. جگە لەوە فەرەنسی‌یەکان کە ئەو کاتانە ئینتیدابی سوریایان دەکرد، یارمەتی‌یەکی هێزەکانی تورکیایان داو ڕێگەی ئاسنی (حەلەب)یان بۆ ئاواڵە کردن. ئیحتیمالی ئەو هاریکاری‌یەی فەرەنسا و تورکیا شتێک بوو لە حسێبی سیاسەتمەدارانی کورد بە دەربوو، چونکە هێشتا یەکانگیری بەرژەوەندی‌ی ئیمپریالیزم و هێزە زەبەلاحەکان و تورکیای داگیرکەر و دوژمنی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردیان نەدیتبوو. بەو جۆرە تورکەکان توانی‌یان ئەو شۆڕشە دامرکێننەوە. دیبلۆماسێتی تورکیا لە هەندەران قاوی ئەوەیان دادەخست گوایە ئەو شۆڕشە بزووتنەوەی خۆفرۆشان و بەکرێ گیراوانی ئینگلیزە[١٢٦]. ئەو پروپاگەندانە شوورەویشی لە خشتە بردبوو، ئەوانیش پاڵیان دابووە پاڵ تورکیاوە[١٢٧].

جەواهیر لال نەهرۆی سەرەک وەزیرانی هیندستان دەربارەی ئەو بوختانانە دەڵێت: (ناتوانرێت بگوترێت بەکرێ گیراوانی ئینگلیز هیچ پێوەندی‌یەکیان بەو یاخی بوونەوە هەبووە... ئاشکرایە مەسەلە ئاینی‌یەکە پاڵپشتێک و هۆیەکی ئەو شۆڕشە بووە، هەستی نەتەوایەتی‌ی کوردیش هۆیەکی دی بووە. بەڵام وا پێ دەچێت کە مەسەلە نەتەوایەتی‌یەکە لە هۆکانی دیکە کاریگەر تر بوو بێت)[١٢٨].

نەهرۆ درێژەی پێ دەدات و دەڵێت:

(بەو جۆرە ئەو تورکانەی پێش ماوەیەک بۆ ئازادی خۆیان تێ دەکۆشان، ئێستاکە ئەو کوردانە دەچەوسێننەوە کە بۆ ئازادی‌یان لە خەبات دان. سەیرە و سەمەرە نەتەوەیەکی تینووی ئازادی‌ی ببێتە نەتەوەیەکی دەست درێژی کەر و خەباتیان لە ڕێی سەرفرازی‌یاندا ببێتە هەوڵی دیل کردن و ژێر دەست کردنی نەتەوەیەکی دی.

کورد شۆڕشێکی دیکەی لە ١٩٢٩دا بەرپاکرد. ئەویش خامۆش کرا. دیارە بۆ ماوەیەکی کورت، دەنا چۆن دەتوانرێت چۆک بە میللەتێک دابدرێ کە هەمیشە لە خەباتی بێ پسانەوە دا بێت و ئامادەش بێت باجی ئەو خەباتە بدات)[١٢٩].

له ۲۷ی مایسی ۱۹۲۵ دا دەستەڵات دارانی تورک ۹۱ کوردیان بە داردا کرد، له ۲۷ی حوزەیران دا ٤٧ی دیکەو له ۲۸ی حوزەیران دا ۹۳ تێکۆشەری دی. لەنێو ئەوانەدا (شێخ سەعید و پزیشک دوکتۆر فوئاد و پارێزەر محەمەد تۆفیق و شێخ عەبدولقادر و ژەنەراڵ ئیسماعیل)یان تێدا بوو. تۆڵەی شێتگیرانەی تورک بەڕادەیەک بوو کە نێزیکەی نیو ملیۆن کوردیان قڕ کرد.

ئەهرۆ لەو بارەوە دەڵێت:

(ئەتاتورک بێ بەزەییانە کوردەکانی دایە دەست دادگایەکی تایبەتی و ئەویش بە هەزارانیانی تاوانبار کرد. سەردارانی کورد شێخ سەعید ودوکتۆر فوئاد و زۆری دیکەیان لەدار دران. له مردنیشدا بزە لەسەر لێوانیان نەبڕا. ئەمە نیشانەیەک بوو بۆ دڵنیایی و بڕوای تەواویان بەسەربەخۆیی کوردستان)(١٣٠).

(ئارمسترۆنگ)یش لەو بارەوە دەڵێت:

(چۆن سولتانە تورکەکان یۆنانی و ئەرمەنی و بولگارەکانیان داماڵە خاس کرد، تورکە کەمالی‌یەکانیش بە هەمان دڕندەیی و چەپەڵی کوردەکانیان لەتۆڵەدا لەنێو برد)(١٣١). پاش ئەو کارەساتانە ڕژێمی تورک کوردەکانی بە (تورکی شاخاوی) نێوزەد دەکرد. هەوڵی دەدا ژیان و بوونیان وەک یەکەیەکی ئێتنی و گەلێکی دێرین و خاوەن تایبەتمەندێتی‌یەکی سەربەخۆ، هەڵوەشێنێتەوە.

کوردە نیشتمان پەروەرەکان له ۱۹۲۷دا بە پەنهانی له کوردستانی تورکیادا کۆنگرەیەکیان گرت. لەم کۆنگرەیەدا بڕیاری یەکخستنی هەموو ڕێکخراو و پارتە سیاسی‌یەکان له تاکە حیزبێکدا بەنێوی (خۆیبون)ەوە درا. بڕیار وا بوو خۆیبون له ژێر فەرماندەیی یەک سەرکردایەتی سوپایی‌دا، تا سەربەخۆیی ڕێبەریی شۆڕش بکات، مشوری هەموو ئەسبابێکی جەنگی بخۆن و له کێوێک بنکەیەکی سوپایی بۆ ڕێبەرایەتی شۆڕش دابمەزرێنن.

لەهەمان ساڵی ۱۹۲۷دا شۆڕشێکی نوێ بە سەرکردایەتی ژەنەراڵ (ئیحسان نوری)(×) و ڕێبەرایەتی پارتی (خۆیبون) لەنێوچەی ئارارات دا هەڵگیرسا، کە هەڵە و کەموکووڕیی هەموو پارتەکانی پێشینی له نێو خۆی دا حەشار دا بوو، بۆیە ئەم شۆڕشە تەنها تا ۱۹۳۱

(×) ژەنەراڵ (ئیحسان نوری پاشا) پاش هەرەسی شۆڕشەکەی پەنای بردە ئێران و تاکۆتایی ژیانی لەوێ مایەوە. هەر لەوێ بیرەوەری‌یەکانی لەبارەی شۆڕشی (ئاگری داغ)ەوە بە زنجیرە گوتارێک بەزمانی فارسی و لەژێر سەردێڕی (وقائع آرارات)دا لەهەفتە نامەی (کوهستان)ی ۱۹٤٧ دا بڵاوکردەوە. له ۱۹۷۸دا سەرپاکی ئەو گوتارانەم لەووڵات چنگ کەوت و بە کوردیم تەرجەمە کردن. قەخابن=

درێژەی کێشا. شۆڕشگێڕان تا دوا فیشەک جەنگان، ئەوجا تۆڵە دەستی پێ کردەوە(×) هێزەکانی تورک دڕندانە پەلاماری کوردستانیان دا. لە نێزیکی ئاگری داغ دا سەرپاکی دانیشتوانی ۲۲۰ گوندیان قڕ کرد کە نێزیکەی دە هەزار کورد بوون. نێزیکەی صەد رووناک بیری کوردیان بەدەست و پێ بەستراوی فڕێ دایە گۆلی (وان)ەوە. لە دەوروبەری نێوچەی (تاندریک)دا ٤٠٠ گوندیان خاپوور کرد. لە پارێزگای (وان) ۸۳ گوندیان وێران کردو ۵۹۰ کەسی تێدا کوژرا[۱۳۲].

بلاوکراوەی (دەنگ و باسی رۆژهەلاتی نێوەڕاست)ی شوورەوی لە ژمارە ۱۲ی ساڵی ۱۹۳۱ی دا بەم جۆرە دەربارەی هێرشی تورکان دەنووسێت:

(کەمالی‌یەکان لە کوردستاندا هەموو جۆرە چەکێکی نوێ‌یان بە کارهێناوە و هەموو رێگەیەکی خوێنڕێژی و پیاو کوشتنیان گرتۆتە بەر، تا بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد خەفەکەن. تۆپ و فڕۆکە گوندەکانیان تەواو خاپوور کرد. گاو گۆتاڵ و سامانیان تالان کران و دانیشتوانیان قڕ کران، بێ ئەوەی جوداوازی لە نێوان چەکدار و بێ چەک، زارۆکە و ئافرەتی بێ دەرەتاندا بکەن).

پیاو دەتوانێت ئەم راستی‌یانە لەگەڵ گوتەکانی سەرەک وەزیرانی ئەو کاتەی تورکیادا بەراورد بکات کە لە (سیڤاس) گوتبووی: (لەم وولاتەدا تەنها رەگەزی تورک مافی ئەوەی هەیە داوا ئیتنی و میللی‌یەکانی خۆی پێش چاو بخات)[۱۳۳].

---

=ناچاری هەڵهاتن بووم و ئەو پەڕە شڕانەم بۆ دەرنەکرا و نازانم پاشان چی‌یان بەسەر هات.

نووسەری هێژا کاکە (پێ ڕەش) ئەمساڵ مژدەی دامێ کە ئەو بیرەوەری‌یانە و هەندێ نوسراوی دیکەی بەهەشتی‌ی (ئیحسان نوری پاشا)ی لە خانەوادەکەی وەرگرتووە، بەچەند زمانێک تەرجەمەی کردوون و بەو زوانە لە ئەوروپا چاپ و بلاویان دەکاتەوە. (کوردۆ)

(×) ئیحسان نوری پاشا لەو بیرەوەری‌یانە دا بۆمان دەگێڕێتەوە کە ژەندرمەی تورک لەسنووری شوورەوی پەڕیونەتەوە و پشتیان لە شۆڕشگێڕان گرتووە، زۆربەی خانەوادەی پێشمەرگەکان لە گەلی‌ی (زیلان)دا دەبن. کە لە پشتەوە هێرش دەبەن، پێش ئەوەی دەستیان بەشۆڕشگێڕان بگات، سەرپاکی ئەو ژن و مندالانە قڕ دەکەن. (کوردۆ)

چەند رۆژنامە نووسێکی تورک لەگەڵ ئەو هێزانەدا دەبن. کاتێک دەگەنە سەر ترۆپکی ئاگری داغ، رۆژنامە نووسێکیان پارچە خەلوزێک هەڵدەگرێت و لەسەر کێلی پێشمەرگەیەکی شەهید ئاوا دەنووسێت: (کوردستان خەونێکە تا لێرەدا گۆڕ کراوە). (کوردۆ)

وەزیری دادی تورکیا مەحمود ئیسات بۆزکورت لە ئابی ۱۹۳۰دا ئاوا دەڵێت:

(ئازادی لە تورکیا دا لە هەرسووچێکی دی ئەم جیهانە زیترە. ئەم نیشتمانە خاکی تورکە. ئەوەی لەم وولاتەدا لە رەگەزی پاکی تورک نەبێت، تەنها یەک مافی دەکەوێت، مافی خزمەتکاری و کوێلەیەتی‌ی)(۱۳٤).

پاش ئەم رووداوانە رژێمی تورک ئامبازی سیاسەتی چەپەڵی بەزۆر بە تورک کردن بوو. بە پێ‌ی یاسایەک سەرپاکی کوردی دەرسیم (تونجەلی) کرانە تورک(۱۳٥). ئەمە کڵپەی شۆڕشێکی دی لە ۱۹۳۷دا هەڵگیرساند. لەم شەڕەدا رژێمی تورک بۆ یەکەم جار بۆمبای ژەهراوی‌ی لە جیهاندا قەدەغەکراوی دژی کورد بەکار هێنا(۱۳٦). نیو ملیۆن کورد لە نێوبران. نێوی پارێزگای (دەرسیم) کرایە (تونجەلی). لەو کاتەوە وا رادەگەیەنن کە لە تورکیادا نەکێشەی کورد هەیە و نە جارێکی دیش دەبێتەوە.

لە پروپاگەندەی دەرەوەدا شۆڕشی کوردیان بە (یاخی بوون دژی پێشکەوتن و نوێ کردنەوە و چارە سەر و بیناسازی‌ی) نێو دەبرد(*).

لە دووهەم جەنگی جیهانیدا دیبلۆماسێتی تورک، هەڵوێستێکی تەواو هەلپەرستانەی نیشان دا. سەرەتا تورکیا بێ لایەن مایەوە. ئەوجا لە ۱۹ی ئۆکتۆبەری ۱۹۳۹دا پەیمانێکی دۆستانەی لە گەڵ فەرەنسا و ئینگلتەرەدا مۆر کرد، ئەویش پاش ئەوەی هەردوو وولات لە ۱۲ی مایسی ۱۹۳۹دا ئامادەیی خۆیان پیشان دا کە کۆمەکی ماددی بە تورکیا بکەن. بەو جۆرە تورکیا سنوورەکانی خۆی پاراست. بەڵام سەرکەوتنە لە پڕەکانی سوپای ئاڵەمان لەسەرەتای جەنگدا دەستەڵاتدارانی تورکی راچڵەکاند. ئەوەبوو لە ۱۸ی حوزەیرانی ۱۹٤۱دا پەیمانی دۆستایەتی و هاریکاری‌یان لەگەڵ ئاڵەمانیادا مۆر کرد. بەڵام پاش ئەوەی بە راشکاوی دیتیان ئاڵەمانیا جەنگ دەدۆڕێنێت. بەپەلە پروزێ لە ۲۳ی شوباتی ۱۹٤٥دا بانگی جەنگیان دژی ئاڵەمانیا هەڵدا. ئەم سیاسەتە چەرخ و فەلەکی‌یە تورکیای لە هێرش و پەلامار پاراست.

---

(*) Nikitine, Basile: "Les Kurdes:, Paris,1956, P.303

رۆژنامە رۆژئاوایی‌یەکان ئەم پروپاگەندانەیان لە تورکەوە وەردەگرتوو بلاویان دەکردەوە. بروانە:

"The Times", London, June, 16, 1937.

"Le Temps", paris 18. Août 1937.

هەر یەکە و راست پاش کۆتایی جەنگ بڵاوکراوەکانی تورکیا دەستیان بە درۆ و بوختانی دژ بە کورد کردەوە. رۆژنامەی (Son Posta) لە ١١ی نیسانی ١٩٤٦ دەنووسێت:

(لەتورکیادا کەمە نەتەوەیەک بە نێوی کوردەوە نییە. لەسەردەمی ئیمپراتۆریێتی عوسمانییدا، لەو شوێنانەی کە بێگانەکان بە کوردستان و ئەرمەنستان نێویان دەبرد، تورکی دواکەوتوو دەژیان، ئەمانە لە تێکەڵەیەکی ووشەی فارسی و عارەبی زمانێکی دیکەیان لە زمانە تورکییە رەسەنەکەیان دروست کردووە، زمانێک کە ئاوازەیەکی زۆر سەیر و عەنتیکەی هەیە و نێوی کوردییان لێ ناوە).

پاش دووهەم جەنگی جیهانی، تورکیا سیاسەتی رەگەزپەرستانەی دژ بەکوردی درێژە پێ دا. ئیمپریالیزمی ئەمریکیش بووە چێترین هاوبەشی. ئەورۆکەش لە رێگەی ناتۆو سەنتۆ و ئەوروپا و بازاڕی ئەورووپای هاوبەش و گەلێ داو و دەزگای دییەوە بە رۆژئاواوە جووت باقە کراوە.

لە ١٩٥٣دا (جەلال بایەر)ی سەرکۆماری ئەو کاتەی تورکیا سەردانێکی ئەمریکای کرد. لە گوتەیەکی دا رایگەیاند کە (لەتورکیادا چیدی کەمە نەتەوەیی نەماون). لە هاوینی هەمان ساڵدا لە رۆژنامەی (صوت الاهالي)ی ئۆرگانی (الحزب الوطني الديمقراطي) عێراقدا، بە گوتارێک لە ژێر سەردێڕی (سياسة تتريك الاكراد في تركيا) بەرپەرچی ئەو ووڕێنانەم دایەوە. ئەو کاتە عێراق لەگەڵ تورکیادا لە پەیمانی بەغدا (سەنتۆ)ی ئەورۆدا بوو. باڵوێزخانەی تورکیا لە بەغدا شکاتی لەو رۆژنامەیە کرد. حیزبی وەتەنی بە ٦ هەزار دینار جەریمە کرا.

سەرنگون بوونی رژێمی پاشایەتی عێراق بارێکی لەبارتری بۆ کوردەکانی عێراق رەخساند، ئەمەش وورە و تین و تاوێکی بەبەر کوردەکانی تورکیا دا هێنایەوە. ١٩٥٩ رژێمی تورکیا بە رێبەرایەتی (حیزبی عەدالەت) کە ئەو کاتە (حیزبی دیمۆکراتی) عەدنان مەندەریس بوو ٤٩ کوردیان زیندانی کرد. تاوانیان (جموجۆڵی کوردانە) بوو، یانی بڵاوکردنەوەی چەند نامیلکەیەکی کوردیی(١٣٧). کە لە راستییدا بڵاوکردنەوەی تاقە کتێبێک بوو بە زمانی کوردیی. دیارە ئێستاش ئەم (تاوانە!) بەشی هێندە دەکات خەڵکی لەسەر بگیرێت(١٣٨).

هەر هەمان رژێمی مەندەریس بوو کە دەیویست لە حاڵەتی (شاڵاوێکی شوورەوییی)دا هەموو کوردستان بە بۆمبایەکی ئەتۆم بە ئاسماندا بەرێت(١٣٩). بە هۆی کودەتای ١٤ی

تەموزی ۱۹۵۸ی قاسمەوە ئەم پلانە ئاشکرا بوو[١٤٠].

لە ئەنجامی ئینقیلابەکەی ۲۷ی مایسی ۱۹٦۰ی (جەمال گیورسێل) بەسەر رژێمی مەندەریس دا، چاوەڕوان دەکرا رژێمی نوێ سیاسەتێکی دی لەگەڵ کورد دا پێش بگرێت. لە وەرامی پرسیارێکی پەیامنێری رۆژنامەی (The Times) ی لەندەنی‌یدا، کە پرسیبووی ئاخۆ رژێمی نوێ دان بە مسافەکانی گەلی کورد دا دەنێت یان نا؟ گیورسێل گوتبووی: (دەڵێی مێژووت نەخوێندووە! لە تورکیادا شتێکی لە بابەتی کورد و کوردەواری هەر وجوودی نی‌یە)[١٤١].

گیورسێل لە کۆتایی ئۆکتۆبەری ۱۹٦۰دا لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری شاری (دیار بەکر)ی کورد دا هەمان دەهۆڵی کوتابووەوە: (نەتەوەیەک نی‌یە نێوی "نەتەوەی کورد" بێت، ئێوە گشتتان تورکن)[١٤٢].

لە ٦ی نۆڤەمبەری ۱۹٦۰دا رۆژنامەی (Yeni Istsnbul) دەنووسێت کە پێنج صەد کەس بە تاوانی (جموجۆڵی کۆنەپەرستانە) دەستگیر کراون.

وەک رۆژنامەکە خۆی باشتر ئاشکرای دەکات ئەو (جموجۆڵە کۆنەپەرستانە)یە بڵاوکردنەوەی (ئەلف و بێ‌یەکی کوردی‌ی) بووە!!!

لە ٤/١/١٩٦١دا زۆر کورد درانە دادگا. تاوانی ئەوەیان دابوونە پاڵ کە گوایە ویستوویانە (دەوڵەتێکی کوردی‌ی) دابمەزرێنن[١٤٣].

وەک بەرپەرچ دانەوەیەک و بەرهەڵستی‌یەکی ئەو بێ دادی‌یە، لە ۸ی ئازاری ۹٦۱دا لە زۆبەی شارە کوردەکانی وەکو دیاربەکر و ماردین و وان و بەتلیس و سیڤەرێک و... هەندێ شارۆچکەی دیدا خۆپیشاندان دەستی پێ کرد. جەماوەری خۆپیشاندەر ئەم دروشمانەیان بەرز کردبۆوە: "ئێمە تورک نین، کوردین". "بروخێ دەستەڵاتدارە خۆسەپێنەکان". لەتەقە و پێک داندا لەگەڵ هێزێکی سوپایی دا لە شاری دیاربەکر ۱٤۹ کورد کوژران و ٤۰۰ یش زامدار بوون.

لە ماردین ۱۲۱ کورد کوژران و ۳٤۵ زامدار کران. جگە لەوە لە ۱۳ی مایسی ۱۹٦۱دا ۱٤۰ کورد گیران. هەروەها لە ۱۹٦۳ دا ۲۳ روناکبیری کورد بە تاوانی (جموجۆڵی کوردانە) بەندکران و پاشان ئازاد کران.

لە ۱ی مایسی ۱۹٦۳دا دوو خوێندکاری کوردی زانستگەی ئەستەموڵ (یاساکایا) و

(مەدەت سەرحان) بە تاوانی پڕوپاگەندەی کوردایەتی و دەرکردنی گۆڤارێک بەزمانی توركی و كوردی گیران و درانە دادگا[١٤٤].

گیورسێل لە گوتەیەکی دا کە لە ١٩٦٣ لەشاری دیاربەکر دەیدا کینە و داخی دڵی پێ ناشاردرێتەوە، دەڵێت (تف بکەرە چارەی ئەو کەسەی کە پێت دەڵێت تۆ کوردیت)[١٤٥].
(حیفزی ئوغوز بەکاتا)ی وەزیری نێوخۆی لە ١٩٦٣/٦/٢٨دا دەڵێت:
(کوردەکانیش وەکو تورکمان و ئۆزبەگەکان، لەرەچەڵەکی تورکن)[١٤٦].

ئاشكرا و ئاسایی‌یە کە رۆژنامە تورکی‌یەکانیش لەپاڵ رژێمدا بکەونە درۆ و بوختان هەڵڕشتن. ئەو رۆژنامانە هەموو چالاکی‌یەکی کوردانەیان بە (جموجۆڵی کۆمۆنیستی) یا (خەتەر) بۆ سەر (یەکێتی نیشتمان) لەقەڵەم دەدا[١٤٧].

هەتا فەرمانبەرانی رژێمیش کینە و رق و دوژمنایەتی‌یان بەرامبەر کورد ناشارنەوە. لە ١٩٦٦/١١/٢١دا ژەنەراڵ تۆراڵ نامیلکەیەکی سی و شەش لاپەڕەیی دژی کورد و کۆمەڵە جوداوازەکانی تورکیای وەکو: سۆسیالیستەکان، شیعە موسڵمانەکان، نوورسی‌یەکان... تاد بلاوکردەوە. لەو نامیلکەیەدا بێ پەردە هێرش دەباتە سەر کورد، (یانی کورد وەکو نەتەوەیەک)[١٤٨].

لە ١٩٦٧/١/٢٥دا حوکومەتی جەودەت سۆنای یاسایەکی دەرکرد، بە پێی ئەو یاسایە بەرەسمی‌ی زمانی کوردی‌ی قەدەغەکرا. لەو ساتەوە هەموو کتێب، رۆژنامە، بەڵگەنامە، قەوان و شریتەکان بە کوردی قەدەغەن[١٤٩].

ئەمە ئەوپەڕی گەوجێتی و شێتێتی‌یەو تەنها لەرژێمانی فاشیستی لەو بابەتە چاوەڕوان دەکرێت. ئێمە پیرۆزبایی لە وولاتانی (ئازاد!) و (دیموکراسی!!) دونیای رۆژئاوا دەکەین بۆخۆیان و شەریکی (ناتۆ)یان !!!

جگەلەوە ئەم یاسایە لەگەڵ یاسا بنچی‌یەکانی ١٩٦٠/٥/٢٧[١٥٠]ی تورکیا کە لە لایەن دەستەڵاتدارانی ئەو دەمەوە دارێژراوە، دژ دەوەستێتەوە.

تا باشتر روون بێتەوە پێویستە ئەوەش بزانرێت کە ٨٥٪ ی دانیشتوانی رۆژهەڵاتی تورکیا تاقە ووشەیەکی تورکی تێ ناگەن، زمانیان کوردی‌یە، وەکو یەکێک لە رۆژنامە دەمارگیرەکانی تورکیا خۆی دانی پێدا دەنێت[١٥١].

بەو جۆرە کوردەکانی تورکیا ناچارن بە پەنهانی بەزمانی زکماکی خۆیان بئاخڤن[١٥٢].

لە ساڵی ١٩٦٦دا کاتێک شاری (ڤارتۆ)ی کورد بە بوومەلەرزەیەک کاول بوو، وەزیری نێو خۆی تورکیا (خالدون مەنتەشی ئۆغلۆ) سەردانێکی شارەکەی کرد. کە گوێی لێ دەبێت هەندێک لەوانەی ساغ دەرچوون بە کوردی دەدوێن، زۆر تووڕە دەبێت و دەڵێت: (لە دەمی هەندەک گیان لەبەری مرۆڤ ئاسایی‌یەوە دەنگی ئاژەڵ دەبیەم). درێژەی پێ دەدات و دەڵێت: (ئەگەر ئەم دەوڵەتەتان بەدڵ نی‌یە بگەڕێن یەکێکی دی بۆ خۆتان پەیدا کەن).

١٩٦٧ سەرەک کۆماری تورکیا ژەنەراڵ جەودەت سۆنای دەڵێت: (هەموو ئەوانەی لە خاکی تورکیادا دەژین، تورکن... لە حاڵەتێکدا گەر کەسانێک لە نێوماندا هەبن کەتورک نەبن، با بارکەن بڕۆن)[١٥٣].

بەپێی ئەم فەرمایشتانەی سۆنای ئەوانەی پێویستە "بارکەن بڕۆن" تەنها کوردەکان نیین!

لە فێبریوەری ١٩٦٧دا سۆنای گەلەک هەوڵی لەگەڵ عارفی دووهەمی سەرکۆماری عێراق دا کەدان بە هیچ مافێکی نەتەوایەتی کورد دا نەنێت[١٥٤].

خەتەرناکترین و ترسناکترین بەرهەڵستێک کە ڕووبەڕووی کوردەکانی تورکیا دەبێتەوە، کۆڕو کۆمەڵە ڕاست ڕەوە ڕادیکالەکانی تورکن. یەکێک لەوانە (پارتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی)یە (Milletçi hareket Partisi)، کە سەرکردەکەیان (Alpaslan Türkefi)ە. ئەم حیزبە میلیشیایەکی ٥٠٠٠ نەفەری لە جۆری چەکدارەکانی (ss)ی هێتلەری‌یە نازی‌یەکان هەیە[١٥٥].

یەکێک لە هەڤاڵەکانی (Türkefi) کەنێوی (Atsiz)ە لە ١٩٦٧[١٥٦]دا هەڕەشە لە کوردەکان دەکات، کە بە "سوور" یان دەزانێت:

(گەر ئێوەی کورد چیدی بەو زمانە سەرەتایی‌یەتان بئاخڤن، تورکەکان بەدەردی جۆرجی و ئەرمەنی و یۆنانی‌یەکانتان دەبەن و تا ڕەچەڵەکتان لە خوێندا شەلاڵ دەکەن). (Atsiz) گەواهی ئەوە دەدات کە کورد لە (پارێزگاکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا)دا زۆربە پێک دەهێنن. بەلام دەڵێت:

(گەر ئێوە ١٠٠٪ی دانیشتوانیش پێک بهێنن دەبێت بارکەن بڕۆن) تا (لەخوێندا شەلاڵ نەکراون)، لە حاڵەتی ناچاریدا (دەتوانن داوا لە نەتەوە یەک گرتووەکان بکەن وولاتێکتان لە ئەفریقیا پێ بدات)، دەنا (ڕەگەزی تورکی دان بە خۆدا گرتوو دەبێتە نەڕە

شێـر و کـەس خـۆی لەبەردا پێ راناگـیرێت). (Atsiz) پێی وایە کە کـورد دەبێت (لە مـێژووی ئەرمەن پەند و عـیبرەت وەرگـرن). لە هەمـان گـوتاردا دەڵێت: (بۆیە جوولەکە ترسنۆکەکـان توانییان لەشەڕی فـەلەسـتیندا عـارەب بشکێنن، چونکە عـارەبەکـان پاش یەکەم جەنگی جیهانی لە ئیمپراتۆرێتی تورک جودابوونەوە).

لە گـوتارێکی دی هەمـان ژمـارەدا، (M. Resed) بێ پەردە بانگی تۆرانێـتی نوێ (پان تـورکـیـزم) هەڵدەدات. بە پێی بۆچوونی ئەو، ئەو نێـوچانەی (٧٠ ملیـۆن تورکی لەشوورەوی و چین و ئێران و ئەفغانستان لێ دەژین) دەبێ و پێویـستە (لەو وولاتانە جودا بنەوە).

جگەلەوە (Atsiz) هەمـیـشـە لە هەوڵی ئەوەدا بوو (کـەمـایەتی تورک) لە کـوردسـتـانی عێراق دا، دژی برا کوردەکانیان دنە بدات. بە باوەڕی ئەو ئەو کەمایەتییەی لە شاری پڕ نەوتی کەرکوکی کورد دان، دەبێت چاو لەو کەمایەتییە تورکەی (قبرص) بکەن و هەمان رۆڵ ببینن. داوا لە تورکیـاش دەکـات کە هێرشێکی سوپایی بەرێتە سەر کوردسـتـانی عێراق(*).

تێـڕوانینی شۆڤێنیانەی تورک هێندە کوێرانەیە، کەبێ پەروا لە هەڵپەی ئەوەدان هەتا مێژوو و واقیـعی بوون و ژیانی کـورد بەدرۆ بخەنەوە. کاتێـک «کۆمەڵەی مـاف ناسانی جیهـان" لە ساڵی ١٩٦٧دا لە نۆرگانەکەیدا: تورکیای تاوانبار کردبوو، چەوساندنەوەی "کـەمـەنەتەوەیی کورد"ی لە تورکـیـادا بە هەڵوێستێکی ناجۆر و ناهەمـوار دەست نیـشـان کـردبوو. مـاف ناسی تورک (Necdet Kurdakul) بەگـوتارێک لە رۆژنامـەی (Dünya)ی تورکیدا وەرامی دابۆ وە[١٥٧]. (Kurdakul) زۆر سادە و ئاسان دەڵێت:

(کورد تورکن و تورکی ڕەسەنیشن، ئەمە راستییەکی مێژووییە). لەسەری دەڕوات و دەڵێت: (ئەوانەی ئەم گـوتارەیان لە بارەی کـوردەوە نووسـیـوە ئەسـڵـەن سەریان لە مـاف ناسی دەرناچێت، چونکە کورد "تورکی ڕەسەنن").

مەخابن (Kurdakul)ی ماف ناسی زۆر چاک! پێی نەگوتوین هۆی چییە وا لە تورکیادا ئەو "تورکە ڕەسەن"انە تۆو بڕ دەکەن!!

---

(*) بڕوانە (Ötüken) ژ.١٩، ١٦ی تەمـووزی ١٩٦٥. هەروەها بڕوانە گـۆڤـاری (Komünzimle Savafi)ی تورکی، ئەزمیر ١٩٦٥/٨/١.

ئا ئەمەیە واقیعی (دیموکراسیّتی تورکی‌ی). لەگەڵ ئەوەشدا دیاری (٢٠٠ ملیۆن مارک)ی ئاڵەمانی پێ دەبەخشرێت، تا چەکی پێ بکرێت. لێرەدا تەنها بەڵگەنامەکان دەدوێن، بێ هیچ رتووش و دەستکاری‌یەک.

دەبێت ئەوەش بگوترێت کە تەنها ئاڵەمانیای رۆژئاوا نی‌یە کە کۆمەک بە تورکیا دەکات. خاوەن مەقام مەکنامارای وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە کۆبوونەوەی ٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٧ی ناتۆدا پشتگیری داواکاری دەکرد بۆ پڕ چەک کردنی سوپای تورکی بە (چەکی ئەتۆم)(١٥٨).

دواکات کوردەکانی تورکیا دەستیان کردە خۆ رێک خستن و کارکردن لە پێناوی مەسەلەکەیاندا. هەر چەندە هەروا ئاسان نی‌یە پارت و کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی‌یەکانی کورد لە تورکیادا بە تەواوی دەستنیشان بکرێن، چونکە هەموویان بە نهێنی کاردەکەن و دەبزوێن. هێندەی من بزانم پارتێکی دیمۆکراتی کوردستان هەیە کە وێنەیەکی لەبەرگیراوەی پارتەکەی عێراقە. لە ١٩٦٨/١/٣٠دا چوار کورد لە دیاربەکر گیران و بە دامەزراندنی پارتێک بە نێوی "پارتی دیمۆکراتی کوردستان"ەوە تاوانبار کران(١٥٩).

لە ١٩٦٨دا هەندێ کوردی کوردستانی تورکیا لە ئەوروپا (کۆمەڵا تێکۆشەرێن کوردستان)یان دامەزراند. کاتێک هەندێ لە ئەندامانی گەڕانەوە، بییر و ئیدیۆلۆژی‌ی پارتەکەیان بردەوە وولات. لە ١٩٦٩ وە لقی ئەوروپایان بەزمانە ئەوروپایی‌یەکان بەیاننامە بە نێوی (باهۆز)ەوە دەردەکەن. ئامانجیان لە پێڕەوی نێو خۆی پارتەکەیاندا بەدەردەکەوێت کە ئەمانەن:

پتەوکردنی پێوەندی‌ی لە نێوان کوردەکانی هەندەران و وولات دا. برەو پێدانی کولتوری کوردی. ناساندنی مەسەلەی کورد بە بلاوکراوە جیهانی‌یەکان. پشتیوانی کردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلانی دی.

گۆش کردنی ئەندامان بە بیری پێشکەوتوانە و شۆڕشگێڕانە. پشتگیری کردنی شۆڕشی کورد لەهەموو پارچەکانی دی کوردستاندا و لە کاتی پێویستیشدا بە بەشداربوونی راستەوخۆ لەو شۆڕشانەدا(١٦٠).

شایانی باسە کوردەکانی تورکیا لەگەڵ ئەو باری چەوساندنەوە و تۆقاندنەدا توانای خۆیان بە ئیسپات گەیاندووە و چالاکی رۆشنبیری‌یان هەبووە. ١٩٦٢ لە ئەستەموڵ گۆڤارێک بە نێوی (دیجلە و فورات)ەوە بلاو دەکرایەوە. ١٩٦٣ گۆڤارێکی کوردی بە

نێـوی (دەنگ)ەوە بڵاودەکـرایەوە. ١٩٦٦ گـۆڤـارێک بەتورکی بە نێـوی "Yeni Akifi" (شەپۆلی تازە)وە بڵاودەکرایەوە، کە هەندێ شتی کوردی‌یشی تێدا چاپ دەکرا. هەموو ئەم بڵاوکراوانە پاش دەرچوونی ژمارەیەک یان دوان ئیدی قەدەغە کراون.

نووسەری کورد (موسا عەنتەر) لەسەر ئەو چیرۆکەی بەنێوی (برینا رەش)ەوە بە کوردی و تورکی بڵاوی کردەوە، چەند جارێک راپێچی بەردەم دادگا کرا.

کـۆمـەڵناسی کـورد (ئەمین بۆز ئەرسـەلان) بە سێ مـانگ بەندی سـزا درا، چونکە کتێبێکی ئەلف و بێ‌ی بەزمانی کوردی‌ی نووسیبوو[١٦١].

پاش ڕێکەوتنەکـەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی نێـوان کـورد و عـیـراق، تورکـیـا مـامـەڵەی نامرۆڤانەی دژی کورد بەتین تر کرد. هەر لەو کاتانەدا چەندین خوێندکاری کورد بەدەستی تورکە تیرۆریستەکان تیرۆر کران[١٦٢](×).

رژێمی تورکیا سێزدەهەمین کۆنگرەی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا) کە لە ئابی ١٩٦٩ دا گیرا، کردی‌یە بیانوو بۆ لێدانی شووتی خەتەر دژی کورد[١٦٣].

ئەو سـەرکەوتنە عـەسکەری‌یانەی کـوردی عێراق لە جەنگەکانی دژی رژێمی بەغدا دا بەدەسـتـیـان هێنا ، تورکـیـای خسـتـە دڵە ڕاوکـەوە و ناچاری هاوکـاری کردنی ووڵاتەکـانی بەرەی رۆژهەڵات و عـێراقی کـرد، تا پێکڕا دژی شـۆڕشی کـورد بکەونە خۆ. ئەوە بوو ئەو فڕۆکانەی لە ئاڵەمـانیـای رۆژهەڵاتەوە بۆمبـای ناپاڵمیـان بۆ بەغـدا دەگـواستەوە، ڕێگەی نیـشـتنەوەیان لە تورکـیـادا پێ درا، ڕێگە دەدران لە تورکـیـا پڕ بەنزین کـرێن و بەسـەر فڕۆکەخانەکانی ناتۆدا بفڕن[١٦٤]!

لە پاش ١١ی ئازاری ١٩٧٠وە هێزەکانی کۆماندۆی تورکیا بەربوونە گیانی جوتکارانی کـورد. بۆ نمونە لە ٧و٨ی ئاوریلی ١٩٧٠دا دوو هەزار سەربازی تورک بە پشـتـیـوانیی ٦ هەلیکۆپتەر پەلاماری شارۆچکەی (سیلڤان)ی سەر بە پارێزگای دیاربەکریان دا. لە پێش چاوی پیـاوە دەسـتـگیرکـراوەکـان دا بە زۆر سـواری ژنەکـانیـان بوون. ئەوجا دانیـشـتـوانی شارەکەیان ناچار کرد لەسەر زەوی راکشێن و سەربازەکان لەسەر ئەو (فەرشە گیاندارانە!) سەمای فۆلکلۆری تورکی‌یان ساز کرد. هەشت کورد گیانیان لەدەست دا[١٦٥]. کەیفی لەو بابەتەیان لە نێـوچە کوردی‌یەکانی دی وەکو (دێریک، میدیات، بیـسـمیل و باتمان)یشدا

---

(×) (دیارە بەپێ‌ی مێژووی ئەم سەرچاوەیە بێت، ئەو ڕووداوانە پێش ڕێکەوتنەکەی ئازارن).

کرد[١٦٦].

له ١٠/٢/١٩٧٠دا خوێندکاری کورد (حسەین ئەرسەلان تاش) لەلایەن تورکە ڕاست ڕەوە ڕادیکالەکانەوە لە شەقامێکی گشتیی‌یدا بەر گوللە درا. پۆلیس سووربوون لەسەر ئەوەی کە گوایە کوژەریان پێ نادۆزرێتەوە[١٦٧].

ڕژێمی تورکیا گەرەکێتی بەو شێوە و شێوازانە بزووتنەوەی کوردایەتی لە لانکەدا بتاسێنێت، یاخود هەر پەرەی ستاند سەرکوتی کات. تورکیا ڕێگەی ئەوە نادات و پێی قەبوڵ ناکرێت بارێکی وەکی کوردستانی خواروو بێتە کایەوە.

لەم دواییانەدا ڕژێمی دیمیریل پێوەندی‌یەکی پتەوی لەگەڵ عێراقدا بەستووە. (البکر)ی سەرکۆماری عێراق لە ٢٠ی تەموزی ١٩٧٠دا لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامە نووساندا بەشان و باڵی ئەو پێوەندی‌یە چاکانەیدا هەڵدەدا[١٦٨]. ئەو پێوەندی‌یە چاکانە! ڕێ لەوە ناگرێت کە تورکیا دنەی کەمە نەتەوەیی تورک لە عێراقدا دژی کورد بدات، وەک ڕۆژنامەی (Handelsblatt)[١٦٩]. نووسیبووی: "مەسەلەی ئەم کەمە نەتەوەییانە، لەم دواییانەدا بۆتە بابەتێکی زۆر پڕ تام و چێژ بۆ ڕۆژنامەکانی تورکیا". ڕۆژنامەی (Yeni Gezet)ی تورکی‌ی لە ڕۆژی ١٦ی سێبتەمبەری ١٩٦٨دا عێراق وئێرانی بەوە تاوانبار کردبوو، کە گوایە بە نیازن کەمە نەتەوەیی تورک لەو وولاتانەدا "قڕ بکەن" هەمان ڕۆژنامە نووسیبووی تەنها لە ئێران دا یازدە ملیۆن تورک دەژین!

دەبێت ئەوەش بزانین کە دەست ولایەنی تایبەتی لە خودی ڕژێمی بەغدا دا هەن، بە یارمەتی تورکیا ئەو کەمە نەتەوەیی‌یە تورکە دژی کورد هەڵدەسوڕێنن[١٧٠]. بەهەر حاڵ هاوکاری تورکیا و عێراق هێشتا نەگەیشتۆتە ئەوەی ترس لە کارێکی هاوبەشی هەردوولایان پەیدا بکرێت. جگە لەوە کەمە نەتەوەیی تورک بە تەجرەبە ئەوەیان بۆ سەلماوە کە تەنها بە هاریکاری و کۆمەکی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد دەگەنە ئامانجەکانی خۆیان.

سەرەڕای ئەوانە تورکیا خۆی تەنگ وچەڵەمەی کەمی نی‌یە، ئاژاوەیەکی هێند پەرەسەندوو لەنێو سوپادا هەیە[١٧١]. کە بە فاشیستە کەللەپووت و سەرە ڕۆ ئینقیلابچی‌یەکانیش چارە ناکرێت. هەمان کات بێ کاری‌ی لە برەودایە و خەڵکێکی زۆر بەدەست برسێتی‌یەوە دەناڵێنن. بەو پێیە ناڕازی خەڵکی ڕۆژ بە ڕۆژ لەزیادی دایە. چینی کرێکارانی تورکیا ڕاپەڕیون و دژی تاڵان کەرانیان تێدەکۆشن. یاخی بوونی خوێندکارە

چەپی‌یەکان لە پەرە ستاندن دایە. وا پێدەچێت تورکیا لەسەر زێواری جەنگێکی نێوخۆیی وێستا بیت وەک گۆڤاری (Der Spiegel) بۆی چووە.[١٧٢].

دیکتاتۆرێتی عەسکەریش هێندەی لە تواناداية تا رادەیەک و بۆ ماوەیەکی کاتی چەڵەمە ئاڵۆزە تێکچڕژاوەکان خەفە و سەرکپ کات. بەپێی یاسا سروشتی‌یەکەش تەقینەوەی بەدوو دا دێت. نەتەوەی کوردیش چیدی بێ دەنگ دانانیشێت و بۆ هەتا هەتایە رازی نابێت وەک مرۆڤی دەرەجە دوو یا هەتا دەرەجە سێ بژی[١٧٣]. ناتوانن چیدی دان بە خۆدا بگرن، کاتێک دەبینن نێوچەکەیان بە ئارەزوو و بە پێی سیاسەتێکی نەخشە بۆ کێشراو لە هەموو بارێکی کولتوری و ئابووری و تەندروستی‌یەوە پشت گوێ دەخرێت[١٧٤]. تەنها ٥,٦ ٪ کارگەکانی تورکیا دەکەونە نێوچە کوردی‌یەکانەوە کە ٢١ ٪ی سەرپاکی دانیشتوان پێک دێنن[١٧٥]. کوردەکان نایانەوێت چیدی بەدەست برسێتی‌یەوە بناڵێنن[١٧٦]. برسێتی‌یەک کەرژێمی تورکیا بە ئارەزوو دەستی ئانقەست دەیسەپێنێت تا کوردەکان ناچار بن نیشتمانەکەیان جێ بهێڵن، برسێتی‌یەک کە رۆژنامە نووسە بێگانەکان باوەڕیان نەدەکرد، تا بە چاوی خۆیان دیتیان[١٧٧]. هەر بەم بۆنەیەوە پێویستە پیاو ئەو هەواڵەش بزانێت کە نوێنەری شاری (قارس) بۆ یەک مانگ لە پەرلەمان بەدەر نرا، چونکە داوای کردبوو ٢٠ ملیۆن لیرەی تورکی‌ی بۆ بوژاندنەوەی رۆژهەلاتی تورکیا تەرخان بکرێت[١٧٨].

شایانی باسە رژێمی تورکیا ئێستاکە خەریکی پیلانی جۆرە سیاسەتێکی "پشتێنی تورکی"یە. بەپێی ئەم سیاسەتە رژێم گەرەکی‌یەتی بە درێژایی سنوورەکانی سوریا و عێراق (یانی لە نێوچە کوردنشینەکاندا) ١٠ کێڵگەی دەوڵەتی دروست بکات، تا بەو بیانووەوە دانیشتوانی راگوێزێت[١٧٩]. ئەمە هەمان پیلانی "پشتێنی عارەبی"ی نێو زڕاوە کە لە سوریا بەگەڕ خراوە[١٨٠].

لە سالانی داهاتوودا گەلەک گۆڕانی لە پڕ لە تورکیادا روو دەدەن. ئەو دژواری‌یە سەرەکی‌یانەی نێو کۆمەڵگای تورکیا لەگەڵ گەلێک هۆکاری دی دا، دەبنە بزوێنەری ئەو گۆڕانکاری‌یانە. زەق ترینیان ئەوەیە کە تورکیا دەوڵەتە بەلام دەوڵەتێکی دەستکردە، نێوی دەوڵەتە بەلام لە راستی‌دا بن بۆشە. بێ هودە هەوڵ دەدرێت ئەو سیستێمە گەندەڵە دادۆشێنەرە رەگەز پەرستە قوتار کرێت. نە ئینقیلابە عەسکەری‌یەکەی ١٢ی ئازاری ١٩٧١ کە بەسەر (دیمێریل)دا کرا و، نە یاسا گۆڕانکاری‌یەکەی ٢٧ی ئازاری

١٩٧١چارەیەكیان پێ دەكرێت[١٨١]. ئینقیلابە عەسكەرییەكانی دیش چییان لەدەست نەهات. ئەو یاسا عەسكەرییەش كە رژێمی فاشیستی توركیا لە ٩٧١/٤/٢٨وە لە نێوچەی رۆژهەلات دا سەپاندویتی چ چارە سەرێک ناكات. گرتنی ژمارەیەكی زۆری كوردیش[١٨٢] بێ سەر ئەنجامە و دادێک نادات.

بەلّی، پۆلیس میلیشیای فاشیستی پارتی رەگەز پەرستی كۆلۆنیل (Türkefi) و هێزە ئیسلامە دەمارگیرەكانی[١٨٣] راگرتووە، ئەوەش دادیان نادات.

پێشنیازی گۆرینی یاسای هەلّبژاردن كراوە، كە تەنها "ئەو كەسانە مافی هەلّبژاردنیان هەبێت كە خوێندەوارن"[١٨٤] ئەمە یانی ٩٠٪ی كورد مافی هەلّبژاردنیان لێ دەستێندرێتەوە. گۆرینی لەو بابەتە نیشانی گەلەكەی دەدات كە رژێمی توركیا تا چ رادەیەک "دێمۆكراسی"یە.

لە لایەكەوە قسەكەری رەسمی‌ی رژێم و وەزیری داد (ئیسماعیل ئارار) لە كۆبوونەوەیەكی (پارتی گەلی كۆماری)یدا یاسای عەسكەری و هەلّپەی رژێم بەوە لێفە پۆش دەكات كە توركیا لەبەردەم خەتەری (كێشەی كورد) دایە و بارزانی‌ی (چاوی تەماعی بریوەتە توركیا) و كوردەكان لە توركیادا (پارتی ئازادی‌ی كورد)یان دامەزراندووە و چەپییە رادیكالەكان لە ژێر دروشمی (نەتەوەكانی توركیا)دا پشتگیرییان لێ دەكەن[١٨٥]. سەرەک وەزیران لە لایەكی دییەوە دەبێژێت (كورد لە توركیادا نی‌یە)[١٨٦]. ئەمە ئەوە نیشان دەدات تا چەندە ئەم دەستەلاّتدارانە راستگۆن و گوتەیان یەكە. كاتێک وەزیری داد لە ١٩٧١/٤/٢٨دا لە رادیۆوە رایدەگەیەنێت كە (ملیۆنەها كورد لە پارێزگاكانی رۆژهەلاّت دا نەخشەی شۆرشێكی چەكدارانەیان كێشاوە)[١٨٧]. بەمە دان بەوەدا دەنێت كە ملیۆنەها كورد لە ژێر زەبری سیاسەتی رەگەزپەرستانەی رژێمی توركیادا دەنالّن.

گومان لەوەدا نی‌یە كە ئەم رژێمە عەسكەرییەی دژ بەكورد و دژ بە (پارتی كرێكارانی توركیا)یە سەرنگون دەبێت[١٨٨].

## خۆر هەلاّتی كوردستان

با ئاورێكی دی پاشەوە بدەینەوە. یەكێک لە دەستەلاّتدارە ناسراوەكانی ئێران لەپاش روخاندنی بنەمالّەی پاشایەتی صەفەوییەكان لە سالّی ١٧٢٩دا، نادر قولی خانی بە

نێوبانگ بوو (یاخود نادر شای ئەفشار ۱٦۸۸-۱۷٤۷). خۆی لە راستیی‌دا موسڵمانی سوننی بوو، بەڵام بەهۆی هەندێ پێشهاتی سیاسی‌یەوە، خزمەتی شیعەگەرێتیی دەکرد. هەرچەندە کورد لە هەموو جەنگەکانیدا کۆمەکی زۆریان پێ کرد، بەڵام ئەو هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی بەرامبەر کورد هەبوو. لەسەردەمی ئەودا کوردستان بوو بووە کەلاوە و خەرابات. هۆنراوەیەک لە زاراوەی گۆران دا هەیە، کە بەنێوی دانیشتوانی کوردستانەوە جوێن بە نادر شا دەدات.

نادر لە ۲۳ی تەموزی ۱۷٤۷دا لە کاتی پەلامارێکی کوردستاندا، لە لایەن کوردەکانی خۆراسانەوە کوژرا. پاش کوشتنی ئەو، سەردارانی خانەوادەی قاجاری فەرمانڕەواییان گرتە دەست(*).

زەبر و زەندی پاشا قاجاری‌یەکان (۱۷۹٤-۱۹۲۱) لەگەڵ کورد دا، لە رادە بەدەربوو. لایەنگرانی سەرکردەی کورد عوبەیدوڵلای نەهری[۱۸۹]. لەگەشەپێدانی هۆشی نەتەوایەتی‌ی کوردەکانی ئێران دا دەورێکی پڕ رەونەقیان دی.

ژەنەراڵ حاجی موستەفا پاشای یامولکی کە ئەفسەرێکی کورد بوو لە هۆردووی عوسمانی‌یدا، ساڵی ۱۹۲۱ سەردانێکی کوردستانی ئێرانی کرد و پێوەندی بە زۆر کەسانی نێودار و ناسراوی کوردەوە کرد. ئەمە بووە هۆی بوژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد لەم نێوچەیەدا.

رەزا خانی پەهلەوی کە سەرتیپی لەشکری قوزاقی ئێرانی بوو، توانی لە ۱۹۲۱دا کودەتایەکی سەرکەوتوانە بەسەر خانەوادەی قاجاری‌یەکاندا رێبەری بکات. ۱۹۲۳ بووە سەرەک وەزیرانی ئێران. لە ۱۳ی دیسەمبەری ۱۹۲٥دا خۆی کردە شای ئێران. بەو جۆرە کۆتایی بەدەستەڵاتدارێتی‌ی خانەوادەی قاجاری هێناو بووە یەکە دیکتاتۆری وڵات.

یەکێک لەزەق ترین سیاسەتەکانی، قەدەغە کردنی جلکی کوردی و زمانی کوردی بوو. گەلەک کوردی بە زۆر ڕاگوێزا. بەمە کوردی لە خۆی ئاڵۆزاند.

نێودارترین سەرداری کوردی ئەم سەردەمە کە دە ساڵی رەبەق دژی رژێمی تاران لە

---

(*) رژێمی پاشایەتی‌ی بنەماڵەی قاجاری بە کۆمەکی (صدیق خان)ی سەرەک هۆزی شوکاک دامەزرا. ئەم پاشانشینە لە ۱۷۹٤دا بە سەرۆکایەتی‌ی ئاغا موحەمەدی قاجاری‌ی دامەزرێنرا و پاش رووخاندنی پاشایەتی زەند (۱۷٥۳-۱۷۹٤) بوو، کە کەریم خانی زەند سەرکردەی بوو. کەریم خان کۆمەکی زۆری بە میرنشینی بابان دژی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی کرد.

خەباتی بێ پسانەوەدا بوو (ئیسماعیل خانی سمکۆ) بوو. سمکۆ (١٨٧٥-١٩٣٠) بزووتنەوەکەی دەوروبەری ١٩٢٢ دەست پێ کرد. سەرکردەیەکی هێند قارەمان و جەنگاوەرێکی هێند لێهاتوو بوو کە ڕەزاخان بەدڵ لێی دەترسا[١٩٠].

گەورەترین خەوشی ئەوە بوو کە سەرەک هۆزێکی تەقلیدی بوو، مەخابن سیاسەتمەدار نەبوو. بەو هۆیەوە گەلەک هەڵەی کردووە. بۆ نموونە هەڵوێستی سیاسی‌یانەی چەوتی بەرامبەر گەلی ئاسووری براماان هەبووە و بەو بۆنەیەوە گەلێک پێکدا پژان لە نێوان هێزەکانی و هێزی ئاسووری‌یەکاندا رووی داوە و قوربانی زۆری لە هەردوولا (کورد و ئاسووری) خواستووە و بۆتە هۆی بە هێز بوونی دوژمنی هاوبەشی هەردوولا. جگە لەوە متمانەیەکی نا بەجێی بە ئەتاتورکی دیکتاتۆری تورکیا دەکرد، بە ئومێدی ئەوەی بتوانێت لە دژی رژێمی ئێران دایدۆشێت، کە هەق وابوو لەو کاتەدا دژی تورکیا خۆی بجەنگێت.

چونکە سمکۆ سەرەک هۆز بوو، زێتر بەلای بەرژەوەندی‌یەکانی خودی خۆیدا دایدەشکاند. نەیتوانی لەگەڵ سەرکردەکانی دیکەی وەکو شێخ مەحمود و سەید تەهای شەمزینی‌یدا پێک بێت. ئەوانیش بەوە رازی نەبوون ئەو بەرێبەر و سەرکردەی خۆیان قبوڵ کەن.

لەگەڵ ئەو مەردایەتی و دلێری و نەبەردی‌یەیدا، تا رادەیەک خاوەن باوەڕێکی پتەو و تەواو نەبوو، بۆیە رژێمی تاران توانی بەفەند و فێڵ بیکوژێت. هەر پاش مردنی لایەنگرانی بڵاوەیان لێ کرد، چونکە باوەڕیان بە پاڵەوانێتی تاکە کەسێک هەبوو، نەک بیر و باوەڕێکی شۆڕشگێڕانە. لە ئەنجامدا رژێمی تاران توانی خۆی بچەسپێنێت و زوڵم و زۆرداری بەسەر کوردا بسەپێنێت. ڕەزاخان توانی ڕاپەڕینی سەرەک هۆزەکانی کورد هێدی هێدی سەرکوت بکات. توانی لە ١٩٣٠دا شۆڕشی جوتیارانی کوردی خۆراسان سەرکوت کات[١٩١].

١٩٣٥ ڕەزاشا بەرەسمی‌ی نێوی (ئێران)ی لە (دەوڵەتی فارس)نا[١٩٢]. لەو کاتانەدا کوردی ئێران کە لە لایەکەوە شۆڕشی کوردەکانی تورکیای ١٩٢٧-١٩٣١ و لەلایەکی دیکەوە پێوەندی‌ی کوردە نیشتمان پەروەرەکانی عێراق کاری تێ کردن، هەوڵی خۆ ڕێکخستنیان دا. ١٩٣٩ بە رێبەری‌ی دوکتۆر عەزیز زەندی پارتێکیان بە نێوی "پارتی ئازادیخوازی کوردستان"ەوە دامەزراند. ئەم پارتە زۆر نەژیا. پرۆگرامێکی چەسپاوی

نەبوو. ئەوەی کردیان دەرکردنی تاقە بەیاننامەیەک بوو کە لە ١٩٤١دا خۆش هاتن لە لەشکری شوورەوی‌ی دەکەن و داوای مافی چارەنووسی کورد لەرووس دەکەن. ١٩٤٢ ئەم پارتە هەڵوەشایەوە.

هەمان ساڵ پاش ئەوەی پارتی (هیوا)ی کوردستانی عێراق لە رێگەی ئەفسەرێکی کوردەوە کە نێوی (میر حاج ئەحمەد) بوو، پێوەندی‌ی بە هەندێ نیشتمان پەروەری کوردستانی ئێرانەوە کرد، لە ١٦ی سێپتەمبەردا (ژێ-کاف) دامەزرێندرا(١٩٣). (ژێ-کاف) پارتێکی نهێنی بوو، ئەندامانی خۆی بە پێ‌ی داب و دەستوورێکی تایبەتی گۆش دەکرد. رۆژنامەیەک کە نێوی (نیشتمان) بوو ئۆرگانی ئەم حیزبە بوو.

دامەزرێنەرانی (ژێ-کاف) کەسانی سادە و رەشۆکی نێو گەل بوون، کە زۆر بە ئەمەک و خۆ بەختکەر بوون، بەڵام ئامانجی خۆیان لە قالبی ئیدیۆلۆژی‌یەکدا دانەڕشتبوو، چونکە خاوەنی قوتابخانەیەکی فیکری نەبوون. لەنێو خۆشیاندا هەمیشە یەک گرتوو نەبوون، هەرچەندە هەموویان لەژێر تاوی هەستی نەتەوایەتی‌یدا پێکەوە لکابوون.

یەکەمین بڕوایان ئەوەبوو: "ئەوەی بەزۆر لەکورد زەوت کراوە، تەنها لەرێگەی زۆر و هێزەوە دەستێندرێتەوە". بەداخەوە نەیانتوانی ئەم باوەڕە لە چوارچێوەیەکی فەلسەفی‌دا دارێژن.

یەکێک لەهەڵە ئیدیۆلۆژی‌یەکانیان ئەوەبوو کە چیدی باوەڕیان بەهێزی لەبن نەهاتووی رەش و رووتی کۆمەڵگە نەمابوو، هەر چەندە خۆشیان لە توێژاڵە رووتە و هەژارەکانەوە سەریان هەڵدابوو و بەردەوام رەخنەیان لەفیۆدال و سەرەک هۆزە تەقلیدی‌یەکان دەگرت.

بۆ خۆناسین و خۆ چەسپاندن لە ١٩٤٤دا نێودارێکی وەکی (قازی محمد)یان کردە ئەندامی خۆیان. قازی (١٨٩٣-١٩٤٧) توانی لەماوەیەکی کەمدا توانا و کەسی‌یەتی خۆی بەگەڕ بخات و ببێتە سەرکردەی حیزبەکە. پاشان حیزبەکەی بە ئارەزووی خۆی و بەویستی کاربەدەستانی ئەو کاتەی شوورەوی‌ی هەڵدەسوڕاند. لە ٢٥ی ئابی ١٩٤١دا لەشکری شوورەوی و ئینگلیز چوونە خاکی ئێرانەوە، بۆ لێفە پۆش کردنی ئەم داگیرکردنە، بەهانەی (پێوەندی‌ی و جموجۆڵی نهێنی بەکرێگیراوانی ئاڵەمان)یان راگەیاند(*) پاش سێ رۆژ لە ٢٨ی ئاب دا بەرهەڵستی‌ی سوپای ئێران خامۆش کرا. لە ٦ی ئەیلول دا رەزاشا ناچاری واز هێنان کرا. (بۆ خوارووی ئەفریقا دوور خرایەوە و لە ١٩٤٤دا لەوێ

(*) "Ploetz, Auszug aus der Geschichte", 26.Auflage, S.1140.

مرد).

له ۱۷ی ئەیلولی ۱۹٤۱دا تاران لەلایەن هێزەکانی شوورەوی و ئینگلیزەوە داگیرکرا. بەرۆگری رەزاشا، محەمەد رەزا پەهلەوی کوری بوو، کە بێ دەستەڵاتانە بەرامبەر رووداوەکان راوەستابوو.

بەو جۆرە بەشێک لە کوردستان و ئازربایجان لەلایەن سوپای شوورەوی‌یەوە داگیر کرا. کۆمەڵەی (ژێ-کاف) بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد توانی ئەم هەلە بقۆزێتەوە و سەرنجی رووسەکان بەلای مەسەلەی کورد دا رابکێشێت. قازی لە ژێر تاو و تینی هەندێ دۆستی رووسی‌یدا بوو، کە چاکەی کوردیان نەدەویست. لەنۆڤەمبەری ۱۹٤٥دا لەسەر خواستی (جەعفەر باقرۆف)ی[194] سەرۆکی ئازربایجانی شوورەوی‌ی نێوی (ژێ-کاف)ی گۆری بە (پارتی دێمۆکراتی کوردستان). هەمان کات سەرکردایەتی‌یەکی نوێی بۆ پارتەکەی هەڵبژارد کە زۆربەیان سەرەک هۆز و مڵکدار و پیاوی ئاینی بوون. بە رەزامەندێتی شوورەوی‌ی لە ۱۹٤٦/۱/۲۲دا قازی محەمەد بانگی کۆماری کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی داری هەڵدا و مەهاباد کرایە پێتەختی.

شایانی باسە کە "کۆماری مەهاباد" هەندەک چارەسەر و گەشە و پێشکەوتنی کولتووری‌ی بەسەر نێوچەکەدا هێنا، وەکو هاندان و پێشخستنی زمانی کوردی بە (بلاوکردنەوەی رۆژنامە و گۆڤار و کردنی زمانی کوردی بە زمانی خوێندن لە فێرگەکاندا). جگە لەوە زەماله بە هەندێ خوێندکاری کورد دراو بۆ شوورەوی‌ی نێردران. بەڵام هیچ باسێک لەگۆڕان کاری‌ی کۆمەڵایەتی لە ئارادا نەبوو. هەر چەندە یەکێک لە ئامانجەکانی پارتی دێمۆکرات بوو.

قازی محەمەد داخوازی‌ی (قوام السلطنه)ی سەرەک وەزیرانی ئێرانی دایە دواوە، کە "کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی دۆست بەتاران"ی دەخستە بەرچاو[195].

قازی نەیدەویست لەپشتی شوورەوی‌یەوە، یان بێ ئاگاداری‌ی ستالین و باقرۆف پێوەندی لەگەڵ کەس ببەستێت. لەسیاسەتدا ناکامڵ و کەم تەجرەبە بوو. پێ‌ی وابوو ستالین هیچ کات پشتی بەرنادات، چونکە گەلەک گفت و بەڵێنی دۆستایەتی و برایەتی پێدا بوو، بەڵام دیکتاتۆرە بەهێزەکەی شوورەوی‌ی بێ باکانە و بێ پەروا پشتی تێ کرد. بە پەنهانی لەگەڵ رژێمی ئێراندا کەوتە گفتو گۆ و بەڵێنی ئەوەی دا، گەر ئێران ئیمتیازی بە دووی نەوت گەرانی ژووررووی ئێرانی پێ بدات، ئەویش لەبەرامبەردا هێزەکانی لە

کوردستان و ئازربایجان دەکێشێتەوە. ئێران ئامادەیی خۆی پیشان دا، بەڵام داوای گەڕانەوەی دەست بەجێی سوپای شوورەوی لەنێوچە داگیر کراوەکانی ئێراندا کرد، تا "گەل" بتوانێت "پەرلەمان"ێک هەڵبژێری و ئەو پەرلەمانەش ئەو پەیمانە مۆر بکات.

ووتوو وێژی تاران لە نێوان (ساد تشیکۆف)ی باڵوێزی شوورەوی و (قوام السلطنە)ی سەرەک وەزیرانی ئێران لە ٥ی ئاوریلی ١٩٤٦دا بەم سەر ئەنجامانە گەیشت:

١- هێزەکانی سوپای سوور لە ٢٤ی ئازارەوە، لەماوەی مانگ و نیوێک دا هەموو خاکی ئێران چۆڵ دەکەن.

٢- پەیمانی دامەزراندنی کۆمپانیایەکی نەوتی رووس و ئێرانی هاوبەش لە ماوەی حەوت مانگ دا (کە لە ٣/٢٤ وە حسێب دەکرێت)، دەدرێتە پازدەهەمین کۆبوونەوەی ئاسایی پەرلەمانی ئێران، تا رازی بوونی خۆی لەسەر دەرببڕێت.

٣- مەسەلەی ئازربایجان وەکو مەسەلەیەکی نێو خۆی ئێران، لەلایەن رژێمی ئێران و دانیشتوانی ئازربایجانەوە، بە ئاشتیانە چارەسەر دەکرێت[١٩٦].

شایانی باسە کە کورد و کێشەکەی بەهیچ جۆرێک باسی لێوە نەکراوە.

سوپای شوورەوی لەنۆڤەمبەری ١٩٤٦دا ئێرانیان جێ هێشت. مانگێک پاشتر سوپای ئێران بەنێوی پاراستنی (هەڵبژاردنی ئازاد)ەوە، بەرەو کوردستان و ئازربایجان جمان. کاربەدەستانی شوورەوی نەسیحەتی قازی محەمەدییان کرد کە متمانە بە رژێمی ئێران بکات. (هاشمۆف)ی کونسولی شوورەوی لە ورمێ قازی محەمەد و بارزانی و ئەوانی دی بە ئاگا هێنایەوە کە نەکەن هیچ پەلامارێکی لەشکری ئێران بدەن[١٩٧]. بەو جۆرە قازی محەمەدیش کە لە سیاسەت دا بێ ئەزموون و کەم تەجرەبە بوو، بەهاتنی لەشکری ئێران رازی بوو. ئەمریکاش پشتگیری لە هێرشی لەشکری ئێران کرد[١٩٨]. یەکێک لەمەرجەکانی دی رژێمی تاران ئەوەبوو کە بارزانی و پێشمەرگەکانی شاری مەهاباد بەجێ بهێڵن. قازی محەمەد فەرمانی بە ئەنجام گەیاندنی ئەو مەرجەشی دا.

لەشکری ئێران لە ١٦ی دیسەمبەری ١٩٤٦دا بێ هیچ بەرهەڵستییەک مەهابادیان گرت و کۆمارەکەیان جوانە مەرگ کرد. کاتێک قازی محەمەد بۆ پێشوازی و خۆش هاتنی لەشکری ئێران چووبووە کەناری شار، وەرامێکی چاوەڕوان نەکراوی دیت، دەست گیریان کرد!!!

له ٣١ی ئازاری ١٩٤٧دا قازی محەمەد و دوو براکەی(×) و چەند کوردێکی دی له مەیدانی (چوارچرا)(*)دا، لەو شوێنەی که قازی‌ی بانگی کۆمارەکەی تێدا هەڵدا، بەدار دا کران. (ستالین)یش (نەوت)ەکەی چنگ نەکەوت.

پاش ئەو ڕووداوانه چەوساندنەوەی کورد دەستی پێ کردەوە. زمانی کوردی که وەکو زمانی فارسی زمانێکی ئێرانی‌یە و زمانی رەسمی‌ی کوردستان بوو، قەدەغەکرایەوە. چاپەمەنی‌ی کوردی یاساغ کران. کتێبە کوردی‌یەکان سوتێنران.

قوتابخانە و فێرگەکان یامۆر کران یا کاول کران. هەموو جموجۆڵێکی کوردانە ڕاگیران. ئەم بێ دادی‌یانە زەبرێکی توندی له برایەتی گەلانی ئێران دا. ئێمە زۆر بەتەنگ برایەتی‌ی نێو گەلانەوە بووین و هەین و هەوڵمان بۆ داوە، بەڵام ئاشکرایە برایەتی‌یانی هاوشانی و چوون یەکی.

هەندێک ئەندامانی پارتی دێمۆکرات بۆ شوورەوی‌ی هەڵهاتن. ئەوانی دی که له ئێران مانەوە هیچ جموجۆڵێکی سیاسی‌یانەیان نەما. ئەو کورد و ئازەری‌یانەی لەشوورەوی‌ی بوونە پەنابەر، لەشاری (باکۆ)ی ئازربایجانی شوورەوی وێزگەیەکیان بۆ دامەزراندن(××). که بەرنامەکانی بەکوردی و ئازەری و فارسی بڵاودەکردەوە. پرۆگرامەکانی یا پێدا هەڵگوتنی رژێمی ستالین بوو، یاخود جوێن دان بوو به رژێمی شا. هەندێ لەو کوردانەی پێشان ئەندامی باڵا دەستی دێمۆکرات بوون و پاشان بوونە پەنابەر، هەڵوێستی هەلپەرستانە و بێ شەرمانەیان نیشان دا. رێکخراوە کوردی‌یەکان لەبەر یەک هەڵوەشان. له هاوینی ١٩٥٣دا وێزگەکەش له ناکاودا پارەی لێ برا.

١٩٥٤ هۆزی جوانڕۆ ڕاپەڕینێکیان دژی رژێمی مەرکەزی بەرپا کرد. لەبەر ئەوەی رێکخراوێکی چوست و چالاک رێبەرایەتی ئەو ڕاپەڕینەی نەدەکرد و هەردوو رژێمی ئێران و عێراقیش له رێگەی پەیمانی سەنتۆوە (که جاران بەغدا بوو) هێزیان یەک خست وپاش ماوەیەک ڕاپەڕینەکەیان سەرکوت کرد.

١٩٥٥ پارتی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران به هەوڵ و تەقەلای زانای کورد (ئەورەحمانی قاسملو) "که خەڵکی نێزیکی وورمێ‌یە و ماوەیەک لەزانستگەی براگ

---

(×) قازی و برایەکی و ئامۆزایەکی لەدار دران، نەک خۆی و دوو برای.

(*) بەنێوی ئەو چوار چرایەوە نراوە که له چوار قوژنەی ئەم مەیدانەدا بوون.

(××) مەبەست وێزگەی "فیرقەی دێمۆکراتی ئازربایجان"ە.

مامۆستای ئابووری بوو" گیانی بەبەردا کرایەوە. رۆژنامەیەکیان بە پەنهانی بەنێوی (کوردستان)ەوە بڵاودەکردەوە و باوەڕ و مەبەستی خۆیان تێدا دەنووسی.

بیری پان عارەبیزمی ناصر وهەڵوێستە سیاسی‌یەکانی بەرامبەر مەسەلەی کورد، توند و تیژ ترین پروپاگەندە و دژایەتی رژێمی ئێرانیان رسکاند. رادیۆی قاهیرە لە تەموزی ١٩٥٨ەوە بە شێوەیەکی بەربڵاو ئەم پروپاگەندانەی بەزمانی کوردی بڵاو دەکردەوە. وەکو بەرپەرچێکی ئەم هەڵوێستە رادیۆی تارانیش لە١ی خوردادی ١٣٣٧ (١٩٥٩)وە بەرنامەی بە کوردی دەست پێ کرد.

رۆژنامەیەکی کوردیش بە نێوی (کوردستان)ەوە لەلایەن رژێمەوە چاپ دەکرا. ئەم رۆژنامەیە هیچ کات لە کوردستانی ئێراندا بڵاونەدەکرایەوە. بە خۆڕایی بۆ هەندێ کوردی ئاوارەی ئەورووپا دەنێر درا. رژێمی تاران دەیویست بەبەڵگەی لەرزۆک وا نیشان بدات کە گوایە کورد ئازادی چاپەمەنی‌یان هەیە.

روخاندنی رژێمی پاشایەتی عێراق لەلایەن (قاسم)ەوە لە ١٤ی تەموزی ٥٨دا بێ تین و تاو و کاریگەری‌ی نەبوو لەسەر کوردی ئێران. پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەولیان دا دەرفەتی رەخساوی ناتەبایی هەردوو رژێمی ئێران و عێراق و هەندێ بەڵێنی سەربەستی کە قاسم بە کوردی عێراقی دابوو، بقۆزنەوە وجموجۆڵێک لە کوردستانی ئێران دا دەست پێ بکەن. لەبەر ئەوەی پارتی دێموکرات یەک بیری سەرتاپاگیر و یەک سەرکردایەتی یەکگرتووی نەبوو، قوربانی زۆریان لەسەر کەوت. سەرکردە و ئەندامە ناسراوەکانیان ناچاری هەڵهاتنی کوردستانی عێراق بوون.

کاتێک لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١دا شۆڕشی کورد لە عێراقدا هەڵگیرسا، گەلەک کوردی ئێران شان بەشانی براکانیان بوونە پێشمەرگە و دژی رژێمی قاسم جەنگان. پاش ئەو ئاژاوەیەی لە ١٩٦٤دا لە قەوارەی پارتدا رووی دا و سەرکردایەتی شۆڕشەکەی لەبەر یەک هەڵوەشاند(١٩٩) هەندێ لەو پێشمەرگانە پاڵیان دایە پاڵ تاقمەکەی تاڵەبانی(٢٠٠) و سەنگەری دوژمنایەتی‌یان لە شۆڕشەکە گرت. جا لەبەر ئەوەی چیدی نەیاندەتوانی لەکوردستانی عێراق بمێننەوە و گەڕانەوەشیان بۆ کوردستانی ئێران بەهۆی شاڵاوی ژەندرمەوە لە تواناندا نەبوو، ئەمە هەلێ چاکی بۆ سیاسەتمەدارانی دوای تراویلکە کەوتوو خەیاڵ باز و ماوی‌یەکان رەخساند کە ئەم پێشمەرگانە بە هاشە و هووشە لە گرێژەنە بەرن و بە بۆچوونی نامۆ و سیاسەتی دۆگما و ووشک تەڵقینیان بدەن.

بەو جـۆرە لەسـاڵی ١٩٦٨دا بزووتنەوەیەکی چەکـدارانەی بێ نەخـشــە و خـۆ بەخـۆ لەکوردسـتـانی ئێران دا دەستی پێ کرد. ئەنجامـەکـەی لەدەست دانی چەندین تێکۆشەری نیـشـتـمـان پەروەر و ئازادیـخـواز بوو کـە بەدەسـتی سـوپا و ژەندرمـەی شا ئەنجن ئەنجن کران(٢٠١). لاشەکانیان لە بازاڕ و مەیدانی شارەکانی کوردستاندا هەڵخران(٢٠٢).

ئەوڕۆکـە گـەلـەک کـوردی ئێـران ئاوارەی هەندەرانن. هێندێک لە عێـراقن و هێندێک لەئەوروپا. چەندێک لەوانەی ئاوارەی ئەورووپان، لە فـێـبـریوەری ١٩٦٥ەوە ڕۆژنـامـەیەک بەنێـوی (کـوردسـتـان)ەوە(٢٠٣) بڵاودەکەنەوە. بەداخـەوە ئەم دەست پێشکەری‌یانە تاکە تاکەن و چالاکی سیاسی‌یانەی کوردی ئێران لەهەندەران چوست و جێی سەرنج نی‌یە.

لەبەیاننـامـەیەکـدا کـە لە ٩٦٩/١٢/١٢دا بڵاوکـراوەتەوە، بانگی دامـەزراندنی ڕێکخراوێک بەنێوی (ڕێکخراوی روناک بیرانی کوردی ئێران لە هەندەران) هەڵدەدات. وا بڕیارە ئەم ڕێکخراوە خۆی بۆ (کـێشـەی کـورد لە ئێـران و دژی شۆڤـێنیـستی فـارس) تەرخان بکات(٢٠٤).

ڕژێمی تاران بایەخێکی کەم بەدانیشتووە کوردەکان دەدات، کوردستانی ئێران لەڕووی خزمەت گوزاری‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانەوە تەواو پشت گوێ خراوە. کاتێک سەرەک وەزیرانی ئێران لە ١٩٥٨دا گەشتێکی بە کوردستاندا کرد، دیتی لەشاری (بیجار) کە صەد هەزار کەسی لێ دەژی‌ی، تەنها تاکە پزیشکێکیان هەیە(٢٠٥). ئەمە بە هۆی نەداری و هەژاری‌ی ئێرانەوە نی‌یە، نەخێر! ئێران یەکێکە لە دەوڵەمەندترین وڵاتەکانی جیهـان. کان و کانزا مـەعـدەنی‌یەکـانی لەرادە بەدەرن. تەنهـا لە سـاڵی ٩٧١و٩٧٢دا بە پێی ڕاگـەیاندنی سەرچاوە ئێرانی‌یەکان سوودی نەوتی ١٣٥٠ ملیۆن دۆلار بووە(٢٠٦).

لەگەڵ ئەو بەرنامەیەشدا کە ڕژێم بەنێوی (سپاه دانش)ەوە بە گەڕی خستووە هێشتا پلەی نەخوێندەواری‌ی زۆر باڵایە. ژمارەی قوتابخانە و فێرگەکان لە کوردستانی ئێران دا، لە هەموو شوێنێکی دی ئێران کەمترن. لە زۆر جێگەی کوردستاندا نەپزیشک ونە دەرمان دەست ناکەون(٢٠٧).

## خۆرئاوای کوردستان

وەک سەرئەنجـامێکی یەکەم جەنگی جیهـانی‌ی، فەرەنسی‌یەکـان ئینتیـدابی سوریا و پشکێکی کـوردسـتـانیان گرتە دەست. کوردەکانی ئەوێ کەمە مافێکی ڕۆشنبیری‌یان پێ بڕا. هەندێ گۆڤاری وەکو (هاوار) و(روناهی) لە دیمەشق بەزمانی کوردی بڵاو دەکرانەوە.

قوتابخانه و فێرگەی کوردی‌ی لەدیمەشق کرانەوە. رادیۆی دیمەشق پرۆگرامی کوردی پەخش دەکرد. ئەم ئازادی‌یە سەرەتایی‌یانە وای لە سەرکردە تەقلیدی‌یەکانی کورد کرد کە متمانەی تەواو بە ئیمپریالیزمی فەرەنسی بکەن. بەو جۆرە کوردەکانی ئەوێ بێ بزووتنەوەیەکی سیاسی خاوەن ئیدیۆلۆژی و بێ رێکخراوێکی جەماوەری مانەوە. کاتێک لە ١٩٤٦دا فەرەنسی‌یەکان بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەک لە مافی کورد، ئەو بەشەی کوردستانیان دایە دەستی عارەبەکان، هیچ خۆ ئامادە کردنێک بۆ بار و دۆخەکە پێش چاو نەگیرابوو. ئیدی لەو کاتەوە چ باسێک لە قوتابخانە و رۆژنامەی کوردی‌ی و رێکخراوی ئاشکرا لە ئارادا نەمان. بە پێچەوانەوە، لەو دەمەوە رژێمە یەک لەدوای یەکەکانی سوریا خەریکی لە نێو بردن و بە عارەب کردنی کوردن. خەتەرناکترین پیلانێک کە رژێمی بەعسی سوریا بۆ لە نێوبردنی کورد دایهێناوە، بە نێوی (پشتێنی عارەبی)یەوە بەگەڕ خراوە. بەپێ‌ی ئەم پیلانە دەیانەوێت دانیشتوانی کوردستان لە ماوەی پێنج ساڵدا ریشە کێش کەن و ناچاریان بکەن نیشتمانەکەیان بە جێ بهێڵن. ئاشکرایە کورد دژی ئەم پیلانە وێستاوەتەوە، هیچ جوتکارێکی کورد ئامادەی ئەوە نی‌یە خاک وماڵەکەی هەروا بە سانایی چۆڵ بکات.

بەو جۆرە رژێمی سوریا لە بەرایی سنووردا، بە قووڵی ١٥کم و بەدرێژی‌ی ٣٧٥کم، سەرجەم ٣٣٢ گوندی بە نێوی (کێڵگەی دەوڵەتی)یەوە بە تۆبزی بە دانیشتوانی چۆڵ کردووە و بەدەری ناون. بەو پێ‌یە جوتکارانی کورد خاکەکەیان لە چنگ دەرهێنراوە و ژیانیان کەوتۆتە غەرغەرەوە(*).

رژێمی بەعسی سوریا بەشێوازێکی دیکەش لە کوردی هەڵپێچاوە، نێزیکەی ١٢٠ هەزار کورد جنسیەی سوری‌یان لێ سەندراوەتەوە. ئەمە پاش سەرژمێری‌یە تایبەتی‌یەکەی ١٩٦٢ دەستی پێ کرد(٢٠٨)، کە ئەنجامەکەی لە ٤/١٠/١٩٦٤دا ئاشکرا کرا. بەو پێ‌یە ئەو کوردانە نە بێگانەن (واتە مافی بێگانەکان نایانگرێتەوە)، نەخەڵکی وڵاتیشن تا مافی

---

(*) بەندەکانی ئەم پیلانە ئەهریمەنانەیە لە رۆژنامەی (المناضل)ی ئۆرگانی پارتی بەعسی سوریادا لە ژمارە ١١،ل ١٢و١٣، نێوەڕاستی دیسەمبەری ١٩٦٦دا دەخوێنیتەوە. هەروەها بڕوانە:

"Tribune de Geneve", 20 und 21.5.1967.

"Le Monde", Paris, 12.12.1967.

"Austreibung der Kurden aus Nordsyrien Grenzgebiet", in:

"Neue Zürcher Zeitung", 24.5.1967. بەدەرنانی کوردەکان لە نێوچە سنووری‌یەکانی ژووروی سوریا

هاونیشتمانی وولاتەکە بیانگریتەوە. کاری دەولەتی بەهیچ کوردێکی سوریا نادرێت گەر بزانرێت خۆی بە کورد دەزانێت. حەوت خوێندکاری کورد لە ٩/٣/ ٩٧٠دا یەکی سالێک بەندییان کێشا، تەنها لەبەر ئەوەی هاواریان کردبوو (بژی برایەتی کورد و عارەب)[٢٠٩].
دەستەلاتدارانی سوریا پێیان وایە کەس بۆی نییە نێوی کورد لە وولاتێکدا ببات کە کوردی تێدا نەبێت! ئەم یاسایە هەتا ئەورۆ دژی کورد پێرەوی لێ دەکرێت.

کاربەدەستانی سوریا بوونی کورد لە وولاتەکەدا بۆ رۆژنامەنووسانی بێگانە بەدرۆ دەخەنەوە[٢١٠]. رۆژنامەی (الحرية) ئۆرگانی (حركة القوميين العرب) کە رێکخراوێکی سۆسیالیستانەیە[٢١١]، رژێمی بۆرژوای سوریا بە پێرەوکردنی سیاسەتێکی رەگەزپەرستانە بەرامبەر بە کورد تاوانبار دەکات. رۆژنامەکە پەردە لەسەر پرۆژەی (پشتێنی عارەبی)ی لادەبات و داوای مافی (کەمە نەتەوەییەک) بۆ کوردی سوریا دەکات. ئەمە تاکە حیزبێکە کە ئەم هەلوێستەی نیشان داوە. ئەمانە هەموو لە پێش چاوی سەراپای جیهاندا روویان داوە، هیچ پارتێکی دی، هیچ دەولەتێک، نقەیان لێ نەهاتووە.

لە ئاوریلی ١٩٦٦دا و لە ٢٥/١٢/١٩٦٦دا دوو وەفدی کورد کە زۆربەیان (جوتیاران) بوون، چوونە دیمەشق بۆ چاوپێکەوتنی سەرەک وەزیران (يوسف زعين)، تا دەربارەی وەزعەکەیان قسەی بۆ بکەن. رۆژانێکی دووروو درێژ چاوەروان بوون، بێ ئەوەی سەرەک وەزیران رێگەی چاوپێکەوتنیان بدات[٢١٢].

پارتی دیموکراتی کوردستانی سوریا[٢١٣] هەلوێستێکی ئۆپۆرتونیستانەی هەیە. چاک دەزانێت گەلی کورد لەسوریادا لەبەر دەم خەتەری لە نێوچووندایە لەگەل ئەوەشدا پێ دزکە دەکات لەوەی دژی دەستەلاتدارییە فاشستەکانی سوریا دەست بەکار بێت. بروو بیانوویان ئەوەیە کە گوایە ئەو بەشەی کوردستان تەختانییەو وەکو کوردستانی عێراق گردۆلکە و شاخی نییە، بۆیە نە بۆ شەری پارتیزانی و نە بۆ هیچ بزووتنەوەیەکی چەکدارانە دەست نادات. شتێکی ئاساییە گەر پیاو ئەو جۆرە بیانووانە لە بۆرژواکان ببیەت. ئەوان خەباتی شۆرشگێرانە تەنها بە گوتەی ئال و والا و پروپاگەندەی پف هەلدراو تێ دەگەن.

## کورد لە شوورەویی

بە پێویستی دەزانین چەند ووشەیەکیش دەربارەی باری کورد لە شوورەوییدا بلێین:

شـوورەوی‌ی بە پێ‌ی پەیمانی (برێست-لیتۆفیسک)ی ١٩١٨/٣/٣ پارچەیەکی گچکەی لە خاکی کوردستان پێ برا. دەبێ ئەوەش بڵێم کە کوردەکان لەسەدەی پێشووەوە، لە ساڵانی (١٨٠٤-١٨٠٥)ەوە پێوەندی‌یان لەگەڵ رووسەکاندا هەبووە. ئەم پێوەندی‌یانە کاریگەری‌یەکی دیار و ئاشکرای بووە(*). کوردەکان لەساڵی ١٨٢٩دا کۆمەکی سوپایی زۆریان بەرووسەکان لە دژی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی کرد(٢١٤). ئەم پێوەندی‌یانە وای لە رووس کرد کە هانی زۆر کورد بدەن بۆ رووسیا رەو بکەن. لە پێش شۆڕشی ١٩١٧دا ژمارەیەکی زۆر کورد لە رووسیا دەژیان، پاش پەیمانی (برێست - لیتۆفیسک) گەلەک کوردی دیکە پەڕیدەی شوورەوی بوون.

کورد لەشوورەوی کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی پێدراویان نی‌یە. لە کۆمارەکانی ئەرمینیا، ئازربایجان، جۆرجیا و تورکستان دەژین. بەڵام مافی رۆشنبیری‌یان هەیە، رۆژنامەیەکی کوردی‌یان هەیە(٢١٥). قوتابخانە و داو و دەزگای کوردی‌یان هەیە، زۆر خوێندکار تا ئێستا توانیویانە لەبەشە جوداکانی زانست دا بخوێنن و سەرکەوتن بەدەست بهێنن(٢١٦). ئومێد دەکەین هەر کاتێک میللەتەکە خواستی، شوورەوی مافی ئۆتۆنۆمی‌یان پێ رەوا ببینێت، کە بێگومان دەبێتە هۆی بەتین کردنی زێتری دۆستایەتی‌ی کورد و شوورەوی‌ی.

جگەلەوە دەمانەوێت تکا لەشوورەوی بکەین، لە پێدانی کۆمەکی ئابووری ونەو بابەتانەدا بەو وولاتانەی کوردستانیان بەسەر دا بەش کراوە، بار و دۆخی ئاڵۆزی کورد پێش چاو بگرن، چونکە زۆربەی زۆری ئەو کۆمەک و دەستگیرۆییانە بەتایبەت لەرووی سوپایی‌یەوە یەکە و راست دژی کورد و بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەکەمان بەکار دەبرێن. لەوەش زێتر دەمانەوێت داوا لەشوورەوی‌ی بکەین زێتر پشتگیری و پشتیوانی‌ی لەشۆڕشگێرانی ئازادیخوازی کورد بکات، نەک لەرژێمانێک کە بۆیاخی سۆسیالیستانەی ساختەیان لە خۆ هەڵسووە، تا مەبەستی خێرخوازانەی شوورەوی‌ی بۆ ویستی شەڕخوازانەی خۆیان دالەنگێنن.

## کورد لە وولاتانی دیدا

بە پێویستی دەزانین شتێکیش دەربارەی کەمە نەتەوەیی کورد لە وولاتانێکدا کەهیچ پارچەیەکی کوردستانیان پێوە نەلکاوە، باس بکەین:

---

(*) بڕوانە مینۆرسکی: "کورد" لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلام دا، ب٢، (E-K) لایدن و لایپزیک، ١٩٢٧، ل ١٢٢٩.

کەمە نەتەوەیی کورد یانی ئەو کوردانەی لە دەرەوەی کوردستان دەژین. بۆ نموونە لە لوبناندا نێزیکەی ١٠٠ هەزار کوردێک دەژین، لەوانە تەنها ٢٠٪ یان جنسیەی لوبنانی‌یان هەیە[٢١٧]. ئەم کوردانە هەندێکیان لەگەڵ سوپاکەی صەلاحەددین و هەندێکی دیکەشیان لەگەڵ ئەرمەنی و ئاسووری‌یەکاندا پێش پەنجا ساڵێک، کاتێک تورکەکان قەتڵ و عامی ئەو نەتەوانەیان دەست دایە، بۆ ئەو نێوچانە رەویان کرد.

بەپێچەوانەی کەمەنەتەوەیی‌یە کۆچ کردووەکانی دی‌یەوە، کوردەکان هێشتا جنسیەی لوبنانی‌یان پێ نەدراوە[٢١٨]. بەهۆی دەمارگیری‌ی ئاینی‌یەوە هەزاران کورد بە چاوی بێگانە مامەڵە دەکرێن. بە هیواین رژێمی لوبنان لە حاڵ و بارەکەیان بگات و جنسیەی لوبنانی بە هەموو کوردی لوبنان بدات. ئێمەی کورد، رێز و تەقدیری خۆمان بۆ دێموکراسێتی و ئازادی‌ی لوبنان دەردەبڕین و دۆستایەتی گەلی لوبنان بە ئاوات دەخوازین.

لە ئیسرائیل نێزیکەی ٦٠ هەزارێک کورد هەن. باپیرانی هەندێ لەوانە لە ١٨٢٠ەوە چوونەتە فەلەستین. زۆری دیشیان لە ١٩٤٩ بەدواوە پاش دامەزراندنی ئیسرائیل، لە کوردستانی عێراق و سوریاوە چوونەتە ئەوێ(*).

لە ئەفغانستانیش چەند هۆز و تیرەیەکی کورد هەن.

## خوارووی کوردستان

دەبێت دەربارەی پەرەسەندنی مەسەلەی کورد لە کوردستانی عێراقدا زۆر بە دوور و درێژی بدوێین. چونکە لەم پارچەیەدا گەورەترین شۆڕشی نەتەوایەتی لە مێژووی کورد دا هەتا ئەوڕۆکە بەردەوامە.

لەخوارووی کوردستاندا سەردار و سەرکردەی کورد (شێخ مەحمود ١٨٨٢-١٩٥٦) سوودی لەدەرفەتی یەکەم جەنگی جیهانی وەرگرت. لەگەڵ نوێنەری هێزی داگیرکەری ئینگلیز مێجەر نوئێل دا لە ئۆکتۆبەری ١٩١٨دا کەوتە ووتو وێژ.

لە٢ی نۆڤەمبەری ١٩١٨دا شێخ مەحمود لەهەڵبژاردنێکی ئازاد دا، لەلایەن کوردەوە بە مەلیکی کوردستان هەڵبژێردرا. هێزی داگیرکەری ئینگلیز دانیان بەو هەڵبژاردنە داناو لە ١ی دیسەمبەری ١٩١٨دا کۆلۆنێل (ئارنۆلد وێلسن)ی سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی

---

(*) بڕوانە لاپەڕە (١٤٤)ی ئەم کتێبە.

ئینگلیز لە عیراقدا بۆ پیرۆزبایی شێخ مەحمود، بە فڕۆکە هاتە سلێمانی.

شێخ مەردێکی قارەمان و دلێر و کراوە بوو، بەڵام لەسیاسەت دا بێ تەجرەبە بوو. لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی‌یدا هەڵەی زۆری کرد. متمانەی زۆری بە ئینگلیز کرد، لە سەروەختێکدا کە نەدەبوو بیکات. دژی ئەو هێزە داگیرکەرە جەنگا، لەسەردەمێکدا کە نەدەبوو بجەنگێت. باوەڕیشی بەدەستەڵاتدارانی تورک دەکرد کە نەدەبوو بیکات. سیاسەتی رەق و ووشک و بێ تاکتیکی ئەم لەگەڵ دەستەڵاتدارانی ئینگلیزدا لەلایەک و هەڵویستی کەللەڕەقانە و لووت بەرزانەی نوێنەرانی ئەو هێزە لە کوردستاندا لەلایەکی دی‌یەوە،[219] بوونە هۆی گەلەک لێک دان و پێکدا پژان لە نێوان کورد و هێزەکانی ئینگلیزدا. بارێکی زۆر ئاڵۆز هاتە پێش. کوردناسێکی نێوداری وەک (مێجەر سۆن) کە دەستەڵاتداری سلێمانی بوو، هێور کردنەوەی بارەکە و خاوکردنەوەی گرژی‌یەکەی لەتوانادا نەبوو. لەگەڵ ئەو هەموو زانیاری‌یە بەنرخانەی لە بارەی کوردولۆژی‌یەوە، لەگەڵ ئەو هەموو خۆماندوو کردنانەی بۆ پەرە پێدان و پێشخستنی زمان و کولتوری کوردی، لەگەڵ ئەوانە هەموویدا هەڵویستی دڕندانە و شێتگیرانەی بەرامبەر خەڵکەکە نیشان دەدا[220]. چونکە لەروویەکی دی‌یەوە نوێنەری ئیمپریالیزم بوو. بۆ نموونە گەر (سۆن) بە شەقامێکدا رەت بایە، دەبایە هەموو کەس رێزیان نیشان بدایە و بەرزە پێ لەبەری هەڵسانایە. دەنا خراپ جەریمەی دەکردن. (ئەمە جۆرێک بووە لە بیر و رەفتاری شیزۆفرینیانە کەلە کەسێکی وادا بەدەرکەوتووە).

لەو شەڕانەدا کوردەکان زۆر قارەمانانە جەنگان. هێزەکانی ئینگلیز بە زیانێکی زۆرەوە ناچاری پاشەکشە بوون[221].

لە ٢١ی مایسی ١٩١٩دا شێخ مەحمود شاری سلێمانی گرت و ئینگلیزەکانی بەدەرنا. کاتێک ئینگلیز دیتیان بەشەڕ چارەی کوردیان پێ ناکرێت، فیوداڵێکی کوردیان[×] بە پارە کڕی و بەهۆی خیانەتی ئەوەوە پاش چوار رۆژ جەنگ توانی‌یان لە ١٩١٩/٦/٢٢دا دەربەندی بازیان (کە لە نێوان کەرکوک و سلێمانی دایە) بگرن و شێخ بە زامداری دەستگیر بکەن و بەدیلی‌ی بۆ بەغدای بەرن. لە ٢٥ی تەموزی ١٩١٩دا شێخ درایە دادگایەکی عەسکەری ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌ی. شێخ لەکاتی موحاکەمەدا بە دەنگێکی زوڵاڵ دووبارەی کردەوە کە چ تاوانێکی نەکردووە و تەنها بۆ مافی چارەنووسی نەتەوەکەی تێکۆشاوە. ئەوەش مافێکە کە بەندی دوازدەهەمی ١٤ خاڵەکەی سەرەک وێلسن[222]،

---

(×) نێوی موشیری حەمەی سلێمان بوو.

روون کردنەوەکەی کلیمنسۆی سەرەکی فەرەنسی(٢٢٣)، بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان سەرجەم ئاشکرا و روون دانیان پێدا ناوە. شێخ زێتر پارێزگاری لە خۆی دەکات و دەڵێت: تاوانکار خودی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌یە کە گەرەکی‌یەتی لەڕێگەی هێز و زۆرەوە خاکی بێگانان داگیر کات(٢٢٤). کاتێک ئەو دادگا بێگانەیە فەرمانی خنکاندنی شێخی دەرکرد، شێخ پێکەنی و گاڵتە و قەشمەری بەدادوەرە ئینگلیزەکان کرد(٢٢٥).

رەنگە زۆر کورد هەبن بەو هەڵوێستانەی شێخ مەحمود بنازن، یا بەهەڵوێستی کاتی شەڕ و دەستگیرکردنەکەی، یاخود بە هەڵوێستی قارەمانانەی کاتی دادگاکەی. بەڵام من پێم وانی‌یە و ئەوە بەسیاسەتێکی نەرسکاو تێ دەگەم کە بەرامبەر دوژمنێکی ترسەنۆک، کە بە ساختە و فێڵ هەڵدەقونێت، مرۆ راستگۆ و بێ باک بێت. دوژمنانی نەتەوەکەمان وولاتەکەمانیان بە قارەمانێتی و مەردایەتی داگیر نەکردووە. بۆیە بۆیان نی‌یە چاوەڕوانی پەیمان نەشکێنی و سوارچاکی لە ئێمە بکەن(×).

ئیمپریالیزمی ئینگلیزی خاوەن تەجرەبە و دوور بین بوون. شێخیان نەخنکاند. بەڵکە بۆ هندستانی ژێر دەستەی ئەو کاتەیانیان دوورخستەوە. لە پاش دوورخستنەوەی شێخ، لە تەموزەوە بۆ ئۆکتۆبەری ١٩١٩ راپەڕینی چەکدارانە لەنێوچەکانی کۆیە و بادینان دەستی پێ کرد. چەندین کاربەدەست و ئەفسەری ئینگلیز بەدەستی کورد کوژران. هەمان کات

---

(×) ئەز پێم وایە راستە شێخی قارەمان وەکو هەموو سەرکردەیەکی دی مێژوویی هەڵەی هەبووە، بەڵام بەڕاستی نازانم هەڵوێستی سیاسیانەی نیو سەدە لەمەوبەر بە پێوەری ئەورۆکە کێشانە بکرێت. شێخ وەکو سیاسی و سەرکردەیەک رێگە نەما نەیگرێتە بەر. دەستەو دامێنی هەر لایەک بووە کە تروسکەی ئومێدێکی بۆ کورد لێ بەدی کرابێت. دۆست و دوژمنی هەڵسەنگاندووە، هەتا نامە و دەنگی کوردی بە شوورەوییش گەیاندووە و خۆی لە بواری هەموو تاکتیکێک داوە. هەڵوێستی مەردانە و قارەمانانەی هەڵوێستێکن لە مێژوودا کەم وێنە و بێ نموونەن. هەقە هەموو کوردێک بە شانازی و سەربەرزی‌یەوە بیگێڕنەوە. شێخێک بە زامداری لە جەنگدا دەستگیر بکرێت و بدرێتە دەست دادگایەکی داگیرکەری بێگانە، خودا نەکردە بکروزێتەوە و بپاڕێتەوە و چەکمەی داگیرکەران ماچ کات چاکە، یاخود خۆی ئاسایی لەدادگادا لە لنگە کلاشە خوارەکانی بنەوێت و لە پەنا گوێی سەرکردەی هەموو هێزە چەکدارەکانی ئەو داگیرکەرەی بسرەوێنێت و بڵێت "بەدبەخت هەمووی تاوانی تۆ بوو!!!" چ لەوە سیاسی‌یانە تر و مەردانەتر دەبێت کە رووبەروو بەداگیرکەر بڵێت "من تاوانبار نیم، نەهاتوومەتە سەرخاکی ئێوە، ئێوە تاوانبارن و چاوی تەماعتان بڕیوەتە خاکم و لەگفت و بەڵێنی خۆتان و هاوپەیمانتان لاتان داوە." جگە لەوانە ئینگلیز بڕیاری پێشەکی دابوو. پلانی بەش کردنی نێوچەکە لەمێژ بوو نەخشە کێش کرابوو. بەهیچ پاڕانەوە و سکاڵایەک ئەو تەون و داوە نەهریمەنانەیە هەڵنەدەوەشایەوە. تەنها رێگەیەک کەئەو پیلانەی پێ هەڵتەکاندرایە گوللە بوو. صەد مەخابن خۆفرۆش و پوازی نێو خۆی کورد ئەو تاکە رێگەیەشیان بەستەوە.

تورکەکان بە نێوی (برایەتی ئیسلام)ەوە لە نێو کورد دا دەستیان بە پروپاگەندەیەکی بەربلاو کرد. یەکێک لە چالاکترین پروپاگەندەچی‌یەکان ئەفسەرێکی تورک بوو بە نێوی (ئۆزدەمیر). ساڵی ١٩٢١ هاتە رەواندز و لەوێ وە دەست بەکار بوو.

ئینگلیز ترسی لە دەست دانی خوارووی کوردستانیان لێ نیشت. نەیاندەویست چاوگەکانی نەوت لە کیس بدەن، بۆیە پێویستیان بە سەرکردەیەکی کورد هەبوو کە بەرژەوەندی‌یەکانیان بۆ بپارێزێت، (بێ گومان جگە لە شێخ)، دووکەس پاڵیوراوی ئەو ئەرکە بوون، حەمدی بابان و سەید تەهای شەمزینی. یەکەمیان میر و ئۆرۆستۆکراتێک بوو کە لە ئینگلتەرە گەورە بوو بوو. نە کوردی دەزانی و نەقەتیش لە کوردستان بوو بوو[٢٢٦]. دووهەمشیان لە بەرامبەر بەگژدا چوونی تورکان دا داوای کوردستانێکی سەربەخۆی لە کوردستانی خوارووداەکرد کە کوردستانی ئێرانیش بگرێتەوە. ئینگلیز بەوە قایل نەبوون و رەتیان کردەوە[٢٢٧].

لە ٢٥ی ئاوریلی ١٩٢٠دا سوێندخواران بە ئینتیدابی ئینگلیز لەسەر عێراق رازی بوون. بنەما یاسایی‌یەکانی ئینتیداب کە لە ١٩٢٠/١٢/٩دا بلاوکرایەوە مافی کوردی فەرامۆش نەکردبوو. لەبەندی شازدەهەم دا دەڵێت: (ئەوەی لەم یاسایەدا باسی لێوە کراوە رێگەی ئەوە لەدەوڵەتی خاوەن ئینتیداب ناگرێت گەر بەچاکی بزانێت، رژێمێکی ئیداری‌ی سەربەخۆ لە نێوچە کوردی‌یەکاندا دابمەزرێنێت)[٢٢٨].

شان بەشانی شۆرشی خوارووی کوردستان، لەخوارووی عێراقدا یاخی بوون دەستی پێ کرد. لە حوزەیران و ئابی ١٩٢٠دا شەڕ و لێک دانی زۆر توند لە نێوان ئینگلیز وعێراقی‌یەکاندا لەزۆر شوێنی عێراق دا بە تایبەت لەبەغدا روویدا[٢٢٩]. ئینگلیز ناچار بوون لە ٢٥/١٠/١٩٢٠دا "حوکومەتێکی عێراقی کاتی" دابمەزرێنن، کە میرێکی عارەبیان بە نێوی (فەیسەڵ)ەوە (١٨٨٣-١٩٣٣) لە سوریاوە بۆ هێنا و لەسەریان دانا. ئەویش لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١دا تاجی پاشایی عێراقی لەسەر خۆی نا. نوێنەرانی لیوای کەرکوک و سلێمانی وەک پروتێستێک بەشداری‌یان لەو هەڵبژاردنە ساختەیەی فەیسەڵ دا نەکرد[٢٣٠] هەڵوێستی بێ ویژدانانەی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی کوردەکانی تەواو هەژاند.

لە ٢١ی تەموزی ١٩٢٢دا ژەنەراڵ حاجی مستەفا پاشای یامولکی، پارتێکی بە نێوی (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان)ەوە دامەزراند. رۆژنامەیەک بە نێوی (بانگی کوردستان)ەوە ئۆرگانی بوو. لە ساڵی ١٩٢٢دا تەقە و لێک دانی کورد و ئینگلیز روو لە زیادی بوو. لەسەر ئەنجامی ئەوانەدا و بە هۆی زەبری پروپاگەندەی تورکانەوە، ئینگلیز ناچار بوون لە ٢٢ی سێبتەمبەری ١٩٢٢دا، شێخ مەحمودی دوورخراوە بۆ هندستان، بۆ کوردستان

بگێڕنەوە و بە ڕازی بوونی فەیسەڵ بیکەنەوە فەرمانداری کوردستان[٢٣١]. پێش گەیشتنەوەی شێخ واتە لە ١٧ی سێبتەمبەر دا ئالای کوردستان بەرەسمی ی هەڵکرا و لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٢دا شێخ مەحمود کابینەیەکی هەشت نەفەریی دیاری کرد[٢٣٢].

شێخ بە هۆی ئەو مەکانە ئاینییەی بە میرات بۆی مابووەوە، بەداخەوە دژی بیری نوێ وڕۆشنبیرانی کورد بوو. ئەم توێژاڵەی لەبەڕێوەبردنی کارە گرنگ و بایەخدارەکان دوورخستنەوە و کەسانی دواکەوتوو لێ نەهاتووی لەشوێن دانان، ئەوانەی هەمیشە پێیاندا هەڵدەدا و مەرایی و کلکە لەقێیان دەکرد و ماستاویان سارد دەکردەوە. سکرتێرەکەی کە (رەحە کانێسکانی) بوو هەموو پیاوە هەڵبژاردە و یەکی یەکییەکانی دەبوغزاند[٢٣٣](×). لەسەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ دا، بلیمەت و نووسەر و ماتماتیکەوان و شارەزای زانستە سوپاییەکان (جەمال عیرفان)، کە لە لایەن کاربەدەستانی رەسمییەوە بە ئاژاوەچی نێوە دەبرا، لە بارێکی نووتەک و نادیاردا کوژرا. سەرکردەی سوپایی نێوداری کورد حاجی مستەفا پاشای یامولکی، ئەستەمولی بەجێ هێشت و گەڕایەوە کوردستان، تا خزمەت بەگەلەکەی بکات، بە بوختانی "بێ ڕەوشت"ی بەرهەڵستیی دەکرا ورەدوو دەنرا. تاوانی هەر هەموو ئەمانە لە ئەستۆی ئینگلیز و ئەو سیاسەتە چەوت و ناقۆڵایەیان بوو بەرامبەر کورد بە گشتی وشێخ مەحمود بە تایبەتی. ئەو سیاسەتە دڵی شێخی وا کرمێ کردبوو کە گومان لە هەموو کەس بکات.

ئەو کاتەی ئینگلیز گفتی کوردستانێکی سەربەخۆیان بە شێخ دەدا، هەمان کات بە فەیسەڵیان دەگوت کە خوارووی کوردستانیش بە عێراقەوە دەلکێ.

تا ئەم سیاسەتە دووفاقانەیە یەک لۆ کەنەوە، زۆر سەرەک هۆزی کوردیان لەشێخ ڕاست

---

(×) شێخ محەمەدی خالصیی، کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانیی، لەساڵی ١٩٢٤دا لە شیعرێک دا کە بۆ شێخی ناردووە، هەمان گلەیی دەکات و دەڵێت:

لەبەر چاوت وەکو یەک وایە بێ فەرقن لەخزمەت تۆ
شەهێن و حاجی لەقلەق، شێر و ڕێوی، مرشد و جانیی
کەر و گا خەرجی بار و جووتە، ئێستر ماڵی کاروانە
ئەمانە نابنە کوێخا و رەئیس و میری دیوانیی

پاشان دەڵێت: هەموو شێر و پڵنگن وەختی نان خواردن لە ئەترافت
سمێڵ بابڕ، کفن دڕ، کەللە خڕ، پەرچەم مەریوانیی
دوعات با بۆ بکەن ئەمجا، بە تەدبیریان نەکەی زینهار
مەلاو دەرویش و سۆفی و شێخەکانی لوقمە باقانیی

تا دوایی... بڕوانە: جەمیل صائب: "لەخەوما"، بەغدا، ١٩٧٥ل١٨-١٩.

کـردەوە. هیچ چارەسـەرێکی دی بۆ شـێخ نەمـایەوە لەوە زێتـر کـە لە نۆڤـەمـبـەری ١٩٢٢(٢٣٤)دا بانگی (مـەلیکی کـوردسـتـان) هەڵبـدات و بە زمـانـی گـوللە لەگـەڵ ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دا بدوێت.

هێشتا پەیمانی سیڤەری ١٩٢٢ نووزەیەکی تێدا مابوو. ئینگلیـز دڵەڕاوکەی ئەوەیان بوو لیوای موسڵ (خوارووی کوردستان) بدرێتەوە بە تورکیا. لەترساندا هێزی داگیرکەری ئینگلیز و دەسندە خۆرەکانی (دەستەڵاتی عێراق) هەوڵی هێور کردنەوەی کوردیان دەدا. لە ٢٤ دیسـەمبەری ١٩٢٢دا هەردوولایـان روون کردنەوەیەکیـان دایە کۆمـەڵەی گەلان و تێیدا مـافی دامەزراندنی حوکومـەتێکی کوردیان لە چوار چێوەی عێراقدا دان پێدا نا. لەو روونکردنەوەیەدا دەڵێن:

(حوکـومـەتی خـاوەن شکۆی بەریتـانیای مـەزن و حوکـومـەتی عـێراق دان بە مـافی ئەو کوردانەدا دەنێن کە لەسنووری عێراقدا دەژین، تا حوکومـەتێکی سەربەخۆ لەو نێوچانەدا کـە زۆربەی زۆریان کـوردن، دابمەزرێنن. بە هیـوان تـوخمـە جـوداکـانی کـورد لە نێزیکتـرین کاتدا لەسەر شێوە و شێوازی ئەو حوکـومـەتەی دەیخوازن، یەک بکەون و نوێنەری خۆیان بنێـرنە بەغـدا، تا وەکـو باس لە پێـوەندیـیە سیـاسی و ئابووریـیەکانیـان لەگـەڵ هەردوو حوکومەتی ئینگلیز و عێراقدا بکرێت)(٢٣٥).

ئەمـە بەڵگەنامـەیەکی جیـهانییەکەدان بە مافی ئۆتۆنۆمی کورد دا دەنێت، تا ئێـستـاکـە پاش پەنجـا سـاڵی رەبەق، بەگـەڕ نەخـراوە. تا ئەورۆکـەش مـەرەکـەبە و پەڕە کـاغـەزی نەخشاندووە.

شێخ تا دەهات زێتـر و زێتـر بڕوای بە "دادوەرییی" ئیمپـریالیزمی ئینگلیـز لەق دەبوو. بۆیە لە ١٩٢٣/١/٢٠دا نامەیەک بۆ شوورەویی دەنێرێت و هانای کۆمەکیان بۆ دەبات. ئەم نـامـەیە لە ڕێگەی کـونسـوڵی شـوورەویی لە تەورێزەوە نێـردراوە(٢٣٦). دەربارەی وەرامی شوورەویی هیچ نازانین. لەشوباتی ١٩٢٣دا سەرداری کورد (سمکۆ)(٢٣٧)، بێ هوودە هەوڵی دا شێخ و ئینگلیز رێک خاتەوە(٢٣٨)، تا هەموو پێکڕا بەر بەبزووتنەوەی ئەتاتورک بگرن. بۆ ئەم مـەبەسـتـە سـمکۆ لە ١٩٢٣/١/١٨دا هاتە سلێـمـانی و لەگـەڵ شێخدا پێک گەیشتن. بەڵام بە پێچەوانەوە، شێخ زێتـر و زێتر لە تورک نێزیک دەبووەوە. کاتێک ئینگلیز دیتیان شێخ نایەوێت دژی تورکان بوەستێتەوە، خۆیان هەنگاویان هەڵناو بە پەنهـانی لەگـەڵ ئەتاتورک دا سـەودایان دەست پێ کـرد. ئەم سـەودا و مـامـەڵەیەی لە

پشتی کوردەوە کرا. پاشان ڕێی بۆ پەیمانی لۆزان خۆش کرد[٢٣٩].

ئیدی ئینگلیز توند تر لە کورد و شێخیان هەڵپێچا. لە ١٩٢٣/٢/٢٦دا فڕۆکەکانی ئینگلیز بەیاننامەیان بەسەر سلێمانی‌یدا هەڵدایە خوارەوە، کە تێیدا هەڕەشەی توند لە دانیشتوانی دەکەن[٢٤٠].

لە ١٩٢٣/٣/٤دا فڕۆکەکانی ئینگلیز سلێمانی پێتەختی کوردستانیان بۆمباران کرد، ئەم شاڵاوە سێ ڕۆژی خایاند[٢٤١].

شێخ و لایەنگرانی ناچار بۆ کێوان هەڵهاتن، تا دەست بە خەباتی پێشمەرگانە بکەن. لە ٣٠ی ئاوریلی ١٩٢٣دا کۆمیتەیەکی (ئەنگلۆ-عێراقی) لیوای سلێمانی‌یان بە لیوایەکی عێراقی دایە قەڵەم. لە ١٩٢٣/٥/٢دا و لە ١٩٢٣/٥/٢٢دا سەرلەنوێ فڕۆکەکانی ئینگلیز بەیاننامەی پڕ هەڕەشەیان بەسەر سلێمانی‌دا هەڵدا[٢٤٢].

شێخ لە ١٩٢٣/٧/١١دا هەمدیسان سلێمانی گرتەوە و جڵەوی کاری گرتەوە دەست. دواکات لە ١٩ی تەموزی ٩٢٤دا لەناکاو هێزەکانی ئەنگلۆ-عێراقی بە پێچەوانەی هەموو گفت و بەڵێنەکانیانەوە (وەکو ئەو گفتەی لە ١٩٢٢/١٢/٢٤دا بە کۆمەڵەی گەلانیان دا)، شاری سلێمانی‌یان داگیر کرد و بە عێراقیانەوە جووت باقە کرد. ئەمە یەکەمین جار بوو هێزی (عێراق) بتوانێت توخنی سلێمانی بکەوێت.

بەڵام بە پێچەوانەی سەر ئەنجامی چاوەڕوانکراویانەوە، ئەم ڕەفتارە هەستی نەتەوەییانەی کوردی زێتر هەژاند و لە هەموو لایەکەوە ڕاپەڕین دەستی پێ کرد.

لە کانوونی دووهەمی ١٩٢٥دا کۆمەڵەی گەلان، وەفدێکی نارده کوردستان تا گەل پرسی‌یەک بە ئەنجام بگەیەنن. چونکە ئینگلیز و تورک نەیانتوانی بە گفت و گۆ کێشەی ویلایەتی موسڵ بەلادا بخەن. لەو گەل پرسی‌یەدا کوردی کەرکوک و سلێمانی، دژی لکاندنیان بە عێراقەوە دەنگیان دا[٢٤٣].

کوردی هەولێر و موسڵ، لەگەڵ ئەوەدا بوون بە عێراقەوە بلکێنرێن، بە مەرجێ ئۆتۆنۆمی‌یان لە چوارچێوەی عێراق دا بۆ دەستەبەر بکرێت.

شێخ دوور لە سلێمانی سەرەوکاری‌ی شەڕی پێشمەرگانەی دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دەکرد، بۆیە (مەندوبی سامی بەریتانی‌ی) لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٢٥ دا خەڵاتێکی ٦٠٠٠ روپیێ‌یی بۆ سەری شێخ تەرخان دەکات[٢٤٤]. لەگەڵ ئەو هەموو

بەرهەڵستکاری و بەرەنگاری‌یەی کورد دا، وەفدەکەی کۆمەڵەی گەلان لە ١٦ی تەموزی ١٩٢٥دا بڕیاری لکاندنی ویلایەتی موسڵ (خوارووی کوردستان)یان بە عێراقەوە دا، بەو مەرجەی خۆیان خۆیان بەڕێوە ببەن. تا ئەوڕۆکەش کورد بۆ ئەو خۆ بەڕێوە بردنە تێدەکۆشێت و هێشتا پێی نەگەیشتووە.

لە ١٦ی دیسەمبەری ١٩٢٥دا کۆمەڵەی گەلان بڕیارێکیان دەرکرد، کە تێیدا پێشنیازی لکاندنی خوارووی کوردستانیان بە عێراقەوە پەسەند کرد.

بەڵام داوا لە ئینگلتەرەی خاوەن ئینتداب دەکات، کە ئەو خۆ بەڕێوەبردنەی وەفدەکە بۆ کوردی عێراقی پێشنیاز کردبوو، دەستەبەری بکات[٢٤٥]. ئینگلیز لە ٢٤ی فێبریوەری ١٩٢٦دا کۆمەڵەی گەلانی دڵنیا کردەوە کە ئەو مافەی کورد مسۆگەر دەکات[٢٤٦].

عێراق ناچار بوو وەکو پاداشتێک، بەرامبەر بەوەی کوردستانی خوارووی پێشکەش کرا، لە ١٨/١/١٩٢٦دا پەیمانێک لەگەڵ ئینگلتەرە مۆر بکات. عارەبەکان تەنیا بەو پەیمانە رازی‌ی بوون، چونکە ئەو دیاری‌یەی ئەم پەیمانەی سازکرد، گەلەک پڕ بایەخ بوو. وەکی سەرەک وەزیرانی عێراق پێی لێنا، عێراق بێ کوردستان ناتوانێت بژی، چونکە کوردستان بۆ عێراق وەکو سەرە بۆ لاشەی مرۆ[٢٤٧]. ئینگلتەرە لەنێوەڕاستی ١٩٢٤دا عێراقی بەهۆش هێنایەوە گەر ئەو پەیمانەی لەگەڵ نەبەستێت کوردستانی خوارووی ناداتێ[٢٤٨].

ئەو کاتانەش رژێمی عێراق، کوردی بە بەڵێنی بێ کاکڵە هێور دەکردەوە، ئەوەتا سەرەک وەزیرانی عێراق لە ٢١/١/١٩٢٦دا لەبەردەم پەرلەماندا دەڵێت:

بەڕێزان! گەر هەموو توخم و تۆوەکانی عێراق مافی خۆیان نەدرێتێ، ئەم وولاتە توانای ژین و بەردەوامی نابێت. دەبێت مافی کورد دەستەبەر بکرێت، دەبێت فەرمانبەرانیان لە خۆیان بن، زمانەکەیان بکرێتە زمانی رەسمی‌یان، دەبێت منداڵانیان لە قوتابخانەدا بە زمانی زگماکی خۆیان فێرکرێن. (چەپڵە)[٢٤٩].

لەگەڵ ئەو گفت و لفتە شیرینانەدا، عێراق لە ٥ی ژونی ١٩٢٦دا پەیمانێکی هاوکاری لەگەڵ تورکیا و ئینگلتەرە دا مۆر کرد کە راستەوخۆ بۆ دژ وەستاندنەوەی ویستەی ئازادی‌ی کورد تەنرابوو. رۆژێک پاشتر (لە ٦ی ژونی ١٩٢٦دا) کۆمەڵەی گەلان پێشنیازی وەفدەکەی بۆ لکاندنی خوارووی کوردستان بە عێراقەوە، بەگەڕ خست.

دەبایە ئەو کاتەی نوێنەرە نێو دەوڵەتی‌یەکان لەکوردستاندا گێژیان دەخوارد، شێخ

مەحمود داواکاریی سەربەخۆیی گەلەکەی پێ بگەیاندنابایە. بەڵام ڕەدوونان و تاقیب کردنی لە لایەن هێزی سوپای ئینگلیزەوە، ڕێی ئەوەیان لێ بەستەوە، بۆیە شێخ لە گێژاوی گومان و بێ هیوایی دا لە (مەریوان)ەوە هانای کۆمەکی بۆ رژێمی تورکیا برد، بەڵام بێ سەر ئەنجام بوو(٢٥٠).

لە ٢ی ژونی ١٩٢٧دا پاش ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیز، شێخ ناچار بوو داوای پەنابەرێتی لە ئێران بکات.

ئینگلیز هەڵوێستە سیاسی‌یە ناکاملەکانی شێخیان کردە بەهانەیەک، تا بە هۆیەوە یاری بە چارەنووسی کورد بکەن و ڕێگەی ئیحتیمالی سەربەخۆیی یا مافێکی ئۆتۆنۆمی، لە خوارووی کوردستان ببەستنەوە. کاتێک لە فێبریوەری ١٩٢٩دا شەش نوێنەری کورد لە پەرلەمانی عێراقدا، بەپێی گفتە نێو دەوڵەتی‌یەکان داوای مافی خۆبەڕێوەبردنی خوارووی کوردستانیان پێشکەش کرد، چ عێراق و چ ئینگلیزی ئاغایان بایەخیان پێ نەدا و پشتگوێیان خست(٢٥١).

لە ١٤ی سێبتەمبەری ١٩٢٩دا ئینگلیز بەڵێنی ئەندامێتیی کۆمەڵەی گەلانی بە عێراق دا. وا پێویست بوو عێراق بە پەلە "نیاز چاکیی!!!" خۆی بەرامبەر بە کورد پیشانی کۆمەڵەی گەلان بدات، تا مافی ئەندامێتیی بدرێتێ.

بەرەسمی کردنی زمانی کوردیی لە نێوچە کوردنشینەکاندا بەدەستەوەیە.

ئینگلیز لەبەرامبەر بوونە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان و دان نان بە مافی سەربەخۆیی عێراقدا داوای بەستنی پەیمانێکی لە عێراق کرد. ئەمە هەمان ساڵ لە (٣٠ی ژونی ١٩٣٠)دا جێ بەجێ کرا. بەڵام وا پێویستی دەکرد "گەل" پەرلەمانێکی نوێ هەڵبژێرێت، تا ڕازی بوونی خۆیی لەسەر دەربڕێ و مۆری کات. کورد بەشداریی ئەم هەڵبژاردنەیان نەکرد، بەوە ڕازیی نەبوون دان بە پەیمانێک دا بنێن کە ئیمتیازاتی ئابووری و سیاسی بە ئینگلیزێک بدات کە خاکەکەیانی پێشکەش بە عارەب کرد. کوردەکان بە بروسکەیەک داوای مافی خۆیان لە کۆمەڵەی گەلان کرد. ئەوانیش دیسانەوە داوایان لە ئینگلیزی خاوەن ئینتیداب کردەوە کە مافەکانی گەلی کورد دەستەبەر بکات. وەرامی ئینگلیز" نیاز چاکیی عیراق بەرامبەر کورد "نیشان دەدات و دەڵێت:

"کوردەکان بە هەموو مافێکی خۆیان گەیشتوون!" لە ئۆگوستی ١٩٣٠دا مەندوبی سامیی ئینگلیز لە عێراقدا، سەردانێکی کوردستانی کرد، لەگەڵ سەرەک وەزیرانی

عێراقدا هات ئەو "نیاز چاکی"یەی عێراق بۆ کورد بە ئیسپات بگەیەنن.

لە ٨ی ئۆگوستی ١٩٣٠دا سەرەک وەزیرانی عێراق بە جەماوەری خۆ پیشاندەری سلێمانی‌ی راگەیاند کە: "حوکومەتی عێراق بڕیاری گردە بڕی داوە ئەو گفتانەی بە برا کوردەکانمان دراوە نەک تا ١٩٣٢ بەڵکە پاش ئەو کاتەش پێڕەوی لێ بکرێت)[٢٥٢].

راستی و دروستی ئەم "بڕیارە گردەبڕ"ە زوو ئاشکرا بوو، کاتێک لە ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠دا تیپێک پۆلیسی عارەب تەقەیان لە خۆپیشاندانێکی خەڵکی سلێمانی کرد و ٣١ کەسیان لێ کوشتن. ئەم رۆژە لە مێژووی کورد دا بە "رۆژی رەشی شەشی ئەیلول" ناسراوە.

لە فێبریوەری ١٩٣١دا شێخ گەڕایەوە دیوی عێراق. لە٥ی ئاوریلی ١٩٣١دا لە "ئاوباریک" شەڕێک لە نێوان لایەنگرانی شێخ و سوپای عێراق دا رووی دا. ئەمجارەیان شێخ داوای ئۆتۆنۆمی لە ژێر ئینتیدابی ئینگلیزدا بۆ کوردستانی عێراق دەکرد[٢٥٣]. ئەمە ناخەملاوی‌یەکی دیکەی سیاسی شێخ بوو. دیارە ئینگلیز ئەم داوایەشیان دایە دواوە. ئیدی بەرژەوەندی‌یەکانیان مسۆگەر کرابوو. لە ١٣ی مایسی ١٩٣١دا شێخ کۆڵی دا. ئەوجا بەدەست بەسەری نێردرایە بەغدا.

١٩٣١ عێراق بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان قەبوڵ کرا. بۆ بە ئیسپات گەیاندنی "نیاز چاکی"یان، پەرلەمانی عێراق لە ٢٣ی مایسی ١٩٣١دا نێوبراو بە "یاسای زمانە نێوچەییەکان"ی بلاوکردەوە. ئەم یاسایە لە ١ی ژونی ١٩٣١دا لە رۆژنامەی رەسمی‌ی عێراقدا بە نێوی (یاسای ژمارە ٧٤)ەوە بلاو کرایەوە[٢٥٤]. بە پێ‌ی ئەم یاسایە کورد مافی ئەوەی دەکەوێت لەقوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستاندا بە زمانی کوردی بخوێنن. جگەلەوە دەبایە لە کوردستاندا فەرمانبەران بەلای کەمەوە زمانی کوردی‌یان بزانیبا[٢٥٥]. بەڵام ئەم یاسایە تەنها لە سلێمانی و هەولێردا کاری پێ کرا. لە موسڵ و کەرکوک و خانەقین دا بەگەڕ نەخرا. ئەمە بووە هۆیەک بۆ بەبێ سەوادی‌ی مانەوەی کوردەکانی ئەم نێوچانە.

ئەو "نیاز چاکی"یەی عێراق کە هەمیشە بە لنگە و قووچی دەردەکەوت، ماکی هەموو راپەڕینەکانی کورد بوو. لە ١٩٣١/١٢/٨دا هێزێکی عێراقی لە ناکاو شالاویان بۆ نێوچەی بارزان برد. کلپەی شۆڕشێکی لە بارزان هەلایسان کە لە دیسەمبەری ١٩٣١ەوە تا تەموزی ١٩٣٢ درێژەی کێشا. عێراق بانگی "غەزا"ی دژی شێخ ئەحمەد بارزانی‌ی

هەڵدا. بە پێی پڕوپاگەندەی ڕژێم گوایە شێخ ئەحمەد لەدین لایداوە و بانگی مەسیحێتی هەڵداوە.

لە ١٥ی مایسی ١٩٣٢دا هێزی ئاسمانیی ئینگلیز، پشتگیریی تەواوی هێزەکانی عێراقیان کرد(٢٥٦) أ.ج.ر. گارۆد باسی ئەو نەبەردانەی!! ئینگلیز دژی کورد ئاوها دەکات: "هەل و دەرفەتێکی زۆر نایاب بوو بۆ هێزی ئاسمانیی ئینگلیز تا بێ هیچ زیان و مەترسیی‌یەک فڕۆکەکانی مەشق بکەن"(٢٥٧).

بەڵام شۆڕشەکە تا ٥ی تەموزی ١٩٣٢ بەردەوام بوو ئەوجا خامۆش کرا. بارزانیی‌یەکان پەرێدەی تورکیا بوون، تا لە ١٣ی مایسی ١٩٣٣دا بە پێی پەیمانێکی نێوان تورکیا و عێراق و ئینگلیز لێیان خۆش بوون. بەڵام هەر گەیشتنەوە عێراق دەست بەجێ دەستگیر کران و ڕەوانەی خوارووی عێراق کران. پاشان دوورخرانەوە بۆ سلێمانی. تێکڕا ١١ ساڵی ڕەبەقیان بە دەربەدەری بەسەربرد. ١٩٣٢ ئینگلتەرە ویستی عێراقی موستەعمەرەی بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بگۆڕێت. بۆیە وا پێویست بوو کە عێراق جارێکی دی بە پڕتاو "نیاز چاکی" خۆی بەرامبەر بە کورد، بۆ کۆمەڵەی گەلان وەدەرخات. لە ١٩ی مایسی ١٩٣٢دا بڕیارێکی لەو بابەتەی بۆ کۆمەڵەی گەلان نارد. تێیدا مافی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی کورد وەکو بەشێک و یاسایەک لە یاسا بنچیی‌یەکانی عێراق، دانی پێدا نرابوو.

سێر فرانسیس همفری کە لە ١٩٢٩/١٠/٧دا کرابووە سەرۆکی کۆمیسیۆنی باڵای ئینگلتەرە، لە کۆبوونەوەکانی جنێفی کۆمەڵەی گەلاندا بۆ لێکۆڵینەوە لە وەرگرتنی عێراق لە ١٠/٢٦ و ١٩٢٩/١١/٣٠دا دەڵێت: "لە ڕاستیدا عارەبی عێراق ڕەگەزێکی دڵ واڵا و بەخشندەن. بەرامبەر ڕەگەز و ئاینەکانی دی گەلەک میهرەبانن"(٢٥٨).

عێراق لە ١٩٣٣/١/٢٨دا بە ئەندامێکی تەواوی کۆمەڵەی گەلان وەرگیرا. ئەمە هەمان کات دان پێدانانی بوو وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

پەرلەمانی عێراق لە ١٩٣٢/١٠/٣دا لەسەر ئەو بڕیارەی پێشان باسمان کرد ودان بە مافی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی کورد دا دەنێت، ڕازی بوو.

بەو جۆرە کورد بەڵگەنامەیەکی دی نێو دەوڵەتی چنگ کەوت، کە دان بە مافی ئۆتۆنۆمی‌یدا دەنێت. ئەوڕۆ نەتەوە یەک گرتووەکان کە بەرۆکگری کۆمەڵەی گەلانە، لەسەری پێویستە عێراق بە ئاگا بهێنێتەوە بۆ پێڕەوی کردن و دەستەبەرکردنی ئەو مافانەی کورد

کە لەو یاسا بنچینەییەی خۆی دا دەست نیشانی کردووەو دژی نەوەستێتەوە[٢٥٩].

عارەبی عێراق لە پەیمانی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٠یان وەکی سەرەتایەکی دیل کردنیان دەروانیی. پێش مۆرکردنی پەیمانەکە سەرەک وەزیرانی عێراق (محسن السعدون) لە ١٩٢٩/١١/١٣دا خۆی کوشت. بەرگەی ئەوەی نەدەگرت کە میللەت بە چاوی خایەن و خۆفرۆش تێی بروانن. هەموو پارتە عارەبی‌یەکان دژی ئەو پەیمانە وەستانەوە(*).

ئەمە دامەزراندن و هێنانە گۆڕێی دەوڵەتێکی دەستکرد بوو لەلایەن ئینگلیزەوە بە نێوی عێراقەوە، کە لە بەشێکی وولاتی عارەب و بەشێکی کوردستان پێک هێنرا. پاشایەکی نامۆیان لەسەر دانا وپەرلەمانێکی نامۆیان بۆ هەڵپڕوزاند کە "وێنەیەکی لەبەر گیراوەی" پەرلەمانی ئینگلیزی‌ی بوو! عێراق بەدژی خواستی گەلەکانی هەڵتۆقی، تا بەرژەوەندی‌یە ئابووری‌یەکانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی پارێزگاری‌ی بکات. مرۆ بە تێڕوانینی سنوورەکانی عێراق لەسەر نەخشەیەک تێ دەگات و دەبینێت چۆن دەڵێی بەراستە کێشراوە.

ئەم دەوڵەتە دامەزراوە خۆ نەویستەی عێراق بەو گەلە جوداوازانەوە، هەر لەسەرەتاوە ئەو دەردە کوردەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت کە بە تێپەڕبوونی زەمانە، لێی پیستر کرد. هۆکەشی خۆگێل کردن و پشت گوێ خستنی ئەو هەموو گفت و بەڵێنە نێو دەوڵەتی و نێوچەیی‌یانە بوون کە چەندین جار بە نووسین مافی خۆبەڕێوەبردنی کوردیان دان پێدا ناوە.

## ئاسووری‌یەکان لە عێراق دا

ئەو ئاسووری‌یانەی پاش قەتڵ و عام لەدەستی تورکان خەلەسین و پەنایان هێنایە کوردستانی عێراق[٢٦٠]، بەلای ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌یەوە تۆپە پەڕۆی چاک بوون بۆ بە گۆڵ دا کردنی سیاسەتی ئیمپریالیزمانەیان لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا. لە ١٩٣١ەوە باری دەردناکی ئاسووری‌یەکانیان لەلایەکەوە بۆ چاوترسێن کردنی رژێمی عێراق و لە لایەکی دی‌یەوە بۆ دژایەتی‌ی برا کوردەکانیان، قۆزتەوە. لە ١٩٢٣وە ٢٥٠٠ ئاسووری‌یان بەنێوی (هێزی لیڤی)یەوە لەژێر چاودێری ئەفسەرە ئینگلیزەکان و بەپێی نەخشە و پڕوپاگەندەی ئیمپریالیزمانەیان، دابەست و گۆش کرد. ئاشکرا بە دڕندانەترین شێوە دژی کورد دنەیان دەدان[٢٦١]. گفتی ئەوەیان دەدانێ کە لە پاشەڕۆژ دا بۆ دامەزراندنی

---

(*) بڕوانە ئەو گوتارەی (ناجي السويدي) لە رۆژنامەی (العالم العربي)دا، بغداد، ١٧و١٨/١٠/١٩٣٠.

دەوڵەتێکی ئاسووری‌ی یارمەتی‌یان دەدەن. هەمان کات رژێمی عێراق و کوردەکانیشیان دژی ئاسووری‌یان هان دەدا. سیاسەتە کۆنە بەدناوەکەی ئیمپریالیزم (جیا کەرەوە و بەرەوە!) بە شێوەیەکی بەر بلاو لە لایەن ئینگلیزەوە پێڕەو دەکرا.

لە ٥ی ئابی ۱۹۳۳دا لێک دانێک لە نێوان سوپای عێراق و ئاسووری‌یەکاندا رووی دا کە ژمارەیەکی زۆر ئاسووری تێدا کوژرا. ئاغای ئینگلیز نەبزوا. باڵوێزی ئینگلیز لە عێراق "سێر همفری فرانسیس" رێگەی (دوکتۆر فریتز گرۆبا)ی باڵوێزی ئاڵەمانیای نەدا تێ بکەوێت و کارێک بکات، لەترسی ئەوەی نەبا دەوڵەتان، عێراق بە تاوانی قەتڵ و عامی ئاسووری‌یان سزا بدەن[۲٦۲].

سیاسەتمەداری ئاسووری‌ی، هاوڕێی ئازیزم بەهەشتی "یوسف مەلەک" لە ساڵی ۱۹٥٦دا لە بێروت بەشێک لەو چەرمەسەری ونەهامەتی‌یەی ئاسووری‌یەکانی بۆ گێڕامەوە. ئەو تاوانانە لەکەیەکی دژوێنە، هەتا هەتایە بەتەوێڵی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌یەوە دەمێنێتەوە. ئەوە یەکەم جار نەبوو کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی، ئاسووری‌یەکان تەفرە بدات. پێشتریش لە ٤ی مایسی ۱۹۲٤دا لێکدانێکی خوێناوی‌یان لەکەرکوک لە نێوان کورد و ئاسووری‌یدا سازدا. ئەوە بوو ئینگلیزەکان چەند بەکرێگیراوێکی ئاسووری‌ی خۆیانیان هاندا پەلاماری گەرماوێکی ژنان بدەن[۲٦۳].

## شۆڕشی یەزیدی‌یەکان و کودەتای بەکر صدقی

لەسەر ئەنجامی ئەو جەور و ستەم و هەست رووشاندنە بەردەوامەی کورد دا، کوردە یەزیدی‌یەکان لە ۷/ ۱۰/ ۱۹۳٥دا بە شۆڕشێک هەڵستان. حەوت یەزیدی بەدار داکران و زیاد لە صەدیان زامدار کران. هەمان ساڵ بارزانی‌یەکان بە سەرکردەیی خەلیل خۆشەوی و مستەفا بارزانی‌ی راپەڕین. عێراق تا ۱۹۳٦ کلپەی ئەم شۆڕشەی پێ دانەمرکایەوە.

لە ۲۹/ ۱۰/ ۱۹۳٦دا سوپا سالاری عێراق، ژەنەراڵ (بەکر صدقی)ی کورد، کودەتایەکی سەرکەوتووانەی بەسەر رژێمی عێراقی بەکرێ گیراوی ئینگلیز دا، بەرپا کرد. حوکومەتێکی لە پارتە عێراقی‌یەکان و کەسانی نیشتمان پەروەر دامەزراند. بەکر صدقی دوژمنی سەر سەختی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی بوو. ئەم رێڕەوە و کەم ئەزمونی و کەم تەجرەبەیی لە سیاسەتدا، پێوەندی‌یەکی توندی لەگەڵ ئاڵەمانەکاندا پێ پەیدا کرد. رێکەوت وا بوو کە خوشی ژنێکی ئاڵەمانی‌ی دۆستی بوو، پاشانیش خواستی. ئەو هۆکارانە وای لە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌ی کرد کە لە بەکر صدقی دڕۆدنگ بێت و وەکی

مەترسی‌یەکی گەورە تێی بڕوانن. بەکر صدقی لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر بە خۆ دەنازی، گەلەک نەترس و قارەمانیش بوو. تا ڕادەیەکی زۆریش دڵناسک بوو. هەر زوو لەگەڵ شێخ مەحمود دا کە ئەو کاتانە بە ئاوارەیی لەبەغدا دەژیا، تێک چوو. ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌ی لەو کاتانەدا کۆمەڵێک شۆڤێنیستی عارەبی لێ هار کرد.

لە ١١ی ئابی ١٩٣٧دا بە پیلانێکی ڕەش لە موسڵ شەهید کرا، کە کۆمەڵێک ئەفسەری عارەب تەون کەری بوون(×). جارێکی دیش تارمایی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌ی باڵی بەسەر عێراق و کوردستاندا کێشایەوە.

کەسێکی دیار و لەبەرچاوی دی هەبوو، کە زۆر دژی دەستەڵاتی ئینگلیز دەوەستایەوە، ئەویش مەلیک غازی‌ی بوو. ئەمیش دژی ئینگلیز و سەر بە نازی‌ی ئاڵەمانیا بوو. لە ٤ی ئاوریلی ١٩٣٩دا بەڕووداوێک گیانی لەدەست دا. لە عێراق دا ئەمەش بە پیلانێکی ئینگلیزی دەزانرا. (عبدالاله)ی ژن برای کرایە دەمڕاستی تەخت. بەڵام دەستەیەک ئەفسەری‌ی عارەبی سەر بە ئاڵەمانیای هێتلەری‌ی لە ٢ی مایسی ١٩٤١دا هەڵیانفڕاند و حوکومەتێکی نوێیان بە سەرۆکایەتی (ڕەشید عالی گەیلانی) دامەزراند. ئەم حوکومەتە هەڵوێستێکی زۆر شۆڤێنیستانەیان بەرامبەر جووەکانی عێراق هەبوو. ڕاپەڕین و پەشێوی‌یەکی زۆر کەوتە عێراقەوە. شێخ مەحموودیش توانی لەدەست بەسەری‌ی بەغدایەوە بۆ سلێمانی‌ی هەڵبێت. ڕژێمی گەیلانی گفتی زۆی بە مستەفا بارزانی‌ی‌دا، بەو مەرجەی ئەویش دژی ئینگلیز پشتگیری لێ بکات. بارزانی‌ی هاریکاری‌ی گەیلانی دایە دواوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی تێدا چوویەکی سیاسەتی ئینگلیز بوو، بەڵام نەیدەویست بۆ بەرژەوەندی‌ی نازی‌ی دژی ئینگلیز بجەنگێت، بۆیە ئەو دەمە ئارام و هێمن مایەوە.

هەندەک کوردی دی هەبوون ویستیان بارو دەرفەتەکە بۆ بەرژەوەندی‌ی کورد بقۆزنەوە. لەوانە هەندێ کەسی ناسراو و نێوداری کورد بوون، وەک عەلی کەمال، تۆفیق قەزاز و هەندێکی دی، کە خۆیان لە ژێر سەرکردایەتی‌ی مێژوو نووسی کورد میرلیوا محەمەد ئەمین زەکی‌یدا (١٨٨٠-١٩٤٨) ڕێک خست، تا لە ئاشووب و پەشێوی نێوان عێراق و ئینگلیز سوودێک بۆ کورد بەدەست بهێنن. شێخ مەحموود هاوکاری لەگەڵ ئەم دەستەیەدا نەکرد.

---

(×) یەکێک لە تەون کەران و ڕاپەڕێنەرانی ڕاستەوخۆی ئەو پیلانە ئەفسەرێکی کورد بوو، کە نێوی (عەبدلعەزیز یا مولکی) بوو.

کاتی دەست بەکاربوونی کورد دواکەوت. کاتێک حوکومەتی گەیلانی لە ٢ی ژوونی ١٩٤١دا بە بەشداری و دەست تێوەردانی راستەوخۆی سوپای ئینگلیز ژێرە و ژوور کرا، ئیدی ئەو دەرفەت و هەلە زێرینەش رابورد. شێخ مەحموود بە زۆر نێردرایە گوندی (داری کەلی‌ی) لە نێزیکی سلێمانی و بەدەست بەسەری مایەوە. بە نەداری هەر لەوێ لە ٩/١٠/١٩٥٦دا کۆچی دوایی کرد(×). ناشتنی شێخ لە شارەکەیدا، بووە خۆپیشاندانێکی خوێناوی‌ی دژی رژێمی عێراق. سەرقافڵەی خۆپیشاندەرەکان ئافرەتێک بوو بە نێوی (ئەختەر)، کە پۆلیس بەر دەست رێژیان دا و شەهیدیان کرد. لە ٢٥/١٠/١٩٤١دا یەزیدی‌یەکان جارێکی دی راپەرینەوە، بەڵام شۆرشەکەیان زوو خامۆش کرا.

## ئاڵەمانیای نازی و چاوبرینە کوردستان

لەجەنگی دووهەمی جیهانی‌یدا ئاڵەمانیا چاوی تەماعی بریبووە بیرە نەوتەکانی کوردستانی عێراق. "گوتفرید یۆهانێس میوللەر" و گرووپێکی بەکرێگیراوی نەناسراو، لە هاوینی ١٩٤٣دا بە فرۆکە دەنێردرێنە کوردستان، تا کورد دژی ئینگلیز هان بدەن(*) دەزگای جاسوسی‌ی ئینگلیز زوو بە پلانەکەی زانی و بە پەلە گروپەکەیان دەستگیر کرد.

رژێمی نازی‌ی دەیەویست لە ژێر دەمامک و چارشێوی دۆستایەتی‌ی کورد دا خۆ تێهەڵکێشی مەسەلەی کورد بکات، ئاشکرایە ئەمە پیلان و کڵاوبازی‌ی بوو، چونکە نازی‌ی ئاڵەمانیا هیچ کات بیری لەوە نەکردۆتەوە یارمەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد بدات.

نازی‌یەکان لە ١٩٤١ەوە لەگەڵ تورکە تۆرانی‌یە رەگەز پەرستەکان رێک کەوتبوون کە ئیمپراتۆریتی‌یەکی تورکی فراوان دابمەزرێنن. لە کۆبوونەوەیەکی هیتلەر دا لەگەڵ فۆن پاپن و نوری پاشای نوێنەری تورکیادا، ئەم ئیمپراتۆرێتە نەخشە کێش کرا بوو. ئەم پیلانە لەو نامەیەی ٥/٨/١٩٤١ی بارۆن "ئێرنست ڤایز ئاکەر"ی وەزیری کاروباری بێگانەی ئەو کاتەی ئاڵەمانیا دا کە بۆ (رێبنترۆپ)ی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی نووسیوە، زۆر بە ئاشکرا بەدەر دەکەوێت. بە پێی ئەم پیلانە بڕیار وابوو ئەو تورکانەی لە شوورەوی‌ی

---

(×) شێخی قارەمان، بە نەخۆشی برایە بەغدا و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

(*) Muller, Gottfried Johannes: “Im brennenden Orient”, (لە رۆژهەڵاتی گڕ گرتوودا) Stuttgart 1959.

دەژین، خۆیان و خاکەکەیان لە سۆڤیەت داپچڕێنن و بلکێن بە تورکیاوە.

گەر ئیمپراتۆرێتێکی تورکیی لەو جۆر و بابەتە فراوان و هێزدارە سەری گرتبا، صەد لە صەد نەتەوەی کوردیان بە هێجگاری قڕ دەکرد و ئەو (چقڵە مێژوویی)یەیان لە چاوی دەستەڵاتدارانی تورک دەردەکێشا.

## بارزانیی و بارزانییەکان

لە ١٩٤١ەوە سەرکردەیەکی دیار هاتە سەر شانۆی سیاسەتی کورد ئەویش مستەفا بارزانیی بوو. لێرەدا بە پێویستی دەزانین شتێک دەربارەی ڕەچەڵەک و ڕێباز و کەسایەتی بڵێین. هەر باست لێوە کرد ناچار دەبیت باسی رابووردووی بکەیت. چۆن پێ گەییوە و ئەو مەزنایەتی‌یەی پێ بڕاوە!

کەواتە بارزانیی خەڵکی گوندی (بارزان)ە. پێش نێوی مەلای هەیە کە بە واتای زانای ئیسلامەوانیی دێت. ئەمە وای لە زۆر کەس کردووە کەوا تێ بگەن ڕێبەرێکی ئاینیی‌یە.

هەر زوو توانا و لێ هاتوویی سەرکردەیەکی میللی لێ دیاریی دا. ساکار، بەرچاو تێر، جەسوور، ئازا، هێمن، خۆ ڕاگر، دوور بین، خاوەن توانایەکی عەسکەریی. بۆ نموونە ڕۆژنامەی (New York Herald Tribune) بە "جەنگاوەرێکی هەڵکەوتوو" و "پاڵەوانێکی کورد" نێوی دەبات(٢٦٤). لەگەڵ ئەوانەدا مرۆڤێکی خانە گومان بوو. کەواتە پێداویستی‌یەکانی سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتووی تێدا کۆ بوو بووەوە.

"هێمن بوو، توانایەکی خۆڕسک وکەسایەتی‌یەکی زۆر سادەو ساکاری تێدا بەدی دەکرا، ڕۆلاند ئویرتل لەگوتارێکی (Frankfurter Rundschau)دا بەو جۆرە باسی لێوە دەکات(٢٦٥).

بارزانیی هەمیشە کەمی گوتووە و زۆری کردووە، "بەڕاسی سەرکردەیەکی میللی و مێژوویی‌یە"، وەکو (Jean Pradier) لەبارەیەوە دەڵێت(٢٦٦). باو و باپیرانی هەر لەسەروەختی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی‌یەوە لە شۆڕشە ئازادیخوازەکانی کورد دا بەشدار بوون. بابی کە نێوی (عبدالسلام بارزانی)(×) بوو، لە ١ی دیسەمبەری ١٩١٤دا بە تاوانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی ١٩٠٨ لە دژی دەستەڵاتدارانی عوسمانی، لەدار درا(٢٦٧).

---

(×) ئەمە برای بوو نەک بابی. بابی نێوی شێخ محەممەدە.

کەواتە هۆزی بارزانی‌یان لە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد دا جێگەیەکی دیاریان هەیە. ئەندامانی ئەم هۆزە بە یەکسانی‌ی دەژین، زۆر داخراو و کەنارگیرن. هیچ ڕژێمێک نەیتوانیوە تا ئێستا بارزانی‌یەک بکڕێت و بیکاتە داردەستی خۆی(×).

هەر بارزانی‌یەک بەشی خۆیی هەیە و کەسیان بە بەلەنگازی و دەست پانکردنەوە ناژین. مستەفا بارزانی‌ی لەخەباتیدا بۆ ئامانجە سیاسی‌یەکانی سوودی لە لایەنە گەشەکانی ئەم کەسایەتی‌یەی هۆزەکەی وەرگرتووە. لە ئاکاری سیاسی‌یەوە بارزانی‌ی زۆر واقیع بینانەیە. دەڵێت: (مرۆ دەم زۆر لە مافەوە دەژەنێت، بەڵام ماف تەنها بۆ هێزدارانە، چونکە تەنها ئەوان خاوەن دەستەڵاتن)(٢٦٨).

١٩٤٢ بارزانی‌ی توانی لەدەست بەسەرەی سلێمانی‌یەوە هەڵبێت، بە ڕاوێژکاریی حیزبی هیوا(٢٦٩) بیرخەرەوەیەکی دایە رژێم، کە تێیدا داوای پێشخستن و چاک کردنی باری رۆشنبیری و ئابووری کوردی‌ی کرد. رژێمی عێراق لە ١٩٤٣/١١/٦دا بە هێرشێکی سوپایی وەرامیان دایەوە. بەڵام جەنگ هیچ دادێکی نەدان، بۆیە ناچاری گفتو گۆ کردن بوون. لە نۆڤەمبەری ١٩٤٣دا حیزبی هیوا لەبەغدا بیرخەرەوەیەکی دایە باڵوێزی ئەمریکا، کە تێیدا داوای پشتگیری‌یان لە ئەمریکا کرد. هەرچەندە ئەمریکا هیچ وەرامێکی ئەو هانا بردنەی نەدایەوە، بەڵام رژێم هەندە ئیمتیازاتێکی دا. دیارە ئەوەش لەترسی ئیحتیمالی تەنینەوەی نێو دەوڵەتانەی کێشەکە بوو لەو کاتە ناسکەی دووهەم جەنگی جیهانیدا. لەبەغدا وەزارەتێک بۆ کاروباری کوردان دانرا و کوردێک بە نێوی (ماجید مستەفا)وە کرایە وەزیری. بەڵام ماجید بەکرێگیراوێکی ئینگلیز بوو، کە تەنها بە ئەنجام گەیاندنی پلانێکی پێ سپێردرا بوو. داوای شەڕ راگرتنی لە بارزانی‌ی کرد ولە ٧ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٤دا داوەتی بەغدای کرد، تا پەیمان لەگەڵ رژێمدا مۆر بکات. ئینگلیز لە پشت پەردەی ئەو پەیمانەوە خۆیان مەڵاس دابوو. ئامانج ئەوە بوو هێندەی بکێشیت بەو شەڕ ڕاگرتنە جارێ شۆڕشی کورد راگیرێت. چونکە لەو گەرمەی جەنگی دووهەمەدا ئینگلیز توانای ئەوەی نەبوو پشتگیری‌ی سوپایی لە عێراق بکات. بە

---

(×) لەم سالانەی دواییدا هەر لە خودی خانەوادەی بارزانی‌ی خۆی، چەند کوڕێکی خۆیان بەڕژێم فرۆشت و دژی باییان وەستانەوە. وەکو لوقمان و عوبەیدوڵلا. کە ئەمەی دواییان هەر لەو سەرە رۆیی‌یەدا گیانیشی لەدەست داو رژێمی عێراق سەرنگومیان کرد، پاش ئەوەی ماوەیەک پلەیەکی ساختەی وەزیری‌یان دایە و دژی بابی هەڵیان دەسوڕاند.

پێی ئەو پەیمانە حەوت ئەفسەری کورد وەک (پێوەندی کەر)ان لە نێوان بارزانیی و ڕژێمدا، نێردرانە بارزان. بەڕێکەوت هەندێ لەو ئەفسەرانە زۆر نیشتمان پەروەر بوون. لە پتەو کردن وبەهێزکردنی بزووتنەوەکەدا، زۆر یارمەتی بارزانییان دا. چوار لەو ئەفسەرانە، تا دوا ترپەی ژیانیان بۆ باوەڕەکەیان زۆر بە ئەمەک مانەوە(٢٧٠).

ئەو سەروەختە بارێکی سیاسی گونجاو بۆ کورد ڕەخسابوو. تورکیا کە گەورەترین پارچەی کوردستانی داگیر کردووە، شەریکە ئاڵەمان و دژ بە ئینگلیز بوو(٢٧١). بۆیە ئینگلیز دژی ئەوە نەبوو کورد بۆ ماوەیەک ئاهێکی بە بەردا بێتەوە. لە ڕادیۆی (حەیفا)وە بەرنامەیان بە کوردی بڵاودەکردەوە. لەبەغداش باڵوێزخانەی ئینگلیز گۆڤارێکی کوردی بەنێوی (دەنگی گێتی تازە)وە دەردەکرد. من ئەو کاتانە مێر منداڵێک بووم و لە قوتابخانەی سەرەتایی دەمخوێند، چاکم بیرە بەیانیان پێش چوونە پۆل کۆیان دەکردینەوە و سروودی نەتەوایەتی کوردمان دەچڕاند. بەڕاستی هەل و دەرفەتێکی چاک بوو گەر توانرابا پڕا و پڕ سوودی لێ وەرگیرابا.

کورد لەسەر وەختی جەنگدا ڕێک و پێک و پڕ توانا تێ نەکۆشان، هەلی ڕەخساوی ئەو جەنگەیان لەکیس داو وەک پێویست سوودیان لێ وەرنەگرت. بەخۆداهاتنەوەی پاش جەنگیش تازە دێر و بێ شەر ئەنجام بوو. لە ٢٩ی نۆڤەمبەری ١٩٤٨دا وەفدێکی کورد لە پاریس بیرخەرەوەیەکیان دایە (تریکفە لیی) سکرتێری گشتی ئەو کاتەی نەتەوە یەک گرتووەکان، کە تێیدا داوای چارە سەرکردنی کێشەی کوردیان کرد بوو(٢٧٢). بیرخەرەوەکە پشت گوێ خرا.

لە مایسی ١٩٤٤دا نوری سەعیدی سەرەک وەزیرانی عێراق و ماجید مستەفای وەزیری کاروباری کوردان، سەردانێکی کوردستانیان کرد، تا بار و دۆخەکە بە پێی سەردەم و قۆناغە نوێکە هەڵسەنگێنن. لەگەڵ گەلەک سەرەک هۆزی کورد دا (جگە لە بارزانیی) لە کێشەی کورد دوان. گفتی جۆرە ئۆتۆنۆمییەکیان بە کورد دا. نوری سەعید پاش گەڕانەوەی ڕاپۆرتێکی بە پەرلەمان دا. ڕاپۆرتەکە دەڵێت لە کوردستاندا سێ توێژاڵ هەن:

١- سەرەک خێڵەکان، کە تەنها بیر لەبەرژەوەندیی خۆیان دەکەنەوە.

٢- بازرگانەکان، کە هێمنیی بارەکە و ئارامی خۆیان گەرەکە، تا بەرژەوەندیی ئابووریان پارێزراو بێت.

٣- توێژاڵێکی ڕوناکبیر، کە ئامانجی سیاسییان کوردستانێکی مەزن و

سەربەخۆیە[٢٧٣]. نوری سەعید وای راگەیاند کە گوایە (هێزە زەبەلاحەکان دەخوازن کێشەی کورد بۆ ئامانجی خۆیان بەکار بهێنن)[٢٧٤].

هەروەها گوتی (... ئاشکرایە ئێمە لە بارێکی نائاسایی‌دا دەژین، بۆیە ئەرکی هەر یەکێکمان ئەوەیە، لەم کاتی جەنگەدا، زۆر هوشیارانە (لەگەڵ کورد)دا مامەڵە بکەین... داوای من ئەوەیە کە هەست و هۆشمان لای ژووروو (کوردستان) بێت... تاد)[٢٧٥].

ئەو (هەست و هۆشەیان لای ژووروو) زۆری نەخایاند. یەکەو ڕاست پاش کۆتایی دووهەم جەنگی جیهانی‌ی ئاشکرا بوو چ هۆشێکە. گفت و بەڵێنەکانی ئۆتۆنۆمی لەلایەن وەزیرە عارەبەکانی کابینەکەیەوە درانە دواوە[٢٧٦].

١٩٤٤ بارزانی‌ی داوای لە رژێم کرد، گفتەکانی ١٩٤٣ بەرێتە سەر. بە هێرشێکی سوپایی وەرامیان دایەوە.

لە ١٩٤٥/١/٨دا سکرتێری پارتی هیوا، رەفیق حیلمی (٣٠/١٠/١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووە) نامەیەک بۆ بارزانی‌ی دەنووسێت و کۆمەک و پشتگیری حیزبەکەی پێش چاو دەخات[٢٧٧]. بارزانی‌ی خۆش ئامادەیی لەو کۆمەکە دەکات[٢٧٨].

لە ١٠ی ئۆگوستی ١٩٤٥دا شۆڕشی بارزان هەڵگیرسایەوە. سوپای عێراق لەلایەن هێزی ئاسمانی‌ی ئینگلیز[٢٧٩] و جاشە کوردەکانەوە (کە زۆربەیان فیۆدالەکان بوون) پشتگیری‌ی لێ دەکرێت. پاش بەرەنگاری‌یەکی قارەمانانە بارزانی‌ی و لایەنگرانی ناچار بوون لە ١٩٤٥/١٠/٧دا کوردستانی عێراق جێ بهێڵن و[٢٨٠] بچنە کوردستانی ئێرانەوە. بارزانی‌ی لە کۆماری کوردی تازە دامەزراوی مەهاباد[٢٨١]دا دەکرێتە ژەنەراڵێکی سوپای ئەو کۆمارە ساوایە. <u>پاش هەرەس هێنانی کۆمارەکە لە کۆتایی ١٩٤٦دا، بارزانی‌ی داوای پەنابەرێتی بۆ خۆی و هەڤاڵەکانی، لە ئەمریکا دەکات. داواکەی دەدرێتە دواوە،</u> چونکە بە داردەستێکی "شووره‌وی‌ی" دەزانرا[٢٨٢] هەمان کات رژێمی (ستالین)یش بە بەکرێگیراوێکی ئینگلیز تاوانباریان دەکرد[٢٨٣].

بارزانی‌ی ئێرانی جێ هێشت و گەڕایەوە عێراق. لە ١٤ی مایسی ١٩٤٧دا عێراق جاری شەڕی دژی بارزانی‌ی هەڵدا. تورکیا و ئێرانیش بە هەمان جۆر لە ئامادەیی دا بوون. بارزانی‌ی جەنگاوەری بە توانا، پاش ئەوەی ماوەیەک لە عێراق جەنگی، ئەوجا لە ٢٠ی مایسی ١٩٤٧دا هێزەکەی کرد بە تورکیادا. دوای هەندێ شەڕ و پێکدادانی قورس لەگەڵ ژەندرمەی تورک دا، هەمدیسان دەگەڕێتەوە دیوی ئێران، لەوێ سوپای ئێران

پەلاماری دەدەن. رادیۆی BBC لەندەن لە ١٧ی حوزەیرانی ١٩٤٧دا باسی توند ترین شەڕ لەنێوان بارزانی و سوپای ئێران دا دەکات.

بارزانیی و ٥٣٠ هەڤالی، بە سنووری نێوان تورکیا و ئێراندا زیرەکانە و پیتۆڵانە خۆیان بۆ شوورەویی دەرباز دەکەن. لە سۆڤیەت و وولاتە سۆسیالیستەکانی دی مانەوە، تا لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا ژەنەراڵ قاسم کودەتایەکی سوپایی کردو و کۆتایی بەرژێمی پاشایەتیی عێراق هێنا.

بارزانیی لەو یازدە ساڵە لەشوورەویی چی کردووە، نەزانراوە. بە پێی هەندێ سەرچاوەی رۆژئاوایی (کە برێکیان دوژمنی کوردن، وەکو رۆلف ف. شلۆس بڕوانە لاپەڕە ٢٥) گوایە لە ئەکادیمیای عەسکەریی مۆسکۆ خوێندوویەتی و پلەی ژەنەراڵی سۆڤیەتیی وەرگرتووە. بەو هۆیەوە گەلەک جار لە رۆژئاوا بە هەڵە بارزانی بە "ژەنەراڵی سوور" نێو دەبەن(٢٨٤).

لێرەدا پێویستە ئەوە یادخەینەوە، کە بارزانیی لە سوپای کۆماری مەهاباد دا و پێش دا ی شوورەویی، ژەنەراڵ بووە.

شوورەویی تا ئێستا هیچ روونکردنەوەیەکی دەربارەی ئەو ماوەیەی ژیانی بارزانیی پێش چاو نەخستووە. هەندێ سەرچاوە دەڵێن بارزانیی لەوێ زۆر هەژارانە ژیاوە و هەتا گوایە (ئاشەوانیی) کردووە(٢٨٥) بارزانیی خۆی دەڵێت مێژوو و سیاسەت و ئابووری گەلانی خوێندووە(٢٨٦). ئەو زانیارییانەی بە ئێمە گەیشتوون وا ڕادەگەیەنن کە بارزانیی لە ١٩٤٨ەوە تا مردنی ستالین لە زیندان دا بووە. ئەمەش بە هۆی ئەوەوە گوایە داوەتێکی (باقرۆف)ی سەرکۆماری ئازربایجانی داوەتە دواوە، چونکە تەنها بارزانیی داوەت کردووە بێ لە هەڤاڵەکانی. باقرۆف رەنجاوە و لای ستالین بۆی تێ چاندووە و ئەویش فەرمانی گرتنی بارزانیی داوە. لەسەردەمی مالینکۆف و خرۆشۆف دا حاڵی زۆر باش بووە و چاک بەڕێوەچووە. شایانی باسە هیچ یەکێک لە بارزانییەکان لەشوورەویی ژنیان نەخواست(×). بەپێچەوانەی زۆر کوردی دیکەی پەریدەی هەندەرانەوە. زۆریان بۆیان گێڕاومەوە کە هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوون کە رۆژێک دێت و دەگەڕێنەوە. سا هەر واش

---

(×) ئەم زانیارییەی بە مامۆستا نەبەز دراوە، تەواو راست نییە. چونکە هەندێک لە بارزانییەکان لەشوورەویی ژنیان خواستووە. بۆ نموونە خوالێخۆشبوو شێخ سلێمان کوڕی شێخ عەبدولسەلام دوکتۆر سەعید ئەحمەد نادر، ملکۆ بارزانیی، وەیس بارزانیی و عیسی سوار.

بوو. شێخ ئەحمەد بارزانیی لەگەڵ بارزانیی و هەڤاڵەکانیدا بۆ شوورەویی هەڵنەهات، بەڵکە لە گەڵ زۆبەی خێزانە بارزانییەکان و چوار ئەفسەرە کوردەکەی لە گەڵیاندا چووبوونە مەهاباد، گەڕانەوە. پاش ئەوەی عێراق گفتی لێ خۆش بوونی پێدان، خۆیان تەسلیم کردەوە. هەر چوار ئەفسەرەکە لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧دا لە بەغدا لە دار دران. شێخ ئەحمەد و هەموو بارزانییەکانی دی لە زیندان خزێندران و تا کودەتای قاسمی ١٩٥٨ تێیدا مانەوە. لە ١٩٥٨/٧/٢١دا بە مەرسومێکی جەمهوریی ئازاد کران.

## بزووتنەوەی سیاسی کورد پاش هەڵهاتنی بارزانیی

دەبێت باسێکی جموجۆڵی سیاسییانەی کورد لە عێراقدا لە پاش هەڵهاتنی بارزانیی بکەین:

"پارتی دیمۆکراتی کوردستان" کە لە ١٦ی ئۆگوستی ١٩٤٦ دا لە لایەن هەندەک رووناکبیری کوردەوە، بەسەرپەرشتیی پارێزەر هەمزە عەبدوڵلا، میر حاج ئەحمەد و هەندێکی دی دامەزرێنرا، هەر ئەو کاتە بارزانییان کردە سەرۆکی. هەر چەندە بارزانیی خۆی لە دامەزرێنەرانی نەبوو. دامەزرێنەرانی پارت لە توێژاڵی وردە بۆرژواوە سەریان هەڵدا بوو. باوەڕیان بە خۆیان و هێزی جەماوەر نەبوو، بەڵکە بەکەسی نێو و نێوبانگ دار. لەشالاوی کۆمۆنیستیش زۆر دەترسان، کە ئەو کات و سەردەمە هێز و پروپاگەندەیان زاڵ بوو، بە تایبەت لە ١٩٤١و بە دواوە، پاش ئەوەی سوپای شوورەویی چوونە ئازربایجان وکوردستانەوە. ئەم توێژاڵە سیاسییە بزۆزەی وردە بۆرژوای کورد، بەدووی پشتیوانێک دا وێڵ بوون، تا لە سایەیدا خۆ حەشاردەن. ئەو توانایەیان لە بارزانییدا دیتەوە. بەتایبەت کە ئەو سەروەختە بارزانیی نێوبانگێکی ئازادیخوازانەی درەوشاوەی هەبوو. جگەلەوەی پاش (هەرەسی کۆماری مەهاباد)یش بۆ شوورەویی هەڵهاتبوو. بەو بۆنەیە ئەو پارتە لە کۆمۆنیست تۆقیوانە ئیدی ترسیان لەوە رەوی بوو کە کۆمۆنیست بە تەکرێ گیراوی ئەمریکا نێوزەدیان بکەن. ئا بەو جۆرە سەرکردەکانی پارت هەر لە هەڵهاتنی بارزانییەوە بۆ شوورەویی تا گەڕانەوەشی، بەنێوی ئەوەوە دەدوان و بەنێوی پارتەکەیەوە پروپاگەندەیان دەکرد. بێ ئەوەی هیچ پرسێک بە خودی بارزانیی بکەن و رایەکی وەرگرن. ئەو هەڵبژاردنە خۆبەخۆیەی سەرۆکی پارت، ماکی صەدان تەنگوچەڵەمەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و پاشانیش بووە هۆی دووبەرەکی پارت. مەسەلەیەکە روون و ئاشکرا، سەرکردەی پارتە شۆڕشگێڕەکان دەبێت لەبۆتەی خەبات دا قاڵ بوو بن و خۆیان

حێ بەنجە و حێ پێی تێکۆشانی خۆیان دیاریێت. سەرانی پارتێک کە لە رێگەی نێوبانگی کەسانی دیکەوە بە دۆستایەتی کەسێک بناسرێندرێن، دیارە ئەو سەرانە هەر بەدەستی ئەو دۆست و نێودارە بە ئاسانی ئاوەڕووت دەکرێن. پارتێک کە لەبەنا نێوبانگی کەسێکدا، سەرکردەیەکی نامۆ دا، رەگی داکوتابێت، بە ئاسانی ناتوانێت نێوی ئەو کەسە بسڕێتەوە و لەکەداری کات و لەبنی هەڵکێشێت. "بیاو شتێکی نەدابێت، ناتوانێت بیسێنێتەوە". پارتێکی بۆرژوای وەک پارتی دیموکرات ئەم راستییەیان بەمێشکدا نەدەچوو. کاتێک ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی پارت (۱۹٥۹و۱۹٦٤) هەوڵیان دا بارزانی سەرۆکیان هەڵدێرن، خۆیان سەرەنگرێ بوون. وەک لە پاشاندا دەبینین.

لەپاش دووهەم جەنگی جیهانیی لەکوردستانی عیراق دا دوو رێچکەی سیاسی هەبوون. پارت وکۆمۆنیست. هەروەک ئەورۆکە پارتێکی کۆمۆنیستی کورد لە ئارادا نەبوو. شایانی باسە کە رێرەوی کۆمۆنیستیی چ لە کوردستانی عێراق و چ لە کوردستانی ئێراندا، لەپاش دووهەم جەنگی جیهانی، زۆر لەبرەودا بوو. بەتایبەت پاش ئەوەی شوورەویی لە دامەزراندنی ئەو کۆمارەی کوردستانی ئێران دا دەوری هەبوو. خیانەتی ستالین بەرامبەر بەکورد وەک پێشتر لێی دواین، لەلایەن کۆمۆنیستەوە بە نێزیکە بەم جۆرە عەیب پۆش دەکرا: "رژێمی ستالین خۆی نەیویستووە کورد بە گورگان خواردوو بدات، بەلام چاری نەبوو. نەیدەتوانی هەتا سەر دەست بە باڵی کوردەوە بگرێت، چونکە بە دڵنیاییەوە ئەوە دەبووە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگێکی سێهەم لە جیهاندا"، "تاوانی تەنهای لە ئەستۆی جیهانی سەرمایەداریی ئیمپریالیزمدایە، نەک رژێمی ستالین".

لە ژێر تین و تاوی ئەو پروپاگەندانەدا، خەڵکی لە کوردستاندا رۆژ بە رۆژ بەلای شوورەوییدا دایان دەشکاند و قێزیان لەبەرەی رۆژئاوا دەهاتەوە. جگە لەوە پیاو رۆژانە لە کوردستاندا واقیعەکەی بەچاوی خۆی دەدیت. دەیبینی چۆن سەرمایەدارانی رۆژئاوا سەروەت و سامانی بە تالان دەبەن و دایدەدۆشن. بۆ نموونە لە شیرکەتی نەوتی کەرکوک و کرماشاندا سامانی کورد ئاشکرا تالانکاریی دەکرا. مانگرتنێکی کارکەرانی نەوت لە گەرەکی "گاورباخی"ی شاری کەرکوک لە ۱۲ی تەموزی ۱۹٤٦دا لە لایەن رژێمەوە دڕندانە سەرکوت کرا. چەندین کارکەر ژیانیان لەدەست دا.

بەشێک لە مێژووی خەباتی کورد لە عێراقدا هەر لە پێش هەڵهاتنی بارزانییەوە بۆ

شووره‌وی تا گه‌رانه‌وه‌ی، مێژووی زۆرانبازی‌ی نێوان پارت و کۆمۆنیسته‌. ئه‌و زۆرانبازی‌یه‌ تا ئه‌وڕۆکه‌ش به‌رده‌وامه‌. هه‌رچه‌نده‌ هه‌ردوولاشیان خۆیان به‌ مارکسی- لینینی نیشان ده‌ده‌ن. پارت خۆی به‌ پارتێک ده‌زانێت که‌ به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌کانی جوتکار و کرێکار و بۆرژوای نیشتمانی ده‌پارێزێت، یانی جۆره‌" پارتێکی میللی"یه‌. سوورن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی هیچ پارتێکی دی-نا کورد- مافی ئه‌وه‌ی ناکه‌وێت که‌ نوێنه‌ری گه‌لی کورد بێت. کوردستان خاکێکی خۆ به‌خۆیه‌، بوونی حیزبێکی کۆمۆنیستی عێراقی له‌ کوردستاندا، زیان به‌ مه‌سه‌له‌ی کورد ده‌گه‌یه‌نێت(٢٨٧). شایانی باسه‌ پارتی کۆمۆنیستی عێراق (که‌ له‌ ٣١ی مارتی ١٩٣٤دا له‌لایه‌ن "یوسف سلمان یوسف"ی ناسراو به‌ "فهد"ه‌وه‌ دامه‌زرا)، له‌سه‌ره‌تاوه‌ کوردیان به‌ "که‌مه‌نه‌ته‌وه‌یه‌ک" ده‌زانی، نه‌ک به‌ نه‌ته‌وه‌یه‌کی پارچه‌ پارچه‌ کراو(٢٨٨). پارتی کۆمۆنیستی عێراق بانگاشه‌ی ئه‌وه‌ ده‌کات که‌ (تاکه‌ نوێنه‌ری چینی پرۆلیتاریای عێراقه‌، چ کورد بن یا عه‌ره‌ب)(٢٨٩). زیاد له‌وه‌ ده‌ڵێن (عێراق له‌یه‌که‌یه‌کی سیاسی و ئابووری پێک دێت) و گشت حیزبێکی مارکسی له‌سه‌ر بنچینه‌ی تێکۆشانی چینایه‌تی داده‌مه‌زرێت، نه‌ک تێکۆشانی نه‌ته‌وه‌یی. له‌هه‌ر وولاتێک دا "ته‌نها تاکه‌ پارتێک هه‌یه‌" که‌ "نوێنه‌ری کرێکاران و جوتیاران بێت" گه‌ر یه‌کێکی دی بوو دیاره‌ "ئۆپۆرتونیست" و"گه‌ل فرۆشه‌". به‌و پێ‌یه‌ پارتی دێموکراتی کوردستان ته‌نها" نوێنه‌ری وورده‌ بۆرژوای کورده‌"(٢٩٠). که‌واته‌ هه‌رای سه‌ره‌کی‌ی نێوان پارتی دێموکرات و پارتی کۆمۆنیستی عێراق له‌سه‌ر بوونی لقێکی پارتی کۆمۆنیسته‌ له‌ کوردستاندا. وه‌کو کۆمۆنیستێکی عێراقی دیار و به‌رچاو ره‌پ و راست پێ‌ی لێ ناوه‌(٢٩١).

ئه‌وه‌ی پارتی دێموکراتی کوردستان پارتی وورده‌ بۆرژوای کورده‌، ڕاستی‌یه‌کی بێ گرێ وگۆڵه‌. پارت قاڵبێکی ئیدیۆلۆژی‌ی دیاری کراوی نی‌یه‌. له‌مه‌وه‌ دیاره‌ که‌ ستراتیژێکی ئاشکراشی نی‌یه‌. کاتێک کۆمۆنیستی و مارکسێتی له‌ بره‌و دا بێت، مارکسین. کاتێکیش نه‌ته‌وه‌یییه‌کان جڵه‌وی حوکمیان به‌ده‌ست بێت، ئه‌وانیش نه‌ته‌وه‌یین. هه‌ر کاتێکیش دیکتاتۆرێک حوکمی وولاته‌که‌ی کرد، ئه‌مان دێموکراتین. بۆ نموونه‌ "دارا تۆفیق"ی ئه‌ندامی سه‌رکردایه‌تی شۆڕشی کورد و بالاّ ده‌ستێکی پارت، پارتی به‌ حیزبێکی "نه‌ته‌وه‌یی" نێو ده‌برد(٢٩٢). پاش ئه‌وه‌ی پارت په‌یمانی یازده‌ی ئازاریان له‌گه‌ڵ به‌غدا مۆر کرد.

ئه‌ندامانی پارت جۆره‌ها بیر و بۆچوونی جوداوازیان هه‌یه‌: نه‌ته‌وه‌یی، دێموکراتی، سۆسیالیستی ئیسلاحی، ئاینی‌ی... تاد. به‌ نێزیکه‌ له‌ هه‌موو کۆنگره‌یه‌کدا پرۆگرام ده‌گۆڕدرێت. به‌هه‌ق پارتی دێموکراتی کوردستان به‌ پارتێکی چه‌پ ڕه‌وی ئۆپۆرتونیستی نا

شۆڕشگێڕانە نێو براوە. بۆ نموونە لەیەک کاتدا هەوڵ دەدات ١- خاکی کوردستان بە خاکی کورد نیشان بدات کە لە ڕێگەی زەبر و زۆری ئیمپریالیزمەوە دابەش کراوە و ٢- هەوڵیش دەدات ئەم سنوورە دەستکردانەی ئیمپریالیزم پتەوتر کات.

پارتی دیمۆکراتی کوردستان زۆر باسی (برایەتی کورد و عارەب) دەکات. بەڵام ئایا بێ هاوتایی و هاوشانی هیچ جۆرە برایەتییەک بووە لوغەی مارکسییە خەلیسەکان؟ لەسایەی ڕژێمێکی سۆسیالیستیدا نەبێت کە مافی ئازادیی هەر نەتەوەیەک و چارەنووسی بداتە دەست خۆی، هاوتایی و هاوسانی کوا؟ برایەتی کورد و عارەب جارێ نێوێکی بێ نێوەڕۆکە، چونکە ئەو عارەبانەی باوەڕیان بەو برایەتییە هەیە و ئارەزووی دەکەن، هیچ دەستەڵاتێکیان بەدەستەوە نییە.

کە ئێمە بە پارت دەڵێین: "برایەتی کورد و عارەب" جارێ تا ئێستا تەنها هیوایەکی پەتییە، بە "جودا خواز" نێومان دەبەن!! ئەوەتا پارت لە پرۆگرامەکەیدا دژی ئێمەی "جودا خواز!!" خەبات دەکات[٢٩٣]. بەو بەهانە بن پۆش و هەرزانەی هەمیشە کوتەکی دەستی داگیرکەران و ئیمپریالیزم بووە، بۆ سەرکوت کردنی هەڵگرانی بیری ئازادیی لە کوردستاندا. کەواتە پارتی دیمۆکرات، پارتی وردە بۆرژوای کوردستانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە گەلەک جوتکار و کرێکار لەڕیزی پارت دان، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی وەک بارزانییان هەیە.

ئەوڕۆ کە پارت ڕێبەریی شۆڕشی کوردستان دەکات، وە نەبێت لەشۆڕشگێڕێتی خۆیان بێت، بەڵکە کەسایەتی سەرۆکەکەیانە کە ڕۆڵێکی دیاری لە سەرخستن و پێشەوایەتی شۆڕشەکەدا دیتووە. ئەمە بالادەستێکی پارت، (صالح یوسف)ی خۆشی بێی لێ ناوە[٢٩٤].

کەواتە لێرەدا ئێمە لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا، لەسەر ئەوە یەکین کە پارتی دیمۆکرات، حیزبی وردە بۆرژوای کوردە.

بەڵام ئاشکرایە پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش چارەی دزێوی ئیستیعماری عێراقی، بە دروشمی (برایەتی کورد و عارەب) لێفە پۆش دەکات. دیارە دەبایە لای پارتی کۆمۆنیست شاردراوە نەبایە، کە "برایەتی" پێش هەر شتێک چوون یەکی و هاوشانییە. ئەمە سەرەتا و ئەلف و بێی بیری مارکسیزمە. چوون یەکی و هاوشانیش بە پێوەری مارکسیزم لە ڕژێمێکی سۆسیالیستیدا نەبێت وەدی نایەت.

هەر دوو پارتی کۆمۆنیست و دیمۆکرات ڕێکخراوی نهێنی بوون. بەڵام ڕاپەڕینە

جـەمـاوەری‌یە لە ناکـاوەکـەی ١٩٤٨/١/٢٧ کـە دژی پەیمانی (پۆرتسـموٚث)ی ١٩٤٨/١/١٥ی نێوان عێراق و ئینگلیز بوو، بەهۆیەوە کابینەکەی صالح جەبر رووخا، بواری ئازادی‌ی جموجۆڵێکی زێتری بۆ لایەنگرانی کۆمۆنیست و دیمۆکرات رەخساند. هەمان کات مل ملانێ‌ی ئیدیۆلۆژی‌ی نێوان هەردوولایان دەستی پێ کرد. کۆمۆنیستەکان تاکو بتوانن ئەو زۆرانبازی‌یە چێتر رێبەری بکەن، خۆیان لەپشت پارتی سۆسیال دیمۆکراتی (التحرر الوطني) عێراق دا حەشار دا. بەو پێ‌یە توانی‌یان ئاسانتر ببزوون. هەرچەندە (التحرر) زوو لە لایەن رژێمەوە قەدەغە کرا، بەڵام دژایەتی‌یەکەیان بە بەیان نامە بەردەوام بوو. دژایەتی یەکدی‌ی بەلای هەردوولاوە لە دژایەتی‌ی ئیمپریالیزم لە پێشتر بوو.

لە ٢٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٢دا ڕاپەڕینێکی جەماوەری‌ی لەبەغدا بەرپا بوو، کە بە نێزیکە گشت حیزبەکان تێیدا بەشدار بوون. بەڵام رژێم تەنها پارتی کۆمۆنیستی تاوانبار کرد. ویستی بەنێوی بەرەنگاری‌ی کۆمۆنیستەوە زەبر بەهەموو هێزە نیشتمانی‌یەکان بگەیەنێت. ئەو شێتگیری‌یەی رژێم بووە کۆمەکێکی مەعنەوی‌ی چاک بۆ کۆمۆنیستان و بەهۆیەوە بەهێز تر بوون. (وەصی) عەبدول ئیلاه دروست کردنی کابینەیەکی نوێ‌ی بە ژەنەراڵ (نورالدين مەحمود) سپارد(*). رژێمی عەسکەری‌ی نوێ هەموو حیزبەکانی قەدەغە کرد. ژمارەیەکی زۆری لەسیاسی‌یەکان، رۆژنامە نووسەکان، خوێندکاران و کرێکاران گرت. من ئەو کاتە لە زانستگەی بەغدا دەمخوێند و لە یادمە چۆن لە کاژێری دووی شەودا، پۆلیس هەڵیان کوتایە سەرم و لە پێخەف دەریان کێشام. پاشان بە حاڵێکی زۆر شڕەوە سێ حەوتووم لە رەشبگیرخانەدا بردە سەر.

زۆر کەس لەسەر شەقامەکان بەر تەقە دران، چونکە بەقەدەغە کردنی هاتووچۆیان نەزانیبوو. لە یادمە تەنها رێفۆرمێک کە حوکومەتەکەی (نورالدين مەحمود) کردی هەرزان

(*) یەکەو ڕاست پاش خامۆش کردنی ڕاپەڕینەکە، (وەصی) کابینەکەی (نورالدين مەحمود)ی هەڵوەشاندەوە. (نورالدين) کارەکەی پێشووشی لە کیس چوو. پێشان سوپا سالاری عێراق بوو. ١٩٥٥ لەگەڵ دۆستێکدا کە ناسیاوی بوو، سەردانێکمان کرد. سەرزەنشتی رەفتارەکانیم کرد، لەوەرامدا گوتی گوایە (کورد)ە و بۆیە پلەی سەرەک وەزیرانی قەبوڵ کرد، تا بتوانێت کودەتایەک دژی رژێمی پاشایەتی بەرپاکات و (گەل رزگار کات). بەڵام بۆیە سەری نەگرت، چونکە ئەفسەرە کوردەکانی سوپای عێراق رێکخراو و کۆک نەبوون. نازانم ئەم بانگاشەیەی تا چەند ڕاستە. بەهەر حاڵ رۆڵی سیاسی‌یانەی ئامراز و دار دەستێکی رژێم بوو.

کردنی هەندێ سەوزەواتی وەکوو توور و گوێزەر و شێلم بوو. کرێکارێکی قنۆشمە بروسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ سەرەکی وەزیران ناردبوو، گوتبووی: (نرخ دانانتان بۆ شێلم، دڵی فێنک کردینەوە. ئێزدان بتانپارێزێت بۆ خزمەتی زێتری ئەم میللەتە). کابرا شەش مانگ لە گرتووخانە توند کرا.

ئەو هەڵوێستە دڕندانەی رژێم جێ پێی پارتی کۆمۆنیستی لای میللەتەکە قایم تر کرد. چونکە رژێم دەربڕی "کە بەرەنگاری یەکی سەر سەختانەی بزووتنەوەی قەدەغەکراوی کۆمۆنیست دەکات".

به هەمان جۆر پارتی کۆمۆنیست لە کوردستانیشدا بە هێز تر بوون. بە پێچەوانەوە، پارتی دێمۆکراتی کورد لە ١٩٥٢دا دووبەرەکی یەکی تێکەوت. دووباڵی لێ کەوتەوە: باڵی هەمزە عەبدوڵلا و باڵی برایم ئەحمەد.

هەر چەندە من ئەندامی پارت نەبووم؛ بەڵام تکایان لێ کردم بکەومە بەینەوە. باش ماندوو بوونێکی زۆر ئەوجا لە زستانی ١٩٥٤دا توانیم کۆبوونەوەیەک لە بەغدا بۆ هەردوولایان ساز بکەم. لەوانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربوون برایم ئەحمەد (کۆنە سکرتێری گشتیی پارتی دێمۆکرات)، حیلمی عەلی شەریف (ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزیی)، عەبدولرەحمان زەبیحی (کوردێکی کوردستانی ئێرانە و پاشان بووە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی کۆمەڵی تاڵەبانی)، عەلی شەریف (کە نوێنەری باڵی هەمزە بوو). دەرکەوت تێکچوونەکەیان شتی شەخسی رووتە. پاشان یەکیان گرتەوە و (پارتی دێمۆکراتی کوردستان)یان پێک هێناو پرۆگرامێکی نوێیان بۆ دانا.

١٩٥٢ کوردێک کە نێوی (بەهادین نوری)یە و نێوی نهێنی (باسم)بوو، بووە سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق. لەسەردەمی ئەودا پارتی کۆمۆنیست پرۆگرامێکی نوێی دانا، کە بە (پرۆگرامی باسم) ناسراوە. (پرۆگرامی باسم) هەڵوێستی پێشینی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بە (ئۆپۆرتونێست)انە دەست نیشان دەکات. چونکە پەرەگرافی دەهەمی پرۆگرامەکەی سەردەمی (فەهد) کوردی بە کەمە نەتەوەییەک لەقەڵەم دابوو[٢٩٥]. هەروەها (یەزیدی)یەکانیشی هەر بە کەمەنەتەوەییەک دەست نیشان کردبوو[٢٩٦].

پرۆگرامەکەی (باسم) دان بەوەدا دەنێت کە کورد نەتەوەیەکن و یەزیدییەکانیش بەشێکن لەوان. نەک کەمەنەتەوەییەکی جوداواز. لەراستیشدا هەر وایە و یەزیدییەکان کوردن[٢٩٧].

پرۆگرامەکەی (باسم) لەو رووەوە رەخنەی لە پرۆگرامەکەی (فەهد) گرتبوو کە لە هیچ پەرەگرافێکی دا دان بە مافی چارەنووسی گەلی کورد دا نانێت[298]. هەرچەندە پارتی کۆمۆنیستی عێراق دواتر پرۆگرامەکەی (باسم)یان گۆڕی، بەلام ئەو پەرەگرافەی (مافی چارەنووسی کورد) لە عێراقدا، کە تا مافی جودا بوونەوەش دەست نیشان دەکات، هێشتیانەوە[299]. ئەمە بووە هۆی چێتر بوونی پێوەندیی پارت و کۆمۆنیست. ١٩٥٤ هەردوو حیزبەکە لیستەیەکی هاوبەشیان بۆ هەلبژاردنەکانی پەرلەمانی عێراق دابەزاند.

لەگەل تاو سەندن و بەتین بوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد دا، پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش پتر بایەخی بەمەسەلەی کورد دەدا. لەدووهەم کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیست دا کە لە ١٩٥٦دا گیرا، پێشکەوتنی زێتر رووی دا. دانیان بەوەدا نا کە کورد لە عێراقدا لەهەموو روویەکەوە لە ژێر باری چەوساندنەوەی نەتەوایەتی‌یدا دەنالێت. هەتا لە بواری چاپەمەنی و بلاوکراوەو سوپاشدا. هەروەها دەلێت: "لەبارترین چارەسەری کێشەی کورد ئەوەیە کە هەردوو نەتەوەی کورد و عارەب دان بە مافی چارەنووسی یەکدی‌یدا بنێن و شان بە شانی یەک بۆ دەستەبەری ئازادی و یەکگرتنەوەی نەتەوایەتی هەردوو لا هەول دەن. بڕیارەکە داوای مافی ئۆتۆنۆمی‌یەکی نێوچەیی بۆ کوردستانی عێراق، لە عێراقێکی دێمۆکراسی و یەکگرتوودا دەکات"(*).

دەبێت ئەوەش بزانین کە لە لایەکەوە خاوکردنەوەی رێچکەی ستالینیزم لەشوورەوی (بەتایبەت لەسەر وەختی خرۆشۆف دا) و لەلایەکی دی‌یەوە سیاسەتی پان عارەبیزمی ناصر و پشتیوانی شوورەوی‌ی لێ‌ی، هۆشیاری نەتەوایەتی کوردی لە عێراقدا برەو پێ دا. ئەویش لەم راستی‌یانە سەری هەلگرتبوو: کۆمۆنیستەکان هەر لەدێر زەمانەوە هەولیان دەدا کورد تێ بگەیەنن کە هەموو تێکۆشانێکی نەتەوەییانە، کوردایەتی بێت یا عروبە، هەولدانێکی ئیمپریالیزمانەیەو لەگەل کۆمۆنیزمدا ناچنە جەوالێکەوە. کە خەلکی سادەی کوردستان دیتیان وا شوورەوی‌ی بەگەرمی پشتگیری بزووتنەوەی نەتەوە خوازانەی (ناصر) دەکات، لەگەل ئەو هەموو هەلوێستە نادۆستانەیەی دا بەرامبەر کۆمۆنیستەکانی میسر، ئیدی باوەڕیان بە کۆمۆنیستی خۆمانە کز بوو. لەو رووەوە لقی کوردستانیان گۆڕانکاری‌ی وای دیت، کە زۆر ئەندامیان بە تەواوی بڕوایان لەق بێت. لە ١٧ی

---

(*) جبار علي: "الحزب الشيوعي العراقي والمسألة الكردية"، مجلة "مسائل السلم والاشتراكية"، العدد ٨، آب ١٩٦٢.

ئۆگوستی ١٩٥٧دا، کەمال فوئاد، صالح حەیدەری، حەمید عوسمان و هەندێ بالادەستی دیکەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە کوردستاندا، روونکردنەوەیەکیان بلاوکردەوە بەو پێیە لقی کوردستانیان هەلوەشاندەوە و بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە پەیوەست بوون. ئەمە زەبرێکی سەنگین بوو لە پارتی کۆمۆنیست کەوت. لە نامیلکەیەکدا(٣٠٠) هەلویستی کەمال فوئاد و هاوڕێکانی بە هەلویستێکی بۆرژوایانەی کەم بایەخ و ئۆپۆرتونیستانە تاوانبار دەکەن و داپچڕانەکە بە ڕاسپاردەی ئیمپریالیزم دەست نیشان دەکەن.

پارتی دیموکرات لەو ڕێیەوە گوڕ و تینێکی پەیدا کرد.

بزووتنەوەی (پان عارەبیزم)ی ناصر تا دەهات بەتین و گوڕ تر دەبوو. وا پێویستی دەکرد کە مەسەلەی کوردی پێ ئاشنا بکرێت و سەرنجی بەلایدا رابکێشرێت، بۆ ئەو مەبەستە (جەمال نەبەز) یەکەم هەنگاوی نا. لە ڕێگەی کتێبولکەیەکی عارەبییەوە بە نێوی (کفاح الاکراد)(٣٠١) گرنگی و بایەخی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردی بۆ خەباتی ئازادیخوازانەی عارەب روون کردەوە. پاش ئەوەی وەفدێکی هاوبەشی کورد و عارەب لە ١٩٥٧دا چوونە قاهیرە و سەردانی ناصریان کرد، ناصر بڕیاری دا بەرنامەیەکی کوردیی لە وێزگەی قاهیرەوە بێتە بلاوکردنەوە. پرۆگرامەکەی هەموو رۆژ بە سروودی نەتەوەیی کورد دەستی پێ دەکرد و هەولی دەدا بەسروودی شۆڕشگێڕانە پروپاگەندە بو ڕێبازی ناصر بکات. ئەمە کارێکی خراپی کردە سەر کۆمۆنیستەکانی کوردستان و تا دەهات لاوازتر دەبوون. هەمان کات جێ پێی پارتی قایم تر دەکرد.

ناصر دژی پەیمانی بەغدا (سەنتۆی ئێستا)بوو، لەوەشەوە سەنگەری دوژمنایەتیی لە رژێمانی تورکیا و ئێران و ئینگلتەرە گرتبوو. ئەو هەلویستەی ناصر دەردی سەریی زۆری بۆ ئەو وولاتانە وعێراق بە تایبەتی، سازاند. رژێمی عێراق لە ترسی تەقینەوەی وەزعەکە کەمێک جلەوی ئازادیی بۆ کورد بەرهەلدا کرد. ڕێگەی بلاوکردنەوەی چەند گۆڤار و رۆژنامەیەکی کوردی درا. لە کوردستاندا هەندێک کارگەی وەکو (جگەرە و چیمەنتۆ) دامەزرێنرا.

کاتێک عێراق و ئەردەن لە ١٤ی فێبریوەری ١٩٥٨دا پەیمانی (یەکێتی عارەب)یان لەدژی یەکگرتنەکەی ١ی فێبریوەری ١٩٥٨ی میسر و سوریا، مۆر کرد، جموجۆلێکی زۆری خستە نێو کوردەوە. نوێنەری کورد لە پەرلەمانی عێراقدا، (عەلی کەمال)، لە

کۆبوونەوەیەکی پەرلەماندا رەخنەی لە بڕیارەکانی ئەو یەکێتی‌یە گرت، کە هیچ باسێکی کوردی تێدا نەهاتبوو.

هەڵگرانی بیری شۆڕشگێڕانە لە کوردستاندا پێیان وابوو کە دەبێت ئەو ناتەبایی‌یەی ناصر و حسێن و فەیصەل بۆ سوودی کورد بقۆزێتەوە. پارت هەوڵی دەدا لەڕێی ئیمزا کۆکردنەوەی خەڵکی‌یەوە مافی کورد لە دەستووری تازەدا بچەسپێنرێت. ئەمە هەمدیسان نیشانی دەداتەوە کە پارت چەند کەم سەری لە مەسەلەی شۆڕشگێڕیتی دەرچووە. جگەلەوە نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت کە پارت (یەکێتی عارەب)ی ١٩٥٨ی نێوان سوریا و میسری زۆر بەگەرمی‌یەوە پیرۆزبایی کردوو، هەر لە سەرەتاوە پشتگیری خۆی بۆ دەربڕین(*).

بڵاوکراوەکان و خۆڕەتاندنەکانی پارت، لەلایەن رژێمی عێراقەوە هیچ بایەخێکی پێ نەدرا. لەگەڵ ئەوەشدا پارت هەر بەرەو بەهێز بوون سەری هەڵدەگرت. چونکە تەنها رێکخراوێک بوو کە ووشەی (کوردستان)ی بە خۆوە لکاندبوو.

ئەو کاتەی قاسم رژێمی پاشایەتی گۆڕ کرد، لە کوردستاندا ئەم هێزە سیاسی‌یانە هەبوون: پارتی دێمۆکراتی کوردستان (لەرووی چەندایەتی‌یەوە بەهێز، بەڵام لەرووی چۆنیەتی‌یەوە زۆر خراپ رێکخرابوو)، کۆمۆنیست، هەروەها دەستەیەکی کەمی هەڵگرانی بیری سۆسیالیستانەو نیشتمان پەروەرانەی کورد. ئەم گرووپەی دوایی پاشان لە ١٩٥٩/٤/١٤دا خۆیان لە پارتێکی خاوەن ئیدیۆلۆژی‌یدا بە نێوی (کاژیک)ەوە، رێکخست(٣٠٢).

پاش کودەتاکەی قاسم، کوردستانی عێراق چەند رۆژێک بێ رژێم مایەوە. ئێوارەی ١٧ی تەموزی ١٩٥٨ کۆبوونەوەیەکی سیاسی‌یانە لەسلێمانی کرا، تا جێگەی کورد لە کۆماری تازە کوورەدا دیاری بکەن.

بەشدارانی کۆبوونەوەکە بریتی بوون لە "هەمزە عەبدوڵڵا" سکرتێری گشتی‌ی مەکتەبی سیاسی پارتی دێمۆکراتی کوردستان، "حیلمی عەلی شەریف" ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی‌ی پارتی دێمۆکرات، "ئەحمەد غەفور" نوێنەری پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە کوردستاندا، "جەمال نەبەز" نوێنەری دەستەی سێهەم(٣٠٣). هەندێ پارێزەر و

(*) بڕوانە رۆژنامەی (النور)، ئۆرگانی دەستەی تاڵەبانی، ژ. ١٦٠، ساڵی یەکەم، بەغدا، ٢٩ی ئاوریلی ١٩٦٩.

کاسبکاریش بەشدار بوون، کە نوێنەری هیچ حیزبێک نەبوون. حیلمی لەو باوەڕەدا بوو کە کورد پێویستە بە هەموو هێز و توانایەکی‌یەوە پشتگیریی بێ چەند و چوونی کۆماری تازە بکات، بێ ئەوەی هیچ داوایەکی کوردیش پێش چاوخرێت، چونکە "ئەم کودەتایە زەبرێکە لە ئیمپریالیزم دراوە".

ئەحمەد غەفور پێی وابوو کورد لایەنگیریی خۆی لەو کۆمارە دەرببرێت و داوای ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکان (کە زۆربەی کۆمۆنیست بوون)و داوای دروست کردنی (مقاومەی شەعبی) بکەن.

نەبەز لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە کورد دەست بەجێ (کۆمیتەیەکی نەتەوایەتی) رێک بخات و لە چوار چێوەی سنوورەکانیدا، ئەوەی پێویستە و لە جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە لە رێگەی چەندین روونکردنەوە و پرۆتۆکۆلی نێو دەوڵەتی و نێوچەییەوە گفت و بەڵێنیان پێ دەدرێت، پیادەی بکەن. گەر قاسم دانی بەو مافانە دا نەنا ئەوا پێویستە دژی بوەستنەوە، چونکە پێی وابوو کە رژێمی قاسم بە هیچ جۆرێک توانای ئەوەی نەبێت لە دژی کورد بجەنگێت. چونکە ئەو کاتانە ئەردەن بە کەشتی‌یە جەنگی‌یەکانی ئەمریکا کە لە کەنارەکانی بێروت بوون و، بە سوپای ئینگلیز کە لە ئەردەن دا بوون، هەڕەشەی لە عێراق دەکرد. هەروەها نەبەز پێی وابوو گەر بێت و قاسم دان بەو مافانەی کورد دا نەنێت، ئەوا بە ئیسپاتی دەگەیەنێت کە رژێمێکی کۆنەپەرستە و ئیدی پێویست ناکات و نابێت پشتگیری لێ بکرێت.

پێشنیازەکانی درانە دواوە. بیانوو وابوو گوایە "بارێک دێتە پێشەوە کە رێگە بۆ ئیمپریالیزم خۆش کات، لە پشتەوە پەلاماری عێراق بدەن".

جگە لەوە بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی نەبەزەوە، پێیان وابوو دەتوانرێت متمانە بەرژێمی نوێی قاسم بکرێت، چونکە "رژێمێکی دژ بە ئیمپریالیزم"ە. نەبەز گوتی ئەمە لەگەڵ راستیدا یەک ناگرێتەوە، چونکە ئەگەر راست بێت کە رژێمێکی دژ بەئیمپریالیزمە، ئەوا دەبێت بێ چەند و چوون دان بە هەموو مافە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی‌یەکانی گەلی کورد دا بنێت.

لەو کۆبوونەوەیەدا کە تا کازێری ۳ی بەرەبەیانی خایاند، نەبەز هێندەی توانی ئەوانی دی بەوە رازی بکات کە دەست بەجێ بروسکەی پیرۆزبایی بۆ قاسم نەنێرن، بەڵکە وەفدێک بنێرنە بەغدا و لەگەڵ قاسم دا گفتوگۆ بکەن. شایانی باسە کە هەمزە عەبدوڵلا

لەسەرتاسەری ئەو دانیشتنەدا مەتەقی نەکرد و دەنگی لێ نەهات. پیاو هەستی دەکرد کە لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا ناتەبایە.

هەڵوێستی ڕژێمی قاسم بەرامبەر بە کورد هەر لە سەرەتاوە روون بوو. چەند رۆژێک پاش کودەتاکە، کاتێک جەمال نەبەز و هەشت مامۆستای نێوەندی و سەرەتایی، بیرخەرەوەیەکیان بۆ قاسم و وەزیری رۆشنبیری‌ی (دوکتۆر جابر عومەر) نارد و داوای مافە رۆشنبیری‌یەکانی گەلی کوردیان کرد، دەست بەجێ رۆژنامەی (البلد) کە ئەو بیرخەرەوەیەی بڵاوکردبۆوە لەلایەن (عەبدولسەلام عارف)ی جێگری سەرەک وەزیران و وەزیری نێوخۆ وە قەدەغە کرا، هەرچەندە رەقابەش رێگەی بڵاوکردنەوەی بیرخەرەوەکەی دابوو.

لەو چاوپێکەوتن و پێک گەیشتنەی چەند وەفدێکی کورد لەگەڵ قاسم دا لە۲۷ی تەموزی ۱۹۵۸دا لە وەزارەتی بەرگری لەبەغدا، برایم ئەحمەد کە ئەو کاتە سکرتێری گشتی‌ی پارتی دیموکرات بوو، بە نێوی هەموو ئامادەبوانەوە گوتەیەکی خوێندەوە. هەرچەندە برایم هیچ داواکاری‌یەکی ئەوتۆی پێش چاو نەخست، بەڵکە تەنها باسێکی سەرپێیی گەلی کورد و خاکی کوردستانی کرد. قاسم لەوەرامدا گوتی (برا) کوردەکانی (شیمال)ی لە (پروپاگەندەی ئیمپریالیزم) بە ئاگا دێنێتەوە!

هەمان رۆژ جەمال نەبەز بە برایم ئەحمەدی گوت کە پێ‌ی وایە قاسم نە دۆستی کورد دەبێت و نە بە هیچ جۆرێکیش باوەڕی بە دیموکراسیتی دەبێت. ئەوێک لەو کاتە ناسکەدا نەیەوێت هیچ دەربارەی گەلی کورد و خاکی کوردستان ببیەت، ئاخۆ کە رۆژێک گوڕ و هێزی پەیدا کرد و جێ پێ‌ی قایم بوو چ بکات!!! وەرامی برایم ئەحمەد ئاوها بوو: "هەر بەرپێ گرتنێکی قاسم یانی خزمەت بە ئیمپریالیزم"! کاتێک نەبەز ویستی تێ‌ی بگەیەنێت کە دەست تێکەڵ کردنی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا، هەروا سانا نی‌یە و جگە لەوەش هەموو پەستێوتێکی کورد لەسەر قاسم، تەنها بەسوودی کورد تەواو دەبێت، چونکە کورد هیچی نی‌یە لەدەستی بدات! برایم بە تووڕەیی‌یەوە گوتی: "تۆ دەتەوێت من یاری‌ی بە ئاگر بکەم؟ من یاریی بە ئاگر ناکەم! تۆش وا بڕۆیت شیوعی‌یەکان پەل پەلت دەکەن"!

ئەمە چێترین نموونەیەکە بۆ مەنطق و بیر و بۆچوونی کەسانی بۆرژوا، کە بێ دڵ لە دڵ دانیش خۆیان بە "شۆڕشگێڕ" نێو دەبەن.

هەڵوێستی پارت دنیایەک قوربانی و دەریایەک خوێن لەسەر گەلی کورد کەوت. دوو ساڵان دواتر قاسم بە فڕۆکەی مێک و بۆمبای ناپاڵم و تۆپخانەیەوە شاڵاوی بۆ کورد هێنا.

قاسم گەلەک تاکتیک باز و هۆشیار بوو، دەیزانی دەبێت حسێب لەگەڵ گەلەک دوژمنی بەهێز بەلادا بخات. بەهێز ترین دوژمنی بەعسی‌یەکان(*) بوون کە ئەو دەمە لەگەڵ ناصری‌یەکاندا یەکیان گرتبوو. بەعسی‌یەکان وایان دەویست کە عێراق یەکسەر بچێتە یەکێتی سوریا و میسرەوە.

کەللەڕەق ترین و دەمارگیرترین نوێنەری ئەم ڕێبازە، (عەبدولسەلام عارف) بوو. قاسم دەیزانی کە دەستە و یەخەی کوردیشی لە پێشە، بەڵام دەشیزانی کە زۆر نارێک و پێکن و هێندەش چەوسێنراونەتەوە. بە کەمترین گفتی بن بۆش ماوەیەک سەرمەست دەکرێن. دەیزانی کۆمۆنیستەکانی عێراق بە سیاسەتی پان عارەبیزمی ناصر رازیی نین، چونکە ناصر لە میسر و سوریا هاوڕێیانیانی لە سیاسەت هەڵبواردووە و بەدەری ناون. کوردی سوریاش لەگەڵ سیاسەتی ناصردا نەبوون، چونکە دەچەوسێنرانەوە، بە تایبەت پاش یەکگرتنەکەی سوریا و میسر. بەو جۆرە قاسم توانی ژیرانە تاکتیک بازی خۆی بکات. ئەوە بوو هەندەک بەری بۆ کورد و کۆمۆنیست بەر هەڵدا کرد.

لەدەستووری کاتی‌یدا کە بە ئانقەست لە رۆژی ۲۷ی تەموزی ۱۹۵۸دا، لەو رۆژەی وەفدی کورد چوونە لای، بڵاوی کردەوە، کوردی بە هاوبەشی عارەب نێو برد. دیارە ئەمە تەنها ڕستەیەکی ڕازاوە بوو، چونکە ئەم دەستوورە بە پێچەوانەی دەستووری ۱۹۲٤وە، گەلی عێراقی بەبەشێک لە نەتەوەی عارەب دەست نیشان کردبوو. دەی سا چۆن پیاو دەبێتە هاوبەشی شتێک کە هیچ بەشێکی تێدا نەبێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا خۆڵیان کردە چاوی زۆر کوردەوە و قاسمیش توانی بێ خشپە سیاسەتی خۆی پیادە کات.

لەهەموو گوتەیەکیدا بانگاشەی (برایەتی کورد و عارەب)ی دەکرد. ڕێگەی بڵاوکردنەوەی چەند رۆژنامەیەکی کوردی دا. لە ٤ی ئاوریلی ۱۹۵۹وە لە لایەن

---

(*) حیزبی بەعس لە ۷ی ئاوریلی ۱۹٤۷دا لە لایەن مامۆستایەکی ئامادەییەوە کە نێوی (مێشیل عەفلەق) بوو لە دیمەشق دامەزرێنرا. ئەم حیزبە لەکودەتاکەی قاسم دا بەشدار بوو. هەروەکو لە کودەتاکەی عارف بەسەر قاسمیشدا بەشدار بوو. بەڵام پاشان عارف لە رژێم دەری پەڕاندن. لە ۱۷ی تەموزی ۱۹٦۸دا ئەم حیزبە کودەتایەکی بەسەر بەرۆکری عارف (واتە عارفی دووهەم)دا کرد و تا ئێستا لەعێراق دا فەرمانڕەوان.

لایەنگرانی بارزانی‌یەوە رۆژنامەیەک بە نێوی (خەبات)ەوە بڵاو دەکرایەوە.

قاسم بەڕێوەبەرایەتی‌یەکی بۆ خوێندنی کوردی دامەزراند، لە زانستگەی بەغداش بەشێکی بۆ زمانی کوردی کردەوە. بەرنامەی کوردیی رادیۆی بەغدا زیاد کرا. لەدروشمی عێراقدا خەنجەرێکی کوردیی وەکو هێمایەک خرایە پاڵ شمشێرە عارەبی‌یەکە. لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا دەرس بەکوردیی دەگوترایەوە. یەکێتیی مامۆستایانی عێراق لە ١١-١٣ی سێپتەمبەری ١٩٥٩و لە ١٥ی ئۆگۆستی ١٩٦١دا دوو کۆنگرەی فراوانی بۆ مامۆستایانی کورد رێک خست، تا وەکو لەتەنگ و چەڵەمەکانی باری رۆشنبیریی کورد بکۆڵنەوە(*).

لە ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٨دا رێگەی بە بارزانیی و هەموو بارزانی‌یە پەنابردووەکانی شوورەوی و وولاتە سۆسیالیستەکانی دی دا کە بۆ عێراق بگەڕێنەوە. ئەوە بوو بە پاپۆڕێکی سۆڤیەتیی ٨٧٠ ئاوارەی کورد (٤٥٥ پیاو و ٤١٥ ژن و منداڵ) لە ١٩٥٩/٤/١٦دا گەیشتنە بەندەری بەسرە. زۆر بەگەرمی لە لایەن گەلی عێراقەوە پێشوازی کران. قاسم لە ١٩٦٠/٢/٩دا دانی بە پارتی دیمۆکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی بارزانی‌یدا نا.

هەلێکی چاکیشی بۆ کۆمۆنیستەکان رەخساند و بواری چاکی دان. بە ئاشکرا کاریان دەکرد، رۆژنامەیان بڵاودەکردەوە، کتێبی مارکسی‌یان دەفرۆشت، ئیدیۆلۆژیی خۆیان لەگشت لایەک، هەتا لە نێو سوپاشدا بڵاودەکردەوە.

هەروەها نێو براو بە (مقاوەمەی شەعبی)ش بەدەست کۆمۆنیستەکانەوە بوو. قاسم هیچ دەستی نە دەهێنایە رێگەیان. هەرچەندە بووبوونە دەزگایەکی تێرۆر و داپڵۆسین و جۆرە هێزێکی غەیرە نیزامی. لەو رێگەیەوە پێکدا پژانی زۆر لە نێوان کۆمۆنیستەکان و دژەکانیان دا رووی دا (وەکو بەعسی‌یەکان و نا کۆمۆنیستەکانی دی)، کەدیارە هەمووی بە پیلانی قاسم خۆی بوو. قاسم توانی زۆر بەسانایی و بێ ماندوو بوون سەرپاکی دوژمنە سەرەکی‌یەکانی لەشوێنی دەستەڵات بەدەرنێت، چونکە ئەمانە هەمان کات دوژمنی کۆمۆنیستیش بوون و کۆمۆنیستەکانیش هێز و توانای خۆیان لەدژیان بەگەڕ خست. بەکۆمەکی کۆمۆنیستەکان توانی لە ٣٠ی سێپتەمبەری ١٩٥٨دا جێگرەکەی خۆی (عەبدولسەلام)ی ناصری کە لە کودەتاکەدا پشتی گرتبوو، لەدەستەڵات دووری خاتەوە و بیکاتە باڵوێزی عێراق لە ئاڵەمانیای رۆژئاوا.

---

(*) بڕوانە گۆڤاری "هیوا"، ژ.٢و٣، ساڵی ٣، کانوونی یەکەمی ٩٥٩و کانوونی دووهەمی ١٩٦٠.

کاتێک عارف لە ٥ی نۆڤەمبەری ١٩٥٨دا گەڕایەوە بەغدا، لە فڕۆکەخانە بەتاوانی نەخشەکێشانی کودەتایەک گیرا. لە ١٩٥٨/١٢/٢٧دا درایە "دادگای گەل"و بەمردن سزا درا. بەڵام سزاکەی بەسەردا نە چەسپێندرا.

قاسم لە ١٩٥٩/٣/٨دا کودەتاکەی (ژەنەراڵ شەواف)ی ناصری بە توندی سەرکوت کرد.

کۆمۆنیستەکان بە هۆی ئەو پێوەندی و لێک نێزیکی‌یەیانەوە لەگەڵ قاسم دا، لە وولات دا هێزێکی چاکیان پەیدا کرد، کە بەداخەوە خراپ هەڵیان سوڕاند. ئەو دەمە هیچ پێوەندی و هاریکاری‌یەک لە نێوان کورد و بەعسی‌یەکان دا نەبوو، چونکە بەعسی‌یەکان هەڵوێستێکی زۆر دوژمنکارانەیان بەرامبەر کورد هەبوو. کۆمۆنیستەکان لە سەرتاپای عێراق دا دەستەڵاتدار بوون. (قاسم)یان بە (سەرکردەی تاقانە) و(باوکی دیمۆکراسیێتی و هەژاران) نێو دەبرد.

ئەو کاتانە من لە بەغدا مامۆستای قوتابخانەی نێوەندی‌ی جەعفەری‌یە بووم. چاکم لە یادە بەعسی و ناصری‌یەکان چەندە حاڵیان شڕ بوو. هەروەها هەر کەسێکی دیکەش کە لە چاویلکەی کۆمۆنیستەوە لە مافی کوردی نەڕوانیبا، بێ ویژدانانە دژایەتی دەکرا.

"دادگای گەل" بە سەرۆکایەتی (مەهداوی) ئامۆزای قاسم، زۆر کەسی بە مردن سزا دا. ئاژاوە و تیرۆر سەراپا گیر بوو. لە ١١ی مایسی ١٩٥٩دا رۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی ئۆرگانی کۆمۆنیستی عێراق، گوتارێکی بڵاو کردەوە تێیدا بوختانی زۆری بە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد کردبوو. لەو گوتارەدا بزووتنەوەکە بە (جاش و چڵکاوخۆری ئاغاو فیۆدالەکان) لەکەدار دەکات. دەڵێت: (بەکرێگیراوی سەنتۆ و ئەمریکا)ن و هەوڵ دەدەن بەکۆمەکی ئەمریکا (دەوڵەتێکی کوردی) دابمەزرێنن.

پاش گەڕانەوەی بارزانی مل ملانێ و کێشمە کێشی نێوان کۆمۆنیست و پارت زێتر پەرەی سەند. هەردوک لا دەیانەویست بارزانی‌ی بەلای خۆیاندا راکێشن. کەس نەیدەزانی بارزانی سەر بە کامە لایانە.

کاتێک لە ١٩٦٠/٢/٩دا پارتی دیمۆکرات بە سەرکردایەتی بارزانی‌ی رێی پێ درا(*). کۆمۆنیستەکان کەوتنە هێرشی توند و تیژ بۆ سەر بارزانی‌ی. هەوڵیان دەدا قاسمی لێ پڕ

(*) بارزانی لە ١٩٦٠/١/٩دا لەگەڵ ٥٠ کوردی دیکەدا داوایان لە وەزارەتی نێوخۆ کرد کە بە رەسمی‌ی رێگەی دامەزراندنی (پ.د.ک)یان بدات. بەپێی دەستووری عێراق، پاش مانگێک، یانی لە ١٩٦٠/٢/٩دا پارت بووە حیزبێکی رەسمی‌ی.

کەن. بارزانیی هەر لە سەرەتاوە توانی پێوەندییخۆی لەگەڵ قاسم دا چاک رابگرێت. رەنگە بەهۆی وورپایی و ژیری و ئارامی زۆری‌یەوە. هەتا قاسم لەگەڵ کورد گێری نەگۆڕی، بارزانی دژی نەوەستایەوە. بەڵام وەکو هەموو سیاسی‌یەکی کارامە، هەمیشە خانە گومان و هوشیار بوو. رەنگە ئەویش تاکتیک و فریوەکانی قاسمی هەست پێ کردبێت. دۆستێکم کە نێزیکی بارزانیی بوو بۆی گێڕامەوە، کە ئەو کاتانە بارزانیی رێژیی دەکرد و برنجی نەدەخوارد. کاتێک لەو بارەوە پرسیاری لێ کردبوو، بارزانیی گوتبووی "حاڵ و بارەکە لەقە. بەزوویی ناچار دەکرێین پارێزگاری لە مافی خۆمان بکەین. پیر بووم و گەر وورگ و گیپاڵم هەبێت ئیدی ناتوانم بچمە شاخ".

کۆمۆنیستەکان هەوڵیان دەدا لەرێگەی هەندەک کاربەدەستی پارتەوە کە هەمان کات لایەنگرانی خۆیان بوون، تین و تاوێکی وا بخەنە سەر پارت کە ناچار بن لە بڕیارەکانیان دا وەک پاشەڕۆکەیەکی پارتی کۆمۆنیست مامەڵە بکەن. گرنگترین لایەنگرانی کۆمۆنیست لە نێو پارت دا "هەمزە عەبدوڵلا"ی سکرتێری گشتی مەکتەبی سیاسی بوو. کاتێک حیزبە عێراقی‌یەکان لە ١٩/١١/١٩٥٨دا کۆبوونەوەیەکیان کرد و کۆمەڵە بڕیارێکیان دا، پارتی دیموکراتیش بەشداری کرد و لە ژێر کاریگەرێتی پارتی کۆمۆنیستی عێراق دا وەک باقی حیزبە عێراقی‌یەکان، پەنجە مۆری کرد کە "عێراق بەشێکە لە نیشتمانی عارەب"(*). جگە لەوە پارت دەستی کردە هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوە جەماوەری‌یەکانی وەکو قوتابیان و لاوان و مامۆستایان و ئافرەتان و ئەندامانی ئەو رێکخراوانەی ناردە نێو رێکخراوەکانی پارتی کۆمۆنیستەوە. هەمان کات هەمزە توانی بەرە لەژێر پێ‌ی ناحەزەکانی ئەو کاتەی وەکو "برایم ئەحمەد" و"جەلال تالەبانی" دەرکێشێت. بەوە تاوانباری کردن کە گوایە دەستیان لەگەڵ (عەبدولسەلام)ی (ئەو کاتە بەمردن سزادراو)دا تێکەڵ کردووە. گوایە لەگەڵ عارف دا لەسەر پێنج خاڵ رێک کەوتوون. لە حاڵەتێکدا گەر عارف بە کۆمەکی ئەوان کودەتاکەی دژی قاسمی سەرکەوێت، ئەوا کورد دەحەوێتەوە.

بارزانیی بە وورپایی و بێ دەنگی لە حاڵ و بارەکەی پارتی دەڕوانی. دەیزانی گەر دەستەڵاتی پێویستی خۆی بەکار نەهێنێت، پارت هەڵدەوەشێتەوە و لەبەین دەچێت. بەڵام هێشتا هەر چاوەڕوانی دەکرد. لە ئێوارەی رۆژی ٣٠ی ژونی ١٩٥٩دا بارزانیی لەگەڵ

---

(*) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسەدایە.

چەند چەکدارێکی دا چوونە بارەگای سەرەکی پارتی دیمۆکرات لەبەغدا. بارەگایان بە زۆر داگیر کرد و هەمزە و پیاوەکانیان تووڕ هەڵدایە دەرەوە. لە کۆنگرەی چوارهەمی پارت دا لە ٦/ ١٠/ ١٩٥٩دا هەمزە و لایەنگرانی بە تاوانی "خیانەت لە حیزب و میللەت" لە ڕیزی پارت بەدەرنران.

کوردە سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان کە ئیدیۆلۆژی‌یەکی سەربەخۆ و جودا لە پارتیان هەبوو و خۆیان لە حیزبی (کاژیک)(٣٠٤)دا ڕێک خستبوو، لەهەموو هەنگاوەکانی بارزانی‌ی ڕازی نەبوون. ئەوەیان پێ چاک بوو کە بارزانی هەندێ نەفەری هەلپەرستی وەکو هەمزەی دوور خستەوە، بەڵام پێ‌یان باش نەبوو کە سەرکردایەتی پارت بکەوێتە دەست کەسانی ووردە بۆرژوای وەک تاڵەبانی و برایم ئەحمەد(٣٠٥).

## کارەساتی کەرکوک و ڕۆڵی کۆمۆنیستەکان

لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٩دا پێکداپژانێکی خوێناوی لە نێوان کۆمۆنیستەکان و تورکەکانی کەرکوک دا رووی دا. دەبێت لێرەدا راستی‌یە مێژوویی‌یەکان چۆنن ئاوها پێش چاو خرێن. ئەو لێکدانەی بووە هۆی کوشتنی هەندەک تورکمان، پیلانێک نەبوو لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە نەخشەکێش کرابێت. دوژمنەکانی قاسم، ئەوانەی هەمیشە سەرکۆنەیان دەکرد بەوەی پشتی کۆمۆنیستەکان دەگرێت، ئەو کۆنەپەرستانەی کودەتای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨یان بۆ بەرژەوەندی خۆیان با پێدایەوە، بە هاریکاری‌ی هەندێک کەسانی فاشیستی (پان تورکیزم)، بە کۆمەکی بەکرێ گیراوانی ئای. پی. سی، ئەو ئاژاوەیەیان لە کەرکوک دا گێڕا، بەڵام کۆمۆنیستەکان خرانە تەپکەوە، تا هەموو تاوانەکان لە ملی ئەوان بئاڵێنن. قاسمیش وا تەلقین درا کە گوایە تەنها و تەنها کۆمۆنیستەکان تاوانبارن.

لە ١٦ی تەموزی ١٩٥٩دا قاسم لە کڵێسەی (مار یوسف) لەبەغدا گوتەیەکی دا. بۆ یەکەم جار هێرشی کردە سەر کۆمۆنیستەکان و بە گێرە شێوێن نێوی بردن(*).

ئەمە بواری ئەوەی بۆ کۆنەپەرست و دوژمنانی کۆمۆنیست رەخساند کە درزێکی گەورە بخەنە نێوان کۆمۆنیست و قاسمەوە و تا دەهات فراوانتریان دەکرد. قاسم پێ‌ی وابوو

---

(*) قاسم پاش دوو ساڵ(×). هەستی کردکە پیلانی کەرکوک لەلایەن کۆمۆنیستەوە نەخشەکێش نەکرابوو، بەڵکە ئەوان کەوتبوونە فاقەکەوە. (بروانە راکانی قاسم لە رۆژنامەی "الایام"دا، ژ. ٥٩، بەغدا، تەموزی ١٩٦٢.

(×) سێ ساڵ دەکات نەک دوو.

پاش ئەوەی دوژمنانی خۆی (بە کۆمەکی کۆمۆنیستەکان) کەنەفت کردووە، ئیدی کاتی وەی هاتووە دژی خودی کۆمۆنیستەکان دەست بەکاربێت. بۆیە بەعسی‌یە هێز لێ براوەکان، ناصری‌یەکان، (اخوان المسلمين)، تورکمانەکان و هەندێکی دی دژی کۆمۆنیستەکان دنە دا.

ئەو هەڵوێستە چەوت و کورت بینانەی کۆمۆنیستەکان لە سەروەختی ئازادی‌یاندا نواندیان، ئەو بارەیان رەخساند کە دوژمنانیان ماوەیەک ئەو هەلەیان بۆ هەڵکەوێت کە تۆڵەیان لێ بکەنەوە و بار و دۆخی نوێ بۆ مەبەستی خۆیان بقۆزنەوە. رۆژی تۆڵە و قەیرانی کۆمۆنیست لە عەرەبستانی عێراق دا دەستی پێ کرد.

تۆڵە لە کۆمۆنیست و دیانەکان (کە بەدوژمنی نەتەوەی عارەب) دەزانران، بە پێوستی‌یەکی رۆژ حسێب دەکرا.

بەو جۆرە گەلەک دیان و کۆمۆنیست بۆ کوردستان هەڵهاتن. لەگەڵ هەموو هەڵوێستێکی رابوردووشیاندا، پەنا دران و پارێزران. هێندەی لواو بڕی کرد، کۆمۆنیستەکان سیاسەتی دژایەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردیان پەیڕەو کرد.

هەرچەندە کۆمۆنیستەکان زۆر جار و لە زۆر هەل و بۆنەدا هەوڵیان دا لەگەڵ قاسم پێک بێنەوە و هەڵە و هەڵوێستی خۆیان هەڵسەنگاند و بەرەخنەوە دانیان پێدانا، بەڵام قاسم ببڕای ببڕ، رووی پێ نەدانەوە و هەر بە دژیان مایەوە.

کاتێک بەعسی‌یەکان لە ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٩دا لە شەقامی رەشید لەبەغدا تەقەیان لە قاسم کرد و هەوڵی کوشتنیان دا، کۆمۆنیستەکان دەست بەجێ رژانە سەر شەقامەکان و هەوڵیان دا بە هوتاف و جوێنی هەرزان و هاندان دژی بەعسی‌یەکان و ناصری یەکان، پشتگیری خۆیان پیشانی قاسم بدەن، بەڵام بێ سوود بوو. قاسم بایەخی پێ نەدانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمۆنیستەکان هەتا مردنیشی هەر پشتیان بەر نەدا، چونکە دەیانزانی بە نەمانی قاسم، قڕانی ئەوانیش دێت.

کۆمۆنیستەکان رۆژ لەدوای رۆژ لەکزی و کەنەفتی‌یان دەدا و تا دەهات ریزەکانیان چۆڵ تر دەبوو. چارەنووسی خوێناوی کۆمۆنیست وکۆمۆنیزم لە عێراقی ٩٦٣ی پاش قاسم دا، وەک دواتر باسی دەکەین، چاک وایە ببێتە چێترین پەند و عیبرەت بۆ زرە سۆسیالیست و زرە مارکسیستەکانی ئەوروپای رۆژئاوا کە بەهەمان گرانەتاوە دەناڵن، بە پەتای ئۆپۆرتونیستی‌یەوە.

کۆتایی ١٩٦٠ کورد بە سەرکردایەتیی بارزانیی یەکە مەترسییان لەبەردەم قاسم دا قوت کردبووەوە. قاسم ترسی شەخسیەت و نێو بانگ و شۆرەت و دەستەلاتی بارزانیی لەدڵ نیشتبوو. ویستی ئەویش و کوردیش بێ هێز کات. رۆژنامە کوردییەکانی یەک لەدوای یەک قەدەغە کرد(*). بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی لەکار خرا. گەلەک کورد بەند کران. زۆر کاربەدەستی کورد، بە تایبەت لە پۆلیس و سوپادا بۆ نێوچە عارەبییەکان راگوێزران. زۆر کورد کوژران. جموجۆڵی پارتی دیموکرات بەری پێ گیرا. چەند چاوپێکەوتن و گفتوگۆی بارزانیی لەگەڵ قاسم دا سوودێکی نەگەیاند. قاسم سیاسەتی دژایەتی کوردی گرتە بەر. ١٠٠٪ی باجی لەسەر بەرهەمی کشتوکاڵی زیاد کرد. ئەم باجە هەستی ناڕەزایی چ جوتیارە هەژارەکان و چ مولکدارانی کوردستانی بزواند. قاسم پێی وابوو دەتوانێت هەل وبارەکە بۆ سوودی خۆی هەڵسووڕێنێت. "فەتاح شاڵیی" ئەندامی "دادگای گەل"ی نارده کوردستان تا لە نێو مولکداران و دەرەبەگەکاندا پروپاگەندەی ئەوەی بۆ بکات گوایە گەر بچنە بەغدا و پشتگیری خۆیان بۆ قاسم دەربڕن و دژایەتی دوژمنەکانی وەکو "بارزانی" و"ناصر" ڕابگەیەنن، ئەوا باجەکەیان لەسەر هەڵدەگرێت.

هاوینی ١٩٦٠ ژمارەیەکی زۆر دەرەبەگ و بازرگان و جۆتکار و مامۆستا و خوێندکار و پیاوی ئاینی و ئافرەتان گەیشتنە بەغدا. هەر ئەو دەمە حیزبی تازە کۆرپەی کاژیک، ڕۆڵێکی هێجگار دیاری لەنێو ئەم وەفدانەدا دیت. "کاژیک" ویستی ڕێی ئەوە لەدەرەبەگەکان ببەستێتەوە کە جۆتکاران بۆ مەرامی خۆیان هەڵسوڕێنن. بۆیە نوێنەرانی حیزبی "کاژیک" کەوتنە نێو هەژاران و رۆشنبیرەکانی وەفدەکەوە. مەبەستی چەوت و دوژمنکارانەی قاسمیان بەرامبەر کورد بۆ روون کردنەوە. تێیان گەیاندن کە قاسم هیچ کات نەیویستووە یاسای چارەسەری زەوی لە کوردستاندا بچەسپێنێت. بەهەمان جۆر نەشیویستووە کێشەی نەتەوایەتیی کورد چارە بکات. کاژیک بۆ کەسە نیشتمان پەروەرەکانی وەفدەکەی روون کردۆوە کە قاسم گەرەکییەتی کورد دژی دوژمنەکانی هەڵسوڕێنێت. پاشان دەرکەوت کە بارزانیيش بەدزییەوە پەیوەندیی بەزۆر ئەندامانی وەفدەکەوە کردووەو ئەو مەسەلانەی بۆ روون کردوونەتەوە. بەو جۆرە دووبەرەکی کەوتە ریزی وەفدەکەوە. دوو دەستە هاتنە کایەوە: دەستەیەکیان دەیانویست لایەنگری لە قاسم بکەن تا ئەویش باجی زەوییان لەسەر هەڵگرێت، جگەلەوەش جموجۆڵی کۆمۆنیستیش لە

---

(*) بڕوانە رۆژنامەی "ژین"، ژ. ١٥٧٤، سلێمانی، ١٩٦٠/١٢/٨.

کوردستاندا خەفە بکات. ئەمە باری سەرنجی دەرەبەگ و فیۆدال و بازرگانەکان بوو. دەستەکەی دی بڕیاریان دا بیرخەرەوەیەک بدەنە قاسم داوای جێ بەجێ کردنی گفت و بەڵێنەکانی خۆی لێ بکەن، یانی مافی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی کورد و مافی رۆشنبیری و چارەسەری زەوی لە کوردستاندا(*). پاشان هەردوو لا یەکخران و بیرخەرەوەیەکی هاوبەشیان دایە قاسم. ئەمە ناکامی‌یەکی چاوەڕوان نەکراو بوو بۆ قاسم. بڕوای نەدەکرد وەفدێکی ئاوها کە لەسەر داوای خۆی و بۆ مەبەستێکی دیاری کراو هاتبنە بەغدا و داوایەکی دی پێش چاو بخەن. لەیادمانە ئەمە تەنها بەتوانای (کاژیک) هاتە دی، چونکە چەکی بیروباوەڕی خستە کار و کاری لەوەفدەکە کرد. ئەمە پەندێکە بۆ ئێمە و ئەوەمان فێر دەکات کە: "تەنها پارتێکی خاوەن ئیدیۆلۆژی‌ی شۆڕشگێڕ دەتوانێت بەرژەوەندی‌یە تێک چڕژاوە دژ بەیەکەکانی نێو دوژمنانی دەست نیشان بکات و هەڵیان سەنگێنێت و ئەو بەرە دوژمنانە بەگژ یەکدا بکات. بەو جۆرە رێگەی ئەوە لە دوژمنانی بیری شۆڕشگێڕ دەبەستێتەوە کە بەرەیەک پێک بهێنن و لەبریتی وی دژی یەک دەیان بزوێنێت".

قاسم خۆی بە ئیهانە کراو دیت. وەفدەکانی لەو گەرما سوتێنەرەی بەغدا دا چەند مانگێک هێشتەوە، بێ ئەوەی چاوی پێ‌یان بکەوێت. وەفدەکان زۆر بە پڕی و دڵ گرانی و تووڕەیی‌یەوە بۆ کوردستان گەڕانەوە.

کاتێک وەفدەکان لەبەغدا بوون، پارتی کۆمۆنیست لە رۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی ئۆرگانی دا، گەلەک جار هێرشی بردە سەریان. شایانی باسە کە رۆژنامەی (خەبات)ی زمان حاڵی پارتی دێمۆکراتیش بەهەمان شێوە هێرشی دەکردە سەر وەفدەکە. پاش دووبەرەکی‌یەکەی ١٩٦٤ی پارتی دێمۆکرات، رۆژنامەی (خەبات) بڵاوی کردەوە و دانی پێدانا کە بارزانی‌یش پروپاگەندەی لە نێو وەفدەکەدا کردبوو(٣٠٦).

بەهەر حاڵ ئەو وەزعە ئاڵۆزە باری ڕاپەڕینێکی جەماوەری‌ی هێنایە گۆڕێ. سەرکردەکانی پارتی دێمۆکرات بێ هوودە هەوڵیان دەدا میللەت هێور کەنەوە. بارزانی‌یان لەوە هۆشیار دەکردەوە کە نەکات هەڵوێستێکی دژ بە قاسم وەبەر بگرێت(٣٠٧). گشتی بێ سەر ئەنجام بوو. زەمینەی شۆڕش خۆش بووبوو. دەستی قاسم کەوتبوە ڕوو. هەر لەو کاتەدا پەژارەیەکی

---

(*) یاسای چارەسەرکردنی زەوی لە ٣٠ ئەیلولی ١٩٥٨دا بڵاوکرایەوە، بەڵام هیچ کات کاری پێ نەکرا.

دی بۆ قاسم خولْقا. له ٦/١١/١٩٦٠دا بارزانیی بەرەسمیی لەلایەن پارتی کۆمۆنیستی شوورەوی‌یەوە داوەت کرا. بەفرۆکەیەکی تایبەتی سۆڤیەتیی چووە مۆسکۆ[٣٠٨] و چاوی بەسەرکردەکانی شوورەویی کەوت[٣٠٩]. بەلاّم نێوەڕۆکی گفتوگۆکانیان نەزانرا. لەخانەگومانی و بێ باوەڕی بەکەسانی دیکە، بارزانیی بەکەسی نەکوت.

ئەمە گیانی حەسادەت و دوو دلّی و گومانی قاسمی پەرە پێدا. مووچەی دەولّەتی لێ بڕیی. ئۆتۆمبێل و خانووی بەغدای لێ سەندەوە. هەمان کات سەرەک هۆز و دەرەبەگەکانی بەچەک و پارە دژی بارزانیی هان دا.

قاسم لەڕێگەی لابردنی باجی بەرووبومەوە گەلەک دەرەبەگی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. ڕۆژنامەی "خەبات"ی ئۆرگانی پارت درایە دادگا. بەلاّم له ٢٧/١١/١٩٦٠دا بێ سزا خەلەسا، چونکە دادوەرەکان کەسانی دژ بە قاسم بوون.

بارزانیی له ١٣/١/١٩٦١دا گەڕایەوە بەغدا و بێ خانە و لانە مایەوە. دواتر بەدزی‌یەوە گەڕایەوە کوردستان و ئیدی لەوساوە سەری بە بەغدا دا نەکردۆتەوە. کاتێک دەرەبەگێکی کورد بەنێوی (صدیق میران)ەوە، پاش ئەوەی لەبەغدا چاوی بەقاسم کەوت بۆ کوردستان گەڕایەوە، لەنێوچەی کاوان نەناسراوێک ئۆتۆمبێلەکەی بەر گوللە دا و (میران)ی کوشت. چونکە جۆتکارانی کاوانی لایەنگری بارزانیی و حیزبەکەی بوون، ئەمە بووە بەهانەیەک بۆ قاسم تا سەرکردەکانی پارت بەتۆمەتی کوشتنی میران تاوانبار بکات و فەرمانی گرتنیان دەربکات. سەرانی پارت ناچار بوون خۆ وەشارن. لەکوردستانیش ژمارەیەکی زۆر کورد گیران.

ئالۆزیی نێوان کورد و قاسم تا دەهات پەرەی دەسەند. قاسم فەرمانی بە ڕۆژنامەی (الثورة)ی زوڕناژەنی دا، قاپی کورد بگرێت. (الثورة) لە ژمارە ٥٥٥ی ١٧/٢/١٩٦١دا گوتارێکی نووسی و داوای تواندنەوەی کوردی کردبوو. وەکو بەرپەرچ دانەوەیەکی ئەو سیاسەتە گەلەک دەستە و تاقمی چەکدار ڕاپەڕین، کە (زۆربەیان جوتکاران و گوندنشینەکان بوون). لە ٣١/٨و ٨/٩/١٩٦١دا کاژیک دوو بەیاننامەی بلاّوکردەوە کە تێیاندا ڕەخنەی لە بزووتنەوە چەکدارەکە گرت. داوای لە شۆڕشگێڕەکان کرد کە شەڕی پارتیزانانە بکەن و دووی سەرکردایەتی بۆرژواو هەلپەرستی کورد نەکەون[٣١٠]. ئەمە ڕەخنەیەکی دروست کەرانە بوو. بەلاّم کۆمۆنیستەکان دژی ڕاپەڕینە چەکدارانەکە وێستانەوە و بەتوندی لۆمەیان دەکرد و بوختانیان ڕێک دەخست[٣١١].

له ۱۱ی ئەیلولی ۱۹٦۱دا تەقە و لێکدان لە نێوان کورد و سوپای عێراقدا رووی دا. ئەو یەکەم تروسکەیە ئیدی تا ئێستا نەکوژاوەتەوە، بە پێچەوانەوە هەر لە کڵپە و پەرەسەندن دایە.

قاسم داوای لە بارزانیی کرد ئەو راپەرینە جەماوەریيە بە پیلانی ئیمپریالیزم دەست نیشان بکات ودژی بوەستێتەوە. وەختێک بارزانیی ملی نەدا و داوای لە قاسم کرد گفت و بەڵێنەکانی خۆی بەرێتە سەر و مافە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیيەکانی کورد دەستەبەر بکات، هێزی هەوایی عێراق لە ۱٦ی ئەیلول دا نێوچەی بارزانیان بۆمباران کرد. ئەوسا بارزانیی کەوتە خۆ و دەست بەجێ شۆڕشەکەی رێک خست و شەڕی پارتیزانانەی دەست پێ کرد.

کاتێک بارزانی جڵەوی کاری گرتە دەست، قاسم ترسی لێ نیشت. لەوە دەترسا سەربازەکانی بەچەکەوە بۆ لای کورد هەڵبێن، بۆیە چەکی تەواوی پێ نەدەدان. پێشمەرگە بەو گیان و وورە بەرزەوە ترسێکی ئەوتۆیان لە لەشکری عێراق نەبوو. بەهۆی هەڵمەتی لە پڕ و تاکتیکی جەنگی پارتیزانانەوە زۆ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. قاسم وەکو بەرپەرچ دانەوەیەک ۱۲۰ فڕۆکەی جەنگی خستە گەڕ. زۆر دڕندانە دژی کورد وێستانەوە. هێزی ئاسمانی عێراق صەدان گوندیان کاول کرد و گەلەک هاووڵاتیيان کوشت.

پێشمەرگە لە ئەشکەوت و کونە شاخەکاندا خۆیان حەشار دەدا. زیانێکی ئەوتۆیان پێ نەدەگەیشت.

هەر لەیەکەم رۆژی ئەو راپەرینە جەماوەریيەوە، دەرەبەگەکان هەڵوێستی نانیشتمانیانەی خۆیان بەدەر خست. پشتی قاسمیان دەگرت. هەندەکیان، وەکو (مەحمود فەقێ محەمەد هەمەوەندیی) جاشیان بۆ دژی ئەو راپەرینە رادەگرت.

سەرەتا سەرکردەکانی پارت لەبەغدا پشتی شۆڕشەکەیان نەگرت. زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی لە ئەیلولی ۱۹٦۱ەوە بڕیاریان دابوو چەک دژی قاسم بەکار نەهێنن(۳۱۲).

قاسم و دار و دەستەکانی بێ دەنگ نەوەستان. حیزبە عێراقیيەکان وەخۆکەوتن. رۆژنامەی (الأهالی) ئۆرگانی (الحزب الوطني الديمقراطي) گوتارێکی نووسیبوو، تێیدا بزووتنەوەی کوردی بە (بزووتنەوەیەکی گومان لێ کراوی داردەستی ئیمپریالیزم) لەقەڵەم دابوو. (الأهالی) داوای لەرژێم کردبوو "گەل" لە وەزعی (شیمال) ئاگادار کاتەوە.

هەروەها رۆژنامەی (البیان) ئۆرگانی (الحزب الوطني التقدمي) لە ١٨/١٠/١٩٦١دا گوتارێکی دژی راپەڕینەکە نووسیبوو. (البیان) مافی کوردی وا هەڵسەنگاندبوو کە گوایە تەنها مافی "هاووڵاتێتی"یان هەیە و مافی نەتەوایەتی ئەو "هاووڵاتی" یانە ناگرێتەوە. ئاوها (البیان)؟؟؟ لە٢٣ی سێبتەمبەری ١٩٦١دا قاسم کۆنفراسێکی رۆژنامە نووسی لەبەغدا گرت. بارزانیی بە (بەکرێگیراوێکی ئیمپریالیزم) نێو زەد کرد و هەمان کات ئینگلتەرە و ئەمریکای بە هاوکار و یارمەتیدەری شۆڕشی کورد تاوانبار کرد(٣١٣).

شایانی باسە کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی هیچ کات رووی پیشانی داواکانی بارزانیی نەداوە(٣١٤). لەوەش پتر، سەردەمی ئینتدابی ئینگلیزیی سەرپاکی شۆڕشەکانی کورد لە عێراقدا، لەلایەن هێزی هەوایی ئینگلیزەوە شێتگیرانە دەستیان لێ وەشێندراوە، وەکو رۆژنامەی "The Times" ددانی پێدا دەنێت(٣١٥).

قاسم پێشی لەسەر ئەوە داگرت کە لە ماوەی حەوت رۆژدا "یاخی بوو و لەرێ لادەرەکان" سەرکوت دەکات. دیارە ئەمە خەیاڵ پڵاو بوو.

بەپێچەوانەوە، بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد گەلەک سەرکەوتنی بەسەر سوپای قاسمدا بەدەست هێنا(٣١٦).

گەلەک کۆمۆنیست "خۆ ویستانە" خۆیان نێو نووس کرد، بەهێزی چەک شۆڕشەکە سەرکپ کەن. گەرەکیان بوو لەو رێگەیەوە بگەڕێنەوە سەر خوانی لەدەست چووی قاسم. لە بەیاننامەکانیاندا بزووتنەوەکەیان بە بزووتنەوەیەکی "نائومێد و وابەستە و ناسیۆنالیستانە" کە لەلایەن "سەنتۆ"وە پشتگیریی دەکرێت، نێو دەبرد(٣١٧). لە بڵاوکراوەیەکی کۆمیتەی مەرکەزی پارتی کۆمۆنیستی عیراق لە مارتی ١٩٦٢دا دەڵێت:

"پارتی کۆمۆنیستی عێراق نکۆڵی لەسیاسەتی سەرکوت کەری قاسم لە کوردستاندا ناکات. لەگەڵ ئەوەشدا نابێت کورد دژی رژێمی قاسم بوەستنەوە، چونکە عێراق سیاسەتێکی بێ لایەنانەی سەربەخۆی هەیە. یانی پابەندی هێزە ئیمپریالیستەکان نییە. جگە لەوە عێراق پێوەندییەکی چاکی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت دا هەیە"(٣١٨).

لەگەڵ ئەو هەموو پشتگیرییەدا، تا دەهات قاسم کەمتر بایەخی پێ دەدان. بۆیە پارتی کۆمۆنیست ناچار بوو هەڵوێستی بەرامبەر بزووتنەوەکە بگۆڕێت و چێتری کات. ئەوجا خۆیان بۆ "ئاشتی کوردستان" هەڵدەسوڕاند. خۆپیشاندانێکی کۆمۆنیستەکان لە ٢٧/٤/١٩٦٢دا لە بەغدا کە هاواریان دەکرد "نرید السلم في کردستان، یا شعب طفي

النیران" لەلایەن پۆلیس و سوپاوە زۆر درِندانە داپلۆسێنران[٣١٩].

گەلەک کۆمۆنیست و لایەنگرانیان کە بیرخەرەوەیەکیان بە قاسم دا و داوای "ئاشتی‌یان لەکوردستان"دا دەکرد، گیران و یەکی بە پێنج ساڵ بەندیی سزا دران[٣٢٠].

لەگەڵ ئەوانەشدا کۆمۆنیست هەر بە پاڵپشتی قاسم مانەوە. لەدڵەوە پشتگیریی شۆڕشی کوردیان نەدەکرد. رۆژنامەی (رێگای کوردستان)، ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە کوردستاندا، هێرشی دەکردە سەر بزووتنەوە ئازادیخوازانەکەی کورد و بە (ناسیۆنالیستی کورد) نێوی دەبردن. گوایە ئەو (ناسیۆنالیستانە) رێگری چارەسەری کێشەی کوردن. چارەسەرێکی ئەوتۆ کە لە گەڵ خواست و ئارەزووەکانی گەل و وولاتدا یەکانگیر بێت[٣٢١].

کۆمۆنیستەکان لە کاتێکدا کە ئەو هێرشەیان دەکردە سەر شۆڕشی کورد، خۆیان گەواهی ئەوەشیان دەدا کە "نەتەوەی کورد لە عێراقدا و بەپلەی یەکەم و تایبەتی بارزانیی و لایەنگرانی پارتی دێمۆکرات، کەسانی نیشمان پەروەر و هێزی دژ بە ئیمپریالیزمن"[٣٢٢].

لە ١٩٦٢/٣/١دا سەرکردایەتی پارتی دێمۆکرات بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە و بۆ یەکەم جار بەتەواوی پشتیوانی خۆی بۆ شۆڕشەکە دەربڕیبوو. لەو بەیاننامەیەدا داوا لەگەل دەکەن، لەژێر فەرماندەی بارزانیی "رۆڵەی گەل" دا دژی قاسمی دیکتاتۆر بجەنگن[٣٢٣].

جگە لەوە پارتی دێمۆکرات لە ١٩٦٢/٣/٦دا گشت پارتە عێراقی‌یەکانی بانگ راهێلا کە "بەرەیەکی میللی" دژی قاسم پێک بهێنن. پارتی کۆمۆنیست داواکاری‌یەکی تایبەتی بۆ پارتی دێمۆکرات نارد کە تێیدا داوای هاریکاری و هاوکاری چەکدارانەی دژی قاسمیان دەکرد. بەڵام ئەو داواکاری‌یە بێ سەر ئەنجام بوو[٣٢٤].

لە ئاوریلی ١٩٦٢دا کوردێک هەوڵی کوشتنی قاسمی دا، بەڵام سەری نەگرت[٣٢٥].

فیۆداڵەکان رۆژ لەدوای رۆژ زێتر لە قاسم نێزیک دەبوونەوە. لە ١٨/٥/٩٦٢دا دەرەبەگێکی بەنێو بانگی کورد، (مەحمود ئاغای زێباریی) پشتیوانی خۆی بۆ قاسم دەربڕی و کەوتە کۆکردنەوە و رِست کردنی بەکرێ گیراو، کە بە کوردی بە (جاش) نێوزەد کران و رژێمیش بە (فرسان صلاح الدین) نێوی دەبردن.

رژێمە کۆنەپەرستەکانی عارەب لەمپەرِی دوژمنایەتی‌یان لەشۆڕشی کورد گرت. بۆ نموونە

رادیۆی مەککە هێرشی دەکردە سەر بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد و ناصری بە لێ پرسراوی تاوانبار دەکرد.

هەڵوێستی دوژمنکارانەی هێزە کۆنەپەرستەکانی دەرەوە و نێوەوە چاوی کۆمۆنیستیان تێر نەدەکرد. لەسەر بوختانی خۆیان بەردەوام بوون. لە ئۆگوستی ۱۹٦۲دا گۆڤاری (قضايا السلم والاشتراكية) لە ژمارە ۸ی دا، گوتارێکی (جبار علي)، لەژێر سەردێری (الحزب الشيوعي العراقي والمسألة الكردية)دا بڵاو کردەوە. لەو گوتارە دا نووسیبووی:

(بەکرێ گیراوەکانی ئیمپریالیزم لە کوردستاندا، لەنێو خەڵکە دواکەوتووەکاندا پڕوپاگەندە دەکەن "دەوڵەتێکی کوردیی دەستکردی ئیمپریالیزم لە نەبوونی دەوڵەتێکی کوردیی چێترە". "گەر کوردستان تا ئەورۆکە کۆلۆنی بایە ئێستاکە سەربەخۆیی خۆی بەدەست هێنا بوو".

بەمە دەیانویست ئەو راستییە لنگەو قوچ کەنەوە، کە گوایە "کوردستان کۆلۆنی نییەو یا هەتا لە کۆلۆنییش کەمتر نییە"!

کاتێک سوپای عێراق دانیشتوانی کوردستانی قڕ دەکرد، یەکێک لەسەرە ناسراوەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، (عەزیز شەریف)ی سەرۆکی رێکخراوی (جەڤینی ئاشتیی) سەر بە کۆمۆنیست، لە ۱۹٦۲/٦/۱٥ بەنێوی (کۆنگرەی ئاشتی)یەوە کە لە عێراق گیرا، بروسکەیەکی بۆ قاسم نارد و گوتبووی:

(جەڤینی ئاشتیی دڵنیایە کە دەنگی ئاشتیخوازانەی رژێمە جەمهورییەکەمان بە سەرۆکایەتی "قاسم"ی رێبەری، جارێکی دیش لەم کۆنگرەیەدا دەبیسترێتەوە)(*).

ئەو هەڵوێستە دوژمنکارانەی کۆمۆنیست بەرامبەر کورد هیچی لێ شین نەبووەوە. قاسم خراپتر لێی هەڵدەپێچان. لە ۱٤/٦/۹٦۲دا دادگایەکی سوپایی لەبەغدا چەند کۆمۆنیستێکی کوردی بەمەرگ سزا دا. گوایە لە هەراکەی ۱٤ی تەموزی ۱۹٥۹ی کەرکوک دا دەستیان هەبووە[٣٢٦]. دادگایەکی سوپایی دی هەر لەبەغدا لە ۲ی سێبتەمبەری ۹٦۲دا حەوت کۆمۆنیستی بەهەمان تۆمەت بەمەرگ سزا دا[٣٢٧]. ئا ئەوە (دەنگی ئاشتیخوازانەی رژێمە جەمهوری یەکەیان) بوو.

---

(*) رۆژنامەی "١٤ تموز"ی پارتی کۆمۆنیست، ژ.٧٩، بەغدا، ١٩٦٢/٦/٢٥.

## هەڵوێستی دەوڵەتە بێگانەکان بەرامبەر شۆڕشی کورد

شوورەویی لەسەردەمی قاسم دا هیچ رووبەکی پیشانی شۆڕشی کورد نەدا[٣٢٨]. هیچ پشتگیریی نەدەکردن[٣٢٩]. هەرچەندە گۆڤاری (World Marxist Review) بەتوندی رەخنەی لە رژێمی دیکتاتۆری قاسم دەگرت و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەکرد[٣٣٠]. بەڵام ئەمە رێگەی ئەوەی لەشوورەویی نەدەبەستەوە کەکۆمەک بە رژێمی قاسم بکات. نەخێر! شوورەویی لەنۆڤەمبەری ١٩٦٣دا بە گوتەی بەغدا خۆی، ١٠ فڕۆکەی جەنگیی لە جۆری (TU-16)ی پێدان[٣٣١]. جگەلەوە سەرپاکی رۆژنامەکانی شوورەویی لە ئاستی قەتڵ و عامی کورد دا کڕ و کپ بوون.

هەرچەندە قاسم لە ١٩٦١/١٢/١١دا، بە پێی یاسای نێوبراو بە (یاسای ژمارە ٨٠) زەبرێکی توندی بەشیرکەتە نەوتییەکانی ئیمپریالیزم گەیاند[٣٣٢] (٩٩٪ی کۆمپانیا نەوتییەکانی بێگانەی میللی کرد)، بەڵام ئینگلتەرە هەر بەکێش کەری سەرەکیی نەوتی عێراق مایەوە و هیچ پشتگیرییەکی لەبزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد نەدەکرد.

بەڵام کوێت پشتی شۆڕشی کوردی گرت، چونکە قاسم پێشان لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەنووساندا لە ١٩٦١/٦/٢٥دا بە رەسمیی بانگی هەڵدا کە کوێت دەستێنێتەوە و دەیلکێنێتەوە بە عێراقەوە[٣٣٣].

هەرچەندە پێوەندیی نێوان تورکیا و عێراق ئاڵۆز بوو (هێزی ئاسمانیی تورکیا لە ١٩٦٢/٨/١٦دا فڕۆکەیەکی عێراقیان خستە خوارەوە)[٣٣٤]. بەڵام تورکیا هیچ لایەنگیرییەکی کوردی نەدەکرد. بە پێچەوانەوە هێزەکانی سوپای تورک دانیشتوانی کوردیان لە رۆژهەڵاتی تورکیادا بە نێوی (گەڕان بە دووی جەردەدا) جەزرەبە دەدا[٣٣٥]. یاسای عەسکەریی لەنێوچە کوردییەکاندا بەگەڕ خرا[٣٣٦]. لە ١٩٦٢/٩/١١دا رۆژنامەی (جەمهورییەت)ی تورکی گوتەکانی سەرەک کۆمار (جەمال گیورسێل)ی بڵاوکردەوە کە دەڵێت: (ئەم بزووتنەوانەی کورد لە لایەن بارزانیی خۆیەوە نەخشەکێش نەکراون، بەڵکە بە تەقەلای هەندێ دەستە و تاقمی بێگانە هەڵگیرساون).

لەگەڵ ئەو هەڵوێستە دوژمنکارانە ئاشکرایانەی تورکیادا بەرامبەر بەکورد، کەچی قاسم تورکیای بە کۆمەک کەری بارزانیی تاوانبار دەکرد(*).

---

(*) بڕوانە رۆژنامەی "الثورە"، العدد ١٠٠١، بغداد، ١٩٦٢/٩/٢١.

ئێران بەرامبەر بارزانیی بەبەدگومانی مایەوە، هەرچەندە شا دوژمنایەتی زۆری قاسمی دەکرد، چونکە قاسم گەلەک توودەیی ئێرانی داڵدە دابوو.

رادیۆی ئیسرائیل لە (حديث ابن الرافدين)دا، بێ پەروا خەریکی درۆ هەڵڕشتن بوو دەربارەی کورد. رۆژنامەی (الثورة)ی زورناژەنی قاسم بێ گوێ دانە ئەوانە، لە ٢١ سێبتەمبەری ١٩٦٢دا دەنووسێت کە گوایە (زایۆنیستەکان و بارزانیی پێکرا کاردەکەن). لەڕاستیدا ئیسرائیل لەسەردەمی قاسم دا بەووەوە نەدەوەستا کە شۆڕشی کورد بە بازییەکی شوورەویی لەقەڵەم بدات، بەڵکە لە ئیسرائیل دا لە کەمەنەتەوەیی کوردیشیان هەڵپێچابوو دەیانچەوساندنەوە. وەک لە پێشدا باسمان کرد گەلەک کورد لەساڵی ١٨١٢دا بۆ (ارض الميعاد) گەڕانەوە. پاش دامەزراندنی دەوڵەتۆچکەی ئیسرائیل، لە لایەن جووە ئەوروپییە (تزیڤیلیستەکانەوە) خراپ مامەڵە دەکران و پشت گوێ خرا بوون. ١٩٦٣ لە ئیسرائیل رێکخراوێکی کوردی بۆ پارێزگاریی لە مافی جوولەکە کوردەکان دامەزرێنرا. دەمڕاستێکی ئەو رێکخراوە بەم جۆرە ڕای خۆی بۆ رۆژنامەنووسێکی ئیسرائیل دەردەبڕێت:

(هەر شاڵاوێکی ئیسرائیل بۆ سەر عێراق و بۆ بەرژەوەندیی کورد، وولاتە دۆستەکانی وەکو ئێران و تورکیا، کە ئەوانیش کەمە نەتەوەیی کوردیان تێدایە، لە دۆستایەتی ئیسرائیل دوور دەخاتەوە......)(٣٣٧).

١٩٦٣ باڵوێزی ئیسرائیل لە هۆڵەندا (David Shealetiel) سیاسەتی ئیسرائیل بەرامبەر بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد ئاوها هەڵدەسەنگێنێت:

(ئێمە بایی هێندە تێ دەگەین کە هەموو نەتەوەیەک ئازادی خۆی گەرەکە، بەڵام لەلایەکی دییەوە هێمنی و ئارامی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، لە پێویستییە هەرە گرنگەکانی ئیسرائیلە. نا ئارامیی لەو بابەتە " مەبەستی ئەوەی کوردستانە - نەبەز - بۆ دەوڵەتی ئێمە زیان بەخشە)(٣٣٨).

ئەمەش وەرامێکی بەجێیە بۆ ئەوانەی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد بە (بازییەکی زایۆنیستەکان) لەقەڵەم دەدەن(٣٣٩).

ئەوەی دەربارەی هەڵوێستی ئەمریکا پێویست بێت ئەوا لە رۆژنامەی (New York Times) ی وەردەگرین. رۆژنامەکە بە نێوی قسەکەرێکی رەسمییەوە دەنووسێت (ئەمریکا نە کۆمەکی ماددی و نە کۆمەکی مەعنەوی بەشۆڕشی کورد ناکات)(٣٤٠).

له ١٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٢دا هەمان رۆژنامە دەنووسێت کە (ئەمریکا وەکو کێشەیەکی نێوخۆیی عێراق، لە مەسەلەی کورد دەڕوانێت).

لەم راستی‌یانەوە روونە کە کوردەکان تا ئەو کاتانە تەنها پشتیان بەخۆ بەستووە و هیچ کۆمەکێکی دەرەکی پێ نەدراوە.

کەواتە بێگانە یارمەتیدەری ئێمە نەبوون، بە پێچەوانەوە، گەرەکیان بووە لەرێی درۆ و بوختانە وە، بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد، بۆ بەرژەوەندی و مەبەست و پڕوپاگەندەی خۆیان هەڵشێلن.

کاتێک رادیۆی (بی. بی. سی) لەندەن، شوورەویی دەکاتە بەرپرسیاری شۆڕشی کورد[٣٤١]. رۆژنامەی (Neues Deutschland) (ئاڵەمانیای نوێ)ی ئاڵەمانیای دیمۆکرات لە ١٩٦٢/٦/٧دا رژێمی (بۆن) بە (کۆمەکی پەنهانی‌ی کۆمیتەی رزگاریخوازانەی کورد) لە ئاڵەمانیادا تاوانبار دەکات و دەڵێت گوایە "ئەفسەرەکانی سوپای ئاڵەمانیا مەشق بە کوردە یاخی بووەکان دەکەن". رۆژنامەکە مەبەستی ئەوە بوو (هەڵوێستی دژ بە عارەبی) ئاڵەمانیای رۆژئاوا بەدەرخات.

ئەو بانگاشایەی ئاڵەمانیای رۆژهەڵات کاتێک بوو، کە رۆژنامەی (Wehrpolitische In-formation) ی ئاڵەمانیای رۆژئاوا شوورەویی بە پشتگیری کەری شۆڕشی کورد لەقەڵەم دەدات: "شەوانە فڕۆکە جەنگی‌یەکانی شوورەویی بۆ نێوچەی شۆڕشگێرە کوردەکان دەفڕن و پێویستی‌یەکانی جەنگیان پێ دەگەیەنن"[٣٤٢]. ئەم بوختانەی کە لەگەڵ رادیۆی (بی. بی. سی) بەشی عارەبی لەندەن دا چوون یەکن، لە لایەن کاربەدەستانی رەسمی‌ی عێراقەوە بە درۆ خراوەتەوە[٣٤٣].

بە پێچەوانەوە، رۆژنامەی (الثورة) دەنووسێت "ئاڵەمانیای رۆژئاوا هەندێک پەنابەری کورد مەشق پێ دەکات، تا بتوانن کۆمەکی یاخی بووەکانی (شیمال) بکەن"[٣٤٤].

شایانی باسە کە رژێمی (بۆن) زۆر لەوەوە دوور بوو کە یارمەتی بۆ کورد لێ هەڵوەرێت.

لەوەرامی پرسیارێکی گۆڤاری (Quick) لە ١٩٦٥دا، کە ئایا ئاڵەمانیای رۆژئاوا یارمەتی کورد دەدات؟ ژەنەراڵ بارزانی‌ی گوتبووی:

(نەخێر نایدەن. "بارزانی‌ی دەستی بۆ رادیۆکەی راکێشا بوو کە لەو کاتەدا لەقاهیرەوە هێرشی کردبووە سەر ئاڵەمانیا"، یارمەتی میللەتێک نادەن کە رێزی بۆیان هەبێت و

دۆستایەتی‌یان ئارەزوو بکات، بەڵکە هی ئەوانە دەدەن کە تف لەچارەیان دەکەن)(٣٤٥).

لەگەڵ ئەو هەموو چەرمەسەری و درۆو بوختان پێ کردنانەدا، جەنگی میللی کورد تا دەهات سەرکەوتن و پێشکەوتنی زێتری بەدەست دەهێنا، بەرادەیەک کە پێشمەرگەکانی کورد لە ئاوریلی ١٩٦٢دا زێترین بەشی کوردستانی عێراقیان کەوتە ژێر دەستەوە(٣٤٦).

لە ٢٠ی ئاوریلی ١٩٦٢ وە بارزانی‌ی رۆژنامەنووسانی بێگانەی بۆ کوردستانی ئازاد داوەت کرد و پاراستنیشیانی گرتە ئەستۆ. یەکەم پەیامنێرانێک کە سەردانی بارەگای بارزانی‌یان کرد (Richard Anderegg)ی(٣٤٧) پەیامنێری (la radiofision Suisse pour le Proche- Orient) و(Dana Adams Schmidt)(٣٤٨)ی پەیامنێری (New York Times) و (David Adamson)(٣٤٩)ی پەیامنێری (Daily Telegraph) بوون. ئەم سێ پەیامنێرە یەکەم کەسانێک بوون کە دەنگی شۆڕشی کوردیان بە بڵاوکراوەکانی جیهان راگەیاند. بەو پێ‌یە تەنها خزمەتی ئێمەیان نەکرد، بەڵکە خزمەتێکی زۆری راستی و واقیعیان کرد. سوپاسی زۆری خۆمانیان پێشکەش دەکەین.

لەو کاتەوە تا ئێستا رۆژنامە نووسەکانی جیهان بەردەوام سەردانی کوردستان دەکەن. سەرپاکیان ئەو راستی‌یەیان دەربڕیوە، کە شۆڕشەکەمان داواکاری‌یەکی پەتی‌ی مافە کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی‌یەکانی میللەتەکەمانە. گوتارەکانیان پەردە لەسەر ئازارو ئاواتی نەتەوەکەمان لادەدەن. بەچاوی خۆیان دیتوویانە چۆن گەلەکەمان بێ هیچ کۆمەکێکی دەرەکی‌ی بەرووی دیکتاتۆرێتی و سیاسەتی تۆو برکردندا وەستاوەتەوە(٣٥٠). هەتا بێ هیچ کۆمەکێکی داو و دەرمان و پێویستی‌یە ئاسایی‌یەکانی تەندروستی‌ی خاچی سووریش. پێشکەشی‌یەکی لەو بابەتەی خاچی سووری دەوڵەتان، لە لایەن قاسمەوە درایە دواوە(٣٥١). دەبێت ئەوەش بگوترێت کە دەنگدانەوەی زێتری شۆڕشی کورد لە چاپەمەنی‌یەکانی جیهاندا، بەهۆی رفاندنی چەند ئەوروپاییەکەوە بوو، لەو رێگەیەوە مەسەلەی کورد سەرنجی بڵاوکراوە جیهانی‌یەکانی راکێشا. رفاندنی جیۆلۆجی ئینگلیزی (Mr. Gosling) و ئەو میوانداری‌یە کوردانەیەی لێ‌ی کرا، وای لەگەلەک رۆژنامەی ئینگلیزی کرد کە دەربارەی کێشەی کورد بنووسن(٣٥٢).

ئەو سەرکەوتنانەی شۆڕشی کورد بەدەستی هێنا، قاسمی شێواند. گەلەک جار لێ خۆش بوونی گشتی‌ی بڵاوکردەوە. چیدی کەس باوەڕی پێ نەدەکرد. شۆڕشی کورد رۆژ لە دوای رۆژ فراوانتر و بەهێز تر و رێکوپێک تر دەبوو. کاتێک سوپای عێراق لە زۆر نێوچەدا

زەبری توندی وە بەرکەوت[٣٥٣]. ئیدی قاسم جڵەوی سیاسی و دەسەڵاتی لە زۆر شوێنی کوردستاندا لەدەست دا[٣٥٤]. گەلەک سەرباز و ئەفسەر و دەرەجەدار و پۆلیس بۆ کن کورد هەڵهاتن. قاسم زۆر جار ڕایگەیاند کە گوایە "بارزانیی" کوژراوە" و یاخیگەرییەکە سەرکوتکراوە[٣٥٥]. لە رۆژنامەکانی (العهد الجديد)[٣٥٦] و (الثورة)[٣٥٧]دا بڵاوی دەکردەوە گوایە ئەمریکا و تورکیا و کۆمپانیاکانی نەوتی ئینگلیز، کۆمەک بە بارزانیی (بەکرێ گیراو) دەکەن. بەکورتییەکەی قاسم هێندەی درۆ کرد، کە چیدی رۆژنامە نووسانی بێگانەش باوەڕیان پێ نەدەکرد[٣٥٨]. (New York Herald Tribune) لاقرتێی بە گوتەیەکی قاسم کردبوو، خستبوویە نێو ئاخنی سەردێڕی گوتارەکەیەوە و نووسیبووی (شۆڕشی کورد کۆتایی هات، کەچی جەنگ هەر بەردەوامە!)[٣٥٩]. لە یادمە رادیۆی ئیسرائیل بەم شێوەیە وەرامی گوێگرێکی دایەوە، کە پرسیبووی (ئاخۆ مرۆ پاش مردن چی بەسەردێت؟)، قسەکەرەکە گوتی:

" گوێگری ئازیز! بەداخێکی زۆرەوە من ناتوانم وەرامی پرسیارەکەت بدەمەوە چونکە تا ئێستا کەس زیندوو نەبۆتەوە تا هەواڵی ئەو دونیامان پێ رابگەیەنێت. بەڵام گەر هەر لەسەر وەرامی پرسیارەکەت سووریت، ئەوا تکایە بفەرموو بڕۆ بۆ کوردستان و لە بارزانیی سەرکردەی کوردەکان بپرسە، چونکە ئەو گەلەک جار مردووە و زیندوو بۆتەوە".

دوژمنەکانی قاسم هەل و دەرفەتی هەڵکەوتویان لە کیس نەدا. لە ١٩٦٣/٢/٨دا چەند ئەفسەرێکی سەر بە حیزبی بەعس بەسەرۆکایەتی سەرهەنگ (عەبدولسەلام عارف)ی ناصری، کودەتایەکی سەرکەوتویان دژی قاسم ساز دا. عەبدولسەلام یەکسەر پاش کودەتاکە بووە فیلد مارشاڵ[٣٦٠]. کاتێک کۆمۆنیستەکان ویستیان پارێزگاری لە بوون ومانەوەی رژێمی قاسم بکەن[٣٦١] قەتڵ و عامی کۆمۆنیست دەستی پێ کرا[٣٦٢].

چەپەڵی دەستە و تاقمی بەعس و(حەرەسی قەومی)یان، هەتا لەلایەن (میشێل عەفلەق)ی سکرتێری گشتییشیانەوە نەفرەتی لێ کراو بە خوێن رێژ تاوانبار کران[٣٦٣].

دەبێت ئەوەش لە یاد نەکرێت کە دەستگای جاسووسیی ئەمریکا (سیا) لە عێراقدا، لیستەی نێوی کۆمۆنیستەکانی بۆ رژێم نارد و لەو رێگەیەوە زۆریان دەست نیشان کران و لە نێو بران.

ئەو کۆمۆنیستانەی لە سەردەمی قاسم دا دژی شۆڕشی کورد وەستابوونەوە پاش کودەتاکە پۆل پۆل بۆ کوردستان هەڵهاتن، تا پەنا بدرێن و بپارێزرێن. زۆر چاک و میوان

دۆستانە مامەڵەیان لەگەڵ کرا. زۆر ئەفسەر و دەرەجە داری عارەبیش لە ترسی زەبر و تۆقاندنی رژێمی بەغدا بە چەکەوە بۆ کوردستانی ئازاد هەڵهاتن و چوونە پاڵ سوپای شۆڕشگێری کوردەوە(٣٦٤).

قاسم لە ١٩٦٣/٢/٩دا دەستگیر کرا. پاش موحاکەمەیەکی پێنج دەقیقەیی کوژرا. لەگەڵ ئەوەشدا تا گیرا ئازایانە بەرەنگاری کرد. پاش کوشتنی تەرمەکەی لە تەلەفزیۆن دا پێشان درا. بەڵام (کوردێک) بە (چەقۆیەک) سەری نەبڕیبوو، وەکو (شلۆس) بوختانی کردبوو(٣٦٥)، بەڵکە لە لایەن بەعسی‌یەکانەوە بەر گولله درا.

سەرەڕای هەموو ناجسنی و دڕندایەتی‌یەکی قاسم بەرامبەر بەکورد، دەبێت ئەوەش بڵێین کە کودەتاکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ی قاسم گەلەک سوودی ناڕاستەوخۆی بەکورد گەیاند:

لە ١٥ی ئازاری ١٩٥٩دا سوپای ئینگلیز لە عێراق بەدەرنرا. عێراق لە ٢٤ی ئازاری ١٩٥٩دا لە پەیمانی بەغدا (سەنتۆ ی ئێستا) کشایەوە. لەو ڕێگەیەوە سیاسەتی دەرەوەی بەرامبەر تورکیا و ئێران (کە دوو ئەندامی سەنتۆ و داگیرکەری دوو پارچەی کوردستانن)، ڕەنگێکی دی پۆشی.

چیدی هاریکاریی تورکیا و عێراق و ئێران دژی کورد لەڕێی پەیمانی (سەنتۆ)وە لە ئارادا نەماو لە گرێژنە چوو.

قاسم لە ٣٠ی ئازاری ١٩٥٩دا ئینگلیزی ناچار کرد بنکەی سوپایی (حبانیة)ی نێزیکی بەغدا چۆڵ بکەن، ئەمەش زەبرێکی دی بوو لە سەنتۆ درا.

لە ٣٠ی مایسی ١٩٥٩دا عێراق خۆی لە پەیمانی هاوکاری‌ی سوپایی‌ی ئەمریکا کێشایەوە کە لە ١٩٥٤دا مۆر کرابوو.

لە ١٦ی تەموزی ١٩٥٨دا پەیمانی گومان لێ کراوی (فیدراسیۆنی عارەب)ی لەگەڵ ئەردەن دا هەڵوەشاندەوە و پشتگیری خۆی بۆ نێو براو بە وولاتە عارەبە ئازادەکان دەربڕی‌ی. لە ١٩ی تەموزی ١٩٥٨دا پەیمانێکی بەرگری‌ی لە نێوان عێراق و کۆماری عارەبی یەکگرتوودا مۆر کرا.

قاسم ئازادی‌یەکی بێ سنووری بە کۆمۆنیستەکان دا، بەڵام پیاو نەیدەتوانی لە حاند کردار و ڕەفتاریان بێ دەنگ و رازی بێت.

سەردەمی قاسمیش ئەوەی ئاشکرا کرد کە برایەتی کورد و عارەب تا ئەو کاتەی مافی مرۆڤانەی کورد دانی پێدا نەنرێت، تەنها هیوایەکی پەتی‌یە.

بەهۆی کودەتای قاسمەوە بارزانی وهەڤاڵەکانی لە ئاوارەیی هەندەران گەڕانەوەو سەر لەنوێ دەست بەکار بوونەوە.

کەواتە دەبێت پێ لەو راستی‌یە بنێین، کە هاتنی قاسم، لە کوردستانی عێراقدا و لەو رێگەیەوە لە کوردستانی مەزن دا، دەروازەی سەردەم و قۆناغێکی نوێی ئاواڵە کرد و رێگەی بۆ ئیدیۆلۆژی و بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە خۆش کرد و هەر ئەوەش بووە بەهێزترین هۆیەکی رووخاندنی قاسم(٣٦٦).

شایانی باسە -کە بەعسی‌یەکان پێش کودەتاکەیان، لە بەهاری ١٩٦٢دا، پەیوەندی‌یان بەکوردەوە کردبوو(٣٦٧). (طاهر یحیی) بۆ (برایم ئەحمەد)ی سکرتێری ئەو کاتەی پارتی دێمۆکراتی نووسیبوو (بە چ مەرجێک شۆڕشی کورد پشتگیری‌ی لە کودەتایەکی دژ بە قاسم دەکات؟) گوایە پارت لە ٢٨/٤/١٩٦٢دا وەرامیان داوەتەوە (بە پاداشتی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق)(٣٦٨)(×).

ئەم سەودا و مامەڵەیەی پێش کودەتاکە تا کوێ رۆیشتووە و بەکوێ گەیشتووە، لای من ئاشکرا نی‌یە. هێندە هەیە لە ١٠ی شوباتی ١٩٦٣دا، دوو رۆژ پاش کودەتاکە، (صالح یوسفی) بە نێوی مەکتەبی سیاسی پارتی دێمۆکرات و شۆڕشی کوردەوە، بروسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ رژێمی نوێ نارد و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کرد(٣٦٩).

ماوەیەکی کورت پاش ئەوە، لە ٥ی مایسی ١٩٦٣دا گفت و گۆی رەسمی‌ی لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و رژێمی بەعسی عارفی‌دا، لە رێگەی ژەنەراڵ (طاهر یحیی)وە دەستی پێ کرد. پێشتر لە ٧و٨ی مارتی ٩٦٣دا (وەفدێکی میللی) عێراق چوونە لای بارزانی‌ی(٣٧٠). بە پێی گوتەی رۆژنامەی (Le Monde)(٣٧١)ی فەرەنسی گوایە بارزانی‌ی هەر زوو دردۆنگی و گومانی لە رژێمی بەعس پەیدا کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گفت و گۆیانە بەرێکەوتنێک لە نێوان هەردوو لادا کۆتایی هات. (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی رژێمی بەعس لە ١٠ی ئازاری ١٩٦٣دا یاسایەکی

---

(×) ئەم زانیاری‌یە یا هەر راست نی‌یە، یاخود مێژووەکەی هەڵەیە. چونکە دەڵێت (بەعسی‌یەکان پێش کودەتاکەیان لە کۆتایی ٩٦٢دا پەیوەندی‌یان بە کوردەوە کردووە)، بەڵام لە چەند دێرێکی پاشتر دا دەڵێت (پارت لە ٢٨/٤/٩٦٢دا وەرامیان داونەتەوە) یانی سەرەتای ٩٦٢.

بڵاوکردەوە کە (لێ خۆش بوونی گشتی‌ی) بۆ ئەوانە دەرکرد کە بزووتنەوەی چەکدارانەی کوردیان لە ١٩٦١/٩/٩[٣٧٢]دا لە ژووروی کۆماری عێراقدا هەڵگیرساند یا بەشداری‌یان تێیدا کردووە[٣٧٣].

لە ١٩٦٣/٣/١١دا، رادیۆی بەغدا بڵاوی کردەوە کە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) لە عێراقدا، دان بە مافی کورد لە قەوارەی لامەرکەزی‌یدا دەنێت[٣٧٤].

لەبەرامبەر ئەوەدا گیرا وە عێراقی‌یەکان کە لەنێویاندا هەندێ ئەفسەری سوپاشیان تێدا بوو، ئازاد کران[٣٧٥].

سەرەتای ئاوریلی ١٩٦٣ عێراق و سوریا و میسر لە قاهیرە گفتوگۆیان بۆ (یەکێتی عارەب) دەست پێ کرد. ئەمە دڵە راوکەی نوێی بۆ کورد وە پێش هێنا. لەو گفتۆگۆیانە دا هەندێ کوردیش لە نێو وەفدی عێراق دا بوون، تا داخوازی‌یەکانی شۆڕشی کورد پێش چاو بخەن[٣٧٦]. (جەلال تاڵەبانی‌ی) سەرۆکی وەفدە کوردی‌یەکە لە ٨ی ئاوریلی ١٩٦٣ دا بیرخەرەوەیەکی لەم بابەتەی پێشکێش کرد:

(لە حاڵەتێکدا گەر عێراق لەم بارودۆخەی ئێستایدا بمێنێتەوە، ئەوا کورد لەو مافانە زێتر داوا ناکات کە رژێمی عێراق لە ١٩٦٣/٣/١١دا دەست نیشانی کردوون. خۆ ئەگەر عێراق بچێتە نێو فیدراسیۆنێکی عارەبەوە، ئەوا دەبێت کورد رژێمێکی ئۆتۆنۆمی‌ی بەرفراوانی بۆ دیاری بکرێت. بەڵام ئەگەر عێراق لەگەڵ دەوڵەتێک یان چەند دەوڵەتێکی دیکەی عارەب دا، یەکێتی‌یەکی تەواوی پێک هێنا و خۆی تێدا تواندەوە، ئەوا دەبێت گەلی کوردی عێراق لەگەڵ ئەو دەوڵەتە یەک گرتووەدا (وەکو پارێزگەیەک) کە بوون و قەوارەی بپارێزێت، پابەند بێت و بیر لەجودابوونەوەی نەکرێتەوە)[٣٧٧].

لە ١٧ی ئاوریلی ٩٦٣دا سەرکردایەتی شۆڕشی کورد مسوّدە و پلانی نوێی داخوازی‌یەکانی بۆ گفتو گۆ و لێ دوانی زێتر، بە رژێمی بەغدا دا. ئەم پلانە داوای ئۆتۆنۆمی‌یەکی نێوچەیی سنوور بۆ کێشراوی بۆ کوردستانی عێراق دەکرد[٣٧٨].

لە ١ی تەموزی ١٩٦٣دا رژێم پلانی (یاسای پارێزگەکانی) بڵاوکردەوە. بەو پێ‌یە عێراق بەسەر پێنج پارێزگەدا دابەش کرا. یەکێک لەوانە پارێزگەی سلێمانی بوو، کە هەندێ شاری کورد نشینی وەکو هەولێر و دهۆک و سلێمانی‌ی دەگرتەوە. شاری پڕ نەوتی کەرکوک و خانەقینی سەرسنوور و نێوچەی شێخان و سنجاری یەزیدی‌یەکانی تێدا نەبوو. دەبێت ئەوەش بڵێین کە ئەو سەردەمە شۆڤێنی ترین و رەگەز پەرست ترین دەستەی بەعس

فەرمان ڕەوا بوون.

ناصری‌یەکانیش نەیاندەویست ڕژێمی بەعس چارەسەری کێشەی کورد بکات. بەعسیش هێشتا تەجرەبەیەکی تەواوی دەربارەی کێشەی کورد نەبوو. جگەلەوەی بەعس ستراتیژی‌یەکی یەک توخم و تاکتیکێکی روونی نەبوو، کە پاشان بووە هۆی دووبەرەکی نێو حیزبەکەشیان. دواتر سیاسەتی تەنگ پێ هەڵچنینی کورد و شۆڕشە ئازادیخوازانەکەی وەبەر گیرا و ئەو (یاسای پارێزگە)یەی پێشان نێو برا، بەگەڕ نەخرا. بەعس نەیدەویست دان بەو ڕاستی‌یەدا بنێت کە کەرکوک و خانەقین ونێوچەی یەزیدی‌یەکان خاکی بێ چەند و چوونی کوردن. پێوەندی‌ی گفتوگۆ کاتێک پسا، کە بەعس وەفدە گفتوگۆکەرەکەی لە بەغدا گرت و خراپ رەفتاری لەگەڵ کردن. ئەمە ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، چونکە ئەحمەد حەسەن بەکری سەرکردەی بەعسی‌یەکان، دوومانگ پێش ئەوە بە پێ‌ی داب و نەریتی ئیسلام قورئانێکی خستە سەر سەری و سوێندی "بۆ وەفدەکە خوارد" قەسەم بەم قورئانە هیچ نیازێکی خراپم بەرامبەرتان نی‌یە"(۳۷۹). وا پێدەچێت مەسەلەی گفتوگۆ لەگەڵ کورد دا، تەنها کلاوبازی و فریوێکی ڕژێمی بەعس بووبێت، تا بتوانێت کورد بەدەمەوە بگرێت و خۆی دژیان تەیار کات و هێز و گوڕێک پەیدا کات. دیارە هەر وا بووە و ڕۆژنامەی (پراڤدا)ش لە ۱۹٦۳/٦/۱۲ دا، بۆچوونێکی لەو بابەتەی دەربڕیبوو.

لە ۱۹٦۳/٦/۹دا سوپای عێراق و (حەرەسی قەومی) بەعسی‌یەکان لەناکاو، پەلاماری کوردستانیان دایەوە(۳۸۰). هەمان ڕۆژ ئەفسەرە بەعسی‌یەکان لە سلێمانی ۲٦۷، لە کۆیە ۲۵ و لە بیتوێن ۷۳ کوردیان بێ هیچ هۆ و پێشەکی‌یەک گرت و بێ هیچ دادگا و لێ پرسینەوەیەک گوللەبارانیان کردن.

لە ۱۰ی تەموزی ۱۹٦۳دا ڕادیۆی بەغدا ئینزاری کوردی کرد. جەنگاوەرە ئازادیخوازەکانی کوردی بە جوداخواز و سەر بە کۆمۆنیست و زایۆنیست نێو دەبرد و هەڕەشەی مردنی لەهەر یەکێک دەکرد کە پشتگیری لە بارزانی‌ی بکات. خەلاتێکی ۱۰۰ هەزار دیناری بۆ سەری بارزانی‌ی تەرخان کرا.

ڕادیۆی بەغدا هەڕەشەی کاول کردنی هەر گوندێکی پارێزگەی کەرکوک و هەولێر و سلێمانی دەکرد، لە حاڵەتێکدا، لەوێ وە یا لە نێزیکیانەوە، تاقە گوللەیەک بەرووی سوپا یا حەرەسی قەومی، یاخود هێزە لایەنگرەکانیاندا بتەقێندرێت، یا هەر کەسێک

(یاخی بوویەک) پەنا بدات[٣٨١].

بێ بەزەییانە چل هەزار کوردی دەوروبەری شاری پڕ نەوتی کەرکوک دەرپەڕێندران. دانیشتوانی گوندە کوردنشینەکانی ئەو مەڵبەندە راگوێزران و عارەبی خێڵەکی‌یان لە جێگەنان. خانووی کوردەکان بە بلدۆزەر تەخت کران[٣٨٢]. هەموو چالاکی‌یەکی کوردانە یاساغ کرا. خوێندن و نووسین بەکوردی قەدەغە کرا. هەتا نێوی کوردی موغازەکانیش داگیران و لەجێگەیان عارەبی دانران. گاو گۆتاڵ تالان کران و رەزو باخ سووتێنران[٣٨٣].

بەعسی‌یەکان بانگاشەیان دەکرد کە لە ماوەی ١٠ رۆژدا (یاخی گەری‌ی) کورد کۆتایی پێ دەهێنن[٣٨٤]. (علي صالح السعدي) کە یەکێک لەسەرکردە بالادەستەکانی بەعس بوو، لە ١٩٦٣/٦/١٥دا لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری‌یدا دەیگوت[٣٨٥]. "شەڕی شیمالی عێراق تەنها ٢-٣ مانگێک دەخایەنێت". هۆی درێژە دانی جەنگی دژی کوردی بەم هۆش و گۆشەوە شی دەکردەوە: (ئێمە یەک "ئینج"یان دەدەینێ، ئەوان داوای یەک "یاردە"ی تەواو دەکەن). (السعدي) تاوانی زۆری کوشتاری کورد و ئاسووری لەملە. ئەوەتا ئەورۆ لەبەغدا پاڵی لێ داوەتەوە و بێ ئارەق دەرچووە.

(عارف)ی سەر کۆماری عێراق بەرۆژنامەی (Le Soir)ی لوبنانی‌ی دەگوت: "بەو زوانە کێشەی کورد کۆتایی پێ دێت... سەردەمی دان بەخۆدا گرتن و گفتوگۆ لەگەڵ کورد دا بەسەر چوو"[٣٨٦].

هاوئاهەنگ لەگەڵ شەڕی دژ بەکورد دا، بەعسی‌یەکان سیاسەتی قڕانی کۆمۆنیستیان پێش گرتبوو. رژێمی بەعس هەڵوێستێکی زۆر دوژمنکارانەی بەرامبەر شوورەوی وەبەر گرتبوو. ئەو کاتانە پارتی کۆمۆنیستی عێراق سیاسەتی خۆی بەرامبەر کورد گۆڕیبوو. دانیان بەوە دانا، کە لەگەڵ قاسمی دیکتاتۆر دا. لەسەر خامۆش کردنی شۆڕشی کورد یەکیان گرتبوو. پێ‌یان لەوە نا کە هەندێک کۆمۆنیستیش خۆ ویستانە چەکیان بەرووی شۆڕشی کورد دا بەرز کردبووەوە. پارتی کۆمۆنیستی عێراق بە رەخنە لەخۆ گرتنەوە هەڵوێستی پێشینی خۆیان تاوانبار کرد. بە هەڵوێستێکی "راست ڕەوانە و رەدووکەوتوانە و نابەرپرسیارانە بەرامبەر چارەنووسی وولات" دەست نیشانیان کرد[٣٨٧].

وێزگە و چاپەمەنی‌یەکانی شوورەوی و وولاتە سۆسیالیستەکانی دی دەستیان بە پشتگیری‌ی شۆڕشی کورد کرد. سیاسەتی خوێنڕێژانەی عێراقیان لەقاو داو تاوانباریان دەکرد. لەبەرنامەیەکی ئێوارەی ١٩٦٣/٦/١٣دا رادیۆی مۆسکۆ ئاوای دەگوت:

"کوردەکان دەستدرێژی کەر نین، خەباتیان جەنگێکی خۆ پاراستنی رووتە"(٣٨٨).

رۆژنامـەی (Neues Deutschland)، ئۆرگـانی پارتی سـۆسـیـالیـسـتی یەک گـرتووی ئاڵەمانیای خۆرهەلات، هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد گۆڕی و پێشمەرگەی کوردی بە (هێزە نیشتمان پەروەرەکان) نێو دەبرد(٣٨٩). جیهانی رۆژئاوا و بەتایبەت ئینگلتـەرە، لایەنگیری رژێمی بەعسـی‌یان دەکـرد، چونکە رژێمی بەعس دژی کۆمۆنیست وەستا بووەوە و قاسمی رووخاندبوو. ئەو وولاتانە کۆمەکیـان بەرژێمی بەعس دەکـرد. بۆ نموونە ئینگلتـەرە چەکی قـورس و تەقـەمـەنی بە عـێـراق دەدا و مـەشـقی بە ئەفسەرەکانی دەکرد(٣٩٠).

بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو هەڵوێسـتـەی ئینگلتـەرە، پێـشـمـەرگـە کـوردەکـان لە ١٩٦٣/٦/١٨دا دوو بۆریی نەوتی شیرکەتی (ئای. پی. سی) ئینگلیزیان لەنێزیکی کەرکوک تەقاندەوە. پێنج کـاربەدەستی (ئای.بی.سی) تێیدا کوژران و نەوتێکی زۆر بە هەدەر چوو. رۆژنامـەی (Sunday Express) ئەو نەوتەی بە "نەوتی ئینگلیـز" نێـو دەبرد، یانی "موڵکی ئینگلیز"ە(٣٩١). بارزانیی هەڕەشەی دەست وەشاندنی زێتری لەشیرکەتە ئینگلیزی‌یەکان کرد، کە پارەیان بەعێراق دەدا تا کوردی لە خوێندا پێ شەلاڵ بکات.

(جەلال تاڵەبانی)یش هەمان هەڕەشـەی دەکرد(٣٩٢). ئەو کـاتە نوێنەری شۆڕشی کورد بوو. دەیگوت جەنگی بەعسی دژ بە کورد رەفتارێکە لەشێوەی قڕ کردنی جووەکان لەلایەن هێـتلەرەوە(٣٩٣). تاڵەبانی‌ی زێتـر لەسـەری دەڕوات و دەڵێت: (تا لە نێـو نەبرێین، هاوکاریی لەگەڵ هەموو لایەک دا دەکەین، هەتا لەگەڵ شەیتانیشدا)(٣٩٤).

بەعس پێی لە دژایەتی کۆمۆنیست هەڵبڕی. لە ١٩٦٣/٦/٢٣دا ٢٨ کۆمۆنیست و لایەنگرانیان لە دار دران. گوایە لە ئاژاوەکەی ١٤ی تەموزی ٩٥٩ی کەرکوک دا دەستیان هەبووە.

لە ١٩٦٣/٧/٢دا مەنگۆلیا داوای لە (یۆتانت) کرد" مەسەلەی قڕکردنی میللەتی کورد بخاتە پێش چاوی هەژدەهەمین کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نەتەوە یەککگرتووەکانەوە، بۆیە عێراق پێوەندیی دیبلۆماسی‌یانەی خۆی لەگەڵ مەنگۆلیادا پچڕاند. هەمان رۆژ وەزیری دەرەوەی عێراق (صالح مهدي عماش) هێرشەکانی سوپای عێراقی لە (شیمال)ی وولات دا بە (جەنگی راستەقینە)نا، بەڵکە بە (سەیران و گەشتێکی سوپای عێراق) نێو دەبرد(×).

---

(×) عەماش ئەو جەنگەی بە (نزهة عسكرية) نێو بردبوو.

له مۆسکۆ خۆپیشاندانێکی مەزن لەسەر شەقامەکان دژی رژێمی عێراق سازدرا. شووڕەوی تا دەهات توند تری دەکرد. له پرۆگرامێکی رووسیی رادیۆی مۆسکۆ دا، هێرشی توندی کرده سەر ئەمریکا و ئینگلتەرە، چونکه پشتگیری رژێمی کورد کوژی بەعسیان دەکرد. دەسته و دایەرە دیبلۆماسییەکانی عێراق لەدەرەوە دەستیان کرده درۆو بوختان. دەیانەویست راستییەکان لنگەو قوچ بکەنەوە و وا نیشان بدەن که گوایه کورد خۆی جەنگی خواستووە و گفتوگۆی تێک داوە(٣٩٥).

وەزیری دەرەوەی شوورەویی (ئەندرێ گرۆمیکۆ) له ١٩٦٣/٧/٩دا پرۆتێستێکی دایە باڵوێزی عێراق له مۆسکۆ. نارەزایی دژی قڕ کردنی میللەتی کورد دەربڕی. له ١٩٦٣/٧/١٠دا رۆژنامەی پراڤدا گوتارێکی بڵاوکردەوە که تێیدا تورکیا و سوریا و ئێران و عێراق به ئاگا دێنێتەوە. لەو بەئاگا هێنانەوەیەدا شوورەویی هەڕەشه لەو وڵاتانه دەکات که "نەتەوەی ئازادیخوازی کورد قڕ دەکەن".

شوورەویی توانای ئینتەرناسیۆنالیستانەی خۆی زێتر بەگەڕ خست. له ١١ی تەموزی ١٩٦٣دا نوێنەری شوورەویی، له کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئابووری و کولتوری نەتەوە یەکگرتووەکاندا له جنێف، داوای کرد (سیاسەتی جەنگی له نێوبەری) رژێمی عێراق بخرێته لیستەی کار و لێکۆڵینەوەکانیانەوە(٣٩٦). نوێنەرانی فەرەنسا، ئەمریکا، ئینگلتەرە، ئەردەن و(٣٩٧) هندستان دژی ئەو داوایه وەستانەوە. نوێنەرانی ئەثیوبیا، یۆگۆسلافیا و سەنگال دەنگیان نەدا.

هەمان رۆژ رۆژنامەی (البعث)ی ئۆرگانی حیزبی بەعس له عێراقدا دەنووسێت:

(میللەتی عارەب هەر له ئۆقیانووسەوە تا کەنداو، پێیان وایه ئەم یاخیگەرانه هەوڵ دەدەن ئیسرائیلێکی دووهەم لەسەر خاکی عارەب دابمەزرێنن).

(دوکتۆر نیکۆلای ت. فیدورینکۆ)ی نوێنەری هەمیشەیی شوورەویی له ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بۆ نوێنەرانی ئاشکرا کرد که (قڕ کردنی میللەتی کورد له لایەن رژێمی عێراقەوە بارێکی ئاڵۆز دێنێته گۆڕێ). زێتر لەوە گوتی: (دەست تێکەڵ کردنی وڵاتەکانی دراوسێ، بەهەمان مەبەست لەگەڵ عێراق دا، ئاشتی رۆژهەڵاتی نێوە ڕاست و نێزیک دەخاته مەترسییەکی راستەقینەوە و نیانی و هێمنی و ئاسایشی شوورەویش شلۆق دەکات)(٣٩٨).

کۆتایی ئۆکتۆبەری ١٩٦٣ جموجۆڵی دیبلۆماسییانەی بەرەی رۆژهەڵات دژی عێراق له

پڕێکدا ڕاگیرا. مەنگۆلیا کەمێک پێش ١٨ هەمین دانیشتن کە لە ١٧ی ئۆگوستی ١٩٦٣دا لەنیویۆرک گیرا، شکاتەکەی خۆی لای نەتەوە یەکگرتووەکان کێشایەوە. بەشدارانی کۆبوونەوەکە سەریان سوڕما کە مەنگۆلیا بێ هیچ هۆ و بەڵگەیەک لەکردەی خۆی پەشیمان بووەوە[٣٩٩]. وەزیری دەرەوەی مەنگۆلیا (دوگەر سورن) لە ١ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٤دا ویستی پەشیمانی وولاتەکەی بە (بەتەنگەوە هاتنی هاریکاری و یەکێتی ئەفرۆئاسیا) عەیب پۆش کات. ڕاستی‌یەکەی ئەوە بوو مەنگۆلیا لە ترسی چاوی زیت و هەڕەشەی وولاتە عارەبەکان ئەو هەنگاوەی هەڵنا.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە (کۆماری گەلی چین) ئامادەیی خۆی بۆ پشتگیری‌ی ڕژێمی بەعس، دژی کورد دەربڕی. ماوتسی تۆنگ شۆڕشەکەی بە (بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستی نەتەوەییانەی بارزانی و کوردەکانی) نێو دەبرد[٤٠٠]. ئاشکرایە! مەسەلە ئەوەبوو شوورەویی پشتی کوردی دەگرت. دەنا دەبێت ماو چ بەهانەیەکی دی هەبێت تا بەو جۆرە نێومان بەرێت. پێشان هەمیشە لەجەنگی ئازادیخوازانەی نەتەوەکان دەدوا و سەری ڕەزامەندی‌ی بۆ دەلەقاندن. لەو بارەوە گوتوویە (مل ملانێی نێوان کۆلۆنی‌یەکان و ئیمپریالیزم لەرێگەی شۆڕش و خەباتی نەتەوەییانەوە چارە سەر دەکرێت)[٤٠١]. جەنگی خودی چین دژی ژاپۆن بەڕای ماو خۆی (جەنگێکی نەتەوەییانەی ئازادیخواز بووە)[٤٠٢].

کەسێکی وەکی ماو کە پێشان کوردە ئازادیخوازەکان ڕێزی زۆریان بۆی هەبوو، بەو جۆرە هەڵمان سەنگێنێت، بۆ کورد شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. بەڵام ئێمەی کورد خۆشەبووین و شەقی زەمانە ئەوەی فێر کردووین لەسیخورمەی وا ڕانەچڵەکێن و بێ دەستەڵاتانە خۆ بەدەم هەموو گێژاوێکەوە نەدەین. دەزانین لە نێوان گوتەی ئاڵ و واڵاو واقیعی تفت و تاڵ دا، جوداوازی‌یەکی مەزن هەیە.

ئەو هەڵوێستە دوژمنکارانە و ناتێگەیشتوانەی دەستەڵاتدارانی چین و لایەنگرانیان لەهەر لایەک کەهەن، هۆیەکی سروشتی بوو بۆ پووکاندنەوەی ڕێبازی (ماویزم) لە کوردستاندا[٤٠٣].

شایانی باسە کە پارتی کۆمۆنیستی عێراق نارەزایی خۆی دژی ئەو سیاسەتەی کەڵە پیاوی چین دەربڕی. (ئەنوەر مستەفا)ی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بە نێوی پارتی کۆمۆنیستەوە نامەیەک بۆ پراڤد دەنووسێت و تێیدا هەڵوێستی سەرکردەکانی چین کە (پشتگیری‌ی لە ڕژێمی عێراقی دژ بە کۆمۆنیست و کورد دەکەن)

تاوانبار دەکات و ئەو هەڵوێستە سیاسی‌یەی چین بە (دژیەکی‌ی تیۆری‌یەکانی خودی سەرکردەکانی چین دەربارەی شۆڕشی ئازادیخوازانەی نەتەوەکان) دەست نیشان دەکات[٤٠٤].

بۆ ناساندنی شۆڕشی کورد بە جیهانی رۆژئاوا، یانی بۆ ئەوەی بڵاوکراوە جیهانی‌یەکان باس لەمەسەلەی کورد بکەن، پێشمەرگە کوردەکان هەمدیسان چەند ئەوروپاییەکیان ڕفاند کە لە کوردستان کاریان دەکرد. لەوانە دوو ئەندازیاری ئاڵەمانی بوون[٤٠٥].

وولاتە رۆژئاوایی‌یەکان و پابەندەکانیان هەر لە سەرەتاوە هەڵوێستی دوژمنکارانەیان بەرامبەر بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد نیشان دا. بۆ نموونە ئێران لە ١٩٦٣دا شارەزایانی دەناردە عێراق تا دژ بە کورد یارمەتی‌ی رژێمی عێراق بدەن[٤٠٦]. ئەو سەروەختە هەڵوێستی دژ بە ناصری رژێمی بەعسی عێراق لەگەڵ بەرژەوەندی ئێران دا هاوتەریب بوو. فەرمان بە یاساوڵەکانی سنووری ئێران درابوو، دژی کورد، کۆمەک بە سوپای عێراق بکەن[٤٠٧].

تورکیا سنووری لە کوردەکانی عێراق گرتبوو. کاربەدەستانی تورکیا وعێراق پێکڕا زۆر بە نهێنی دژی شۆڕشی کورد هەڵدەسوڕان[٤٠٨].

پاکستانی ئەندامی سەنتۆ، بە پاپۆڕێک کە لە ١٩٦٣/٨/١٤دا گەیشتە بەندەری بەسرە، ۹۰۰۰ گوللە تۆپی بە(دیاری!) بۆ عێراق نارد[٤٠٩]. ئەم بەخشندەیی و دەست و دڵ فراوانی‌یەی لە کاتێکدا بوو، کە ساڵانە لە پاکستاندا، هەزاران کەس لە برسێتی و بێ دەرمانی و بێ نەخۆشخانەییدا بەدەردەوە سەریان دەنایەوە. پاکستان بۆیە ئەمەی دەکرد چونکە خۆشی بەدەست (دەردی بەنگلادیش)ەوە دەیناڵاند. تەواو وەکو عێراق و چەند وولاتێکی دی کە بەدەست (تیراوێی کورد)ەوە واوەیلایانە. بەڵام بەنگلادیش و هەموو نەتەوە زۆر لێکراو و چەوساوەکانی دی پاکستان، وەکو (پاتان)ەکان و(بلوج)ەکان، رۆژێک دێت هەر بە ئامانج بگەن و ئازادی و سەربەستی خۆیان بەدەست بهێنن[٤١٠].

ئینگلتەرەش چەکی بۆ عێراق دەنارد و پەنجا ئەفسەری فڕۆکەوانی بۆ پێگەیاندن[٤١١].

لە ١٩٦٣/٧/٢٦دا ئاژانسی دەنگوباسی (رۆیتەر) رایگەیاند کە رژێمی ئادیناوەر، پازدە ملیۆن مارک کۆمەک بە عێراق دەدات و پێوەندی‌یەکی کولتوری و ئابووری لە نێوان ئاڵەمانیای خۆرئاوا و رژێمی بەعسدا ساز دەدرێت.

ئەمریکاش لە ١٩٦٣/٧/٢دا ئامادەیی کۆمەک و پشتگیری‌ی خۆیی بۆ عێراق

دەربڕی.

لەگەڵ ئەو هەموو پشتگیری و کۆمەکەی ڕۆژئاوا و لایەنەکانی دیدا، ڕژێمی بەعس نەیتوانی کڵپەی شۆڕشی کورد خامۆش کات. لە لایەکەوە لە نێو خۆ دا دووبەرەکی‌یان تێ کەوت و لە لایەکی دی‌یەوە ناصر بووە دوژمنیان.

لە ٢٢و ١٩٦٣/٧/٢٤دا ناصر لە گوتەیەکدا گوتی: "دۆستایەتی لەگەڵ بەعسی فاشیست دا ناکرێت". بەهەر حاڵ ناصر خۆشی ڕاستەوخۆ پشتگیری‌ی شۆڕشی کوردی نەکرد. (حسنین هیکل)ی قسەکەری ڕەسمی‌ی ناصر جارێک گوتی: "میسر ئامادەیە جڵەوی جەنگی دژ بەکورد وەدەست بگرێت، گەر بەعسی‌یەکان بەیەکێتی عارەب بەسەرۆکایەتی ناصر ڕازی بن"(٤١٢).

لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستی ناصری دژ بە بەعسی‌یەکان، ناڕاستەوخۆ سوودی بە کورد گەیاند. بەعسی‌یەکان (یەکێتی عارەب)یان لەگەڵ ناصر دا نەدەویست، لەبەر ئەوەی ئەوە مانای لە نێوچوونی حیزبەکەیان بوو. چونکە ناصر بۆ (یەکگرتنی عارەب) مەرجی هەڵوەشاندنەوەی هەموو حیزبەکانی دانابوو.

لە ئاکامدا تەقە و لێک دان لە نێوان بەعسی و ناصری‌یەکاندا ڕووی دا. کاتێک ئەو دوو دەستەیە شەڕە کورسی‌یان دەکرد، کورد بێ پرینگانەوە بۆ مەسەلەی خۆی دەجەنگا. هەمان کات ناصر هەڵوێستێکی بێ لایەنانەی بەرامبەر کورد وەبەر گرت(٤١٣).

ڕۆژنامەی (البعث)ی ئۆرگانی بەعسی سوریا گازندەی (پروپاگەندەی سەر بە کورد)ی لە میسر دەکرد. گلەیی (البعث) ئەوەبوو کە ڕۆژنامە میسری‌یەکان گوتاری (دەربارەی کورد)ی ڕۆژنامەی (پراڤدا)ی شووروەوی‌یان بڵاوکردۆتەوە(٤١٤).

لە ٦/٢ەوە تا ١٩٦٣/١١/٦ کوردەکان توانی‌یان ١٢-١٦ زرێ پۆشی سوپای عێراق تێک بشکێنن و ٦٠٠-٧٠٠ سەربازی عێراقی بکوژن.

ژمارەیەکی زۆریش سەربازی عێراقی بەدیل گیران(٤١٥). ئەو هێزانەی سوریا کە بە هانای ڕژێمی بەعسی عێراقەوە هاتبوون(٤١٦) زەبری زۆر توندیان پێ کەوت. هەرچەندە ڕۆژنامەی (الجماهير)، یەکێک لە ئۆرگانەکانی بەعس لە ١٩٦٣/٦/٢٧دا فیشاڵی وای بڵاوکردەوە، کە گوایە (یاخی بووەکان تێک شکێنراون)، بەڵام ئەو درۆیانە زوو پووچ بوونەوە، کاتێک زانرا کە سوپای عێراق، نەک کوردەکان، گەورەترین زیانیان پێ کەوتووە(٤١٧).

دیاره زیانی کوردیش کەم نەبوو. لە ١١/٦/٩٦٣وە تا ٢٣/٧/٩٦٣ تێکڕا ٨٧٥ گوندی کورد خاپوور کران[٤١٨].

کات لەدوای کات ڕژێمی بەعس کەنەفت و لاوازتر دەبوو. لە ٢٤ی ئۆگوستی ١٩٦٣ ناچار بوون داوای گفتوگۆ لە بارزانیی بکەن. ئەو داوایەیان درایە دواوە. لە دیسەمبەری ١٩٦٣دا پێشمەرگەکانی کورد هەموو ئەو نێوچانەیان گرتەوە کە لە سەرەتای شەڕی بەعس دا لە دەستیان دابوو[٤١٩]. باری بەعسییان هێندە لار بوو کە سکرتێری گشتی بەعس (میشێل عەفلەق) لە ١٣/١١/١٩٦٣دا ناچاری چوونە بەغدا بوو. کاروباری ڕژێمی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە[٤٢٠]. (عارف)ی سەرکۆمار ئەوەی بە بێ قەدری خۆی زانی. هەمان ڕۆژ لە بەغدا دا بووە تەقە و پێکدا دان لە نێوان (بەعسە چەپییەکان) و سوپای عێراق دا، لەو هەرایە دا دوو فڕۆکەوان پشتی بەعسییەکانیان گرت و بەغدایان بۆمباران کرد. ئەوە دەرفەتێکی چاکی بۆ عارف ڕەخساند کە کودەتایەک بەسەر هاوەڵە کودەتاکەرەکانی پێشینی دا بکات. لە ١٨/١١/١٩٦٣ عارف هێزەکانی (حەرەسی قەومی)ی بەعسی هەڵوەشاندەوە و ڕژێمی بەعسی هەڵگێڕایەوە. (احمد حسن البکر)ی (بەعسی ڕاست ڕەو)! کە ئێستا سەرکۆماری عێراقە لە دەستەڵاتداریێتی دوور نەخرایەوە.

هەڵتەکاندنی ڕژێمی بەعس، شتێکی چاوەڕوان نەکراو نەبوو. هەندەک ڕۆژنامەی ئەوروپا هەر زوو، واتە لە سەرەتای جەنگی کورد و بەعس دا، پێش بینی ئەوەیان کرد کە چارەنووسی ڕژێمی بەعس لە چارەنووسی قاسم چێتر نابێت[٤٢١].

سەر لەنوێ گفتوگۆ لەنێوان کورد و ڕژێمی عارف دەستی پێ کردەوە، کە لە ١٠ی فێبریوەری ١٩٦٤دا بە "دان پێدانانی مافی نەتەوایەتی برا کوردەکان لە چوارچێوەی عێراق دا "کۆتایی هات. ئەو مافە دەبایە بە جێبێ، لەگەڵ (دەستووری کاتی عێراق)یشدا هاو جۆر کرابا. بۆ ئەو مەبەستە کوردیش تەقەی ڕاگرت و گەلی عێراقیش گەلەک شادمان بوون. گەلەک دەستەڵاتدار و سیاسەتمدارانی جیهان لەوانە (ناصر وخرۆشۆف) بروسکەی پیرۆزباییان بۆ عارف لێدا. خرۆشۆف لە بروسکەکەیدا گوتبووی "پێشکەوتنی عێراق بەدەستەبەرکردنی داخوازییەکانی کوردەوە بە ندە"[٤٢٢]. عارف گفتەکەی خۆی نەبردە سەر و شالاوی بۆ کورد هێنایەوە. لە ٢٣/٣/١٩٦٤دا ڕژێمی عارف یاسایەکی بە نێوی (یاسای مەدالیا بۆ لە نێوبردنی جەردەکانی ژووروو)ەوە دەرکرد. گوایە ئەو مەدالیایە بەو کەسانە دەبەخشرێت کە (ئەرکی لە نێوبردنی چەتەکان و خامۆش کردنی یاخی گەرییەکەی

دەستە خۆفرۆشەکان لە ئەستۆ دەگرن) تا (بتوانن خاکی ئازیزیان لە جودایی خوازەکان و بەکرێ گیراوانی ئیمپریالیزم پاکژ کەن)[٤٢٣]. جگە لەوە عارف لە تەلەفزیۆنی بەغداوە رای گەیاند کە کورد لە (رەچەڵەکی عارەب)ن.

لە ٤ی ئاوریلی ١٩٦٤ داو لەو بارە ئاڵۆزەدا "دەستووری کاتیی عێراق" بڵاوکرایەوە و پێ لەسەر ئەوە داگیرابوو، کە (گەلی عێراق بەشێکە لەنەتەوەی عارەب) و ئامانجی گەلی عێراق (یەکگرتنی نەتەوەی عارەب)ە[٤٢٤]. ئەو بەندەی لەدەستوورەکەی قاسم دا باسی (هاوبەشی کورد)ی دەکرد، تەواو پشت گوێ خرابوو.

ئەو دەستوورە مەسەلەی کوردی بەشێوەیەکی وا فەرامۆش کردبوو کە سیاسەتمەدارێکی عارەبی وەکو (کامل چادرچی) سەرۆکی (حزب الوطني الديمقراطي) بێنێتە جواب و لە ١٩٦٤/٦/٢دا بیرخەرەوەیەک بە رژێمی عارف بدات و بڵێت: (دەستووری نوێ، کێشەی کوردی لەگەڵ هەموو تێکچرژاوی و ئاڵۆزییەکیدا، هەروا هێشتۆتەوە. چێتر وایە رەپ و رەوان دانی پێدا بنرێت و مەودا و چارەسەری گونجاوی بۆ دەست نیشان بکرێت)[٤٢٥].

## دووبەرەکیی نێو پارت

دوژمنەکانی بارزانیی لەنێو پارتی دیمۆکرات دا (وەکو برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی) کە خۆشیان بەشەڕ ویستان لەگەڵ عارف دا رازی بوو بوون، هەل و دەرفەتی چاکیان پەیدا کرد تا هێرش بکەنە سەر بارزانیی و بە (خایەن) نێو زڕاوی کەن. کۆنفرانسێکی پارت کە لەم سەرانە و لایەنگرانیان لە ماوەت گیرا، لە ١٩٦٤/٤/٩دا رێکەوتننامەی نێوان (بارزانی و عارف)ی پووچ کردەوە. هەروەها بارزانییان لە سەرکردایەتی گشتیی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان لابرد. لەو قەواڵە بە گەواڵەیەدا هەندێک لە پیاوان و دەسندەخۆرانی تاڵەبانی و برایم ئەحمەد دانران.

لەلایەکەوە عارف ئەو بەڵێنەی بەکوردی دابوو نەی دەهێنایە دی و لەلایەکی دیشەوە لایەنگرانی تاڵەبانیی بەردەوام خەریکی پروپاگانتەی دژ بە بارزانی بوون و بە (میللەت فرۆش) نێوزەدیان دەکرد. ئەمە بارێکی ئاڵۆز و شڵەقاو و نادیاری هێنایە گۆڕێ.

لە ١٩٦٤/٣/٣٠دا حیزبی کاژیک بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە و تێیدا تێک گیرانی هەر دوو تاقمی پارتی بە (پێک دا پژانێکی ئیدیۆلۆژی) دەست نیشان کرد، کە بنەماکەی

بۆ سەرەتای دامەزراندنی پارت دەگەڕێتەوە. بەلای کاژیکەوە بارزانیی نە (خایەن) و نە (بەکرێ گیراوی عارەب) بوو. کاژیک پێشنیازی کۆنگرەیەکی نەتەوەییانەی کرد، تا گرفتە گرنگەکانی شۆڕشی تێدا چارە سەر بکرێت[٤٢٦]. لەبەیاننامەیەکی دیدا کە لە ١٩٦٤/٤/٦دا بلاوکرایەوە، کاژیک رەخنەی توند و تیژی لە "دەستوورەکەی عارف" گرت و داوای لە کورد کرد کە متمانە بە عارف نەکەن و هاریکاری لەگەڵ نەکەن[٤٢٧].

هەمان کات پارتی کۆمۆنیست لە ١٩٦٤/٤/١٢دا بەیاننامەیەکی بلاوکردەوە و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق دەکرد[٤٢٨].

دووبەرەکی پارت تا دەهات فراوانتر دەبوو. لە ١٩ی ئاوریلی ١٩٦٤دا مەکتەبی سیاسی پارت نامیلکەیەکی بە زمانی عارەبی لە ژێر سەردێری (اتفاقية المشير - بارزاني! اصلح ام استسلام)دا بلاوکردەوە[٤٢٩]. لەم نامیلکەیەدا بەتوندی هێرشیان کردبووە سەر بارزانی و بە (خایەنی مەسەلەی کورد)یان نێو بردبوو، لقی ئەوروپای پارتی دێمۆکرات بە ڕێبەرێتی دوکتۆر کەمال فوئاد، پشتگیریی بڕیارەکانی کۆنگرەی ماوەتی ١٩٦٤/٤/٩ی دژی بارزانیی کرد[٤٣٠].

لە ٢٤ی ئاوریلی ١٩٦٤دا چەند کوردێک (لەوانە عەلی کەمال و رەشید عارف و مەجید عەلی) چوونە لای بارزانیی تا بکەونە نێوان ئەو و تاڵەبانییەوە. بەڵام کۆششەکەیان بێ سەر ئەنجام بوو. بارزانی بۆ کارکردنەوە و هاریکاری لەگەڵ تاڵەبانییەکاندا، مەرجی ئەوەی دانابوو، کە بەنوسین دان بەوەدا بنێن کە خیانەتیان کردووە و داوای لێ خوش بوون و متمانە پێ کردنیان بکەنەوە[٤٣١]. لەو حاڵە پەشێوەدا حیزبی کاژیک بیرخەرەوەیەکی زۆر گرنگی بە بارزانی دا[٤٣٢]. لەم بیرخەرەوەیەدا داوا لە بارزانیی کرابوو کە تاکتیک و ستراتیژی شۆڕشی کورد بە پێی بار و دۆخی نوێ هەڵسەنگێنێت، یانی هەوڵ بدرێت مەسەلەی کورد بکرێتە کێشەیەکی (جیهانی) و (حوکومەتێکی کوردی کاتیی) دابمەزرێندرێت و هێزی شۆڕشگێڕی کوردستان مۆدێرن بکرێت.

<u>ئەو کاتانە لقی ئەوروپای پارتی دێمۆکرات زۆر چالاک بوو. لە کۆبوونەوەیەکی زۆر نهێنیی لێ دا، لە ١٩٦٤/٥/٣دا، کە لە مۆنیخ گیرا، (نوری شاوەیس) (کە ئەوڕۆ وەزیرێکی حوکومەتی عێراقە و لایەنگری بارزانییە)، هێرشی زۆر توندی کردە سەر بارزانیی و بە (بەکرێگیراوێکی بێگانە)ی لەقەڵەم دا</u>[٤٣٣].

له ۱۳ی مایسی ۱۹٦٤دا لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەریی لە کوردستاندا داواکرا کە دەستووری عێراق بگۆڕدرێت، چونکە ڕاستە عارەبی عێراق بەشێکن لەنەتەوەی عارەب، بەڵام کوردی عێراق بەشێک نین لەوان[٤٣٤].

بارزانیی لە ۱۰/٦/۱۹٦٤دا ئەوەی روون کردەوە کە (گەلەک جار داوای کردووە کۆنگرەیەک بگیرێت تا چارەسەر بۆ هەموو تەنگ و چەڵەمەکان بدۆزنەوە، بەڵام ئەو داوایەی لە لایەن مەکتەبی سیاسییەوە هەمیشە دراوەتە دواوە)[٤٣٥]. بارزانیی داوای کۆنگرەیەکی لەشکری پێشمەرگەی کرد. لەو کۆنگرەیەدا کە لە ۱۳-۱٦/٦/۱۹٦٤گیرا، لەبەر بار و دۆخی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان، بڕیاری ڕاگرتنی جەنگ دراو ویسترا بەشێوەیەکی ئاشتییانە کێشەکە لەگەڵ عارف دا چارەسەر بکەن. بەڵام عارف رووی چاکی نیشان نەدا. داوای لە بارزانیی کرد ئەو کۆمۆنیستانەی پەنایان بردۆتە کوردستانی ئازاد ولەوێ دەژین، تەسلیمیان کاتەوە. تەسلیم کردنەوەی پەنابەران بە ڕەدوونەرانیان، پێچەوانەی داب و نەریتی کوردەوارییەو بارزانیی پێی رازی نەبوو. تاڵەبانییەکان ئەوەیان کردە بەهانەیەک و پروپاگەندەیان دەکرد گوایە بارزانی کۆمۆنیستەکان دادەبەستێت. عارفیش ئەوەی کردە بەهانەیەک بۆ تۆمەت و بوختان کردن بە بارزانی. بۆ نموونە (Le Monde) لە ۱۳ی ژونی ۱۹٦٤دا ئەم گوتانەی عارفی بڵاوکردبووەوە:

(کوردی عێراق وەکو هاونیشتمانە عارەبەکانیان موسڵمانن[٤٣٦]. ئێمە ڕێز لە مافەکانیان دەگرین. دەتوانن بە زمانی خۆیان بخوێنن. بەشی زۆری کاربەدەستانی دەوڵەت لە (شیمال) لەرەچەڵەکی کوردن. ئیدی چییان گەرەکە؟ ئێمە لەو بارەوە لەگەڵ بارزانیی سەرۆکیان دا ڕێک کەوتووین. بەڵام ئەندامانی پارتی دیمۆکرات بازرگانی شەڕن، جاسووس و بە کرێگیراوی ئیمپریالیزمن).

ئەمە خۆی لە خۆی دا دنە دانێک بوو دژی بارزانیی. وای نیشان دەدا گوایە بارزانیی لەگەڵ عارف دا ڕێک کەوتووە و دژی پارتی دیمۆکراتە. بەهانەی دایە دەست تاڵەبانییەکان تا لە ۲٦/٦/۱۹٦٤دا بەیاننامەیەک دەربکەن و داوا لە ئەندامانی پارت بکەن دژی بارزانیی بوەستنەوە[٤٣٧].

دواکات لە تەمووزی ۱۹٦٤دا شەشەم کۆنگرەی پارتی دیمۆکرات گیرا. لەم کۆنگرەیەدا بڕیاری دەرکردنی ١٤ ئەندامی سەرکردایەتی پارت درا. لەوانە براییم ئەحمەد، جەلال تاڵەبانی، عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف، عەلی عەبدوڵڵا، نوری شاوەیس و

هەندێکی دی. لەم کۆنگرەیەدا ۸۰۰ کەس بەشدار بوون کە نوێنەری ۲۰ هەزار ئەندام بوون(٤٣٨).

سەرەتای ئۆگوستی ۱۹٦٤ دەرکراوەکانی پارت بە نێوی پارتی دیمۆکراتەوە بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە کە بارزانیی و"بەکرێگیراوانی ئیمپریالیزمیان" تێدا تاوانبار کردبوو. هەروەها وایان راگەیاندبوو گوایە بارزانی سوێند خۆری عارف و کۆنەپەرستانی کوردە و نەخشەی لە نێو بردنی پێشمەرگە و پارتیان کێشاوە. داوایان لە ئەندامانی پارت کردبوو (حیزب لە ژاری بارزانی پاک بکەنەوە)(٤٣٩).

بارزانیی دەربارەی ئەو دوژمنانەی بە پەیامنێری رۆژنامەی (Neue Zürcher Zeitung)ی ئاوها راگەیاندبوو:

(سەرکردەکانی کۆنی پارت، بەلای نیشتمان پەروەرانەوە ناپاک بوون. ئەوانە جەردە و خوێنرێژ بوون، زۆر و ستەمیان لە میللەتەکە دەکرد و پارەی شۆڕشیان دەدزی و بۆ بەرژەوەندی خۆیانیان بەکار دەهێنا. زۆر جارم بە ئاگا هێنانەوە، بەلام گوێیان پێ نەدام. بۆیە ناچار بووم هەلوێستی لەو بارە پێش بگرم)(٤٤٠).

ئەو رووداوانە بارێکی ئالۆز و پێکداپژانی هێنایە گۆڕێ. لایەنگرانی تالەبانیی پێیان وابوو لە ماوەیەکی کەم دا بارزانیی رادەماڵن. بەلام زەینیان بە هەڵەیدا بردن. بارزانیی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستانی لە پشت بوو، حیزبی کاژیکی لە پشت بوو، کۆمۆنیستەکانی پاڵپشت بوو. بۆیە پەلەقاژێی چەکدارانەی ئەو کۆمەڵە تێک شکا. ناچار بوون کوردستانی عێراق بەجێ هێڵن و بۆ ئێران هەڵبێن. سەرەتا لە هەمەدان و پاشان لە تاران دابەستران. ساڵێک زێتر لەوێ مانەوە. لەگەڵ دەستگای جاسووسیی ئێران (ساواک)دا هاریکاریان دەکرد، وەکو لەو نامەیەی مامۆستا جەمیل رۆژبەیانییدا بەدەردەکەوێت کە لە ۲٦/۱۱/۱۹٦٤دا نووسیبووی(٤٤١). رۆژبەیانیی سەرەتا لەگەڵ ئەو تاقمە دا بوو، بەلام کە چوونە ئێران وازی لێ هێنان. (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا) لە نۆهەمین کۆنگرەیدا کە لە ٤-۹/۸/۱۹٦٤دا لە هانۆفەر گیرا، پشتگیری خۆی بۆ دەستەی تالەبانی دەربڕی و دژی بارزانی وەستایەوە(٤٤٢). ئەمەش هۆیەک بوو بۆ پەرت بوونی ئەم رێکخراوە.

لە ۲۳/۸/۱۹٦٤دا حیزبی کاژیک بیرخەرەوەیەکی دایە بارزانیی، کە تێیدا بارزانییان لە پێوەندیی بە رژێمی عارفەوە هوشیارکردەوە، ئەو پێوەندییەی کە

بارزانی‌ی دەخزانە خانەی (خیانەتی میللی)یەوە، جگەلەوە بە هانەی دابووە دەست سەرکردە دەرکراوەکانی پارت تا شالاو بۆ بارزانی‌ی بەرن[٤٤٣]. بە پێچەوانەی کاژیکەوە، پارتی کۆمۆنیستی عێراق کەوتە پێدا هەڵدانی رژێمی عارف و بە (رژێمێکی پێشکەوتنخواز)ی لەقەڵەم دەدا[٤٤٤]. بەیاننامەیەکی پارتی کۆمۆنیست داوای لەگەلی عێراق دەکرد بۆ (یەکگرتنی عارەب) و (ئازادی) و (سۆسیالیستی) خەبات بکەن[٤٤٥]. یانی بۆ ئامانجە سێ کۆچکەکەی بەعس بانگیان رادەهێلا، ئەو حیزبی بەعسەی کۆمۆنیستەکان خۆیان وەکو (حیزبێکی بۆرژوا) تێیان دەروانی. ئەمەش بووە هۆی دووەبەرکی‌یەک لە ریزی کۆمۆنیستەکاندا. دەستەیەک کۆمۆنیست لە سێبتەمبەری ١٩٦٤دا نامیلکەیەکی ٢١ لاپەڕەییان دەرکرد. هێرشێکی توندیان کردبووە سەر سەرکردەکانی پارتی کۆمۆنیست. رژێمی عارفیان بە (رژێمێکی دیکتاتۆر) نێو بردبوو، کە میللەتی کورد دەچەوسێنێتەوە[٤٤٦].

کاتێک باری کوردستان بەو شێوەیە لە هەڵچووندا بوو، لە ٢٤ی ئۆگوستی ١٩٦٤دا، نوێنەرێکی رژێمی عارف چووە (چوارتا)و لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشی کورد دا کۆ بووەوە. لایەنە کوردەکە داوای روون کردنەوەی (واتای مافی کورد)ی کرد. وەرامی نوێنەری رژێم ئاوها بوو: (پێویستە کورد چەک دانێن. تەنها پەرلەمانی دوا رۆژی عێراق هەقی ئەوەی هەیە دەربارەی مافی کورد بڕیار بدات).

ئەرێ عارفێک لەشەش ساڵدا سێ کودەتای کرد، پرسی بەکام پەرلەمانە کرد؟ کە لەگەڵ میسردا بڕیاری "یەکێتی عارەب"ی دا لە کام پەرلەمانەی پرسی؟؟ بە پرسی کام پەرلەمانە "دەستووری عێراق"ی دانا و عێراقی بە "بەشێک لە نەتەوەی عارەب" دیاری کرد؟؟؟ پاش ئەوەی بارزانی‌ی پارتی لە دوژمنەکانی پاکژ کردەوە، ئەنجومەنێکی بۆ سەرکردایەتی شۆڕش لە ٦٣ کەس پێک هێنا[٤٤٧]. ئەم ئەنجومەنە لەجوتیار و کاربەدەستانی پارتی دیمۆکرات و لەشکری و سەرەک خێڵەکان و دوو نێوداری دیانەکان (پاول) بەیداری و ئەندریۆسی بیشۆفی ئاسووری‌یەکان) و نوێنەرێکی کەمایەتی‌ی تورکمانەکان پێک هاتبوو[٤٤٨]. ئەم ئەنجومەنە یاسایەکی تایبەتمەندی بۆ نێوچە ئازادەکان دارشت کە ملیۆنێک کوردی لێ دەژیان، پێشمەرگە هۆ و ئامرازی پاراستنی بوو. یاساکان لە رێگەی دادگاکانەوە دەچەسپێندران. لە ٩/ ١٠/ ١٩٦٤دا یاسا لە مێژ چاوەڕوانکراوەکە دانرا و بڕیار درا دەستەلاتی شۆڕش لە کوردستاندا، جێگەی دەستەلات و یاسای رژێمی عێراق

بگرێتەوە[٤٤٩]. دوو رۆژ پاشتر، لە ١١/ ١٠/١٩٦٤دا بارزانیی بیرخەرەوەیەکی دایە عارف و(طاهر یحیی)ی سەرەک وەزیرانی و داوای مافی ئۆتۆنۆمی کوردستانی کرد[٤٥٠]. لێک دوورکەوتنەوەیەکی فراوان لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد ورژێمی عارف دا پەیدا بوو. لە ٣ی دیسەمبەری ١٩٦٤دا (صبحي عبدالحمید)ی وەزیری نێوخۆی عێراق، نامەیەکی بۆ بارزانیی نارد و داوای (هەڵوەشاندنەوەی) لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستانی لێ کرد[٤٥١]. بارزانیی لە وەرامدا داوای کرد هێزی پێشمەرگە بکرێتە یاساو لێ سنوور و زمانی کوردی لە کوردستاندا بکرێتە زمانی رەسمیی و ئەو کوردانەی لە ١٩٦٣دا لەدەوروبەری کەرکوک بە زۆر دەرپەڕێندراون و عارەبی خێڵەکییان لە جێگە نیشتەجێ کراون، بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و جاشەکان چەک بکرێن[٤٥٢].

شایانی باسە کە سەرکردە دەرکراوەکانی (پ.د.ک)یش هەروەکو بارزانیی بە نێوی پارتی دیمۆکراتەوە کاریان دەکرد و هەروەکو ئەویش رۆژنامەیەکیان بە نێوی (خەبات)ەوە بڵاودەکردەوە. لە ٥/١٢/١٩٦٤دا، ئەم دەستەیە بە سەرۆکایەتی تاڵەبانی بیرخەرەوەیەکیان دایە رژێمی عارف و خۆیان بە نوێنەری شۆڕش و پارت دایە قەڵەم. لەبیرخەرەوەکەدا، داوایان لە عارف کرد کە ئەمان بە نوێنەری راستەقینە بناسێت و گفتوگۆیان لەگەڵ بکات[٤٥٣].

ئەمە یەکەم هەنگاوێک بوو کە تاڵەبانییەکان بۆ خۆ نێزیک کردنەوە لە رژێمی عێراق نایان. ئەم هەڵوێستە عارفی هاندا گوێ بە گفت و بەڵێنەکانی خۆی نەدات.

لە ١٠-٢٤ کانوونی دووهەمی ١٩٦٥دا وەفدێکی کوردی بەسەرۆکایەتی (حبیب محمد کریم)ی سکرتێری نوێی پارت لەگەڵ عارف دا دەستیان بە گفتوگۆ کرد. مەبەستیان گۆڕینی دەستوور بوو. گفتوگۆ سەرکەوتوو نەبوو. عارف رازی نەبوو دان بەوەدا بنێت کە عێراق لە دوو نەتەوە پێک هاتووە. لە کانوونی دووهەمی ١٩٦٥دا (صبحي عبدالحمید)ی وەزیری نێوخۆ ئاشکرای کرد کە رژێم بیر لەوە ناکاتەوە ئۆتۆنۆمی بە هیچ پارچەیەکی عێراق بدات[٤٥٤].

بارەکە تەواو ئاڵۆز بوو. لە ١٠/٢/١٩٦٥دا لە یادی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر رێکەوتنەکەدا، سەرکردایەتی پارت بانگی مانگرتنێکی گشتیی لە کوردستاندا دژ بەتەفرەدانی کورد لە لایەن رژێمەوە، هەڵدا[٤٥٥]. مانگرتنەکە سەرکەوتوو بوو. کۆمۆنیستەکان و کاژیک پشتگیری مانگرتنەکەیان کرد.

سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق (عزیز الحاج) کە ئەو دەمە لە هەندەران بوو، لە ١٩٦٥/٢/١٠دا لە کۆبوونەوەیەکی خوێندکارانی عێراقدا لە پراک گوتی: (جگە لە ئۆتۆنۆمی، هیچ چارەسەرێکی دی کێشەی کورد نی‌یە)[٤٥٦].

رژێمی عارف کەمتر رووی نیشان دەدا. ئەوەی دایە دواوە کە نێوی وەزارەتی (ئاوەدان کردنەوەی ژووروو) بۆ وەزارەتی (کاروباری کوردستان) بگۆڕێت.

ئەوەشی رەت کردەوە کە لە نێوچە کوردنشینەکانی پارێزگەی موسڵ دا پارێزگەیەکی نوێ بە نێوی (پارێزگەی دهۆک)ەوە دابمەزرێنێت. لەو نامەیەدا کە وەزیری نێوخۆ لە ١٩٦٥/٢/١١دا بۆ بارزانیی نووسیبوو، پۆزشیان ئەوە بوو گوایە بوونی وەزارەتێک بە نێوی (کاروباری کوردستان)ەوە (ئۆتۆنۆمی‌یەکی شاردراوەیە) و دروست کردنی پارێزگایەکی نوێ (کاری کردە نی‌یە). لەهەمان نامەدا بوو، داوای (هەڵوەشاندنەوەی) هێزی پێشمەرگەی کوردستانی کردبوو[٤٥٧]. لە ١٩٦٥/٢/١٨دا بارزانیی وەرامی رژێمی ئاوها دایەوە: (داخوازی‌یەکانی کەمترین داوای شۆڕشی کوردە) و ناتوانێت (چیدی لێی بێتە خوارەوە)[٤٥٨]. ئەمە مانای تێک چوونی گفتوگۆ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا (عەگید بارزانیی) نوێنەری ژەنەراڵ بارزانیی لەبەغدا رووونی کردەوە کە ئەو (لەگەڵ جەنگی عارەب و کورد دا نی‌یە)[٤٥٩].

لە فێبریوەری ١٩٦٥دا بارزانی هەوڵی دا پێوەندیی بە وولاتانی جیهانەوە بکات. نامەی بۆ سەرەک وەزیرانی ئاڵەمانیا، سەرۆکی ئەمریکا، سەرەک وەزیرانی ئینگلتەرە، سەرەک کۆماری فەرەنسا، سەرەک وەزیرانی شوورەویی، سەرەک وەزیرانی هندستان و سەرۆک ناصر نووسیی. جگە لە ناصر، سەرپاکیان مەسەلەی کوردیان پشت گوێ خست. (ئیرهارد)ی سەرەک وەزیرانی ئاڵەمانیا بێ پێچ و دەورە ئەوەی دایە دواوە کە یارمەتی کورد بدات[٤٦٠].

عارف ویستی لە بەهاری ١٩٦٥دا هێرشی سوپایی بۆ سەر کوردستان دەست پێ بکاتەوە. بەپێی هەواڵێکی رۆژنامەی (الحیاة)[٤٦١] گوایە ناصر "بەوە رازی نەبووە چەک بۆ عێراق بنێرێت تا دژی کورد بەکار بهێنرێت". گوایە ئەوجا عێراق "داوای چەکی لە ئەمریکا کردووە".

پیاو نازانێت ئەم هەواڵە تا چەند راستە. بارزانیی ئەوکاتە بە پەیامنێری گۆڤاری (Quick)[٤٦٢] ی ئاڵەمانی گوتبوو" فڕۆکەوانی میسری، فڕۆکەکانی عێراق دەئاژوون".

بەهەر حاڵ پاش نێوان تێکچوونی ناصر و رژێمە بەعسی‌یەکانی سوریا و عێراق، ناصر لە قیندا پێشوازی وەفدێکی کوردی کرد و لایەنگیری‌ی خۆی پیشان دان(٤٦٣). لە کاتی شەڕی سەردەمی عارف دا، ناصر هیچ ڕایەکی نەدا(٤٦٤). ناصر دژی جەنگی کورد بوو، چونکە جەنگێکی ئاوها بۆ بەرەی عارەبی دژ بەئیسرائیل زیان بەخش بوو. ناصر لە ئاوریلی ١٩٦٥دا بە بروسکەیەک داوای لە کورد و رژێمی عێراق کرد (شەڕ ڕاگرن)، تا سوپای عارەب (بتوانێت یەک ڕیز و پێکڕا دژی ئیسرائیل بجەنگێت)(٤٦٥).

کاتێک سەرکردە دەرکراوەکانی پ.د.ک زانی‌یان واخەریکە شەڕ هەڵگیرسێتەوە و بارزانی‌ی ناهێڵێت مۆری (میللەت فرۆشی) لە تەوێڵی بدرێت، ئەوجا هەوڵیان دا خۆیانی لەگەڵ ڕێک خەنەوە. برایم ئەحمەد لە ١٦ی ئازاری ١٩٦٥دا نامەیەکی بۆ بارزانی‌ی نووسی کە تێیدا گوتبووی (پێویستی‌یەکانی خەبات وایە کە ناکۆکی لە نێوان دا نەمێنێت). زۆر کەس ویستیان بکەونە نێوانەوە، بەڵام بارزانی‌ی لەسەر رای خۆی سوور بوو، گوایە ئەو کاتە لێیان خۆش دەبێت گەر (بەنووسین دانی پێدا بنێن کە خیانەتیان لە حیزب و شۆڕش کردووە).

دیارە ئەوەیان دایە دواوە و لە بریتی هەوڵیان دەدا خۆیان بە (سەرکردەی شۆڕش) پیشان بدەن.

لە ئەورووپاش سەر لێ شێواوی باڵی بەسەر کوردەکاندا کێشا بوو. زۆربەی زۆریان خوێندکاربوون. گەلێکیان خراپ تێ گەیەندرابوون. (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا) وەکو تاڵەبانی‌یەکان هەڵوێستێکی دژ بە شۆڕشیان وەبەر گرت. بۆیە پێویست وابوو هەنگاوێکی وا هەڵبگیرێت کە نیشتمان پەروەرە شۆڕشگێڕە راستەقینەکان و ئۆپۆرتونیستەکان لێک هەڵبوێردرێن.

لە ٢١ی ئازاری ١٩٦٥دا من شەرەفی ئەوەم پێ بڕا لەگەڵ هاوبیرەکانمدا، لەوانە پێشمەرگەی جوانەمەرگ (لەتیف عەلی)(٤٦٦) و ئەندازیاری خاوەن دیپلۆم ب. ئیبراهیم، (یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا "نوکسە") دابمەزرێنین. سەرەتا ناچاری بەربەرەکانێ‌یەکی توندی ئۆپۆرتونیستەکان و هەموو بێ پەرواو بۆرژواکان هاتین. پاشان (نوکسە) توانی جێ پەنجەی خۆی لە خزمەتی کورد دا دیاری بکات. چ لە رووی سیاسی و چ لە بواری ئەدەبی‌دا. دوژمنانی شۆڕش ناچار بوون حسێب تێ بخۆێننەوە. ئەوانەی ئەو کاتە ئەرکی نوێنەرایەتی شۆڕشیان لە هەندەران وە ئەستۆ گرتبوو، وەکو (عیسمەت شەریف وانلی)، هەقیان بوو شالاومان بۆ بێنن و بوختانمان پێ بکەن(٤٦٧). چونکە

رێکخراوی ئێمە بوو ئاشکرای کرد ئەو (نوێنەرانە!) بازرگانی بە کوێرەوەریی کوردەوە دەکەن[٤٦٨].

## باری وولات

لە ٤ی ئاوریلی ١٩٦٥دا زرێپۆشێکی عێراقی لە سلێمانی چایخانە بە نێوبانگ و پڕ خەڵکەکەی (حەمەڕەق)ی دایە بەر ڕێژنەی گوللە. گەلەک کەسی تێدا کوژران[٤٦٩]. (مەسعود محەمەد)ی وەزیری کاروباری ژووروو وەکو پرۆتێستێک لەبەرپەرچ دانەوەی ئەو ڕەفتارەدا دەستی لە وەزارەت کێشایەوە[٤٧٠].

وەزعە ئاڵۆزەکە تەقینەوەی جەنگێکی نوێی بەدەرخست. کەمێک پێش دەست پێ کردنەوەی ئەو شەڕە، سیاسەتمەداری عێراقی (کامل چادرچی) سەرۆکی (الحزب الوطني الديمقراطي) بیرخەرەوەیەکی دایە ڕژێمی عارف و داوای چارە سەرێکی ئاشتییانەی کێشەی کوردی کردبوو و گوتبووی:

(خۆشبەختانە سەرکردەکانی کورد بەهیچ شێوەیەک نایانەوێت یەکێتی وولاتی عێراق هەڵتەکێنن، یاخود بە جۆرێک لە جۆرەکان لێی جوێ ببنەوە). بیرخەرەوەکە داوا لە ڕژێم دەکات (دۆخێکی لە بار ئامادە بکرێت تا کوردەکان بە مافی نەتەوایەتییان شاد بن وپەرە سەندن و گەشەکردنی کولتوری نەتەوەییان دەستەبەر بکرێت. ئەوەش پێش چاو بگیرێت کە ئەو مافانە یەکێتی وولاتی عێراق نەئاڵۆزێنێت، یانی دەستەڵاتی مەرکەزی و تاو و تینی، کە بنەچەی سەرەکیی هەموو وولاتێکی فرە نەتەوەیە، بپارێزرێت)[٤٧١]. ئەو دەمکاتە تاڵەبانییەکان لەسەر دووپەت یارییان دەکرد:

١- خۆیان بەسەرکردەی شۆڕشی کورد پێناسە دەکرد. ئەوە بوو (سەعدی ئەمین دزەیی) ئەندامی ئەو کاتەی پارتی دێموکرات لەئەوروپا سەرەتای ئاوریلی ١٩٦٥ چوو بۆ ئەمریکا تا "پروپاگەندە" بۆ شۆڕشی کورد بکات[٤٧٢]. سەفەرەکەی تەنها پارە بەهەدەردانێکی رووت بوو.

تاڵەبانی و عەزیز شەمزینی لە ٢٠/٥/١٩٦٥دا لە لەندەن کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسییان گرت و بەنێوی شۆڕشی کورد و بارزانییەوە دەدوان.

تاڵەبانیی وای روون کردەوە کە گوایە پشتگیری لە بارزانیی دەکات. لە کۆبوونەوەیەکی دی رۆژنامەنووساندا لە ٣/٦/١٩٦٥دا لەقیەننا دژایەتی عارف و بەحیایان نیشان دا. یەکسەر پاش ئەوە بارزانیی رروونی کردەوە کە تاڵەبانیی (نوێنەری شۆڕشی کورد نییە) و (مافی ئەوەی نییە بەنێوی ئەوەوە بدوێت).

٢- لەڕێگەی لایەنگرانیانەوە لە نێو (پ.د.ک)ی سەر بارزانی‌یدا هەوڵیان دەدا هەواڵەکانی شۆڕشی کورد وەشارن و کپی کەن. نوکسە ئەم پیلانەی هەڵوەشاندەوە و لە ڕێگەی ئۆرگانەکانی (Kurdistan information) و (خوێندکاری کورد)ەوە هەواڵەکانی شۆڕشی ئازادیخوازانەی کوردی بە هەموو لایەکدا دەگەیاند.

لە ٩ی سێپتەمبەری ١٩٦٥دا ڕژێم دەستووری وولاتی گۆڕی و ئەمەی بۆ زیاد کرد (ئەم دەستووره مافە نەتەوایەتی‌یەکانی کورد لە چوارچێوەی عیراق دا بەپێی دابی نیشتمان پەروەری و برایەتی دان پێدا دەنێت و فەراهەمی دەکات)[٤٧٣]. دوو کەلێنی دیبلۆماسی‌یانەی عارف و لایەنگرانی ناڕاستەوخۆ سوودیان بەکورد گەیاند. یەکێکیان ئەوەبوو عارف لە ٢٩ی کانوونی دووهەمی ١٩٦٥دا دەربارەی (کەنداوی عارەب) دوا[٤٧٤]، کە ئێران لە لای خۆیەوە بە کەنداوی (فارسی) دەزانی.

ئەوی دیان ئەوە بوو لە کۆنگرەی (ماف ناسانی عارەب)دا لە بەغدا، لە ١٠ی دیسەمبەری ١٩٦٤دا بڕیار درا کە دانیشتوانی پارێزگەی (ئەسکەندەرونە) لە تورکیا و دانیشتوانی پارێزگەی (خوزستان) لە ئێران، بەشێکن لەنەتەوەی عارەب[٤٧٥]. ئەو تەنگ پێ هەڵچنینە نادیبلۆماسی‌یانەیە، ئێران و تورکیای لە ڕژێمی عارف شێتگیر کرد.

لە ١٣ی ئەیلولی ١٩٦٥دا (طاهر یحیی)ی سەرەک وەزیران دەستی لە کار کێشایەوە، بێ ئەوەی حکومەتەکەی هیچ لەو بەڵێنانەی بەکوردی دابوو بیانباتە سەر. (عارف عبدالرزاق) کرایە سەرەکی وەزیران. کاتێک عارفی سەرکۆمار لە تەموزی ١٩٦٥دا بۆ بەشداری‌ی لە (کۆنگرەی سەرانی عارەب)دا چووە (مغرب)، عارف عبدالرزاق هەوڵی کودەتایەکی دژی عارفی دا. کودەتا لەلایەن (عبدالرحمن عارف)ی سوپا سالار و برای (عبدالسلام)ەوە سەرکوت کرا(×). (عبدالرزاق) بۆ میسر هەڵهات و (عبدالرحمن بزاز) لە ١٩٦٥/٩/٢١دا کرایە سەرەک وەزیران. بەزاز سەروەختێک لە زانستگەی بەغدا مامۆستای ماف ناسی‌ی بوو. پێش ئەوەی بکرێتە سەرەک وەزیران، لە لەندەن باڵوێزی عێراق بوو. بەزاز لە پاش ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی‌یەوە لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا یەکەمین سەرەک وەزیرانێک بوو کە مەدەنی بێت.

لە ١٩٦٥/١٠/٦دا بەزاز پرۆگرامی حکومەتەکەی بلاوکردەوە. بەڵێنی دا بە پێی

---

(×) ئەو دوو مێژووەی کە دەڵێت گوایە (طاهر یحیی) لە ١٣ی سێپتەمبەری ١٩٦٥دا دەستی کێشاوەتەوە و پاشان (عارف عبدالرزاق) کرایە سەرەک وەزیران و لە تەموزی ١٩٦٥دا هەوڵی کودەتای داوە. ناگونجێن و ناشێت ڕاست بن. جوداوازی کاتەکان دەری دەخات کە یەکێکیان هەڵەن.

دەستووری گۆڕاو و لەسەر بنچینەی یاسا نێوچەییەکان (دان بەمافی کورد)دا بنێت. لە ١٩٦٥/١٠/٢٨دا سیاسەتمەداری بەنێوبانگی عێراق (محمد رضا الشبیبي) بیرخەرەوەیەکی دایە سەرەک وەزیران و داوای چارەسەری کێشەی کوردی لەسەر بنچینەی "لامەرکەزیێتی" کرد(٤٧٦).

لەو کاتانەدا شەڕی کورد لەگەرمەی دابوو. زیانەکانی سوپای عێراق تەنها لە ١١/٣/ وە تا ١٩٦٥/٨/٢٤ گەیشتە ٤١٩٤ کوژراو و ٢٢٠١ بریندار(٤٧٧). ئەمە جگە لە لەدەست دانی کەل و پەلێکی زۆر. سوپای عێراق لە سەرتاسەری ساڵی ١٩٦٥دا ٨٠٠٥ کوژراو و ٤٨٩١ برینداری هەبوو(٤٧٨). هەمان کات ٧٦٨ کاربەدەستی سوپای عێراق بۆ پەنای کورد هەڵهاتن و٣٢٢ عێراقی بەدیل گیران. جگە لەوانە کوردەکان توانیان لە ١٩٦٥دا ٩ فڕۆکەی عێراق بخەنە خوارەوە و٣٥ زرێپۆش و١٤ تانک تێک بشکێنن(٤٧٩). لەگەڵ ئەو زیانانە و ئاشکرا بوونیشیدا، بەزاز لە ٢٢-١٩٦٥/١٢/٢٩دا هێرشێکی سوپایی بەرفراوانی بۆ سەر نێوچەی پێنجوین رێک خست. فڕۆکەی عێراق چەند گوندێکی کوردستانی ئێرانیشیان بۆردومان کرد(٤٨٠). حوکومەتی بەزاز بۆ گەیشتن بە ئامانج دوو رەفتاری چەپەڵ و نامرۆڤانەی وەبەرگرت:

١- پیلانی ئەهریمەنانەی (خاکی سووتێنراو)، یانی سووتاندنی نێوچەکان بە بۆمبا و گازی سووتێنەر.

٢- قەدەغەکردنی دەرمان گەیاندنە کوردستان، تا چارە سەرکردنی پزیشکی لە تواناد نەبێت(٤٨١).

لەبەکار هێنانی گازی کوشندەدا هیچ جوداوازی‌یەک لە نێوان دانیشتووە ئاسایی‌یەکان و پێشمەرگەدا نەدەکرا(٤٨٢).

بارزانی‌ی لە ١٩٦٦/١/١دا بیرخەرەوەیەکی دایە نەتەوەیەکگرتووەکان. لەوەدا سیاسەتی (خاکی سووتێنراو)ی لە قاودا. لەگەڵ سەر ژمێرێکدا ئاشکرا کرا کە سەرجەم ٢٦٨ گوند تەخت کراون(٤٨٣). بارزانی‌ی داوای لەنەتەوەیەکگرتووەکان کرد لیژنەیەک بنێرنە نێوچەکانی شەڕ، تا بە چاوی خۆیان ئەو رەفتارە نامرۆڤانە باوەڕ نەکراوانە ببینن(٤٨٤).

وەزیری جەنگی عێراق (العقیلي) لە ١٩٦٦/١/٣دا گوتی (ئەورۆ وولاتانی رۆژهەلات و رۆژئاوا یارمەتی جەردەکان دەدەن تا ئیسرائیلێکی نوێ لە "شیمال"ی وولات

دامەزرێنن، هەروەکو لە ١٩٤٨دا گشتیان ئیسرائیلیان دامەزراند)[٤٨٥].

(عقیلي) یەکێک بوو لەو دوژمنانەی کورد کە دژی ڕێکەوتن بوو لەگەڵ کورد دا. کاری وای بە (پەڵێنی بلفۆر)[٤٨٦]ێکی نوێ لەقەڵەم دەدا[٤٨٧]. لەراستی‌یدا گەلەک عارەب لەمەسەلەی کورد وەک "ئیسرائیلێکی دووهەم" دەڕوانن[٤٨٨](×).

سوپای عێراق زۆر جار پەلاماری نێوچەی پێنجوینی سەر سنووری ئێرانی دەدا، چونکە پێ‌یان وابوو کە کوردەکان لە ئێرانەوە کۆمەک وەردەگرن. لە ٢و٣/١/٩٦٦ دا سوپای عێراق لە پێنجوین خراپ شکێنرا. لە ٤ی کانونی دوهەمی ٩٦٦ دا (عبدالرحمن عارف) ئێرانی بە هۆیەکی ئەو تێک شکاندنە دەست نیشان کرد. گوتی "ئێران دەست تێکەڵ دەکات و کۆمەک بەچەتەکان دەکات". هەمان رۆژ عێراق پرۆتستۆیەکی لەو بارەوە بە ئێراندا[٤٨٩]. ئێران لە لایەنی خۆیەوە پەیمانی ١٩٣٧ی پێوەندی‌یدار بە (شط العرب)ی نێوان عێراق و ئێرانی هەڵوەشاندەوە. بەزاز لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووساندا ئەو بڕیارەی ئێرانی دایە دواوە و سووربوو لەسەر ئەوەی کە پەیمانەکە هەر لە گەڕدایە[٤٩٠].

ئەمە کێشەیەکی دیبلۆماسی‌یانەی گەورەی لەنێوان هەردوو وولات دا نایەوە. عێراق لە ١٩٦٦دا چەند جارێک خاکی ئێرانی بۆمباران کرد[٤٩١]. بۆیە ئێرانیش هێزەکانی سەر سنووری نێوان هەردوو وولاتی بە هێزتر کرد. (عباس ارام)ی وەزیری دەرەوەی ئێران رای گەیاند کە وولاتەکەی (هەموو هێرشێکی دەرەکی تێک دەشکێنێت)[٤٩٢].

هەڵوێستی تا ڕادەیەک بێ لایەنانەی ئێران بەرامبەر شۆڕشی کورد لە عێراق دا، لەبەر هەر هۆیەک بووبێت، خۆی لەخۆی دا یارمەتی‌یەک بوو بۆ شۆڕشی کورد. ئەم راستی‌یە لە بلاوکراوەیەکی (بەشی پەخش و راگەیاندن)ی پارتی دیموکرات دا لە ١٢/١/١٩٦٦دا پێ‌ی لێ نرابوو: (شۆڕشی کورد لە هەڵوێستی بێ لایەنانەی ئێران بەرامبەر شۆڕشی کورد و چینی دەستەڵاتداری عێراق، رازی‌یە)[٤٩٣].

لە کۆتایی ١٩٦٥دا بەزاز نامەیەکی بۆ سەرەک وەزیرانی ئێران نارد، بەو هیوایەی ئێران دژی کورد بەلای خۆیدا راکێشێت. وەرامی ئێران بۆ بەزاز دڵتەزێن بوو[٤٩٤]. لەو ناکۆکی‌یەی نێوان ئێران و عێراقدا بە نێزیکە سەرپاکی وولاتانی عارەب پشتی عێراقیان

---

(×) ئاخۆ ئێمە دەمانەوێت ئیسرائیلێکی دووهەم دابمەزرێنین، یا ئەوان دەخوازن ئازار و ئەشکەنجە و بەدبەختی‌ی فەلەستینێکی دووهەم لە کوردستان دا سازدەن؟؟؟

دەگرت[٤٩٥]. بۆ نموونە رژێمی سوریا هاوکاری‌یەکی تەواوی بەزازی دژی کورد دەکرد[٤٩٦].

ئەم وەزعە بارێکی مەترسی‌یداری لە رۆژهەلاتی نێوەڕاست دا خولقاند. رۆژنامەی "پراڤدا"ی ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی شوورەوی‌ی لە ١٩٦٦/١/٧دا گوتارێکی دەربارەی وەزعەکە بلاوکردەوە و داوای لە رژێمی عێراق کرد کە "کێشەی کورد بە شێوەیەکی دیموکراسی‌یانە چارەسەر بکات". بەزاز روونی کردەوە ئامادەیە "کێشەی کورد" چارەسەر "بکات، بەلام" ئەوکاتەی کورد چەک دابنێن"[٤٩٧]. ئەم روونکردنەوەیەی بەزاز هیوایەکی نوێی بەتالەبانی‌یەکان بەخشی، تا بتوانن بازرگانی زێتر بەمەسەلەکەوە بکەن. هەولیان دا رژێم رازی بکەن کە ئەوانە بە "نوێنەری" شۆڕشی کورد حسێب بکات و داوای گفتوگۆیان کرد. دەستیان بە جوێن دانی بارزانی‌ی کرد و بە (بەکرێ گیراوی ئێران) نێویان دەبرد.

ئەو سەروەختە دڕندەیی سوپای عێراق بەرامبەر بەکورد گەیشتبووە چلە پۆپەی. لەیاداشتنامەی فرۆکەوانێکدا کە فرۆکەی (ئیلیوشن)ی ژمارە ٤٣٣ی لە ١٩٦٦/١/١٦دا لە لایەن تۆپە تەیارە شکێنەکانی کوردەوە خرایە خوارەوە، نووسرابوو کە تەنها خۆی ٤٥ گوندی کوردی خاپوور کردووە[٤٩٨].

بەلام سوپای عێراقیش زیانی چاکی هەبوو. بەپێی هەوالێک کە رادیۆی دەنگی کوردستان بلاوی کردەوە، لە ١٩٦٥/٤/٤وە تا ١٩٦٦/١/١٧ نێزیکەی ٦٠٠٠ سەربازی عێراقی کوژرابوون. جگە لەوە ٣٥ زرێپۆش و ٣٠٠ ئوتۆمبێل تێک شکێنرابوون[٤٩٩].

شەڕی کوردستان لەسەر عێراق زۆر کەوت. تەنها لە ١٩٦٦دا مەسرەفی جەنگ هەر رۆژە چارەکە ملیۆنێک دیناری دەخواست[٥٠٠].

لە ١٩٦٦/١/١٧دا رادیۆی مۆسکۆ گوتارێکی خوێندەوە و گوتی: (چارەسەری کێشەی کورد بە رێگەیەکی دیموکراسی‌یانە، مانای پووچ کردنەوەی پیلانەکانی ئیمپریالیزمە)، (ناتەبایی نێوان ئێران و عێراق تەنها لەبەرژەوەندی ئیمپریالیزم و پەیمانی سەنتۆ دایە).

رۆژنامەی رەسمی‌ی عێراق "الجمهورية" بەم جۆە بۆچوونەکانی مۆسکۆی هەلسەنگاند: (سەرکردەکانی شوورەوی دەبێت تێبگەن کە کێشەی "شیمال" بە نیسبەت عێراقەوە مەسەلەی ژیان و مردنە)[٥٠١].

شوورەوی‌ی کۆڵی نەداو هەوڵی ئاشتیخوازانەی خۆی بەگەڕ خست. لە ١٩٦٦/٢/٤دا خاچی سووری شوورەوی‌ی بروسکەیەکی بۆ بەزاز نارد و داوای ڕاگرتنی شەڕی دژ بە کوردی کرد. داخوازی کرا ڕێگە بدرێت (کۆمەکی خێرخوازان) بۆ قوربانی‌یەکانی جەنگ بنێردرێن(٥٠٢).

چەند ڕۆژێک پاشتر، لە ١٩٦٦/٢/٧دا (Y. Patomov) گوتارێکی لە پراڤدا دا نووسی و داوای لە ڕژێمی بەزاز کرد کە شەڕی دژی کورد ڕابگرن و مافە نەتەوەییەکانیان دەستەبەر بکەن(٥٠٣).

تاڵەبانی‌ی و پیاوەکانی کە لە گوندێک لە ژێر چاودێری پێشمەرگەدا دانرابوون، توانی‌یان لە ١٩٦٦/١/٢٨دا هەڵبێن و خۆیان بگەیەننە لای ڕژێمی عێراق. سێ لەلایەنگرانی، (نوری ئەحمەدی تەها)، (عەلی عەبدوڵڵا) و (نوری شاوەیس) بەهەڵهاتن ڕازی نەبوون و لایەنگیری خۆیان بۆ بارزانی‌ی سەرکردەی شۆڕش دەربڕی(٥٠٤).

پاش ئەوەی دوا نێردراوی بەزاز (حەمید مەلا تۆفیق) لە ١٩٦٦/٢/٨دا لە گفتوگۆ لەگەڵ بارزانی‌یدا بێ هیوا بوو، ئیدی بەزاز هەموو هومێدێکی خۆی خستەسەر تاڵەبانی‌یەکان. شەڕ دەستی پێ کردەوە. سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان دەستی قارەمانانەیان دەوەشاند. لەفێبریوەری ١٩٦٦دا زەبرێکی هێند کوشندە لە سوپای عێراق درا کە ئەفسەرێکی باڵا دەستی عێراقی ئاوها بڵێت: (ئەرکی سەربازێکی عێراقی لە "شیمال"دا بەهیچ جۆرێک لەئەرکی سەربازێکی ئاڵمانی‌ی لەستالینگراد دا، کەمتر نی‌یە)(٥٠٥).

عارف هێرشێکی توندی کردە سەر بارزانی‌ی و بە (بەکرێ گیراوی ئیمپریالیزم)ی نێو برد(٥٠٦).

ڕژێمی عارف و بەزاز لە ئازاری ١٩٦٦دا غازی کوشندەیان دژی کورد بەکار هێنا. ئەوە دژایەتی و پرۆتێستێکی توندی دژی ڕژێمی عارف خەملاند. بۆ نموونە لە ١٩٦٦/٣/١٨دا سکرتارێتی یەکێتی خوێندکارانی جیهان (IUS) لەپراگ ڕژێمی عارفی بە توندی تاوانبار کرد(٥٠٧). (بەکار هێنانی گازی کوشندەش سوودێکی بەرژێمی عارف و بەزاز نەگەیاند).

بەزاز هەوڵی دا لە نێو لەڕێ لادەرەکانی شۆڕشی کورد دا، دۆست مسۆگەر بکات. چونکە عارف وەکو لە ١٩٦٦/٣/١دا دەری بڕی، پێی وابوو کە کێشەی کورد پتر

کێشەیەکی سیاسی‌یە لەوەی عەسکەری‌ی بێت(٥٠٨). بۆیە دەستی بەپشتگیری و یارمەتی ئاشکرای تاقمی تاڵەبانی و خۆفرۆشە تەقلیدی‌یەکانی دی کرد. لە ١٩٦٦/٣/١٨دا رۆژنامەی "البلد"ی عێراقی دەنووسێت: (ئەو کوردانەی لە بارزانی‌ی جودا بوونەتەوە، لەپێش هەموویانەوە جەلال تاڵەبانی، ئامادەیی خۆی دەربڕیوە، لەگەڵ حوکومەتی نیشتمانی‌یدا لەسەر هەر شتێک رێک بکەون کە هێمنی و ئاسایش بۆ "شیمال"ی وولات بگێڕێتەوە)(٥٠٩).

لەگەڵ ئەوانەدا هەمان کات بەزاز زێتر خۆی لە وولاتە عارەبی‌یەکان نیزیک دەکردەوە، تا پشتگیری‌یان دژی کورد مسۆگەر بکات. میسر گفتی هەموو یارمەتی‌یەکی بە بەزاز دا(٥١٠). دەبێ ئەوەش بڵێین کە میسر لە ١٩٦٤دا نیزیکەی ١٢ هەزار سەربازی بۆ عێراق ناردبوو. بەڵام ١٩٦٦ ناصر رازی نەبوو چەک و سەرباز بنێرێت و تەنها کۆمەکی مەعنەوی لە عێراق دەکرد(٥١١). مرۆ دەبێت پێ لەو راستی‌یەش بنێت کە ناصر هەرچەندە لەگەڵ "کەرت کردنی عێراق" یا "جۆرە سوپایەکی سەربەخۆی کورد" دا نەبوو، بەڵام لەگەڵ "جۆرە مافێکی نێوچەیی" کورد دابوو. ئەم ویستەی ناصر لەلایەن عارفەوە درایە دواوە(٥١٢). بەزاز بەهومێدی گوشار خستنە سەر کورد، هەوڵی راکێشانی تورکیا و ئێران و ئینگلتەرەی دەدا. لایەنگرانی بەزاز پێ‌یان وابوو ئاغایان هەنگاوی زۆری ناوە. وەزیری نێوخۆ (عبداللطیف دراجي)، لە کۆتایی فێبریوەری ١٩٦٦دا بە دڵنیاییەوە دەیگوت "لەبەهاری داهاتوو دا کوردە یاخی بووەکان داماڵە خاس دەکرێن"(٥١٣). بەزاز بەخت یاری نەبوو، شای ئێران ئامادە نەبوو بەرەیەکی دژی کوردی لەگەڵدا دروست بکات. ناتەبایی‌یان بەشێوەیەک بوو هەتا بە تێکەوتنی (شا سعوود)ی سعوودیە و (شا حسین)ی ئەردەنیش نەتوانرا رێک خرێنەوە(٥١٤).

رژێمی (عارف - بەزاز) هەوڵی تۆڵە سەندنەوەیان لە ئێران دا (وەک لە رۆژنامەی صوت العرب)دا دەیخوێنینەوە(٥١٥). ئەمەش شێوای سەرگرتن نەبوو. لەسەردەمی بەزاز دا هێزە دەست وەشێنەکانی عێراق پەلاماری چەند گوندێکی ئێرانیان داو دوو کاربەدەستیان کوشت، کە بووە هۆی گرژی زێتری بارەکە.

بەزاز نەیتوانی ئینگلتەرەش بەلای خۆی دا راکێشێت. دەفتەری قەرزی کۆنی خوێندەوەو ویستی لە رێگەی پەیمانی نەوتی (ئای. پی. سی) نێوان عێراق و ئینگلتەرەوە زۆر بۆ ئینگلتەرە و ئەمریکا بهێنێت، تا دژی کورد یارمەتی بدەن. بەهیوا بوو ئەمریکا و

ئینگلتەرە گوشار بخەنە سەر شا، تا هەڵویستی دۆستانە نیشانی عێراق بدات[٥١٦].
ئەمریکا پشتگیری‌ی پیلانەکانی بەرزای کرد. Raymonde Hare ی راوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ئاوریلی ١٩٦٦دا چووە تاران، تا شا بۆ بەزاز سازکات[٥١٧]. پاشان دەرکەوت کە ئەو هەوڵانەی ئەمریکاش بۆ رێکخستنەوەی هەردوو وولاتی ئێران و عێراق، بێ سەمەر بوون.

لە ١٩٦٦/٤/٢٤دا یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا (نوکسە) بیرخەرەوەیەکی دایە (Lynden B. Johnson) ی سەرەکی ئەمریکا و مەسەلەی کورد و سیاسەتی دژ بەکوردی بەزازی روون کردبووەوە[٥١٨].

لەو سەروەختەدا بە نێزیکە هەموو هەوڵەکانی بەزاز بۆ مسۆگەر کردنی بەرەی رۆژئاوا و رۆژهەلات، بێ سەر ئەنجام بوون و نەیتوانی بەرەیەکی دژ بەکوردیان لێ ساز بدات. کۆمۆنیستانی عارەب پشتگیری‌ی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردیان دەکرد.

لە ئاوریلی ٩٦٦دا، لەکۆنگرەیەکی پارتە کۆمۆنیستەکانی وولاتانی عارەب دا، نوێنەرانی بەشدار تێکرا لایان وابوو (شەڕی دژ بەکورد زیانی بۆ بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەی عارەب هەیە)[٥١٩]. کۆنگرە داوای لە رژێمی عێراق کرد (مەسەلەی کورد بەشێوەیەکی دیموکراسی‌یانە و ئاشتیخوازانە، لەسەر بنچینەی دەستەبەرکردنی ئۆتۆنۆمی چارەسەر بکات)[٥٢٠].

بەزاز دیسانەوە هانای بۆ ناصر بردەوە و داوای کۆمەکی سوپایی لێ کرد. هەوڵەکەی بێ سەر ئەنجام بوو[٥٢١].

تەنها وولاتێک کە بەزاز توانی بەلای خۆی دا رایکێشێت، تورکیا بوو، دوژمنە تەقلیدی‌یە سەر سەختەکەی نەتەوەی کورد. بە پێ‌ی گوتەی رۆژنامەی (البلد) تورکیا سنووری بەڕووی کوردەکان داخستووە و یازدە پەنابەری کورد لە تورکیا کوژراون[٥٢٢].

بەزاز کە لە هەموو لایەک نائومێد بوو، ئەوجا بەلای کورد دا بای دایەوە، بە ئومێدی ئەوەی بەگفتوگۆ چارەسەری کێشەکە بکەن. لە ٩٦٦/٤/٢دا کوردێکی بەنێوی (محەمەد حەسەن دزەیی) وەکو نوێنەرێک ناردە لای بارزانی‌ی. لە ٩٦٦/٤/٢٨دا کوردێکی دی بە نێوی (زەید ئەحمەد عوسمان)ەوە ناردە لای.

سەرکردایەتی شۆڕشی کورد داوای چەک کردنی جاش و گەڕاندنەوەی ئۆردوی عێراقیان لە کوردستان دا کرد. جگە لەوە داوای ئەوەیان کرد هەر رێکەوتننامەیەک لە پاشە رۆژدا

بوو، لەووڵاتێکی عارەبی بێ لایەنی (بۆ نموونە وەکی میسر)دا مۆر بکرێت. عێراق ئەو داوایەی دایە دواوە[٥٢٣]، بە بیانوی ئەوەی لەگەڵ سیادەی عێراق دا رێک ناکەوێت.

کاتێک بەزاز و عارفی ئاغای لەو هەوڵانەش نائومێد بوون، ئەوجا دوو ملیۆن دیناریان خستە بەردەستی ژەنەراڵ (عزیز چلبی)یەوە تا بە هەر تەڵەیەک دەبێت، بارزانیی بەکوشت بدات[٥٢٤]. ئەو هەوڵەش بێ سەمەر بوو.

لەو بارە هەڵچووەدا، لە ١٣ی ئاوریلی ٩٦٦ دا فڕۆکەکەی عارف کەوتە خوارەوە و عارف و هەندێ پیاوی تێدا چوون. هەرچەندە سەرچاوە رەسمییەکانی عێراق گێژەڵووکەو تەم و مژێکی لماوییان بە هۆ نیشان دا، بەڵام هۆی راستەقینەی نا ئاشکرا مایەوە (دراجی)ش کە " گفتی" بەگەلی عارەب دابوو، لەبەهار دا یاخی گەری کورد داماڵە خاس کات[٥٢٥]. تێیدا چوو. پەندێکی کوردیمان هەیە دەفەرموێت: (صەگی هار چل شەوی عومرە).

پاش مردنی عارف رژێمی سوپایی لە ١٧ی ئاوریلی ١٩٦٦دا (عبدالرحمن عارف)ی برایان بەسەر کۆمار هەڵبژارد. بەزاز بەسەرەکی وەزیران مایەوە. هەمان رۆژ بارزانی لە وێزگەی دەنگی کوردستانەوە بڕیاری شەڕ راگرتنی بۆ ماوەی مانگێک راگەیاند. ویستی بوارێک بەرژێمی نوێ بدات و (ئارەزووی) عارف تاقی کاتەوە[٥٢٦]. عارفی نوێ (یاخود عارفی دووهەم)، لە ١٨/٤/١٩٦٦دا بەم شێوەیە هاتە گۆ:

(نەتەوەی کورد راستییەکی بێ چەند و چوونە. رژێم ئامادەیە مافی خۆبەخۆیی کورد لە چوارچێوەی عێراق دا بدات. کوردەکان خۆیان ئارەزوو دەکەن لەگەڵ برای عارەبیاندا بژین. تەنها یەک کەس هەیە کە جودابوونەوەی دەخوازێت، ئەویش بارزانییە، کە بەکرێگیراوێکی ئیمپریالیزمە و ووڵات فرۆشە. تا بارزانیی رێبەریی راپەڕینەکە بکات، مەسەلەی کورد چارەسەر ناکرێت[٥٢٧].

هەمان رۆژ عارفی دووهەم چەپەڵ ترین دوژمنی کورد، (عبدالعزيز العقيلي) کردە سوپا سالار[٥٢٨]. بەر بەهەموو گفتوگۆیەک گیرا. بەڵام بەهومێدی ئەوەبوون کە شۆڕشی کورد لەرێگەی زەبر و زۆرەوە سەرکوت کەن. بۆیە عارفی دووهەم لە ١٩ی ئاوریلی ١٩٦٦دا ئاوهای دەگوت: (بە یارمەتی خودا کێشەی "شیمال" بەو زوانە کۆتایی پێ دێت)[٥٢٩].

نانی جۆ بیانوی وەزیری دەرەوەی بوو! دەیگوت گوایە (هێزی دەرەکی یارمەتیی بارزانیی دەدەن) بۆیە (کێشەی کورد هەر بەردەوامە)[٥٣٠].

ڕۆژێک دواتر عارفی دووهەم بە گۆڤاری "المصور"ی دەگوت: هیچ گفتوگۆیەک لە نێوان ڕژێمەکەی و (چەتە) کوردەکان دا لەئارادا نی‌یە و گوایە چەتەگەری‌یەکە داغان دەکات.

بەزازیش دەبایە سیاسەتی خۆی لەبەر ڕۆشنایی سیاسەتی سەرەک کۆمارەکەی دا میقات کات. لە ٢٢ی ئاوریلی ١٩٦٦دا لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نووساندا هێرشی توندی کردە سەر کوردەکان، دەیگوت: (یاخی بووەکان پێ‌یان وایە دەوڵەتێک بەم هەموو هێز و توانایەوە دێننە سەر چۆک؟ سوپاس بۆ خودا ئێمە گەلەک بەهێزین. برای عارەبمان هەیە کە کۆمەکمان پێ دەکەن. سوپایەکی قارەمانمان هەیە گەر پێویستی کرد دەتوانن شەڕی درێژخایەن بکەن)(٥٣١).

بەزاز لەسەری دەڕوات و دەڵێت: (ئێمە بەکەرت کردن ڕازی نابین، بەڵام هەر داوایەک تایبەتمەندێتی کورد بخوازێت ڕەوایە)(٥٣٢).

بەزاز جاش و فیۆدالی زۆری لەخۆ کۆکردەوە. لە ٢٣ی ئاوریلی ١٩٦٦دا چاوی بەسەرەک جاش (حاجی برایمی چەرمەگا) کەوت، (کە یەکێک لەئەندامانی کۆنی پ.د.ک و لە ٩٦٦ەوە لە تاقمی تاڵەبانی‌ی بوو).

عارف بە پشتیوانی تاڵەبانی‌یەکان، لە ١٩٦٦/٤/٢٨دا ئاشکرای کرد کە ڕژێمەکەی ئۆتۆنۆمی بەکورد نادات(٥٣٣).

بەو جۆە لە ١٩٦٦/٥/١دا شەڕ دەستی پێ کردەوە. دوژمنەکەی کورد، سوپا سالار (العقیلي) لە مێژبوو تان و پۆی پیلانێکی ئەهریمەنانەی بەنێوی (توکلت علی الله)وە دەچنی. ئەو پێی وابوو کە ئێزدان لەپشتی ئەو و سوپاکەیەتی، بۆیە دەتوانن بێ ترس ودوو دڵی دژی کورد بجەنگن!! بەڵام ئێزدانیش لە پشتیان نەبوو. بۆ دەبێت لە پشتیشیان بێت؟؟ ئێمەی کورد دژی هێزە خۆ سەپێنەکان، چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی و ڕژێمە گەندەڵەکان خەبات دەکەین.لە پێناوی ئازادی و چوون یەکیدا، بۆ برایەتی و دۆستایەتی نێو گەلان. دیارە ئەم ئامانجە ئێزدانیش پێی ڕازیيە. ئیدی چ پێویست دەکات لەکینە و ڕقیان بترسین.

لە ١٩٦٦/٥/١٢دا خەونی فاشیستەکان بەتاڵ بووەوە. لەو ڕۆژەدا سوپای عێراق کە لە ٣٠٠٠ سەربازی تیپی شەشەم پێک هاتبوو، پشت ئەستوور بە زرێپۆش و تانک و تۆپ و هێزی ئاسمانیی، لە (هەندرێن)دا زۆر پیس شکێنران(٥٣٤). ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی (René Mauriés) وەک گەواهێکی بەچاودیدە دەگێڕێتەوە، کە سەربازەکانی

عێراق لەسەرەتادا دەیانشیراند "قیامەتە، قیامەت"(٥٣٥).

بەتالیۆنی دووی سوپای عێراق تەواو قڕ کران. کوردەکان گەلەک دەستکەوتیان بوو، لەوانە هەشت تۆپی قورسیشی تێدا بوو(٥٣٦). لەگەڵ ئەوەشدا رژێمی عێراق فیشاڵی دەکرد گوایە" شوێنە ستراتیژی‌یە گرنگەکانی "پێشمەرگەی گرتووە و "صەدان"ی لە "چەتەکان" کوشتووە(٥٣٧).

گەلی عێراق لە سیاسەتی رژێمی بەزاز و عارف تەواو نا بەدڵ و نارازی بوون. سیاسەتمەداری عێراقی (کامل الچادرچي) سەرۆکی (الحزب الوطني الديمقراطي) داوای هەنگاونانی لە باری بۆ چارەسەری کێشەی کورد کرد و داوای کرد "بەگورجی شەڕ رابگرن" تا "بارودۆخی گونجاو بۆ گفتو گۆی ئەم کێشەیە بڕەخسێت"(٥٣٨).

بەزاز ناچاری هەندێ درۆ و دەلەسە بوو، تا وورەی رووخاوی سوپاکەی پێ رابگرێت. بڵاوی کردەوە گوایە (لوقمان) کوژراوە(٥٣٩). (René Mauriés) یەک رۆژ پاش ئەو "کوشتنە" لەگەڵ (لوقمان)ی "مردوو"دا گفتوگۆی کرد(٥٤٠). لەو کاتانەدا بەزاز توانی زێتر و زێتر تورکیا بەلای خۆیدا راکێشێت(٥٤١). لە ٢٣ی مایسی ١٩٦٦دا وەزیری دەرەوەی تورکیا (Caglyankil) سەردانی عیراقی کرد. لەبەیاننامەیەکی هاوبەش لەگەڵ عیراق دا، ناڕاستەوخۆ دژی کورد دوا(٥٤٢).

لەگەڵ ئەوەی بەزاز لەرێگەی تورکیاوە زۆر هەوڵی رێکەوتنەوەی لەگەڵ ئێراندا دا، بەڵام دڵی ئێرانی پێ رازی نەکرا. لە ٢٦ی مایسی ١٩٦٦دا ئێران بەتوندی نارەزایی خۆیی دەربارەی لەسنوور تێپەڕینی سەربازەکانی عێراق دەربڕی(٥٤٣). لەتۆڵەی ئەو شکستی‌یەدا، سەربازەکانی عێراق لە ١٩٦٦/٥/٢٥دا لە بیتوێن حەفتاد و سێ کوردیان کوشت (کە زۆربەیان ژن بوون)(٥٤٤).

لەو دەمانەدا پێشمەرگە کوردەکان چەند بۆری‌یە نەوتی‌یەکیان لەکەرکوک تەقاندەوە(٥٤٥). ویستیان جیهانی رۆژئاوا بەهۆش بێننەوە، کە پشتگیری کردنی بەزاز بۆ لێخوێندا شەلاڵ کردنی کورد، بێ تۆڵە نابێت. ئەم کارەی کورد لە سەراپای چاپەمەنی‌یە جیهانی‌یەکاندا دەنگی دایەوە. گەلەک رۆژنامەی ئەوروپایی دەربارەی مەسەلەی کوردیان نووسی. زۆر هەواڵی وورد و دوور و درێژیان تێدا بوو. بۆ نموونە ئەو هەواڵەی کە لە رۆژنامەی (Neue Zürcher Zeitung) دا بڵاوکرایەوە، لە سویسرا هەل و دەرفەت بۆ باڵوێزی عێراق رەخسێنرا هەڵوێستی عێراق روون بکاتەوە. تووشی دەردی سەری‌یەکی گەورە بوو،

ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر درۆ و بوختان(٥٤٦).

شکستی عەسکەریی و ناقولایی و بێ سەر و بنی دیبلۆماسی‌یانە و سیاسەتی دەرەوە و شێواوی سیاسەتی ناوەوە و کێشە یەک لەدوای یەکەکان بەزازیان ناچار کرد هەوڵی ڕێکەوتن لەگەڵ کورد دا بدات. لە ١٩٦٦/٦/١٥دا (زەید ئەحمەد عوسمان) وەک نێردراوێکی تایبەتی بەزاز بە پێشنیاز و بۆچوونی نوێ وە گەیشتە کوردستان. هەمان ڕۆژ بەزاز لە وێزگە و تەلەفزیۆنی عێراقەوە ڕوونی کردەوە کە "پرۆگرامێکی نوێ" بۆ کێشەی کورد پێشنیاز دەکات. لەم پرۆگرامەدا گفتی ئەمانە دەدات:

(دان نانی تەواو بە بوونی نەتەوایەتی کورد دا. دان نانی تەواو بە زمانی کوردی‌یدا بۆ کار و باری ڕەسمی و دەرز گوتنەوە لە قوتابخانەکاندا. دان نانی تەواو و ڕێزگرتنی هەموو هەستێکی نەتەوایەتی کورد. لێ خۆش بوون لەوانەی چەک دادەنێن. ئاوەدان کردنەوەی ژووروو)(٥٤٧). بەزاز ئەوەشی ڕوون کردەوە کە (عێراق تەنها وولاتی عارەب نی‌یە، بەڵکە بەهەمان جۆر هینی کوردیشە)(٥٤٨). لەوەش زێتر گوتی: (دەزانم هەندێ دەستە و تاقم "ڕەنگە لە نێو عارەبیشدا" دژی ئەم هەنگاوە بن، ڕەنگە ئەم سیاسەتە بەلاوازی تێ بخوێننەوە. ئەو دەستەو تاقمانە تەنها بە لەنێو بردنی دوا یاخی بوو ڕازی دەبن... بەڵام من ڕەپ و ڕاست بەوانە دەڵێم، گەر باری "شیمال"ی وولات بە هێمنانە و... چارەسەرێکی ماقوولانە و... دان پێدانانێکی مافی تەواویاندا چارنەکرێت، کێشەکە هەر بەردەوام دەبێت، چونکە گەر تەنها هەزار یا پەنجا یاخود پێنج ناڕازی بمێننەوە، هەموو نێوچەکە ئالۆز دەکەن و ئاسایش و هێمنی دانیشتوانی دەشێوێن(٥٤٩). ئەمە بۆ چوونی بەزاز بوو. کەچی لە کۆنگرە ڕۆژنامەنووسی‌یەکەی ٩٦٦/٤/٢٢دا(٥٥٠) بەزاز بۆ چوونێکی دی هەبوو. ئەو کاتە دەیگوت "ئەو یاخی بووانە پێ‌یان وایە دەوڵەتێک بەم هەموو هێز و توانایەوە دێننە سەر چۆک؟"(٥٥١).

بەزاز لەسەری دەڕوات و دەڵێت (بودجە لەساڵی پار دا نێزیکەی پەنجا ملیۆن دینار کەمی هێناوە. ئەو پارەیە لە چارەکێکی سەرپاکی بودجەی وولات زێترە)(٥٥٢). هیچ سەیر نی‌یە! عێراقێک ڕۆژانە چارەکە ملیۆنێک دینار بۆ شەڕی کوردستان بەخەرج بدات، حاڵی هەروا دەبێت(٥٥٣).

بەگلەیی و گازندەوە بەزاز زێتر لەسەری دەڕوات و باری ئالۆزی سیاسەتی دەرەوەی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: (گەر بزانین لەو دیو سنوورەوە کەسانێک هەن کە هێمنی و

ئاسایشی ئەم وولاتەیان ناوێت، کەشەڕی نێوان براو برا دەقۆزنەوە، کە بەرژەوەندیی خۆیان لەگەڵ کەرت کردنی ئەو وولاتە یەکپارچەیە دا یەک خستووە، کە چاویان بڕیوەتە پارچەیەک لەخاکەکەی، بەشێک لە سامانەکەی و بەشێک لە ئاوەکەی(٥٥٤).، گەر ئەمانە هەمووی بزانین چێتر وایە رێگەی ئاشتی‌یانە هەڵبژێرین(٥٥٥).

بەزاز لەو گوتەیەی دا بە (پێوەندی‌یە چاکەکانی) نێوان عێراق و تورکیای دا هەڵدەدا. ئەو (پێوەندی‌یە چاکانەی) لەگەڵ ئێرانیشدا بە ئاوات دەخواست. لێرەدا ئەوەی خستە ڕوو کە (ئامادەیە هەموو داواکانی ئێران جێ بەجێ بکات، بەڵام ئەوانە نا کە سەروەریتی عێراق دەخەنە مەترسی‌یەوە)(٥٥٦).

پاش ئەو روونکردنەوانەش هێشتا بەزاز بەهەموو شێوەیەک و بە کۆمەکی چەندین وولات و رژێمی جۆرا و جۆر خەریکی تەنینی داو و پیلانی دژ بە کورد بوو.

لە ١٧ی ژونی ١٩٦٦دا بالوێزی عێراق لەمەدرید چووە خزمەتی ژەنەراڵ فرانکۆ، پاشان بالوێزی عێراق بە هەڵوێستی مەردانە و دۆستانەی (فرانکۆ)ی دا هەڵدەدا(٥٥٧). لە ١٨ی ژونی ١٩٦٦دا بارزانی‌ی لەگەلاڵە پێشوازی وەفدێکی رەسمی‌ی و میللی کرد. لەگفتوگۆدا هەردوو لا لەسەر چەند خاڵێک رێک کەوتن.

شان بەشانی ئەو گفتوگۆیانە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد دا، بەزاز راستەوخۆ لەگەڵ جاشەکانی تاڵەبانی‌یشدا خەریکی سەوداو مامەڵە بوو. لە ١٩ی ژونی ١٩٦٦ دا بەزاز چاوی بە (حیلمی عەلی شەریف) (کۆنە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی‌ی پارت بوو لە ١٩٦٤دا دەرکرا) و (جەلال تاڵەبانی) کەوت(٥٥٨).

هەمان کات بەزاز پێوەندی‌ی بەهەندێ دەستە و تاقمی ئەو هۆزانەوە کرد کە هەمیشە دژی شۆڕشی کورد بوون، وەکو زێباری و هەرکی و سورچی(٥٥٩).

بەزاز هەر زوو بۆی دەرکەوت و تێگەیشت کە نە تاڵەبانی‌یەکان و نەهۆزە لایەنگرەکان بۆیان نالوێت بەنێوی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردەوە بدوێن. ئەوجا رووی لە بارزانی‌ی کردەوە و وەکو نوێنەری شۆڕشی کورد پێوەندی پێوە کردەوە. پاش گفتوگۆ گەیشتنە ئەنجام لەسەر (پرۆگرام)ەکەی بەزاز بۆ (چارەسەری ) کێشەی کورد رێک کەوتن.

لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا بەزاز پرۆگرامە دوازدە خاڵی‌یەکەی خۆی بلاوکردەوە. لەوانە:

(... دان نان بە بوونی نەتەوەی کورد دا لە یاسای بنەڕەتیی عێراق دا. مافی لامەرکەزێتی بۆ پارێزگە کوردی‌یەکانی عێراق. دان نان بە زمانی کوردیدا وەکو زمانێکی ڕەسمیی لە پاڵ زمانی عارەبی دا (لە پەروەردە و کاروباری دەوڵەتی‌یدا!). نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی پاشەڕۆژی عێراق دا و بۆ هەموو کارێکی دی بەرێژەی ژمارەی دانیشتوان دیاری دەکرێن. گەشەپێدانی زمانی کوردی لە زانستگەی بەغدا دا. بڕێک لەزەمالەی خوێندن بە خوێندکارانی کورد بدرێت. ڕێگە بە ڕێکخراوە کوردی‌یەکان بدرێت لەسنووری یاسادا چالاکی بنوێنن. ڕێگە بدرێت بڵاوکراوەی سیاسی بەزمانی کوردی بڵاو بکرێتەوە. لێ خۆش بوون بۆ هەموو ئەوانەی لەکارەساتەکانی "شیمال"دا بەشداری‌یان کردووە. گەڕانەوەی ئەو گوندنشینە کوردانەی لە ١٩٦٣وە عارەب لە جێ‌یان نیشتەجێ کراون)[٥٦٠]. بارزانی‌ی هەمان ڕۆژ بروسکەی بۆ پشتگیری ئەم پرۆگرامە لێدا[٥٦١].

شایانی باسە کە لەم ڕێکەوتننامەیەدا سێ خاڵی تێدا بوو بڵاونەکرانەوە:

١- لەنێوچە کوردنشینەکانی پارێزگەی موسڵ دا پارێزگەیەکی نوێ بەنێوی پارێزگەی (دهۆک)ەوە دابمەزرێت. ٢- لێ خۆش بوونی گشتی بۆ هەموو گیراوە سیاسی‌یەکانی عێراق، سەر بەهەر ڕێبازێک دەبن با ببن. ٣- ڕێگەی کارکردنی ڕەسمیی بە پارتی دیموکرات بدرێت[٥٦٢].

گەر مرۆ بە ووردی و پیتۆڵی لەم پرۆگرامە بڕوانێت، دەبینێت هیچی لەو مافە سەرەتایی‌یانە زیاد نەکردووە کە کورد لەسەردەمی پاشایەتی دا هەیبووە. پرۆگرامەکە هەر زوو لەلایەن (کاژیک) و (نوکسە)وە بە توندی‌ی ڕەخنەی لێ گیرا.

لەگەڵ هەموو کەم و کوڕی‌یەکانیشیدا، هێشتا ئەفسەرە دەمارگیرەکانی سوپای عێراق ئەو پرۆگرامەیان بەسەر دانەواندنێک لەبەردەمی کورد دا دەزانی. ئەوان وای بۆ دەچوون کە (بەزاز) کابرایەکی مەدەنی‌یە و ئەو پرۆگرامە بە تەنها و بێ پرس و بەشداری مێلیتاریستەکان لەگەڵ وەفدە کوردی‌یەکەدا مۆر کردووە[٥٦٣]. لە ٣٠ی ژونی ١٩٦٦دا دەستەیەکی ٢٦ نەفەری (بە ڕێبەرایەتی ئەفسەرە فڕۆکەوانەکانی موسڵ و هەندێ مەدەنی دی) بەسەرۆکایەتی ژەنەراڵی فڕۆکەوان (عارف عبدالرزاق) کودەتایەکی بێ سەر ئەنجامیان دژی سەرکۆمار (عارفی دووهەم) و (بەزاز)ی سەرەک وەزیرانی ساز دا[٥٦٤].

لەو ترسەدا بەزاز لە ٢ی ژولی ١٩٦٦دا کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی‌ی گرت. لەهەندێ لەو بۆچوونانەی بۆ چارەسەری کێشەی کورد پێشنیازی کردبوو پەشیمان بووەوە. بەزاز

گوتی: "عێراق وولاتێکی عارەبی‌یەو هەر بە عارەبیش دەمێنێتەوە"(٥٦٥). ئەمە پاشگەزی‌یەک بوو لەو رایەی لە ١٥ی ژونی ١٩٦٦دا دەری بڕی و گوتی: "عێراق وولاتی کورد و عارەبە"(٥٦٦). بەزاز لەسەری دەڕوات و دەڵێت گوایە "بەکرێ گیراوی ئیمپریالیزم نی‌یە... وەکو لە بەیاننامەیەک دا دەڵێن"(٥٦٧). بە گاڵتە بازییەوە دەڵێت: "بەڵێ! بەکرێ گیراوم! چونکە ئەو وولاتەم خۆش دەوێت... پایە بلندێتی دەخوازم، عارەبێتیم خۆش دەوێت... بە پەنهانی‌ی، بەکاوە خۆ، بەڕاستی و بە ئەمەکانە کاری بۆ دەکەم"(٥٦٨).

لە ٣ی ژولی ١٩٦٦دا بەزاز چووە تورکیا تا دەستەلاتدارانی تورک دڵنیا کات کە ئەو بەڵێنانەی بەکوردی داوە هیچی ناباتە بەسەر. هەمدیسان کەوتەوە کلکە لەقێ بۆ تورکیای دوژمنی خوێنەخۆری کورد. ویستی هیچ نەبێت لایەنگیری ئەوان مسۆگەر بکات، پاش ئەوەی ئەو هەموو خۆڕەتاندنەی لەگەڵ شای ئێران دا بێ سەر ئەنجام بوو، چونکە شا مەترسی‌ی زێتری لەسیاسەتی پان عارەبیزمی ناصری (دۆستی عێراق) هەبوو وەک لە (خەتەری کورد)(٥٦٩). جگە لەوە ناصر کەوتبووە بەربەرەکانی‌ی شا و ئێرانی بەوە تاوانبار دەکرد کە لەوێ (جموجۆڵی زایۆنیستانە) هەیە(٥٧٠).

لە ١٠ی ژولی ٩٦٦دا حوکومەتی بەزاز (وەزارەتی ئاوەدان کردنەوەی ژووروو)ی دامەزراند، تا گەرد بکاتە چاوی کوردە شۆڕشگێڕەکانەوە.

بەزاز لە ٢٧ ی ژولی ٩٦٦دا بە داوەتێکی رەسمی‌ی چووە مۆسکۆ و چاوی بە (کۆسیگین) کەوت. ئەم بانگهێشتنە لە ٢٣ی ئازاری ٩٦٦ وە لەلایەن بەغداوە ئاشکرا کرا(٥٧١). بەپێ‌ی گوتەی (Le Monde) گوایە گفتوگۆ لەسەر چۆنیەتی پڕ چەک کردنی سوپای عێراق لەلایەن شوورەوی‌یەوە، کراوە(٥٧٢). (نوکسە) لە ٩٦٦/٣/٣٠دا بیرخەرەوەیەکی دایە (ئەلێکسی کۆسیگین)، تێیدا باری عێراقی مێژوویی و سیاسییانە هەڵسەنگاند بوو، حوکومەتی بەزازیشی وەک رژێمێکی فاشیستی دەست نیشان کردبوو(٥٧٣). (نوکسە) لەو بیرخەرەوەیەی دا داوای لەشوورەوی‌ی کردبوو کە بەهیچ جۆرێک چەک بەعێراق نەدەن، تا کێشەی کورد چارە سەر دەکەن.

بەزاز بەتایبەت پاش بلاوکردنەوەی پرۆگرامە ١٢ خاڵی‌یەکەی ٢٩ی ژونی ١٩٦٦، خۆی بە (فریشتەی ئاشتی‌ی) عێراق دەزانی و بەو جۆرەش چووە مۆسکۆ و توانی گفتی کۆمەکیان بۆ وولاتەکەی لێ وەربگرێت(٥٧٤).

لە ٤ی ئۆگوستی ١٩٦٦دا گەڕایەوە بەغدا و رایگەیاند کە (مۆسکۆ) گفتی پڕ چەک

کردنی داوەتێ، تا عێراق بتوانێت پارێزگاریی خۆیی لە ئیمپریالیزم پێ بکات.

لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەشیدا، دوژمنەکانی توانییان گوشار بخەنە سەر عارفی دووهەم تا کەناری خات. لە ٧ی ئۆگوستی ١٩٦٦دا بەزاز دەستی لەکارکێشرایەوە[٥٧٥].

هەرچەندە ژەنەرال (ناجی طالب)ی میراتگری بەڵێنی دا (پرۆگرامەکەی ٢٩ی حوزەیرانی ٩٦٦ی بەزاز پێڕەوی لێ بکات)[٥٧٦] بەڵام ئەو قەواڵە بە گەواڵەیەی حوکومەت، دڵەڕاوکەی بۆ کورد دروست کرد. هەقیشیان بوو. وەک پاشە ڕۆژ ئاشکرای کرد حوکومەتی (طالب) هیچی لەو پرۆگرامە جێ بەجێ نەکرد[٥٧٧]. سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان خرایە حاڵەتی ئامادەیی تەواوەوە. تا ترسی جەنگێکی ترسناک لەدڵی گەلی عێراق دا بڕەوێتەوە، عارفی دووهەم لە ١٨ی ئۆگوستی ٩٦٦دا گوتی (بارزانیی گوتوویە چیدی نایەوێت چەک بەڕووی سوپای عێراق دا بەرز بکاتەوە)[٥٧٨].

لەو دەمەدا سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە کۆنگرەی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا) کە لە بەرلین گیرا، ئەوەی دووپات کردەوە (کە هیچ چارەیەک بۆ کێشەی کورد نییە، جگە لە مافی ئۆتۆنۆمی نەبێت).

هەڵوێستی دەستەی تاڵەبانیی بە پێچەوانەوە بوو، تا دەهات زێتر خۆیان لە ڕژێمی عێراق هەڵدەسوو. لەکۆنگرەی (تیمار)دا کە لە ٨/٢٨ - ٢/٩/٩٦٦ی خایاند، ئاوهایان بڕیار دا: (پشتگیریی تەواو لە کۆمارەکەو ڕژێمە نیشتمان پەروەرەکەی دەکەن)[٥٧٩]. ئەوەشیان ئاشکرا کرد کە (بە هەموو توانایەکەوە دژی بارزانیی دەوەستنەوە، هەر کاتێک بە فیتی ئیمپریالیزم شەڕ دەست پێ بکاتەوە)[٥٨٠]. لەگەڵ ئەوەشدا چاکیان دەزانی کە تاوانی شەڕ هەڵگیرساندنەوە تەنها لە ئەستۆی ڕژێمە. لقی ئەوروپای دەستەی تاڵەبانیی بەڕێبەرێتی دوکتۆر کەمال فوئادیش، زێدەڕەوییان لە پێدا هەڵدانی ڕژێم دا دەکرد، بەجۆرێکی وا کە زۆر لەواقیعەوە دوور بوو، بەهیچ عەقڵێک قەبوڵ نەدەکرا[٥٨١].

پشتگیریی تاڵەبانییەکان ڕژێمی کەللە ڕەق تر کرد، بەشێوەیەک کە ئامادە نەبوو تاقە بەندێکی پرۆگرامەکە جێ بەجێ بکات، بەئومێدی ئەوەی ئەوان دژی بارزانیی بۆیان بجەنگن. وەکو سەر ئەنجامێکی ئەو سیاسەتە، گرژییەکی توند لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و ڕژێم دا ڕسکا، کە تەقەو لێکدانی لە چەند نێوچەیەک بە دوو دا هات.

لە ٢٦/ ١٠/ ٩٦٦ دا دووهەم عارف چووە کوردستان تا "برایەتی کوردو عەرەب" بە

قسه ببوژێنێتەوە[٥٨٢]. لە ٢٨/١٠/٩٦٦دا سەردانێکی بارزانیی کرد، تا دڵنیای بکات کە حکوومەتی نوێ بەندەکانی پرۆگرامی حوزەیران دەچەسپێنێت. بارزانیی لە لایەنی خۆیەوە روونی کردەوە کە "ئاشتی و هێمنی" لە عێراق دا بە ئاوات دەخوازێت[٥٨٣].

شایانی باسە کە زۆر پێشمەرگەی کورد و هەموو ئەندامانی کاژیک، هەر لەسەرەتاوە لەو پرۆگرامە نا بەدڵ بوون. ناڕەزاییەکی گشتیی ریزەکانی پارتی دیموکراتیشی گرتبووەوە. زۆر لە ئەندامانی پارت لەو پرۆگرامە دردۆنگ بوون. لەدرۆ هەمیشەییەکانی دەستەڵاتدارانی عێراق بێزار بوون و بێ ئارام چاوەڕوانی کۆنگرەی حیزبەکەیانیان دەکرد. لە ١٥/١١/١٩٦٦دا کۆنگرەی پارتی لە (گەلاڵە) بەسەرۆکایەتی بارزانی گیرا. کۆنگرە بە پرۆگرامەکەی بەزاز رازی بوو، هەر چەندە (ئۆتۆنۆمیشی بۆ کوردستان دیاری نەکردبوو)، بەڵام (پارت دەیەوێت ئاشتی بپارێزێت)[٥٨٤]. تاقمی تاڵەبانیی کۆنگرەکەیان بە (خیانەتێکی گەورە) لەقەڵەم دا[٥٨٥].

لەگەڵ ئەو هەموو بەتەنگەوە هاتن و رووی باش پیشاندانەی شۆڕشی کورد دا، هێشتا رژێم (پرۆگرام)ەکەی بە ئەنجام نەگەیاند. بارزانیی ناچار بوو لە ٢٨/١١/١٩٦٦دا بیرخەرەوەیەک بەرژێم بدات، کە تێیدا داوای جێ بەجێ کردنی (پرۆگرام)ەکەی ٢٩ حوزەیرانی کرد بوو[٥٨٦]. رژێم هیچ وەرامێکی نەدایەوە. لەو دەمەدا شوورەوی بەتەنگەوە هاتنی خۆی بۆ ئاشتی کوردستان نیشان داو نێزیکەی (٢٠ ملیۆن مارک)ی بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستانی عێراق تەرخان کرد[٥٨٧]. کاتێک هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بۆ گەلی عێراق روون و دیار و ناقوتار بوو، رژێم سەر لەنوێ دەستی بەوادە و بەڵێن دان کردەوە، تا بارە ئاڵۆزەکە کەمێک خاو بکاتەوە. جێگری سەرەک وەزیران (رجب عبدالمجید) لە ١١ی ئازاری ١٩٦٧دا لە (باڵەک) چاوی بە بارزانیی کەوت و گوتی (حوکومەتی نیشتمانیی سوورە لەسەر بەگەڕ خستنی پرۆگرامی ٢٩ی حوزەیران و هەوڵی جێ بەجێ کردنی دەدات. پاشەرۆژێکی نێزیک راستی ئەو نیازە بە ئیسپات دەگەیەنێت[٥٨٨]. نەپاشەرۆژی نێزیک و نەدوور راستی ئەو نیازەی بە ئیسپات نەگەیاند.

عێراق بێ پەروا لەگەڵ وولاتانی دراوسێیدا خەریکی تەون کردنی پیلانی دژ بە کورد بوو. لە ١٤ی ئازاری ١٩٦٧دا عارفی دووهەم چووە تاران، تا رژێمی شا بەلای خۆی دا رابکێشێت. لە تاران پێشوازییەکی گەرم لە عارف کرا. عارف لەوێوە رایگەیاند کە

(هێمنی و ئاسایشی عێراق پاڵپشتێکە بۆ ئێران و بەهەمان جۆر بەپێچەوانەشەوە)[٥٨٩].

عارف پاش گەڕانەوەی لە تاران یەکسەر چوو بۆ قاهیرە، تا لەوێ (کەنداوی فارس) بە (کەنداوی عارەبی)ی بگۆڕێت. ئەم بێ تاکتیکی‌یە هەمدیسان ئێرانی دژی عێراق هوروژاند.

تاقمی تاڵەبانی‌ی تا دەهات پترووپتر لە شۆڕشی کورد کەنارگیر دەبوون. لە شەشەم کۆنگرەی پارتەکەیاندا کە لە ٢٢-٢٧ی ئازاری ١٩٦٧ لە گوندی (کەلار) گیرا، ئامانج و ستراتیژی حیزبەکەیان ئاوها دەست نیشان کرد: (دامەزراندنی دەوڵەتێکی سۆسیالیستی لە عێراق دا)[٥٩٠]. وەکو سۆسیالیستی هیچ کردەو کۆشەیەکی نەوێت و هەر بە قاڵەی دەم و بەکارهێنانی رووتی ووشەی (سۆسیالیزم) ئیدی کۆتایی بەهەموو کێشە ئاڵۆزە نێوخۆییەکانی حیزبەکەیان بێت.

بارزانی‌ی کۆنگرەکەیانی بە (خیانەت لە حیزب) نێو برد[٥٩١]. زۆر ئەندامیان دەستیان کێشایەوە.

لە ئاوریلی ١٩٦٧دا هیوای چارەسەرێکی ئاشتی‌یانە دیسان چەکەرەی کردەوە، کاتێک ژەنەراڵ (محمود شکری) سەردانێکی ژەنەراڵ بارزانی‌ی کرد، دیتنەکەی بارزانی‌ی بە پڕ سوود لەقەڵەمدا[٥٩٢]. لە ٢٩ی ئاوریلی ١٩٦٧دا رێگەی بڵاوکردنەوەی رۆژنامەیەکی سیاسی بەنێوی (التآخي)یەوە درا، تا بەنێوی شۆڕشی کوردەوە بنووسێت.

لەپاڵ ئەوەشدا سوپا سالاری عێراق (حمودي مهدي) لە ١٩٦٧/٥/٢دا بلاوی کردەوە کە (هێزە پاڵەوانەکانی سوپای عێراق لە "شیمال"، بەو زوانە دەگەڕێنەوە بۆ بنکەکانی خۆیان)[٥٩٣]. ئەو هەواڵە خۆشە بێ هەنگاونان مایەوە.

عارفی دووهەم هەمدیسان بەوپەڕی تواناوە کەوتە خۆ، تا پێوەندی‌یەکی چاک لەگەڵ ئێران دا چەسپ کات. لە ئاوریل دا عارف دەربارەی چاوپێکەوتنەکەی (شا)ی ئەوەی ئاشکرا کرد کە (شا)ی ئێران لە گەڵیدا رێک کەوتووە، کە گوایە خاکی عێراق نابێت (کەرت کرێت)[٥٩٤]. مانگێک دوای ئەوە، لە مایس دا، وەفدێکی ئاکادیمیای سوپای تاران سەردانێکی عێراقیان کرد[٥٩٥]. لە ٦ی مایسی ١٩٦٧دا ژەنەراڵ (ناجي طالب) لە سەرۆکایەتی وەزیران دەستی کێشایەوە، بێ ئەوەی یەکێک لەبەندەکانی (پرۆگرام)ەکەی (بەزاز)ی جێ بەجێ کردبێت. حوکومەتەکەی تەنها گفتی بەتاڵی بە کورد دەدا[٥٩٦]. بۆ چەند رۆژێک عارفی سەرکۆمار خۆی سەرۆکایەتی وەزیرانی گرتە دەست و

کابینەیەکی هەڵپرووزاند. لە ١١ی مایسی ١٩٦٧دا دیسانەوە (طاهر یحیی)ی کردەوە بە سەرەکی وەزیران. وەکو یەکەم هەنگاو و دڵنەواییەکی کورد (عبدالعزیز العقیلي) وەزیری بەرگری و دوژمنی کوردی لە سوپا دوورخستەوە[٥٩٧]. بە ڕەزامەندیی عارف لە ١٩٦٧/٦/٢٩دا وەزارەتێکی بە نێوی (وەزارەتی کاروباری ژووروو)ەوە دامەزراند، کە ئەرکی (ئاوەدان کردنەوەی نێوچەکە) بێت[٥٩٨].

لە ١٩٦٧/٧/٢٨دا (طاهر یحیی) پرۆگرامی حوکومەتەکەی بڵاوکردەوە، کە بەگەڕ خستنی پرۆگرامەکەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ی تێدا بوو[٥٩٩]. (یحیی) لە ١٠ی ئەیلولی ١٩٦٧دا بڵاوی کردەوە کە (حوکومەتەکەی بەو زوانە هەوڵی جێ بەجێ کردنی پرۆگرامی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ دەدات[٦٠٠].

پاش پێک گەیشتنێکی (یحیی) و بارزانیی لە ١٥ی سێبتەمبەری ١٩٦٧دا[٦٠١]. لە کوردستان، (یحیی) پێنج بەڕێوەبەرایەتیی بۆ وەزارەتە تازە دامەزراوەکەی (کاروباری ژووروو) دامەزراند و ئەندازیار و ماف ناسی کورد (ئیحسان شێرزاد)ی خستە کابینەکەیەوە. ئیدی جێ بەجێ کردنی هیچ بەندێکی دی (پرۆگرام)ەکە دەنگی نەبوو.

پاش ئەوەی رۆژنامەی (التآخي) پێویستی جێ بەجێ کردنی پرۆگرامەکەی ٢٩ی حوزەیرانی چەند بارە کردەوە، بەزاز نامەیەکی بۆ رۆژنامەکە نووسی و گوتبووی:

(ئەو پرۆگرامە کارێکی تایبەتمەندی حوکومەتەکەی من بووە. هیچ حوکومەتێکی دیکە بەجێ بەجێ کردنی ئەو پرۆگرامەوە پابەند نی‌یە)[٦٠٢].

جگەلەوە بەزاز نووسیبووی کە گوایە لەنێوان حوکومەتەکەی ئەو و کورد دا، هیچ ڕێکەوتننامەیەک لەئارادا نەبووە. بەزاز پێی لەسەر ئەوەش دادەگرت کە هیچ (پەرەگرافێکی پەنهانیی) تێدا نەبووە[٦٠٣].

ئەوە نائومێدیەکی تەواو بوو بۆ ئەوانەی بە (بەزاز)یان باوەڕ دەکرد. (التآخي) لەهەمان ژمارەدا نووسیبووی (نەتەوەی کورد لە ئێستا بەدواوە داوای گرەنتی تەواو دەکات بۆ مسۆگەر کردنی مافەکانی).

لەبریتی جێ بەجێ کردنی بەڵێنە یەک لە داوی یەکەکان، رژێم هەوڵی زێتر و زێتری بۆ ئەدانی ڕێبەرانی شۆڕشی چەواشە دەدا.

سیاسەتی دەرەوەیش کەلەلا بوو. عارف لە هەوڵی بەردەوام دابوو بۆ پەیداکردنی

هاوبەشێک بۆ شەڕی دژ بەکورد. لەپشت پەردەوە لەگەڵ تورکیادا لەسەودا و مامەڵەدا بوو. لە ٢٠/١٠/١٩٦٧ (سلێمان دیمیریل)ی سەرەک وەزیرانی تورکیا لەگەڵ وەفدێک دا هاتە بەغدا[٦٠٤].

بۆ چەواشە کردنی کورد، لەهەمان رۆژی ٢٠/١٠دا "لیژنەیەکی سەر بەوەزارەتی" بۆ ئاسان کردنەوەی باری "شیمال"ی وولات، نارده لای بارزانیی. ئەو پێک گەیشتنە ئەو کاتە لەلایەن رۆژنامەی (التآخي)یەوە (زۆر بە پڕ بایەخ)[٦٠٥] دادەنرا[٦٠٦].

عارفی دیکتاتۆر گەلەک جار لەلایەن رۆژنامەکانی ئەورووپاوە بە خراپ باسی دەکرا. ویستی باری خواری راست کاتەوە. (دوکتۆر گیرهارد فرای) سەرنووسەری رۆژنامەی "Deutsche National Zeitung & Soldaten Zeitung" ی بۆ بەغدا داوەت کرد. فرای لەگەڵ خاتوو (ریگینا دال)دا، لە کانوونی دووهەمی ١٩٦٨دا چوونە بەغدا. لەبەغدا دووقۆڵی لایەنگیریی خۆیان بۆ رژێمی عارفی دەربڕی و هێرشی توندیان کردە سەر رژێمی ئالەمانیای خۆرئاوا[٦٠٧]. (فرای) خۆی پێشانیش دوژمنایەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردی بە ئیسپات گەیاندبوو. لە ئاوریلی ٩٦٦ادا بەدەنگ عارفی یەکەمەوە هات و لە رۆژنامەکەیدا بوختانی بەکورد کردبوو. لەپەڕە شڕەکانیدا نووسیبووی "کوردەکان کۆمەک لە ئیمپریالیزم وەردەگرن".

عارف بۆ دەستخستنی چەک بەرەو فەرەنسا رووی وەرگێڕا. ئیمتیازاتێکی چاکی بەشیرکەتی (ERAP)ی فەرەنسەیی‌دا[٦٠٨]. لەبەرامبەر ئەوەدا فڕۆکەی (میراج)ی پێ درا. بەڵام لەو پێناوەدا دوژمنایەتی‌ی شیرکەتی نەوتی ئینگلیزی پێ بڕا.

شەش وەزیر لەبەرئەوەی سیاسەتی عارفیان پێ باش نەبوو، دەستیان لەکار کێشایەوە[٦٠٩]. سیاسەتمەداری بەنێوبانگی عێراق (کامل چادرچی) سەرۆکی (الحزب الوطني الديمقراطي) بەتوندی رەخنەی لە پەیمانی نەوتی (ERAP) گرت[٦١٠]. هەروەها رۆژنامەی "التآخي" پارتی دێموکراتیش بەو توندی‌یە رەخنەی لەو سیاسەتە نەوتاوی‌یە گرت[٦١١].

هەروەها ژەنەراڵ بارزانی‌یش لەنامەیەکی تایبەتی‌یدا بۆ ژەنەراڵ دیگۆل، لە فێبریوەری ١٩٦٨دا نارەزایی خۆیی بەرامبەر ناردنی چەکی فەرەنسی‌ی بۆ عێراق دەربڕی و وای لێک دایەوە کە ئەوە (هارکردنی عێراقە، تا شەڕی رەگەز پەرستانەی دژی کورد دەست پێ

بکاتەوە)(٦١٢).

گەلەک دۆستی کوردی فەرەنسەیی هەواڵی ئەو چەک ناردنەیان بەوپەڕی دڵتەنگی‌یەوە وەرگرت. کاتێک عارف لە دووهەمین حەوتووی فێبریوەری ١٩٦٨دا سەردانی پاریسی کرد، هەندەک کۆڕ و کۆمەڵی شۆڕشگێڕ و سۆسیالیست لە (خوێندکارانی سۆربۆن) لە ١٩٦٨/٢/٨دا خۆ پێشاندانێکیان دژی عارف رێکخست. بانگیان هەڵدەدا "چەک نەدرێت بەخوێنرێژی نەتەوەی کورد"، "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان"(٦١٣).

عارف ناچارانە بە رۆژنامەی (Le Monde)ی راگەیاند: ئەو چەکانەی لەفەرەنسا وەرگیراون، گوایە"دژی کورد بەکار ناهێنرێن".

نوکسە لە کاتی خۆیدا بەتوندی نارەزایی خۆی بەرامبەر ئەو چەک ناردنە دەربڕی. لەسێبتەمبەری ٩٦٦وە کۆمیتەیەکی هاوکاری‌ی لەگەڵ نەتەوەی کورد دا لەفەرەنسا لەژێر ناوی "Comité d'aide á la population sinistréedu Kurdistan d' Irak"دا دامەزرێنرا. کە ئەم نێوداره بەرێزانەی تێدا بەشدار بوون

(Léon Hamon, François Mauriac, Marius Moutet, René Etiemble................

و گەلێکی دیش. هەروەها زۆر رۆژنامەی فەرەنسی مەردانە پشتیان گرتین. بۆ نموونە لە ١٩٦٨/٢/٧دا (Le Combat) زۆر بنج بڕانە رەخنەی لە ناردنی چەکی فەرەنسی بۆ عێراق، گرت. (لەناخی دڵەوە سوپاسی گشت لایەکیان دەکەین).

لە ئەنجامی هاریکاری‌ی رژێم و جاشە غەیرە نیزامی‌یەکانی تاڵەبانی‌یدا، گەلەک گوندی کورد داگیر کران و زۆر جوتکاری کورد کوژران. هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەر پەرچیان دانەوە.

لەئاوریلی ٩٦٨دا یەکێک لەسەرە چەپەڵە تاوانبارەکان، دەرەبەگێکی گەورەی عارەب و سەرەک خێڵی (طي) (شیخ حنش الحمد) لەگەڵ شەش پیاویدا لەلایەن پێشمەرگەوە کوژران. کاتێک هێزێکی سوپایی ویستیان تۆڵەی (الحمد) بکەنەوە، لەلایەن هێزەکانی پێشمەرگەوە گەمارۆ دران و٤٨ سەربازیان لێ کوژرا. ئەوانی دیکەیان کاتێک لەگەمارۆ خەلەسان، کە رژێم هاناو تکای بۆ بارزانی‌ی برد. پاش ئەوەی بارزانی‌ی گەمارۆکەی لەسەر هەڵگرتن، رژێم روون کردنەوەیەکی رەسمی‌ی دەربارەی رووداوەکە بڵاوکردەوە. کە پاشماوەی هێزەکانیان بەو شێوە و شێوازە قوتار کران، ئەوجا کەوتنە هاوار و واوەیلا، گوایە ئەوانە (بوونە قوربانی‌ی وازی‌یەکی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم). هەمان کات بە

پشتیوانی تاقمەکەی تاڵەبانی‌ی بڵاویان کردەوە کە (رژێم هەموو رێگەیەکی گرتە بەر تا کێشەی کورد چارەسەر بکات، بەڵام کوردەکان خۆیان لەنێو خۆیاندا یەک نین)(٦١٤).

ئەو قاوە ناخەملاوە کە "کورد لەنێو خۆدا یەک نین" گەلەک جار گوێ بیست دەبێت، بەزۆریش لەلایەن دوژمنانی بزووتنەوە ئازادیخوازەکەمانەوە. دابەشکەرانی کوردستان ئەوەیان لەبیر نەچووە هەمیشە ئەو خاڵە دیارە زەق تر کەن.

(خواجە سەعدەددین)ی موفتی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی (هۆی) ئەم ناتەباییەی کوردی دەگێڕایەوە بۆ ئەو نزایەی گوایە پەیامبەر لێ‌ی کردووین: (ئۆ خودایە! رێگە نەدەیت قەت کورد یەکگرن. بەیەکگرتنیان دنیا سەرەنگرێ دەبێت)(٦١٥).

ئێمە لەدووهەم عارفێک دەپرسین کە (ناتەبایی) کورد دەکاتە بەهانە بۆ ئەوەی کورد بە بێ بەشی لەهەموو مافێک بهێڵێتەوە: ئایا عارەب لەنێو یەکدا زۆر رێک و تەباو کۆکن؟؟؟ دەپرسین ئاخۆ ئاڵەمانەکان، فارسەکان، ئیتالی و فەرەنسی‌یەکان هەموو لەنێو خۆدا یەکن؟؟؟

بێ گومان نەء! گشت نەتەوەیەک بیر و رێبازی سیاسی جوێ جوێ‌ی تێدا هەڵکەوتووە، ئێمەش بەهەمان جۆر. جگە لەوە کورد بەهۆی گەلەک بنەمای مێژوویی و کۆمەلایەتی و سیاسی‌یەوە تووشی ئەو لێک بڵاوی‌یە بووە. ئاشکرایە لەگەڵ ئەو هەموو ناتەباییەشدا کوردێک نی‌یە بەوە رازی بێت کە پلەیەک لەخوار مرۆڤەوە حسێبی بۆ بکرێت. خۆ لەهیچ دا یەک نەبین ئا لەوەدا یەکین. ئەوە راستی‌یەکە و هەق نی‌یە دوژمنانمان چاوی لێ بقوچێنن.

عارف هەمدیسان هەوڵی رازی کردنی دڵی شای دایەوە. بۆ ئەو مەبەستە لە ٢٤ی ژونی ١٩٦٨دا (طاهر يحيى)ی سەرەک وەزیرانی چووە تاران. ئەم هەنگاوە بە گوشار خستنە سەر کورد دەستی پێ کرد. ئەوە بوو رەقابەی عەسکەری‌ی بەغدا لە ٢٧ ژونی ١٩٦٨دا سەرگوتاری رۆژنامەی (التاخي)ی ژمارە ٢٩٨ی قرتاند. ئەو گوتارەی رێگەی بڵاوکردنەوەی لێ‌گیرا رای پارتی دێموکرات بوو بەرامبەر پلانی گۆڕینێکی کابینەی وەزارەت کە بەدەستەوە بوو.

لە ٢٩ی ئۆگوستی ١٩٦٨دا ژمارە ٣٥٥ی رۆژنامەی (التآخي) سەردێڕی (چەند رایەکی

بارزانیی) بڵاو کردبووەوە، بەڵام ژێر ئەو سەردێرە بە بۆشی و سپیێتی هێڵرابووەوە، کە ڕوون وئاشکرا قەدەغەی چاپ کردنی ئەو گوتانەی بارزانی نیشان دەدا[×].

لە ٢٩ی ژوئنی ٩٦٨ دا کازێر و نیوێک گفتوگۆ لەنێوان شا و بەحیبا دا سازدرا. بەیاننامەیەکی هاوبەش بڵاوکرایەوە، بەڵام هیچ نیشانەیەکی هاریکاریی عێراق و ئێرانی دژ بە کوردی تێدا نەبوو. عارف هێشتا ئەوەی بە مێشکدا نەدەچوو کە ناتەبایی ئێران و عێراق (هەر لەشەڕ و لێکدانی سەر سنووردوە تا جوداوازیی جۆری ڕژێم) بە ڕادەیەکە کە جارێ ئێران ڕازی ناکات بەرەیەکی دژ بەکوردیان لەگەڵ بکاتەوە.

## کودەتای بەعس

سیاسەتی نەوتی عارف، شێرکەتە ئینگلیزی و هۆڵەندییەکانی وەڕست کرد. هەوڵی نێزیک بوونەوە لە ئێرانی (ئەندامی ناتۆ)ش لەلایەکی دییەوە ئەفسەرەکانی جاڕس کرد. بەو پێیە لە ١٧ی تەموزی ٩٦٨دا کودەتایەک لەعارفی دووهەم و بەحیبای سەرەک وەزیرانی کرا[٦١٦].

عارف ڕەوانەی هەندەران کرا، سەرەتا بۆ ئینگلتەرە و پاشان بۆ تورکیا. ئینقیلابچییەکانی ئەمجارە هەمدیسان بەعسییەکان بوون. دوان لەوانەی کودەتاکەیان ڕێبەری کرد (نایف) و (بەکر)ی سەرکۆماری ئێستای عێراق بوون[٦١٧]. کە کابینەی نوێ دامەزرێندرا، (نایف) بەسەرەکی وەزیران دانرا. نایف پێشان یەکێک لەکاربەدەستە باڵادەستەکانی موخابەراتی عێراق بوو. بۆ ئەو کارە لە ئینگلتەرە مەشقی پێ کرابوو و پەروەردە کرابوو.

ئاژانسەکانی ئینگلتەرە بەوپەڕی شادییەوە هەواڵەکەیان ڕاگەیاند. بۆ نموونە (UPI) بەشان و باڵی کودەتاکەی دا هەڵدەدا و بە ئەنتی شوورەویی نێوی دەبرد. (ASSOCIAT-ED PRESS) (البکر)ی بە (سۆسیالیستێکی مام نێوەندی) نێو دەبرد. (Financial Times) لە ٢٣ی تەموزی ٩٦٨دا حاڵ وباری شیرکەتەکانی نەوتی بە (دڵ پڕ لەهیوا) باس دەکرد.

نایف لەیەکەمین ڕۆژی سەرەک وەزیرییدا ڕایگەیاند کە "کێشەی کورد" بەجۆرێک چارە سەر دەکات کەقەوارەی یەکپارچەیی کۆمارەکە بپارێزێت[٦١٨].

---

(×) ئاشکرایە ئەمەیان پاش کودەتای بەعس ڕووی داوە، نەک لەسەردەمی عارف و بەحیبا دا.

دوو وەزیری نوێنەری شۆڕشی کورد لە کابینەدا بەشدار بوون. لە گوتارێکی ١٣ی ئۆگوستی ٩٦٨ی رۆژنامەی (التآخي) ژمارە ٣٣٩دا وا بە دەر دەکەویت کە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد پێش ئینقیلابەکەی ١٧ی تەموز، شان بەشانی هەموو هێزە سیاسی‌یەکانی دی، لەگەڵ بەعس دا پێوەندی‌دار بوو‌بێت. بۆیە ماوەیەکی کەم پاش کودەتاکە نایف چووە کوردسان تا چاوی بە بارزانی‌ی بکەویت.

پاش گەڕانەوەی، لە ٢٤ی تەموزی ١٩٦٨دا کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسی لە بەغدا گرت و رایگەیاند کە چارەسەری کێشەی کورد دەکات و گفتیشی دا پێڕەوی پەیمانی نەوتی (INOC - ERAP)ی ٤ / ٢ / ١٩٦٨ بکات.

لە ٣٠ی تەموزی ١٩٦٨دا ئینقیلابێکی دی لە خودی (نایف) کرا. ئەم یەکەشیان لەلایەن بەعسی‌یەکانەوە و بە سەرکردایەتی (احمد حسن البکر) کرا. لە هەمان رۆژدا بەیانێک (بە نێوی بەیاننامەی ژمارە ٢٧)ەوە لەلایەن (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ەوە لە رادیۆ و تەلەفزیۆنەوە خوێندرایەوە و رایگەیاند کە:

(ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش پەیمان بە خودا و گەل دەدات کە رژێمێکی یەکگرتوو، دێموکراسی و شۆڕشگێڕ پایەدار بکات... مەسەلەی کوردیش ئازادانە و دادوەرانە چارەسەر دەکرێت. بەشێوەیەک کە خواستە نەتەوەییەکانی برا کوردەکانمان دەستەبەر بکات و یەکێتی نیشتمانی عێراقیش بپارێزێت... تاد)(*).

ماوەیەک دواتر رژێم بەیانی ژمارە ٣٥ی دەرکرد. بەو پێ‌یە پرۆگرامی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ی وەکو (بناغەیەک بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد، بەلانی کەمەوە لەو بارەی ئەوسادا) دەست نیشان کرا.

لە ١٩٦٨/٨/٥دا رژێم یاسای لێ خۆش بوونی گشتی بۆ پێشمەرگەی کورد راگەیاند و(کۆڕی زانیاری کورد)ی دامەزراند و گفتی بەگەلی کورد دا کە لە سلێمانی زانستگەیەک دابمەزرێنێت.

بەلام لەیاسا بنچینەییەکان دا کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، لە ١٩٦٨/٩/٢٢دا لەبرێتی یاسای سالی ١٩٦٤ بلاوی کردەوە، هیچ باسێکی هاوبەشی‌ی بۆ کورد تێدا نەبوو. ئەمە هەتا تاقمەکەی تالەبانیشی سەغلەت کرد، کە ئەو دەمە وەک

(*) "Süddeutsche Zeitung", München, den 1. August 1968.

بەکرێگیراوێک بۆ رژێمی بەعس خۆیان دەرەتاند[٦١٩]. لەخوارووی عێراق دا راپەڕینێک بەرپا بوو، کە لە لایەن پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە رێبەری دەکرا. لەبەیاننامەیەکی(جبهة الکفاح الشعبي المسلح)دا داوا لەگەڵ دەکات کە رژێم بڕوخێنن و رژێمێکی دیموکراسییانەی راستەقینە کە مافی ئۆتۆنۆمی بەکورد بدات، لەجێگەی دابمەزرێنن[٦٢٠]. بەڵام ئەو ڕاپەڕینە زوو خامۆش کرا.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٢٥ی سێبتەمبەری ١٩٦٨دا بڵاوی کردەوە کە (جەژنی نەورۆز)، یانی ٢١ی ئازاری هەموو ساڵێک، دەکرێتە (جەژنی نەتەوەیی) کورد و (بۆنەیەکی رەسمی) هەموو عێراق[٦٢١]. هەروەها لە ٢٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٨دا هەمان ئەنجومەن، بەپێی یاسایەک بڕیاری دامەزراندنی زانستگەیەکی لەشاری سلێمانی دا، کە کوردی لە پاڵ عارەبیدا زمانی خوێندنی بێت[٦٢٢].

ئەم ووشە و دەربڕینە شیرین و رەنگینانە ماوەیەکی دوور و درێژ بەکردار تەرجەمە نەکران، چونکە رژێمی بەعس پشتی بەکۆمەکی تاقمەکەی تاڵەبانی بەستبوو.

ئەمانیش رژێم رێگەی ئەوەی پێدان لەنۆڤەمبەری ١٩٦٨ەوە رۆژنامەیەک بەنێوی (النور)ەوە بڵاوبکەنەوە، کە بە عارەبیی لەبەغدا دەردەچوو، ئەرکیشی ئەوە بوو زوڕنا بۆ رژێم بژەنێت، بارزانییان بە (بەکرێ گیراوێکی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم) نێو دەبرد و شۆڕشی کوردیان بە (بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستانە) لەقەڵەم دەدا[٦٢٣]. جگە لەوە تاقمی تاڵەبانیی وەزیرێکیان لەحوکومەت دا هەبوو کە نێوی (تەهای حاجی مەلا محیدین) بوو. هەروەها چەند پارێزگەرێکیان لەشارە کوردەکان دا بۆ دامەزراندن. ئەمە سەرکردایەتی شۆڕشی وا لێ کرد کە هەردوو وەزیرەکەیان بکێشنەوە. جاشەکانی تاڵەبانیی لەگەڵ ئۆردووی عێراق دا دژی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد دەجەنگان، وەکو رۆژنامەی (النور)یان پێی لێ دەنێت[٦٢٤]. لەدوو بەیاننامەدا کە تاقمەکەی تاڵەبانی لەبەغدا لە ١٦و ٣٠ی ئۆگوستی ١٩٦٩دا بڵاویان کردەوە[٦٢٥]. سەرژمێرێکی ئەو زیانانەی تێدایە کە جاشەکانی تاڵەبانیی لەهێزی پێشمەرگەی کوردستانیان داوە.

ئەورۆ لەئاڵەمانیای رۆژئاوا هەندێ کەسی سەر بەتاقمەکەی تاڵەبانیی لەگەڵ چەند خوێندکارێکی ئاڵەمانی دا کە بوختانی چەپ ڕەوی بەخۆیان دەکەن، هاریکاریی دەکەن. بەتێ چاندنی ئەو تاقمە، زانستگەی (Karlsruhe) لەو بەڵێنەی پەشیمان بووەوە، کە بڕیار بوو هۆڵێک بە (نوکسە) بدات تا سیمینارێکی لەسەر کورد پێشکەش بکات.

بیانووشیان ئەوە بوو گوایە شۆڕشی کورد بەرێبەرێتی بارزانیی و بەشداری نوکسە و کاژیک و پارتی دیمۆکرات هەموو رێکخراوی (فاشستیین). ئێمە پیرۆزبایی لەو (چەپی)یانەی ئاڵمانیا دەکەین، بۆ خۆیان و (شەریک)یان.

بە پێچەوانەی تاقمەکەی تاڵەبانییەوە، لیژنەی مەرکەزیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق نامیلکەیەکی لەسەر مەسەلەی کورد بڵاوکردەوە(٦٢٦). کە مەوزوعیانە و واقیع بینانە رای خۆیان لەمەڕ کێشەی کورد ئاشکرا کردبوو. تێیدا دەڵێن:

(گەلی کورد لەعێراق دا پارچەیەکی دانەبڕدراوە لەنەتەوەی کورد، کە لە خاکە دابەشکراوەکەی کوردستانیان دا دەژین و وەکو نەتەوەیەکی دیکە مافی سروشتی خۆیانە کە چارەنووسی خۆیان بەدەستی خۆیانەوە بێت، هەتا مافی جودابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەرتاپایی سەربەخۆ)(٦٢٧).

(گەلی کورد بەدەست سەرپاکی ئەو دەردی سەرییانەوە دەناڵێنێت کە گەلی عێراق تووشی هاتووە. سەرباقیی ئەوەش بەدەست چەرمەسەرییە دێرینەکەیانەوە، کە چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و دان نەنان و ژێر لێو خستنی مافی بوون و ژیانیانە وەکو نەتەوەیەک)(٦٢٨).

نامیلکەکە دەربارەی شۆڕشی کورد دەڵێت:

(شۆڕشی کورد پێش حەوت ساڵ، لەئەنجامی سیاسەتی شۆڤێنیستانە و چەوساندنەوەیانەوە، کە تا رادەی شاڵاوی چەکدارانە و بەکۆمەڵ قڕ کردنیان سەری هەڵگرتبوو، هەڵگیرسا. لەماوەی ئەم حەوت ساڵەدا هەلی ئەوە بۆ شۆڕشی کورد رەخساوە کە مافە ئاساییەکانی خۆیان، داواکانیان، "مافی نەتەوایەتی کورد" روون و ئاشکرا پێش چاوخەن و ئەم کێشەیە لە عێراق و کەوشەنی عارەب دا و لەهەر جێگەیەکی دونیا دا بناسێنن. بەو جۆرە هەندێ مافی نەتەوایەتی خۆیان بەزۆری چەک و قوربانییەکی فرە نرخدار بەدەست هێناوە)(٦٢٩).

پارتی کۆمۆنیستی عیراق مافی نەتەوایەتی کورد بەم جۆرەیە لێک دەداتەوە:

(مافی نەتەوایەتی کورد ناتوانرێت تەنها لەمەودای زمان و ئاهەنگ گێرانی جەژنێکی نەتەوایەتییدا گیر بکرێت. کورد مافی ئەوەی هەیە کە ژیان و بوونی نەتەوایەتی خۆی لەپاڵ مافێکی ئۆتۆنۆمییدا بەدەست بهێنێت)(٦٣٠).

کۆنە سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی عێراق (عزیز الحاج) لە ٣ی ئاوریلی ١٩٦٩دا لەرادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغداوە بەشان و باڵی رژێمیدا هەڵدەدا و هەمان کات هێرشی توندی کردە سەربارزانی و شۆڕشی کورد. بەگوتەی (الحاج) بارزانیی خزمەت بەگەلی کورد ناکات. تانەی لێ دەدا کە گوایە لەگەڵ ئیمپریالیزم دا هاوکاریی دەکات[٦٣١]. (الحاج) لەو دەمەوە نێو و شۆرەت و جێگە و دەستەڵاتی خۆی لە حیزب دا لەدەستدا. ئێستاکە لەسەر خوانی رژێمی عێراق دەلەوەڕێت.

شایانی باسە کە تاقمەکەی تاڵەبانیی لەرۆژنامەی (النور)یان دا پەلاماری پارتی کۆمۆنیستی عیراقیان دەدا. بەتاوانی هاریکاری لەگەڵ بارزانییدا خەتاباریان دەکردن و بزووتنەوەی بارزانییان بە بزووتنەوەیەکی ئیمپریالیزمانە جوێن باران دەکرد[٦٣٢].

رژێمی بەعس هەم دۆستایەتی لەگەڵ تاقمەکەی تاڵەبانی و هەم رەفتارە تاوانکارییەکانی خۆی پەرە پێدا[٦٣٣]. بۆمبای (ناپاڵم)ی دژی دانیشتوانی بێ تاوان و بێ دەرەتان بەکار دەهێنا[٦٣٤]. چەپەڵترین تاوانی سوپای عێراق لەو کاتانە دا لەگوندی (دەکان) کرا. لە ١٩/٨/١٩٦٩دا چەند دەستەیەکی سوپا، کە چەند ئەفسەرێکی باڵا دەستیشیان لەگەڵ دا بوو، شاڵاویان بۆ ئەو گوندە برد. ژن، پیاوی پیر و منداڵیان خزانە ئەشکەوتێکەوە و قانیان دان. کاتێک ژنێکی دووگیان هاواری کۆمەکی لێ هەستا، ئەفسەرێکی عارەب بە چەقۆیەک و ورگی هەڵدڕی و منداڵە نەخەملاوەکەی دەرهێنا[٦٣٥]. ئەم تاوانکارییە کە ٦٧ منداڵ و ژنی بێ تاوانی تێدا کوژرا، کە زۆربەیان لەگەلی ئاسووریی برامان بوون، دڕندایەتییەکە کە تا ئەورۆ بێ سزا ماوەتەوە.

لە ئازاری ١٩٦٩دا رژێمی عێراق ٦٠ هەزار سەربازی بۆ دژی پێشمەرگە خڕ کردەوە. بە بۆمبای (ناپاڵم) گوندەکانی کوردستانیان دابێژا[٦٣٦]. لە تۆڵەدا پێشمەرگەکانی کوردستان چەند دەستگەیەکی (ئای.پی.سی)یان لە (زەنبوور) تەقاندەوە[٦٣٧]. چونکە (ئای. پی. سی) بەردەوام و لەبەر گەلەک هۆی ئاشکرا، یارمەتی رژێمی عێراقی دەدا. بۆ نموونە عێراق لەسەرەتای تەموزی ١٩٦٨دا ٤٧ ملیۆن پاوەندی ئینگلیزی لە (ئای. پی. سی) بەدەست کەوت. کە ٢٢ ملیۆن پاوەندی لە ١٩٦٧ زێتر بوو[٦٣٨]. ئەم دەست والاییە تەنها یەک هۆ و روون کردنەوەی بەرچاوی هەیە: سیاسەت!!!

لە ٢٨ی تەموزی ١٩٦٩دا سوپای عێراق پەلاماری شارۆچکەی (القوش)ی دیانە رۆمە کاتۆلیکەکانی داو قەشەکانیان ئازار دا. قەشەیەکی ٧٥ ساڵەی تێدا مرد[٦٣٩].

خوێنرێژییەکی لەو بابەتەش لە ١٩ی سێبتەمبەری ١٩٦٩دا لە گوندی (سۆریا)ی ئاسووری‌یەکاندا کرا[٦٤٠].

لەپاڵ تاقمەکەی تاڵەبانی‌یدا، رژێم دەیویست (حیزبۆچکەی کوردی‌ی) دیکەش هەڵبێنێت، بۆیە بە کوێخایەتی پارێزەر (عەونی یوسف) حیزبێکی لەو بابەتە ترەکی، کە بێ گومان رێبازی دژ شۆڕشی هەبوو. لەنامەیەکی نهێنی‌ی (رئاسة ارکان الجیش/مدیریة الاستخبارات العسکریة) (رقم ٣٧/س/٧، بغداد ١٩٦٩/١/٢) دا کە بۆ (مدیریة الامن) نێردراوە، داوا لەهەموو تیپەکانی سوپای عێراق دەکات لەگەڵ (یوسف) دا هاریکاری‌ی بکەن. بەڵام حیزبۆچکەکەی کە (رزگاری‌ی) نێو بوو، هیچ جەماوەرێکی بۆ پەیدا نەبوو.

ئەو هەمـوو بەرهەڵستی و چەرمەسەری و بوختانانە وورەیان بەخەباتکەرە ئازادیخوازەکانی کورد بەرنەدا، بە پێچەوانەوە، هێزی مەعنەوی‌ی پێشمەرگە هەر لەتین و تاوی زێتر دا بوو.

رژێم وای بە چاک زانی کارێک بکات کە لای کورد کەمێک برەو بۆ تاقمی تاڵەبانی‌ی پەیدا کات. لە ٢٧ی مایسی ١٩٦٩دا "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش "دامەزراندنی پارێزگەیەکی نوێ‌ی بەنێوی (دهۆک)ەوە ڕاگەیاند(*). ئەم پارێزگەیە لەچەند پەرتێکی نێوچە کوردی‌یەکانی پارێزگەی (موسڵ) دروست کرا. لە ١٩٦٩/٨/١١دا رژێم لە رۆژنامەی رەسمی‌ی (الوقائع العراقیة)دا "یاسای نوێ‌ی پارێزگەکان"ی بڵاوکردەوە. هەمان کات رێگەی چەند بڵاوکراوەیەکی کوردی درا.

لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٩دا (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) ئەو بڕیارانەی دا:

(زمانی کوردی لەهەموو قوتابخانە ئامادەییەکان، زانستگەکان، قوتابخانە پەروەردەییەکان، لەهەموو ئەکادیمیای سوپایی و پۆلیسی‌یەکان دا دەبێت بخوێندرێت، لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی دەرزەکان لەقوتابخانە کوردی‌یەکاندا بەزمانی کوردی دەبێت. لەقوتابخانە کوردی‌یەکاندا، زمانی عارەبی دەبێتە زمانی دووهەم. کتێبە زانستی و ئەدەبی و سیاسی‌یەکان کە دەربارەی کورد و بەزمانی کوردی نوسراون دەخرێنە کتێبخانە گشتی‌یەکان و کتێبخانەی قوتابخانەکانەوە. رێگە بەنووسەران و شاعیرانی کورد دەدرێت کە یەکێتی‌یەکی سەربەخۆیان دابمەزرێنن. بەڕێوەبەرێتی‌یەکی گشتی بۆ رۆشنبیری کوردی

(*) بڕوانە رۆژنامەی "النور"، العدد ١٤٨، بغداد، ٢٨ مایس ١٩٦٩.

"کە سەر بەوەزارەتی رۆشنبیریی و راگەیاندن دەبێت "دا دەمەزرێندرێت. رۆژنامەیەکی حەوتوویی و گۆڤارێکی مانگانە لەلایەن "بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپەمەنی"یەوە بەزمانی کوردی بلاو دەکرێتەوە. بەرنامەی کوردی لەتەلەفزیۆنی کەرکوک دا زیاد دەکرێت و لەپاشەرۆژدا وێزگەیەکی تەلەفزیۆنی تایبەتی کوردی دادەمەزرێندرێت. هەموو قوتابخانە و شوێنە گشتییەکانی نێوچە کوردییەکان نێوی مێژوویی و جوگرافیایی پرمانای کوردییان لێ دەنرێت[٦٤١].

زێتر لەوە روونکرایەوە کە "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" پێشتر بڕیاری داوە کە زمانی کوردی لە قوتابخانە سەرەتایی و نێوەندی و ئامادەییەکانی کوردستان دا، ببێتە زمانی رەسمیی خوێندن[٦٤٢].

ئەم هەموو بڕیار و گفتە ئاڵ و والآیانە نەیانتوانی ژمارەیەکی کەم زێتر فریودەن (بەتایبەت لەنێو خوێندکاران دا) و باوەڕیان پێ بهێنن کە بە هاریکاری تاقمی تاڵەبانیی وبەعسیەکان کێشەی کورد چارە سەر دەکرێت. بە پێچەوانەوە، زۆربەی زۆری جەماوەر باوەڕیان بەسەرکردایەتی شۆڕشی کورد، واتە بە بارزانیی هەبوو. میللەتی کورد تروسکەی هیوای ئازادی خۆی لە رێبازی هەڵدێری تاقمی تاڵەبانییدا نەدەدیت.

کاتێک رژیم ئەمەی بەتەواوی بۆ دەرکەوت، ئەوجا بەرەو شۆڕشی کورد بای دایەوەو گفتو گۆی پەنهانی دەستی پێ کرد. نوێنەری شۆڕشی کورد لە بێروت پێوەندی بە (میشێل عەفلەق)ی سکرتێری گشتی پارتی بەعسەوە کرد[٦٤٣]. ئەوجا لەگەڵ سەرکردایەتی هەرێمایەتیی بەعسی عێراقدا. گفتوگۆی بێروت لەلایەن (دارا تۆفیق)ی ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و ژەنەراڵ (فوئاد عارف)ی نوێنەری بارزانییەوە سەرەو کاری دەکرا. سەر ئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە رێکەوتننامەیەک بوو کە سەرکۆماری عێراق (احمد حسن البکر) لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا لە رادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغداوە خوێندییەوە. بە پێی ئەو پەیمانە، مافی گەلی کورد لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی دەست نیشان کرا.

دەبێت ئەوەش بڵێین کە رژێمی عێراق ماوەیەکی کورت پێش رێکەوتنەکەی ١١ی ئازار هەندێ هەنگاوی بۆ هێور کردنەوەی کورد هەڵنا. "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٢٥ی فێبریوەری ١٩٧٠دا روونی کردەوە کە دان بە (پرۆگرام)ەکەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا دەنێت و هەمان کات "لێ خۆش بوون"ی بۆ ئەو مەدەنی و عەسکەرییانە دەرکرد کە "لە رووداوەکانی ژوورەوەدا" بەشدارییان کردووە. جگە لەوە، روون کردنەوەکە هیوای

چارەسەرێکی ئاشتییانەی کێشەکەی خواست.

## ڕێکەوتننامەی ١١ی ئازار

بە پێویستی دەزانین چەند ووشەیەک دەربارەی ڕێکەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بڵێین:

ئەم بەیاننامەیە لۆمەی ڕژێمە پێشینەکانی عێراق دەکات کە بەرامبەر ئەرکی چارەسەرکردنی کێشەی کورد (ناتوانا) بوون و چارەی بەجێیان بۆ (داوا ڕاستەقینەکان) پێ پەیدا نەکراوە. بەڵام ئەم ڕژێمە بەم ڕێکەوتنە "ئارەزووی ڕاستەقینەیان بە ئیسپات گەیاند". زیاد لەوە دەڵێت:

(شۆڕش "مەبەست شۆڕشی بەعسە"، کە لەبیری شۆڕشگێڕانەی بەعسەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت، پێی وایە مافی نەتەوایەتی حاڵەتێکی بەردەوامی دیمۆکراسیتییە). هەروەها دەڵێت: (ئەم ڕێکەوتنە چەسپاندنی بڕیارەکانی حەوتەمین کۆنگرەی پارتی بەعسە کە لە کۆتایی ١٩٦٨و سەرەتای ١٩٦٩دا گیرا و دانی بەوە دانا کە مەسەلەی خواستە نەتەوەییەکانی کورد لە عێراق دا پێش هەموو مەسەلەیەکی دییە)!

ئەو کۆنگرەیە ئەرکی ئەوەبوو (چارەسەرێکی وا بۆ کێشەی کورد بدۆزێتەوە کە شۆڕشی بەعس تێیدا دەست پێشکەر بێت). جگە لەوە ئەرکی کۆنگرە ئەوە بوو(ڕژێمە شۆڕشگێڕە دامەزراوەکە، پایەدارتر کات).

لەگەڵ ئەوەشدا بەیاننامەکەی ١١/٣/١٩٧٠ هەندە بڕیارێکی دووبارە کردەوە کە ڕژێم پێش ١١ی ئازار بڵاوی کردبوونەوە. لەوانە:

(دان نانی ڕەسمیی بە بوونی نەتەوەی کورد دا. دامەزراندنی زانستگەی سلێمانی. دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد. دان نان بەمافی ڕۆشنبیری و زمانی نەتەوەیی کورد دا. دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد. دامەزراندنی دەزگایەکی چاپەمەنی بۆ بڵاوکردنەوە بەزمانی کوردی. بڵاوکردنەوەی حەوتەنامەیەک و گۆڤارێکی مانگانە بەکوردی. زیاد کردنی پرۆگرامی کوردی لەتەلەفزیۆنی کەرکوک دا و پاشان بکرێتە وێزگەیەکی تەلەفزیۆنی کوردی. جەژنی نەتەوایەتی کورد، نەورۆز، بکرێتە جەژنێکی سەراپای هەموو عێراق. دامەزراندنی پارێزگەیەکی نوێ بەنێوی (دهۆک)ەوە. دەرکردنی یاسای پارێزگەکان. لێ خۆش بوون لە هەموو ئەو مەدەنی و عەسکەرییانەی لە ڕووداوەکانی ژووروودا بەشدارییان کردووە[٦٤٤]. لەبەیاننامەکەدا ئەوەش گوترابوو کە "ئەنجومەنی

سەرکردایەتی شۆڕش پێوەندیی بە بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە و لە سەر ئەم بەیاننامەیە ڕێک کەوتوون"(٦٤٥).

ئەمەش ١٥ بەندەکەی ڕێکەوتننامەکەیە:

١- زمانی کوردیی لەو نێوچانەدا کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن، لەپاڵ زمانی عارەبیدا دەبێتە زمانی ڕەسمیی. زمانی کوردیی لەو نێوچانەدا زمانی دەرز گوتنەوە دەبێت. لە قوتابخانە کوردییەکاندا زمانی عارەبیی وەکو زمانی دووهەم دەخوێندرێت. هەمان کات زمانی کوردی لەهەموو قوتابخانە عارەبییەکانی عێراق دا وەک زمانی دووهەم دەخوێندرێت.

٢- کوردەکان بەشداریی لەهەموو دەستەلاتدارییەکانی حوکومەت دا دەکەن، لەوەزارەتەکان و سەرکردایەتی سوپا و جێگە باڵاکانی دیدا. بۆ ئەم مەبەستە ڕێژەی دانیشتوان و توانای پێویست ڕەچاو دەکرێن.

٣-أ- کار و باری و ێزگەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی کوردی دەدرێتە (بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی کوردیی).

ب- ئەو قوتابییانەی لەخوێندن پچڕاون سەر لەنوێ وەردەگیرێنەوە.

جـ- زیاد کردنی قوتابخانەکان لەنێوچە کوردییەکاندا. تەرخان کردنی زەماڵەی خوێندن لەدەرەوەی وولات بۆ قوتابیانی کورد و، قوتابیانی کورد بە پێی ڕێژەی دانیشتوان لەزانستگە و ئەکادیمییە سوپاییەکاندا وەردەگیرێن.

٤- فەرمانبەرەکان لەنێوچەکوردییەکاندا کورد دەبن، یاخود لەوانە دەبن کە زمانی کوردی دەزانن.

٥- گەلی کورد مافی ئەوەی هەیە ڕێکخراو و داوو دەزگای جەماوەری سەربەخۆی وەکو (قوتابیان، لاوان، ئافرەتان، کرێکاران، جوتیاران، مامۆستایان) دامەزرێنێت.

٦- ئەو کرێکار و فەرمانبەر و کاربەدەستە کوردانەی لەکار دەرکراون، مەدەنی بن یا عەسکەری، دەخرێنەوە سەرکارەکانی خۆیان. لەحاڵەتێکدا گەر جێگەشیان نەبوو، دەبێت ۆیان پەیدا بکرێت.

٧- زەرەر و زیان بۆ ئەو کەسانە ببژێردرێت کە لەنێوچە کوردییەکان دا لێیان کەوتووە. اری دواکەوتووی نێوچەکەش بەهۆی ئەو ڕووداوانەوە ڕەچاو بکرێت. پلانێکی ئابووریی ـراوان دابنرێت و مووچەی خانەنشینیی بۆ ئەو خانەوادانە ببڕدرێتەوە کە لەبزووتنەوە چەکدارییەکەدا قوربانییان داوە... هەروەها بۆ ئەوانەش کە سەقەت بوون، یا توانای

کاریان لێ براوە. خانووبەرە و کار بۆ بێ کاران مسۆگەر بکرێت.

٨- دانیشتوانی عارەب و کورد بگێڕدرێنەوە بۆ ئەو گوندانەی پێشان لێی ژیاون. گەر گوندێکی کوردی لەلایەن میرییەوە بۆ سوودێکی گشتی دەستی بەسەردا گیرا بێت، ئەوا دەبێت لەبریتی وی خەرامان بەدانیشتوانی بدرێت.

٩- بەگەڕ خستنی یاسای چارەسەرکردنی زەوی لەنێوچە کوردییەکاندا. هەڵوەشاندنەوەی پێوەندی دەرەبەگایەتی و بەش کردنی زەوی بەسەر جووتیاران دا. ئەو جوتکارانەی لەسەر وەختی جەنگدا نەیانتوانیوە باج بدەن، چاویان لێ بپۆشرێت.

١٠- دەستووری کاتی بەم جۆرە دەستکاری بکرێت: (میللەتی عێراق لەدوو گەل پێک دێت، کورد و عارەب. ئەم دەستووره دان بەهەموو مافێکی نەتەوایەتی کورد و کەمەنەتەوایەتی‌یەکانی دیدا لە چوارچێوەی عێراق دا، دەنێت. زمانی کوردی لە نێوچە کوردییەکاندا لەپاڵ زمانی عارەبی‌یدا دەبێتە زمانی رەسمی‌ی).

تێبینی- لە حاڵەتی دانانی دەستووری هەمیشەیی‌دا، بەندی ١٠ هەمینی دەستکاری کراوی دەخرێتە نێو.

١١- وێزگەی رادیۆ (مەبەست وێزگە نهێنی‌یەکەی کوردستانە) چەکە قورسەکان، دەدرێنەوە بە میری. بەڵام ئەمە پاش جێ بەجێ کردنی تەواوی بەندەکانی رێکەوتنەکە بەئەنجام دەگەیەندرێت.

١٢- یەکێک لە جێگرەکانی سەرەک کۆمار کورد دەبێت.

١٣- یاسای پارێزگەکان بەجۆرێکی وا کە لەگەڵ ئەم رێکەوتننامەیەدا بگونجێت، دەستکاری‌ی دەکرێت.

١٤- پاش سەرژمێرێکی سەراپایی، پارێزگە کوردییەکان و بەڕێوەبردنیان یەک دەخرێت، تا گەلی کورد بتوانێت خۆبەخۆ خۆ بەڕێوە بەرێت. سامانی زەوی‌ی لەم نێوچەیەدا تایبەتمەندە بەحوکومەتی مەرکەزییەوە.

١٠- گەلی کورد بەپێی رێژەی دانیشتوان، لەدەستگا تەنفیزی‌یەکاندا بەشداری‌ی دەکەن[٦٤٦].

بەیاننامەی ١١ی ئازار بەم بانگەوازە کۆتایی دێت:

ئەم دەستکەوتانەی شۆڕش (مەبەست شۆڕشی بەعسە) بە بەرهەمی هێنان، تەنها هاندەرێکە بۆ ئەوەی لەسێبەری ئەم وولاتەدا کە هەموومانی پێ گەیاندووە، لە سێبەری

یەکێتی گەلە سەروەرەکەی دا بەهەمـوو ئامانجێکی نەتەوایەتیتـان بگەن. مێژوو بە ئیسپاتی دەگەیەنێت، کە ئێوەی کورد نەلە ڕابووردوو نە لەداهاتوو دا، برایەکی وا دڵسۆز و پشت پێ بەستوو و میهرەبانی وەکی گەلی عارەبتان نەبووە و نابێت)(٦٤٧).

بارزانیی بەبروسکەیەک ڕوونی کردەوە کە: (خۆی و حیزبەکەی و گەلی کورد پشتگیری بەیاننامـەکـە دەکـەن و بە ئەرکی خۆیانی دەزانن لەگەڵ حیزبی بەعس و حوکومەتی نیشتمانیی‌یدا هاریکاریی بۆ چەسپاندنی ڕێکەوتننامەکە بکەن)(٦٤٨).

صدام حسين تكريتي، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و جێگری سکرتێری گشتی حیزبی بەعسی عێراق، کە دەوری سەرەکی لە گفتوگۆی کورد دا دیت گـوتی: (برایەتی ڕاستـەقـینەی کـورد و عـارەب لەو ڕۆوە لە عـێـراق دا دەست پێ دەکات)(٦٤٩).

هەروەها گوتی: (ئەم چارەسەرییە تەنها پشوویەکی شەڕ ڕاگرتنی وەکو جاران نییە، بەڵکە کەنار خستنی تەواوی هەموو کێشەیەکی سیاسیی نێوان کورد و عارەبە و بۆ هەتا هەتایە بەرقەرار دەبێت)(٦٥٠).

هەرچەندە (مرتضى عبـدالباقي) ئەندامی "ئەنجومـەنی سەرکـردایەتی شـۆڕش" ئەوەی بەدرۆ خستەوە کە گوایە هیچ بەندێکی پەنهانیی لە ڕێکەوتنەکەدا هەبێت، بەڵام ئەوەی ڕەت نەکردەوە کە هەندەک ڕێکەوتن هەیە و لەبەیانە ڕەسمییەکەدا بڵاونەکراونەتەوە، بۆ نموونە ڕێکەوتن لەسەر "چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی هێزی پێشمەرگە"(٦٥١).

(دوکتۆر مەحمود عەلی عوسمان)ی ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە ٨ی تەموزی ١٩٧٠دا بە پێچەوانەی ئەوەوە، لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری دا ڕوونی کردەوە کە (بەیاننامەکە چەند بەندێکی پەنهانیی تێدایە کە بڵاوکردنەوەیان ئێستا لەبار نییە).

## هۆکارەکانی ڕێکەوتنەکە

ئەم ڕێکەوتنە ڕووداوێکی گەورەی لە مێژووی کـورد هێنایە گـۆڕێ. زانینی مـاک و هۆ سەرەکییەکانی ئەو پێکهاتنە بۆ ئێمە زۆر پڕ بایەخە. بۆیە بە پێویستی دەزانین هاندەرە سەرەکییەکانی دەست نیشان بکەین:

١- خۆڕاگـرتنی هێـزی سوپایی بزووتنەوەی ئازادیخـوازانەی کـورد و ئەو سـەرکـەوتنە مەزنانەی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستـان لەهەمـوو بەرەکـانی جەنگدا بەرامبـەر شاڵاوی

سوپای عێراق بەدەستی هێنا.

٢- سەرکردەکانی بەعس کە هەندێکیان لەتێڕوانینی واقیعی گەلی کوردەوە و هەندێکی دیکەیان لەترسی هۆکاری لەق کردن و روخاندنی رژێمی بەعس، ناچار بوون هەڵوێستێکی وا وەبەر بگرن. لەراستی‌یدا پێشان "تێڕوانینێکی دواکەوتووانە باڵی کێشا بوو بە سەر سەرجەمی هەڵوێستە سیاسی و فیکری‌یەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی عارەب دا بەرامبەر کێشەی کورد"(٦٥٢). وەکو سیاسەتمەداری لوبنانی (غالب یاغی)پێ‌ی لێنا. هەروەها (Dr. Arnold Hottinger) چاک راستی‌ی پێکابوو کە گوتبووی "بەکری سەرکۆماری عێراق لە ١٩٦٨دا واقیعانە تر دەیڕوانی‌یە کێشەی کورد، وەک پێنج ساڵ لەوەو بەر(٦٥٣).

سەرئەنجامی ئەو تێڕوانینە واقیعی‌یە ئەوە بوو:

لەکۆنگرەیەکی هەرێمانەی حیزبی بەعس دا لەبەغدا لە ١٧-٢٤ی فێبریوەری ١٩٧٠دا (کەمیشێل عەفلەقی سکرتێری گشتی‌ی حیزبی بەعس بەشداری‌ی تێدا کرد) بڕیار درا کە ئۆتۆنۆمی بەکورد بدرێت(٦٥٤).

کۆنگرەیەکی نەتەوایەتی حیزبی بەعس کە لە بەغدا لە ١-١٠/٣/١٩٧٠ی خایاند ئەم بڕیارەی دا:

(چارەسەرێکی ئاشتی‌یانە و دیموکراسی‌یانە بۆ کێشەی کورد لە چوار چێوەی کۆماری عێراق دا و لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی، دەبێت پێش هەموو کردەو کۆششێکی حیزب بخرێت، تا بتوانێت هێزە چەکدارەکانی و ووزە ئینسانی و ئابووری‌یەکانی بۆ بەربەرەکانی خەتەری زایۆنیزم بەگەڕ بخات وڕێ لەپیلانەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان لەنێوچەکەدا، ببەستێتەوە).

لەبەر رۆشنایی روونکردنەوە جوداوازەکانی سەرکردەکانی بەعس دا، مرۆ دەتوانێت وا بیر بکاتەوە کە هەندێکیان و (لایەنگرانیان) پێ‌یان وایە کە کورد مافی چارەنووسی خۆی پێ دەبڕێت. بۆ نموونە (میشێل عەفلەق) لە ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٩دا لە گۆڤاری (الاحرار)ی لوبنانی‌یدا، کە ئۆرگانی مەرکەزی‌ی حیزبی بەعسە، ئاوها دەربارەی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد دەنووسێت:

(بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد شتێکی رەوایە و بواری تاوانبار کردن و هێرش ناهێڵێتەوە. سەرکەوتن و هۆ و ماکەکانی خەباتی بەئیسپاتی گەیاندووە، نە دەستکردی

ئیمپریالیزمە و نەبەرهەڵست و بەرپێ گری شۆڕشی عارەبە)(٦٥٥). (منذر عریم)ی سەرۆکی دەزگای ڕاگەیاندن و کادیرێکی باڵادەستی بەعس ئاوها دەنووسێت:

(ڕژێمی عێراق ڕژێمێکی شۆڕشگێڕ و پێشکەوتووی خاوەن تیۆرییەکی زانستانەیە، بۆیە دەتوانێت دەستکەوتی مێژوویی گرنگ بەکورد ببەخشێت. ئەو دەستکەوتانە بە مافی چارەنووسی گەلی کورد دەست پێ دەکەن. بەو پێیە ڕژێم هەموو بوارێکی بۆ گەلی کورد فەراهەم کردووە تا یەکێتی خاک و نەتەوەکەی بەڕاست بگێڕێت، بۆ ئەوەی نەتەوەی کورد پێکڕا لەگەڵ نەتەوەی عارەبی برای دا، بتوانێت دژی پارچە پارچەیی، ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی خەبات بکات)(٦٥٦). تا چەند ئەم ووشە شیرین و ئاڵ و واڵایانەی سەرکردەکانی بەعس کاری پێ دەکرێت، مەسەلەیەکە کردارەکانی بەعس بە ئیسپاتی دەگەیەنێت!

٣- هۆیەکی دی ڕێکەوتنەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، نارەزایی گەلی عێراق بوو بەرامبەر جەنگی کوردستان و سەر ئەنجامە تاڵەکانی. جەنگ ئابووری عێراقی دارزاند، ئەفسەرە سەرکێشەکانی سوپا بە پشتگیری هێزی رۆژئاواییەکان، هەوڵی هەڵتەکاندنی ڕژێمی بەعسیان دەدا، تا نەتوانرێت ڕێکەوتنێک لەگەڵ کورد دا بە ئەنجام بگەیەندرێت. کە لە ٢٠و ٢١ی کانوونی دووهەمی ١٩٧٠دا گفتوگۆ لەگەڵ بارزانی‌یدا دەستی پێ کرد، هەندێ لەئەفسەران، بە ڕێبەرێتی ژەنەراڵ (عبدالغني الراوي) نەخشەی کودەتایەکیان کێشا. بەعسییەکان پیلانەکەیان هەست پێ کرد و سەرکوتیان کرد. الراوي بۆ ئێران هەڵهات. ٤٤ کەس بەداردا کران. قسەکەرێکی حوکومەت گوتی:

(ئاشکرا کردنی پیلانەکە، هیوا رمانێکی گەورەی دەزگای جاسووسی‌ی "سیا"ی ئەمریکی بوو)(٦٥٧).

٤- پێوەندی‌یەکانی نێوان ئێران و عێراق دوژمنانە بوو. لەوەدا بوو هەر ساتێک بێت بەیەکدا بدەن. لە ٨ی فێبریوەری ١٩٧٠دا گرژی نێوانیان گەیشتە چڵەپۆپەی. بەکر ئێرانی بەوە تاوانبار کرد کە گوایە نەخشەی هێرشێکی سوپایی کێشاوە. سەرەک وەزیرانی ئێران (عباس هويدا) لەوەرامدا لە پەرلەماندا گوتی (کۆکردنەوەی هێزە شەڕکەرەکانی عێراق لەسەر سنووری ئێران، تەنگ پێ هەڵچنینی ئێران نیشان دەدات).

وەزیری دەرەوەی ئێران (اردشير زاهدي) ڕای گەیاند: (تەنها گوللەیەک بەدیوی ئێران دا بتەقێندرێت، ئەو جێگەیە دەکەینە کەلاوە کە گوللەکەی لێوە هاتووە)(٦٥٨).

ڕۆژنامەکانی ئێران لە ٩ی فێبریوەر دا (بۆ نموونە "مرد مبارز"، "کیهان"، "مهر ایران") بەتوندی هێرشیان کردە سەر عێراق. ڕۆژنامەی "پارس" کە لەشیراز دەردەچێت، لە ١٢ی فێبریوەری ١٩٧٠دا (بەکر)ی سەرکۆماری عیراقی بە "خوێنڕێژ" نێو دەبرد[٦٥٩].

تورکیای دوژمنە تەقلیدییەکەی کورد ئەو ئاڵۆزییەی نێوان عێراق و ئێرانی بەمەترسییەک بۆ سەرخۆی دەزانی. کاتێک وەزیری بەرگری عێراق (صالح مهدی عماش) چووە تورکیا، تا تورکیا ببێتە دەلالی نێوانیان، زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێ کرا. (عماش) لە ٤/٢/١٩٧٠دا گەڕایەوە بەغدا و گوتی (تورکیا زۆر بەتەنگ عێراقەوەیە)[٦٦٠].

حەوتەنامەی "اطلاعات" لە ١٢/٢/١٩٧٠دا دەنووسێت کە تورکیا ڕۆڵی ڕێکخەرێک لەنێوان ئێران و عێراق دا دەبینێت. دەلالی ڕەسمی (Orhan Eralp)ی سکرتێری گشتیی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا بوو، لە ٥/٢/١٩٧٠دا گەیشتە تاران. بۆ تورکیا ئاشکرا بوو بوو کە عێراق نیازی وایە بەپەلە ئۆتۆنۆمییەک بەکورد بدات و کاری ئاوهاش بۆ تورکیا خەتەرناک دەبێت[٦٦١].

بەلام وا پێ دەچێت تورکیای "کۆتری ئاشتیی" چاک لەشەقەی باڵی نەدابێت! چونکە ڕۆژنامەی "مهر ایران" لە ١٥/٢/١٩٧٠دا دەنووسێت (ئێران عێراق بەهۆش دێنێتەوە، هەر پیلانێک لەکەنداوی فارس دا بتەنێت، بەوپەڕی هێزەوە دژی دەوەستینەوە).

جگەلەوە ڕۆژنامەی "پارس" لە ٢٠/٢/١٩٧٠دا دەنووسێت (ئێران Eralpی ئاگادار کرد کە لەحاڵەتی پێویست دا هێز بەکار دێنێت تا عێراق لەباری ڕاستەقینە تێ بگەیەنێت).

لە ٢ی ئازاری ١٩٧٠دا وەزیری ڕاگەیاندنی ئێران (جواد منصور) وێزگەیەکی لەشاری (سنە)ی کورد دا کردەوە، تا بەکوردیش پروپاگەندە دژی عێراق بکەن.

لەو حاڵ و بارەدا بۆ عێراق زەحمەت بوو شەڕی دژ بە کورد درێژە پێ بدات.

٥- هاندەرێکی گەورەی ئەو ڕێکەوتنە و کەوتنە نێوان عێراق و کوردەوە شوورەویی بوو. شوورەویی کە لە ١٩٥٨ەوە پێوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ عێراقدا هەیە، نەیدەتوانی بەردەوام چەک بۆ عێراق بنێرێت و کۆمەکی ئابووری مسۆگەر بکات و کوردیشی لێ نەڕەنجێت و دوژمنایەتی پێ نەبڕێت. جگەلەوە شوورەویی دەیزانی ئەو شەڕە بەردەوامەی کوردستان ڕەنگە لێکدانی عێراق و ئێرانی بەدەمەوە بێت، کە ئەمە

شتێک بوو دوور لەبەرژەوەندیی ئەو. چونکە لێکدانی لەو بابەتە بەهەموو پێوەرێک دەست تێکەڵ کردنی وولاتەکانی سەنتۆ و ناتۆی لێ شین دەبووەوە. جگە لەوە وولاتە سۆسیالیستەکان پەیمانی ئابووری‌یان لەگەڵ عێراق دا بەستبوو. بۆ نموونە پۆڵۆنیا لە ٢٧/ ٢/ ١٩٧٠دا پەیمانێکی لەگەڵ عێراق دا مۆر کردبوو تا (سلفات و فۆسفات)ی عێراق بەرهەم بهێنێت(*).

دیارە بەرهەم هێنانی کانەکان ئارامی و هێمنی و دەوڵەتێکی پتەوی گەرەکە.

ئێوارەی ١١/ ٢/ ١٩٧٠ رادیۆی مۆسکۆ هێزەکانی رۆژئاوای تاوانبار کرد، کە گوایە گیانی دوژمنایەتی لەنێوان ئێران و عێراق دا پەرە پێ دەدەن تا وەکو خۆیان دەستکەوتێک بەدەست بهێنن.

## دەنگدانەوە و کاریگەریی رێکەوتنەکە

لێرەدا کەمێک دەربارەی دەنگ دانەوە و کاریگەری بەیانەکە لەنێوەوە و دەرەوەی وولات دا، دەدوێین:

گەلی عێراق شادی و پشتگیری‌ی خۆی بە خۆپێشاندانی فراوان نیشان دا. کوردەکانی سوریا بروسکەیەکیان بۆ بەکر لێ داو پشتگیری و شادی‌ی خۆیان ئاشکرا کرد. ئەوەشیان دەربڕیبوو کە گەلی کورد لەسوریا دا لەژێر باری زوڵم و ستەم و تیرۆر دا دەناڵێت(٦٦٢).

کوردەکانی لوبنان خۆپیشاندانێکیان لەبەردەم باڵوێزخانەی عێراق دا لە بێروت ساز دا و بەئاشکرایی تەواو پشتگیری‌ی خۆیان دەربڕی(٦٦٣).

تاقمەکەی تاڵەبانی‌ی کە تا ١١ی ئازاری ١٩٧٠ شان بەشانی ئۆردوی عێراق دژی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد دەجەنگان، تووشی سەر لێ شێواوی‌یەکی عەنتیکە هاتن. خودی تاڵەبانی‌ی چاری ناچار لایەنگیری‌ی خۆی بۆ رێکەوتنەکە دەربڕی(٦٦٤). نێوبراو بە (کۆمیتەی مەرکەزی‌ی پارتی دیمۆکرات "تاقمی تاڵەبانی") بروسکەی پشتگیری‌یان بۆ بەکر لێدا(٦٦٥).

(الحزب الوطني الديمقراطي)ی کامل چادرچی، رێکەوتنەکەی بە (فراژو بوونی ئازادی و دیموکراسی) هەڵسەنگاند(٦٦٦).

---

(*) بروانە رۆژنامەی "الجمهوریە"، العدد ٦٩٥، بغداد، ٢٨/ ٢/ ١٩٧٠.

وەکـــو یەکـــەم ڕێکـــخـــراوی کـــوردی هەندەران، (نـــوکـــســـە) لە ئـــۆرگـــانەکـــەی (KURDISTAN INFORMATION) دا، (بڕوانە ژ. ١٤-٧٠/٣/٢١) ڕێکەوتننامەکەی هەڵسەنگاند. (KURDISTAN INFORMATION) سەرژمێرێکی هەر پێنج ڕێکەوتن و شەڕ ڕاگرتنەکانی پێشینی نیوان کورد و عێراقی کردبوو، کە هیچیان نەبرانە سەر

(KURDISTAN INFORMATION). ئەوجا دەڵێت:

(ئەم پێـــداچوونەوەی ڕابووردوو بەشی هێندە ناکـــات کـــە بەگـــەش بینی تەواوەوە تێبڕوانین... بەڵکە پێویستە بیرێکی لێ بکەینەوە. هەموو شەڕ ڕاگرتنەکانی پێشینیش ڕێکەوتنێکی لەم بابەتەیان لەپاڵ دابوو، بێ ئەوەی ئەو کاتانە هیچ پێڕەوی‌یەکی‌یان لێ بکرێت. هەنگاوەکانی پاش ئەمە نیشانی دەدەن ئاخۆ ڕژێمی عێراق بەتەنگ ئەرکەکانی سەر شانی‌یەوەیەتی بەرامبەر بەکورد، ئاخۆ چارەسەرێکی ئاشتی‌یانە دەکرێت؟؟؟)

(لەگەڵ ئەو بۆ چوون و هەڵسەنگاندنە گوماندارەی حاڵ و بارەکە دا، هێشتا لەدڵەوە پیرۆزبایی ئەو ڕێکەوتنە دەکەین و ئومێد دەکەین تاسەر بێت).

سەرپاکی وولاتە عارەبی‌یەکان جگە لە (سوریا)، پیرۆزبایی‌یان لە عێراق کرد. ناصر و نومەیری یەکەم کەسانێک بوون(٦٦٧). میری کویت(٦٦٨). فەرمانداری (رأس الخیمة)(٦٦٩). و (شیخ صقر محمد القاسمي) پیرۆزبایی‌یان کرد. (عارف ظاهر)ی یاریدەدەری سکرتێری گشتی‌ی کۆمیتەی دەوڵەتە عارەبی‌یەکان پیرۆزبایی کرد(٦٧٠). (احمد بهاءالدین)ی سەرۆکی ڕۆژنامەنووسانی عارەب گوتی (چارەسەری کێشەی کورد هیوای هەموو عارەبێکی پێشکەوتوو و ڕووناک بیر بووە)(٦٧١).

یەکەم وولاتی عارەب کە دژی ڕێکەوتنەکە ویستایەوە سوریا بوو، کە لە وێزگەی دیمەشقەوە هێرشی توندی کردە سەر. هۆ و ماکی ئەوەش لەهەڵوێستی ڕەق و شۆڤێنیستانەی ڕژێمی بەعسی سوریا دا بەرامبەر بەکورد، دەدۆزرێتەوە. دژ یەکی و دوژمنایەتی جووتە ڕژێمی بەعسی سوریا و عێراقیش هۆیەکی دی‌یە.

نێوبراو بە (الوحدویین الاشتراکیین)یش لەسوریا، قاپی ڕێکەوتنەکەیان گرت. لەبەیاننامەیەکدا دەڵێن: (ڕێکەوتنەکە بەنیازە لەهەموو عێراقدا زمانی کوردی بخوێندرێت، ئەمە یانی بەکوردی کردنی هەموو عێراق)(٦٧٢). عەقڵیشیان بەوە شکاوە بڵێن: (ئەو ڕۆژەی کە کوردەکانی سوریاش پشتگیری خۆیان بۆ ئۆتۆنۆمی "شیمال"ی

عێراق دەربڕن، بەدوور نی‌یە)[٦٧٣]. بەیانەکە لە سەری دەڕوات و هێرش دەکاتە سەر ڕژێمی عێراق و دەڵێت:

(هیچ بەربەرەکانی‌یەکی شالاوی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم ناکات. بەڵکە تەنها دژی عارەب هەڵدەسوڕێت، وەکو خاکی کورد تەنها لەنیشتمانی ئێمەدا "مەبەست نیشتمانی عارەبە" هەبێت)[٦٧٤].

ڕۆژنامەی "الحیاة"ی لوبنانی، کە ڕۆژنامەیەکی سەر بە ڕۆژئاوایە، هێرش دەکاتە سەر ڕێکەوتنەکە. پێی وایە (ئەو ئۆتۆنۆمی‌یەی حیزبی بەعس بەکوردی داوە وەکو ئەو بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکان وایە کە دەوڵەتی ئیسرائیلی لەنیشتمانی عارەب دا دامەزراند)[٦٧٥]. بە پێچەوانەی ئەو ڕایەوە "الحیاة" لەسەر وەختی شەڕ دا هێرشی دەکردە سەر ڕژێمی عێراق. ئێستا پیاو دەزانێت ئەو کاتە "الحیاة" چەندە ڕاستگۆ بووە کە لەسەر کوردی هەڵدەدایە.

لەوولاتەکانی بەرەی ڕۆژهەلات، پێش هەمووان شوورەوی پیرۆزبایی ڕێکەوتنەکەی کرد. ئەلیکسی کۆسیگین و نیکۆلای بۆدگۆرنی بروسکەیەکیان بۆ بەکر نارد: بەشێک لەو بروسکەیە دەڵێت:

(ئێمە باوەڕمان وایە، بەگەڕ خستنی ئەم ڕێکەوتنە گشتی‌یە، یەکێتی نیشتمانی‌ی و دۆستایەتی نێوان هەردوو گەلی برا، عارەب و کورد، لەکۆماری عێراقدا بەتین تر دەکات. چارەسەرکردنی ئاشتی‌یانەی کێشەی کورد لەعێراقدا پایەی جیهانی‌ی حکومەتی عیراق بڵند تر دەکات)[٦٧٦].

ڕۆژنامەی (IZVESTIA) گوتارێکی (Kodria Fistev) ی بڵاوکردەوە، کە ڕێکەوتنەکە بە (پێ کەوتنی زەبرێکی گەورە لە ئیمپریالیزم) لەقەڵەم دەدات[٦٧٧]. (Alexej Vasilev) لە (PRAWDA) دا دەنووسێت (گەلانی سۆڤیەت کە هەمیشە لەگەڵ چارەسەرێکی ئاشتی‌یانە و دیموکراسی‌یانەی کێشەکەدا بوون، لەم ڕێکەوتنە پیرۆزبایی دەکەن) (پراڤدا ١٥/٣/ ١٩٧٠). ڕۆژنامەی (Neues Deutschland)ی ئۆرگانی پارتی سۆسیالیستی یەکگرتووی ئاڵەمانیای ڕۆژهەلات لە ١٣/٣/ ١٩٧٠دا ئاوها دەربارەی ریکەوتنەکە دەنووسێت (پتەوکردنی شوێن پێی کۆماری عێراقە لەخەباتیدا دژی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمی نوێ).

ڕۆژنامەی (RONDONK SCHIMAN) ی ئۆرگانی پارتی کرێکارانی کۆریا پشتگیری چارەسەری کێشەی کورد دەکات(٦٧٨).

(World Council of Peace) لە هیلسنکی لە بلاوکراوەی (Information Bulletin)دا لە ٣٠/٢/١٩٧٠(×).دا "لەدڵەوە" پیرۆزبایی لەرێکەوتننامەکە دەکات و بە "ڕووداوێکی پڕ بایەخ"ی نێو دەبات، بۆ "یەکێتی هەردوو گەلی (کورد و عارەب) لەخەباتیاندا دژی ئیمپریالیزم".

سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی نێوبراو ڕێکەوتنەکە بە "شادییەکی مەزن" نێو دەبات و پێی وایە "زەبرێکی کوشندە بوو لە ئیمپریالیزم و هێزە کۆنەپەرستەکان درا)(٦٧٩).

پارتە کۆمۆنیست و سۆسیالیستەکانی جیهانی عارەبیش پشتگیریی خۆیان لەرێکەوتنەکە دەربڕی. سکرتێری یەکەمی پارتی کۆمۆنیستی عێراق (عەزیز محەمەد) بەختەوەریی بۆ گەلی عێراق و حکومەتەکەی بە ئاوات خواست(٦٨٠).

ڕۆژنامەی(نضال الشعب)ی ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی سوریا، لە ژمارەی کۆتایی مانگی مارتی ٩٧٠دا ڕێکەوتنەکەی بە (سەرکەوتنێکی مێژوویی عارەب و کورد) نێو برد.

ڕادیۆی (پەیکی ئێران) ئۆرگانی پارتی تودە "لەناخی دڵەوە" پیرۆزبایی لەرێکەوتنەکە کرد.

## هەڵوێستی بەرەی ڕۆژئاوا و لایەنگرانیان

ڕژێمی تورکیا هیچ ڕوونکردنەوەیەکی ڕەسمیی دەربارەی ڕێکەوتنەکە دەرنەبڕی، بەڵام دوو ڕۆژنامەنووسی نارد بۆ عێراق بۆ بەشداریی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیی بەکری سەرکۆمار لە ٢٠ی تەموزی ٩٧٠دا وبەدەستی ئانقەست پرسیاری بێ مانا و بێ سەر و پێ و ناقۆڵایان دەکرد. لەپرسیارێکیاندا دەربارەی "مافی تورکومانەکان" لە عێراق دا، بەکر گوتی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیارێکی دەربارەی مافی تورکومانەکان بلاوکردۆتەوە). لە پرسیارێکی دیدا دەربارەی هەڵوێستی عێراق بەرامبەر کوردەکانی تورکیا و ئێران، بەکر گوتی (مەسەلەی کورد لەعێراق دا کێشەیەکی نێوخۆیەو لەگەڵ

---

(×) وا پێ دەچێت ئەم مێژووە هەڵەیەکی چاپ بێت، چونکە بەیاننامەکە ١١ ڕۆژ پاش ئەم مێژووە بلاوکراوەتەوە. ڕەنگە ٣٠/٣ بێت.

کوردی ئێران یا تورکیا دا پێوەندی‌یدار نی‌یە)(٦٨١). لەو کۆنگرە رۆژنامەنووسی‌یەدا بەکر دەرفەتی ئەوەی لەکیس نەدا بەشان و باڵی "پێوەندی‌ی دۆستایەتی تورکیا و عێراق"دا هەڵداتەوە(٦٨٢).

رژێمی ئێرانیش هیچ روونکردنەوەیەکی رەسمی‌ی بڵاو نەکردەوە. رۆژنامەکانی ئێران پیرۆزبایی‌یان لەکورد کرد بەبۆنەی سەرکەوتنیانەوە. دیارە بەرامبەر رژێمی بەغداش رەشبینیان دەکردن. بۆ نموونە رۆژنامەی "پارس" دەنووسێت:

(ئێمە بەسەرکەوتنی کورد شادین، چونکە برامانن، بەڵام ئێمە ترسی ئەوەمانە ئاخۆ رژێمی عێراق رێزی رێکەوتنەکە دەگرێت؟ یاخود ئایا ئەو هەموو گفتانەی نادات بەدەم شەپۆڵی دیجلەوە؟)(٦٨٣).

گۆڤاری "اطلاعات"یش دەنووسێت (کوردەکان بەخۆڕاگری و قوربانی‌ی دان ئەم سەرکەوتنەیان بەدەست هێنا، هەقیانە، بەڵام پرسیارێک هەیە، ئایا تاکەی رژێمی بەعس بۆ ئەم رێکەوتنە بەئەمەک دەمێنێتەوە؟)(٦٨٤).

رۆژنامەی "آیندگان"یش هەمان رای دەربڕیبوو (ئێرانی‌یەکان بەسەرکەوتنی برا ئاری‌یە کوردەکانیان دڵشادن. بەهیواین کە بەعسی‌یەکان خاوەنی قسەی خۆیان بن)(٦٨٥).

رۆژنامەی "خاک و خون"ی ئۆرگانی حیزبی "پان ایرانیست" کە تاکە رۆژنامەی ئۆپۆزیسیۆن بوو (ئێستاکە لەکار وەستاوە)، دەنووسێت: (رژێمی کەمایەتی لەعێراق دا، ناچار بوو لەبەر دەم خواستی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی برا کوردەکانی ئەو دیو سنوورمان دا بچەمێتەوە)(٦٨٦).

رۆژنامەی "کیهان"یش لە ١٢/٣/١٩٧٠دا رای لەو بابەتەی نووسیبوو.

رۆژنامەی ئیسرائیلی‌ی (The Jerusalem Post) رێکەوتنەکە واقیع بینانە شی دەکاتەوە و پێی وایە (سەرکەوتنێکی تاکتیکی و سیاسیی کوردەکانە)(٦٨٧).

ئیمپریالیزمی رۆژئاوا و چاپەمەنی‌یەکانیان بەو رێکەوتنە زەبرێکیان پێ کەوت. رێکەوتنەکە رایچڵەکاندن و پێ داگرتنی کورد بەلایانەوە تا ڕادەیەکی چاوەڕوان نەکراو مەزن بوو. رادیۆی (بی. بی. سی) لەندەن (لە پرۆگرامە فارسی یەکەیدا) لە ١١/٣/١٩٧٠دا ئاوها دەڕوانێتە رێکەوتنەکە:

(رووداوێکی مێژوویی پڕ بایەخە لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا).

هەندێ ئۆرگانی راگەیاندنی رۆژئاوا دژایەتی خۆیان بەزەقی‌ی ئاشکرا کرد. بۆ نموونە، لەژێر سەردێری (Kirkuk Oil and United Nations)دا رۆژنامەی (The Observer) لە ١٩٧٠/٣/١٥دا ئاوها دەنووسێت:

(کانە نەوتەکانی کەرکوکی ژووروی عێراق کە ملیۆنەها پاوەند نرخیانە، رەنگە بەپێ‌ی سەرئەنجامی ئەو رێکەوتنە دڵتەزێنەی حەوتووی پێشوو، بکەوێتە ژێر دەستەڵاتی کوردەکانەوە. بانگ لەنەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێت بەگورجی فریا کەون! وادیارە چارەنووسی کەرکوک یەکێکە لەو کێشە سەرەکی‌یانەی لەگفتوگۆی نێوان کورد و بەغدا دا بێ چارەسەر دەمێنێتەوە).

رۆژنامەکە بێ پەردە دێتە گۆ و ئارەزووی بێ چەند و چوونی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌ی ئاشکرا دەکات، کەدەست بەسەر دا گرتنی نەوتی کوردە. ئەو ئارەزووە سیاسەتی دێرینی ئیمپریالیزمە. دەستەڵات و دەست بەسەرداگرتن، تا تاڵانی‌یەکەی دەست کەوێت.

سەرمایەدارە ملیاردێرەکانیش تەواو وەکو (The Observer) ئەو زەبرەیان دەدیت، بۆیە بەهەموو شێوەیەک هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیانیان دەدا.

هەتا ئەورۆکە ئەو سەر ژمێرەی بریار بوو لە (کەرکوک)دا بکرێت، نەکراوە. ئیمپریالیستەکان هەوڵ دەدەن واقیعی کوردانەی کەرکوک بە درۆ بخەنەوە، تا بتوانن دەست بەسەر داهاتی نەوتیدا بگرن. (ئەدمۆنس)[٦٨٨]ی پیرە نوێنەری یئیمپریالیزمی ئینگلیزی‌ی لە کوردستانی پاش یەکەم جەنگی جیهانی‌یدا، لە ١٩٦٦/١٠/٢٥دا لە سیمینارێک دا کە لە (Royal Central Asian Society) لە لەندەن پێشکەشی کردبوو[٦٨٩] گوتبووی (هەر رژێمێکی عێراقی، کەرکوک بخاتە ژێر دەستی کوردەوە، دەستەڵات لەدەست دەدات)[٦٩٠]. بۆیە هەتا ئەورۆ بەکردار هەوڵ دەدرێت لەرێگەی گواستنەوەی دانیشتوانی کوردەوە و نیشتەجێ کردنی عارەب و بێگانەی دی‌یەوە، کەرکووک بەعارەب بکەن. ئێمە گوتە رەوانەکەی ژەنەراڵ بارزانی‌ی بەگوێ‌ی هەموو ئیمپریالیزم و گەراکانیان دا دەدەینەوە. کە گوتی:

(کەرکوک کورد بووە و، کوردە و، بەکوردی دەمێنێتەوە، ئەگەر هەموو دانیشتووە کوردەکانیشی بەزۆر دەربپەرێنن).

بارزانی‌ی پشت ئەستوور بە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد و هەموو هێزە نیشتمان پەرەوەرەکان، هەروا لەگۆترە ناڵێت و دەزانێت مەبەستی چی‌یە.

رۆژنامەی (Die Zeit)ی ئاڵەمانی دەربارەی ڕێکەوتنەکە دەنووسێت:

(... گەلەک جار ڕێکەوتن و شەڕ ڕاگرتنی وەک ئەم دواییە، تەنها بۆ فریو دانیان بووە)[٦٩١].

(Die Zeit) ڕاست دەکات. بۆیە تا ڕادەیەک خانە گومانین و سوورین لەسەر ئەوەی هێزە جەنگاوەرەکانمان بمێننەوە. (بڕوانە روون کردنەوەکەی نوکسە لە ٢١ی ئازاری ١٩٧٠دا)[٦٩٢].

رۆژنامەی (Time)ی ئەمریکی، ڕێکەوتنەکە بە "خەتەر"ێک بۆ سەر ئیسرائیل[٦٩٣]. دەبینێت. ئەو "خەتەر"ە لەلایەن ئیسرائیلەوە نە پشتگیری‌ی لێ کراو نە بەدرۆ خرایەوە.

رۆژنامەی (DE TIJD)ی هۆڵەندی دەنووسێت گوایە ڕێکەوتنەکە بە تێکەوتنی شوورەوی‌ی و لە "مۆسکۆ" بە ئەنجام گەیشتووە[٦٩٤].

ڕاستە شوورەوی تا ڕادەیەک کەوتە نێوانەوە، بەڵام ڕێکەوتننامەکە لە کوردستان، لەبەغدا و لوبنان، نەک لەمۆسکۆ، بە ئەنجام گەیشتووە[٦٩٥].

رۆژنامەی (Financial Times)ی ئینگلیزی لە ١٦/٣/١٩٧٠دا بە گومانەوە دەڵێت (ئاخۆ ڕێکەوتنەکە "ئاشتی‌یەکی هەمیشەیی" بەرپا دەکات؟)

رۆژنامەی (Neue Zürcher Zeitung) لە ١٣/٣/١٩٧٠دا دەنووسێت (ڕەنگە ڕێکەوتنەکە تاکتیکێکی عێراق بێت). ئەم رۆژنامەیە کە ئاگادارترین رۆژنامەیەکی ئەورووپای رۆژئاوایە لەتێڕوانینی کێشەی کورد دا، دەڵێت (بەغدا لەم ڕێکەوتنەدا، بەپلەی یەکەم ویستوویە دەستی ئێران لەنێو "تیرەی کورد" و خاکی عێراق ببڕێت)، هەمان کات عێراق بەهیوایە (وەکو رۆژنامەکە دەڵێت) کە "سێ ملیۆن کوردی ئێرانیش لەلایەنی خۆیانەوە داوای ئۆتۆنۆمی بکەن و ئاڵۆزی و گێچەڵێک بۆ سیاسەتی نێوەوەی شا بسازێنن".

ئەم بۆ چوونە کە لەگەڵ بۆ چوونی (The New York Times) دا یەک دەگرێتەوە[٦٩٦] دوور نی‌یە ڕاست بێت. ئەم ڕایانە لەگەڵ گوتەکانی هەندەک کاربەدەستی باڵادەستی بەعسیش دا دژ بەیەک نین[٦٩٧]. بەڵام رۆژگار ئەوەی بە ئیسپات گەیاند کە کوردەکان سەوداسەری بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیانن و قەرەقۆزی دەستی هێزە بێگانەکان نین. بەڵکە ئازادیخوازی ئامانج دیارن.

دۆستەکانی کورد لەجیهانی رۆژئاوادا بەشداری‌ی شادی‌ی ئەو ڕێکەوتنەیان کردین.

ئەندازیاری ئینگلیز (A.H. Hamilton) کە جادە بەنێوبانگەکەی (هەمیلتۆن)[٦٩٨]ی بەکوردستان دا راکێشا، ئەم دەرفەتەی قۆزتەوە تا داوا لەحوکومەتی ئینگلتەرە بکات، کە کۆمەکی مرۆڤانە بۆ کورد بەرێ بکەن[٦٩٩]. ئەوە یەکەم جار نییە کە (هەمیلتۆن) خۆشەویستی و میهرەبانی خۆی بۆ نەتەوەکەمان بە ئیسپات دەگەیەنێت. کاتێک کورەکەی لەگەشتێکی زانستانەدا گیانی لەدەست دا، زانستگەکەی پرسەنامەیەکیان بۆ (هەمیلتۆن) نارد و بەشداریی خەمی خۆیان بۆ دەربری. (هەمیلتۆن) وەرامی دانەوە کە سەبووریی تەواوی ئەو کۆستەی بەوە دێت، گەر زانستگەکە دوو لێ هاتووی هەژاری کورد بەخۆرایی لەبەشی تەکنیک وەربگرێت، تا لە پاشە رۆژ دا بتوانن لەجێگەی کورەکەی کار بکەن.

سەرپاکی نەتەوەکەمان بەدۆستی وەک (هەمیلتۆن)ەوە شانازی دەکەن و ئەو پەری رێز و سوپاسی پێشکەش دەکەن.

بۆ چەسپاندن و بەئەنجام گەیاندنی رێکەوتنەکە، سەرکردایەتی شۆرش وێزگەی شۆرشی (دەنگی کوردستان)ی لە ٢٣ی ئازاری ١٩٧٠دا لە کار خست[٧٠٠]. دەربارەی کارپێ کردنی رێکەوتننامەکە لەلایەن رژێمەوە، بارزانیی لەنێوەراستی ئاوریل دا بەپەیامنێری ئاژانسی دەنگوباسی (تاس)ی سۆڤیەتیی گوت (هەندێک لەبەندەکانی جێبەجێ کراون)[٧٠١]. بۆ بە ئەنجام گەیاندنی رێکەوتنەکە "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش" لە ١٩٧٠/٣/١٧دا بە سەرۆکایەتی (مرتضي الحديثي)ی ئەندامی ئەنجومەن و ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حیزبی بەعس (لیژنەی ئاشتیی)[٧٠٢] پێک هێنا. (حدیثی) لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەرییدا لە (دهۆک) گوتی:

(ئێمە ئاشکرای دەکەین کە پارتی بەعسی سۆسیالیست لەرووی تاکتیک بازییەوە ئەم چارەسەرەی پەیدا نەکردووە و وەکو شەر راگرتنێکی جارانی پێشوو تێی مەروانن. بەڵکە لە باوەرێکی مرۆڤ ویستانە و لە بریارەکانی کۆنگرەی هەرێمایەتی و نەتەوایەتییەوە هەڵهێنجراوە، کە داوای چارەسەرێکی ئاشتییانەی کێشەی کورد دەکەن)[٧٠٣].

لەکۆتایی مارت دا ژمارەیەکی زۆر لەجاشە چەکدارەکان چەک کران و هێزەکانیان هەڵوەشێندرانەوە[٧٠٤]. (حدیثی) لە ٢٤ی ئاوریلی ١٩٧٠دا گوتی (هەموو هێزە نا نیزامییەکان هەڵدەوەشێندرێنەوە و رژێم چەکەکانیان لێ دەستێنێتەوە)[٧٠٥].

چەک کردنی جاشەکان سەرکەوتنێکی مەزنی هێزە جەنگاوەرەکانی کورد بوو. راگرتنەوەی جاش لەپاشە رۆژدا هەروا ئاسان نابێت.

له ٢٩ی مارتی ١٩٧٠دا کابینه‌یه‌کی نوێ دامه‌زرێنرا، که‌ پێنج کورد پله‌ی وه‌زیری‌یان تێدا وه‌رگرت(٧٠٦).

رۆژنامه‌ی "الثورة" بلاوی کرده‌وه‌ که‌ ئه‌و هێزه‌ عێراقی‌یانه‌ی تا ئێستا له‌ "شیمال" جێگیر کرابوون، ده‌نێردرێنه‌ به‌ره‌ی رۆژهه‌لاتی به‌رامبه‌ر (ئیسرائیل)(٧٠٧).

لێره‌دا پرسیارێک خۆی ده‌سه‌پێنێت:

تا چ راده‌یه‌ک شۆڕشی کورد پاش ١١ی ئازاری ١٩٧٠ هاریکاری‌ی بزووتنه‌وه‌ی ئازادیخوازانه‌ی فه‌له‌ستینی کرد؟؟

له‌و باره‌وه‌ رای هه‌نده‌ک له‌کاربه‌ده‌ستانی بالاده‌ستی پارتی دیموکرات پێش چاو ده‌خه‌ین:

دوکتۆر مه‌حمود عه‌لی عوسمان له‌مارت دا ریگه‌یاند که‌ (هێزی پێشمه‌رگه‌ ئاماده‌ن بچنه‌ به‌ره‌کانی رۆژهه‌لات بجه‌نگن)(٧٠٨).

(صالح یوسفی)یش له‌ ئاوریلی ١٩٧٠دا رایگه‌یاند که‌ پارتی دیموکرات متمانه‌ی ته‌واوی به‌ پارتی به‌عس هه‌یه‌ و کورد له‌کێشه‌ی فه‌له‌ستین دا پشتگیری له‌ عاره‌ب ده‌که‌ن(٧٠٩).

ژه‌نه‌راڵ بارزانی‌ی تا ئێستا له‌و رووه‌وه‌ رای خۆی ده‌رنه‌بڕیوه‌. ته‌نها له‌کۆتایی مایسی ١٩٧٠دا به‌وه‌فدێکی رۆژنامه‌نووسانی ئه‌رده‌نی گوت (کورد له‌ به‌لاداخستنی کێشه‌ چاره‌نووس سازه‌کانی عاره‌ب دا یارمه‌تی عاره‌ب ده‌ده‌ن)(٧١٠). بارزانی‌ی بۆیه‌ هیچی ده‌رباره‌ی فه‌له‌ستین نه‌گوتووه‌ چونکه‌ چاک ده‌زانێت که‌ زۆربه‌ی وولاته‌ عاره‌به‌کان کێشه‌ی فه‌له‌ستینیان به‌راست نه‌گرتووه‌. ئه‌وان بازرگانی به‌ ئازار و ئه‌شکه‌نجه‌ی فه‌له‌ستینی‌یه‌کانه‌وه‌ ده‌که‌ن. گه‌لی فه‌له‌ستینی‌ی برا رێکخراوی سه‌ربه‌خۆی هه‌یه‌ که‌ توانای رێبه‌ری کردنی میلله‌ته‌که‌ی هه‌یه‌. ئه‌و گه‌له‌ قاره‌مانه‌ نه‌ پێویستی به‌ (ده‌مڕاست) و نه‌ پێویستی به‌(رێ نیشانده‌ر) هه‌یه‌. ته‌نها خودی فه‌له‌ستینی‌یه‌کان مافی ئه‌وه‌یان هه‌یه‌ چاره‌نووسی خۆیان ده‌ست نیشان که‌ن. ئێمه‌ی کورد و به‌تایبه‌ت لایه‌نگرانی (نوکسه‌) له‌دڵه‌وه‌ پشتگیری‌ی هه‌موو داوا ره‌واکانی گه‌لی فه‌له‌ستینی‌ی ده‌که‌ین، به‌ پله‌ی یه‌که‌م و سروشتی‌ی، مافی دیاری کردنی چاره‌ نووسیان.

شایانی باسه‌ که‌ رژێمی عێراق له‌ساڵی ١٩٦٥دا هه‌نده‌ک فه‌له‌ستینی‌ی فریودراوی وا

لێ کرد کە (خۆ ویستانە) بێن و دژی شۆڕشی کورد بجەنگن. ئەمە نوێنەری شۆڕشی کورد لەهەندەران ئاشکرای کرد(*). تا ئێستا هیچ ڕژێمێکی عارەب خزمەتێکی ئەرێتی‌یان لەگەلی فەلەستین نەکردووە. لە ١٩٦٧دا بارزانی‌ی ئامۆژگاری دەستەلاتدارانی عارەبی کرد کە لەشەڕی ئیسرائیل خۆ بپارێزن، چونکە بەو حاڵ و دار و بارەوە بێ شک شەڕێکی لەو بابەتە دەدۆڕێن. کاتێک دەستەلاتدارانی عارەب تکایان لێ کرد هێزێکی ڕەمزی بنێرێت بۆ فەلەستین. وەرامی دانەوە کە ئەو نەبڕوای بەرەمزە و نەبەخەرافات. بەو هۆیەوە بارزانی‌یان بە "چەتە" لەقەڵەم دا. پاش شەڕی حوزەیرانی ١٩٦٧و پاش ئە وەی وولاتە عارەبەکان گەلی فەلەستینیان بەو چارە نووسە تاڵەوە بەرهەڵدا کرد، (ژەنەراڵەکانی) عارەب هاتنەوە لای بارزانی‌ی و تکای ڕێنوێنی‌یان لێ کرد. بارزانی‌ی ئاوها وەرامی دانەوە: (کە گوتم لەجەنگێکی ئاوها لەگەڵ ئیسرائیل دا دەیدۆڕێن و دەبینن چیتان بەسەردێت، باوەڕتان پێ نەکردم، بە "چەتە" نێوتان بردم. ئێستاش دەتانەوێت "چەتە"یەک ڕێنوێنی‌تان بکات؟)(٧١١).

لەگەڵ ئەوەشدا سەرئەنجامی جەنگی حوزەیران، بۆ (فیلد مارشاڵ) عارفی دووهەمی سەرکۆماری عێراق، زۆر چاوەڕوان نەکراو" و "باوەڕ نەکراو" بوو،(٧١٢). وەک خۆی لە ٢٠ ئاوریلی ١٩٦٨دا دانی پێدانا.

یەکێک لەسەر ئەنجامە هەرە گرنگەکانی ڕێکەوتنەکە، هەڵوەشاندنەوەی تاقمی تاڵەبانی‌ی بوو. ئەو تاقمە نەیانتوانی چیدی بەنێوی پارتی دیمۆکراتەوە کاربکەن، چونکە بارزانی‌ی لەلایەن ڕژێمەوە بەسەرۆکی پارت ناسرا. بەو هۆیەوە ڕژێم ناچار بوو ئەم تاقمە یاساغ بکات. ڕژێم ڕۆژنامەی "النور"ی ئەم تاقمەشی قەدەغە کرد.

لە ٢٨/٦/١٩٧٠دا نوێنەرانی تاقمی تاڵەبانی‌ی بێوەندی‌یان بە بارزانی‌یەوە کرد. ئەم تاقمە لەژێر سەردێری "نداء حرکة الثوریین الاکراد - ڕزگاری"دا ڕوونکردنەوەیەکیان بلاوکردەوە، داوایان لە ئەندامانیان کرد بچنە ریزی پارتی دیمۆکراتەوە و لەژێر سەرکردایەتی بارزانی‌یدا خەبات بکەن(٧١٣). دەمەوێت ئەوە یاد خەمەوە کە ئەم تاقمە ماوەیەک پێشتر داوایان لەبارزانی‌ی دەکرد لەبەرامبەریاندا داوای بەخشین بکات(٧١٤). وا ئێستا ناچار خۆیان داوای بەخشینیان لەبارزانی‌ی کرد. بارزانی‌ی لێ‌یان خۆش بوو.

(*) "Schwere Kämpfe in Kurdistan" in "Süddeutsche Zeitung", München, den 22.7.1965.

بەڵام ئایا گەلی کوردیش ئەوەی دەکرد؟ جێگەی پرسیارێکی زۆرە!!!

لقی ئەم تاقمە لە ئەوروپا، بە ڕێبەرایەتی دوکتۆر کەمال فوئاد، ڕێبازێکی دییان پێش گرتبوو. لە کۆتایی ئۆگوستی ١٩٧٠دا بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە، تێیدا بزووتنەوەکەی بارزانییان بە (بەکرێ گیراو و جاسووسی ئیمپریالیزم و پەیمانی سەنتۆ نێو بردبوو)[٧١٥]. لەگەڵ ئەوەشدا تاقمی تاڵەبانیی هەڵوەشانەوە و بە پارتی دیموکراتەوە پەیوەست بوونەوە، هەندێ ئەندامیان لە ئەوروپا مانەوە و هێشتا دژی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد هەڵدەسوڕان، ئەم جارەیان لەژێر چارشێوی (ماویزم)دا، تا هەندەک (ماویزم)ی ئەوروپایی لەخشتە بەرن[٧١٦].

سەرەتای تەموزی ١٩٧٠، سکرتێری گشتیی پارتی دیموکرات (حبیب محمد کریم) بە ڕۆژنامەی (التآخي) ڕاگەیاند کە پارت لەگەڵ بەعس دا لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە هەندێک لە هێزەکانی پێشمەرگە بکەنە یاساوڵی سنوور. هەندێکی دیکەیان لەداو و دەستگەکانی میری دا دابمەزرێنن و ئەوانەی دەشمێننەوە دەست بەرداریان بن[٧١٧]. ئەمە لەیەکەم گفتوگۆکانی کورد و بەعس دا لە کانوونی دووهەمی ١٩٧٠دا بڕیاری لەسەر درابوو[٧١٨].

هەشتەمین کۆنگرەی پارتی دیموکرات بەنێوی (بەکر)ی سەرکۆماری عێراقەوە، لە ١ی تەموزی ١٩٧٠دا لە لایەن بارزانیی سەرۆکییەوە، دەستی پێ کرا. ٤٨٨ نوێنەر بەشدار بوون، کە نوێنەرایەتی ٥٠ هەزار ئەندامیان دەکرد. نوێنەرانی پارتی بەعس، پارتی کۆمۆنیستی عێراق، بەرەی ڕزگاری فەلەستین، بزووتنەوەی سۆسیالیستی عارەبی، پارتی دیموکراتی نیشتمانی عێراق و هەندێک ڕێکخراوی دی بەشدار بوون[٧١٩]. ئەم کۆنگرەیە بووە مینبەرێکی ئازاد بۆ هەموو دژەکانی بەعس. ڕەخنەی توند و تیژ لەپارتی بەعسی دەستەڵاتدار گیرا.

بەبۆنەی گرتنی کۆنگرەکەوە. گەلەک لا لەجیهاندا بروسکەی پیرۆزباییان نارد. بۆ نموونە پارتی کۆمۆنیستی شوورەوی پیرۆزبایی لەکۆنگرە کرد و ئاواتی خواست کە (کۆنگرە سەرکەوتوو بێت، ڕێکەوتننامەی ١١ ئازاری ١٩٧٠ بەگەڕ بخرێت)[٧٢٠].

هەروەها ڤالتەر ئۆلبریخت، کۆمیتەی مەرکەزیی پارتی سۆسیالیستی کرێکارانی هەنگاریا، ئەنجومەنی نیشتمانیی بەرەی نیشتمانیی کۆماری گەلی بولگاریا، ئەنجومەنی نیشتمانی بەرەی سۆسیالیستی یەکگرتووی ڕۆمانیا، پیرۆزباییان لێ کرد.

کۆنگره به بڕیاری ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دیمۆکراسیێتی بۆ عێراق کۆتایی پێ هێنرا.

پاش بڵاوکردنەوەی بڕیاره سیاسی‌یەکانی کۆنگره، رژێم پروپاگەندەیەکی بەتینی دژی پارتی کۆمۆنیست و ئەوانی دی کە لە کۆنگرە دا بەشدار بوون، دەست پێ کرد. گەلەک کۆمۆنیست دەستگیر کران[٧٢١].

ئەمە بارێکی گرژ و ئاڵۆزی لە عێراق دا خوڵقاند.

لەو کۆنگرەیەشدا بەرنامەی پارت جارێکی دیش لە زۆر لاوە بیراز کرایەوە! تا لەگەڵ بار و دۆخە نوێ کەدا بگونجێندرێت، وەکو کاربەدەستێکی باڵادەستی پارت گوتی[٧٢٢].
بەپێی ئەو گۆڕانانە "فەلسەفە"ی پارت ئاوهای لێ هات:

(حیزب لە خەباتی سیاسی‌یانە و شیکردنەوەی کۆمەڵگە دا، لە تیۆری‌یە زانستی‌یە پێشکەوتنخوازەکان و تەجرەبەی گەلانەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت. حیزب بە ئەرکی خۆی دەزانێت مافی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری ئافرەت بەڕاستی و تەواوی دەستەبەر بکات. حیزب پشتگیری‌ی یاسای نوێی چارەسەرکردنی زەوی و کارپێ کردنی دەکات، تا مافی جوتیاران لە کوردستان دا مسۆگەر بکرێت). [٧٢٣]

لە ١٩٥٩دا بەرنامەکە ئاوها بوو:

(حیزب لە خەباتی‌یدا سوود لە تیۆری‌یەکانی مارکسی لینینی وەردەگرێت)[٧٢٤].

ئەم بارە نوێ‌یەی عێراق کوردەکانی تورکیاشی هەژاند. هەرچەندە بارزانی‌ی لە ئاوریلی ١٩٧٠دا بە (Lütfü Akdog)ی پەیامنێری رۆژنامەی (Tercüman)ی تورکی‌ی راگەیاند، کە کورد هیچ نیازێکی خراپی بەرامبەر تورکیا نی‌یە،[٧٢٥]. بەڵام وەزیری دەرەوەی تورکیا (Cagliankil) لەهەمان کاتدا لەسەر بانگهێشتنی وەزارەتی دەرەوەی عێراق، چووە بەغدا. (Cagliankil) لە ١١/٧/ ١٩٧٠دا گوتی (سەردانەکەی هەل و دەرفەتی هاریکاری هەردوو وڵاتی خۆشتر کرد و هێمنی و ئاسایشی لەنێوچەکەدا مسۆگەر کرد)[٧٢٦].

لێرەدا ئامادەیی تورکیا بۆ هاریکاری‌ی عێراق دژی کورد بەدەردەکەوێت. (بەکر)یش لە ١٦ی تەمموزی ١٩٧٠دا، لە یادی سێهەمین ساڵەی کودەتای بەعس دا، بایەخی دۆستایەتی عێراق و تورکیای دووبارە کردەوە[٧٢٧]. هەمان رۆژ (بەکر) دەستووری کاتی‌ی عێراقی راگەیاند کە دەڵێت:

«بەندی یەکەم: ئامانجی سەرەکی کۆماری عێراق ئەوەیە کەیەک وڵاتی یەکگرتووی

عارەب دابمەزرێت.

بەندی ٣ب- خاکی عێراق یەکەیەکی لێک دانەبڕدراوە. لەهیچ بەشێکی دەست هەڵناگیرێت.

بەندی ٥أ- عێراق بەشێکە لەنەتەوەی عارەب.

بەندی ٥ب- میللەتی عیراق لەدوو گەلی سەرەکی پێک هاتووە، گەلی عارەب و گەلی کورد. ئەم دەستوورە دان دەنێت بەمافی نەتەوایەتی گەلی کورد و مافی رەوای هەموو کەمە نەتەوەییەکان دا لەچوار چێوەی یەکێتی عێراق دا.

بەندی ٧ب- زمانی کوردی لەنێوچە کوردییەکان دا لەپاڵ زمانی عارەبی دا زمانی رەسمی یە» [٧٢٨].

گەر مرۆ ئەم بەندانە بە وورییی و راستی بخوێنێتەوە، تێ دەگات کە کورد لێرەدا وەکو بەشێک لەنەتەوەی عارەب تێ ی دەڕواندرێت. ئەمە راستییەکەو (مرتضي الحديثي) چەند رۆژێک پاش بلاوکردنەوەی رێکەوتننامەکەی ١١ی ئازار پێ ی لێ نا: (دەستووری پاشەرۆژ دان بەوەدا دەنێت کە عێراق بەشێکە لەنەتەوەی عارەب و گەلی عێراقیش بەعارەب و کوردییەوە، بەشێکن لەنەتەوەی عارەب) [٧٢٩].

ئەم راستییە تاڵە دەبێتە هۆی ناکۆکی زێتری عێراق و کورد. حیزبی کاژیک رەخنەی لەم دەستوورە گرت و ئەوەی خستە پێش چاو کە کوردەکان بەهیچ جۆرێک بەشێک نیین لەنەتەوەیەکی دی. خاکی کوردستانیش نە بەشێکە لەخاکی عارەب و نەبەشێکە لەهیچ خاکێکی دی [٧٣٠].

پارتی دیمۆکرات و بەعس لەسەر ئەو مەسەلەیە رێک نەکەوتبوون. رۆژنامەی "الجمهوريه" یەکێک لەئۆرگانەکانی بەعس، لە ١٩/٥/١٩٧١دا گوتارێکی جەنگ ئامێز دژی پارتی دیمۆکرات دەنووسێت و تێیدا ئەو بەندانەی دەستووری کاتی ی دەنووسێتەوە و خەتیان بەژێر دا دێنێت و روونی دەکاتەوە کە کورد لە عێراق دا تەنها وەکو بەشێک "لەنەتەوەی عارەب"، دەتوانرێت تێ یان بڕواندرێت.

ئەم بەڵگانەی خوارەوەی پێش چاو خستبوو:

(دەستووری کاتی ی راستی گوتووە کە عێراق بەشێکە لەنەتەوەی عارەب. نەیگوتووە کورد بەشێکە لەو نەتەوە گەورەیەی لەنێوان ئێران وشوورەوی یدا بلاوبوونەتەوە.

لەبەیاننامـەی ١١ی ئازار دا باس لەوە نەکـراوە، چونکە ئەوە دەبووە جـودا خـوازی‌یەکی ئاشکرا. لەو ڕێگەیەوە ئەو هاوبەشی‌یە "هەتا هەتایی"یەی هەر دوو نەتەوەی عـارەب و کورد، لە وولات دا کـۆتایی پێ دەهات. حوکـمی زاتی‌ی کورد لە عـێراق دا، تەنها لەنێو یەکـێتی عـارەب دا شیـاوە، ئەو یەکێتی‌یەی حوکـومـەتی بەعس هەوڵی بۆ دەدات. ئەو کـوردانەی ئەم قـاڵبـە نەتەوەیی‌یە نایانگرێتـەوە، شـتـێک نیین لەبێگانە زێتـر... هەر بانگاشەیەکی دی (لێک دانەوەیەکی هەڵە) و لادانە لە بەیاننامـە مـێژوویـیەکـەی ١١ی ئازار)(*).

ڕۆژنامەی "التآخي"، ئۆرگانی پارتی دێمۆکرات، بەرپەرچی ئەو گوتانە دەداتەوە:

(ئەو دەربڕینانە نەک تەنها لەگەڵ ڕاستی‌یە مێژوویی و جوگرافی‌یەکاندا، بەڵکە لەگەڵ سەرچاوە ئیدیۆلۆژی‌یەکانی پارتی بەعـسی عـارەبی سۆسیالیستیشدا دژ دەوەستنەوە. لەو بارەیەوە لەگەڵ برایانی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی بەعس دا لەکاتی گـفـتـوگـۆکـانی پێش ڕێکەوتنەکەی ئازار دا دەمـەتەقێ کـرا. پارتی دێـمـۆکـراتی کـوردسـتـان ئەو کـاتە پێـشنیـازی کـرد کـە ئەو بەندانەی باسی لێ کـرا، لە دەسـتـووری کـاتی‌یدا بگـۆڕدرێن و لەبریتـی‌یان بنووسرێن کە گەلی عـارەبیش لەعـێراق دا بەشـێک لەنەتەوەی عـارەب پێک دێنێت. برایانی حیزبی هاوپەیمان داوای بەخشـینیـان کرد و بە پێشنیـازەکە ڕازی نەبوون. هەندێـک پۆزشـیـان هێنایەوە کـە ئێـمـەی پارتی دێمـۆکـرات ئەو کـاتە پێ‌ی ڕازی بووین، چونکە نەمانویست کۆسپی ناقۆڵا لەبەردەم ڕێکەوتننامەکەی ١١ی ئازار دا قوت کەینەوە، هەروەها چونکە ئەو دەسـتـوورەش خـۆی لەخـۆیدا دەسـتـوورێکی کـاتـی‌یە. ئێـمـە پێـمـان وابوو ئەو بەندانە لەهەمـوو حـاڵەتێکدا دەمـەتەقێ‌ی لەسـەر دەکـرێتـەوە. بەتایبـەت گـەر ویسـترا دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ وولات دابڕێژێندرێت)(٧٣١).

کـۆتـایی هاتنی جـەنگ لەکـوردسـتـان دا کـێشـەی دی خـوڵقاند. چونکە کـۆتایی جـەنگ لەهەمـان کات دا یـانی دروست کردنەوەی ئابووری‌ی و ئاوەدان کردنەوەی نێوچەکە لەلایەن ڕژێمی عـێراقـەوە. (صدام حسین تکریتی) جێگری سەرۆکی پارتی بەعـسی عـێراق، ئەو گرفتانەی بەم شێوەیە هەڵسەنگاند:

(دوایی هاتـنی کـێشـەکـە پێـویسـتـی بەدروست کـردنەوەی ڕێگە و جادە ڕووخاوەکـان و

---

(*) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية". العدد ١٠٧٤، بغداد، ١٩/٥/١٩٧١ ص٥. (مع الاقلام اللئيمة في التآخي).

ئاوەدان کردنەوەی گوندە کاول بووەکانە. ئەمە یانی وولاَت ئێستا ناچارە مانگی ١٥ دینار مووچە بۆ ٢١ هەزار هاوولاَتی ببڕێتەوە. ئەمە یانی وولاَت ناچارە مووچە بۆ هەزاران خانەوادە ببڕێتەوە کە پیاوەکانیان لەرووداوەکانی "شیمال"دا لەدەست داوە. ئەمە یانی وولاَت ناچارە بەزەبری پارە هۆزە کۆچ کردووەکان بۆ نێوچە پێشینەکانی خۆیان بگێڕێتەوە. ئەمە یانی وولاَت ناچارە پرۆژەی پەرەپێدان دەست پێ بکات بۆ ئەوەی هەموو بێ کارەکانی نێوچەی ژووروو کاریان چنگ بکەوێت)(٧٣٢).

شایانی باسە کە رژێمی عێراق لە ١١/٥/١٩٧٠دا "لیژنەیەکی بالاَ"ی بەسەرۆکایەتی صدام حسێن تکریتی، بۆ بە دوودا چوون و جێ بەجێ کردنی رێکەوتننامەکە، پێک هێنا.

هەر چەندە، هەندێک رێکخراوی رۆشنبیریی وەکو "کۆمەڵەی رۆشنبیریی کوردی"(٧٣٣)، "کۆڕی زانیاری کورد".(٧٣٤) و"یەکێتی نووسەرانی کورد" دامەزرێندران و رێگەی کارکردنیان پێ درا(٧٣٥). بەلاَم وا پێ دەچێت رژێم تا ئێستا کەمی لەبەندە جەوهەرییەکانی رێکەوتنەکەی ١١ی ئازار جێ بەجێ کردبێت. راستە ٢ملیۆن دینار بۆ بیناکردنی زانستگەی تازە دامەزراوی سلێمانی و١,٥ملیۆن دینار بۆ دروست کردنی نەخۆشخانەی زانستگە تەرخان کراوە(٧٣٦)، بەلاَم لەبیرخەرەوەیەکی بارزانییدا کە بۆ بەکری سەرەک کۆماری ناردووە دەڵێت (گەلی کورد نارازیین)(٧٣٧).

نکۆڵی لەوە ناکرێت کە لەنێو حیزبی بەعسی دەستەلاَتدار دا تێڕوانین و بۆچوونی جوداوازی بەرامبەر کێشەی کورد هەن. هەندەک لایەن لەرژێمدا کە بەرێکەوتنەکەی ١١ی ئازار نارازی بوون، یاخود تەنها وەکو تاکتیکێک حسێبیان بۆ کردووە، کۆسپ دەخەنە بەر جێ بەجێ کردنی. ئەو لایەنانە هەوڵ دەدەن لە لایەکەوە لەگەڵ تورکیا و لە لایەکی دییەوە لەگەڵ ئێران دا پێوەندییەک ببەستن، بەڵکە بتوانن هێزێک، بەرەیەکی پێکڕایی دژی کورد دامەزرێنن.

وەزیری نەوتی عێراق (سعدون حمادي) لەبۆنەی کۆبوونەوەکەی وولاَتانی ئۆپێک لەتاران، لە فێبریوەری ١٩٧١دا کەوتە پێدا هەڵدانی سیاسەتی شای ئێران بەرامبەر شیرکەتەکانی نەوت(٧٣٨). بەلاَم لەپاشە رۆژێکی وا نێزیکدا هاریکاریی ئێران و عێراق زۆر زەحمەتە. چونکە هەندەک دەستەو تاقمی نێو حیزبی بەعسی دەستەلاَتدار دژی ئەو لێک نێزیک بوونەوەیەن. جگە لەوە ئەو دەستە و تاقمانە لەم دواییانەدا بەوپەڕی تواناوە لەگەڵ هەموو هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی ئێران دا کار دەکەن. تەنها هێندە نییە کە داڵدەی

چەند ئەندامێکی حیزبی (تودە)یان دابێت و لەبەغداوە بڵاوکراوەکانیان بۆ پەخش بکەن. بەڵکە پەنای هەندەک ئۆپۆزیسیۆنی راست رەویشیان لەبەغدا داوە. بۆ نموونە جنسیەی عێراقی بەژەنەراڵ (بەختیار)ی کۆنە سەرۆکی دەستگەی جاسووسی ئێران (ساواک) دراوە، پێوەندیی راستە و خۆی بە (بەکر)ی سەرکۆماری عێراقەوە بوو[739].

بەڵام دەستگای جاسووسیی ئێران توانییان لەرێی بەکرێگیراوێکیانەوە کە "دۆستی" بەختیار خۆی بوو، بیکوژن[740]. رۆژنامەکانی ئێران هەمیشە هێرش دەکەنە سەر عێراق و جوێن بەسەر کۆماری عێراق دەدەن و بە (تاوانکار) نێوی دەبەن[741](×).

دەستە و تاقمە کۆنەپەرستەکانی نێو رژێمی بەعسی دەستەڵاتدار، هەوڵ دەدەن زۆر بۆ کورد بهێنن، بەهیوای ئەوەی شەڕ هەڵگیرسێننەوە.

بۆ نموونە هەوڵ دەدەن کوردە فەیلییەکان، کە زێتر لەدوو صەد ساڵە نیشتەجێی بەغدان، بەبیانووی ئەوەی گوایە لە (رەچەڵەکی ئێرانی)ین، جنسیەی عێراقییان لێ بستێننەوە. هەرچەندە یاسای جنسیەی عێراقیی (ژمارە ٤٢، ساڵی ١٩٢٤) دەڵێت: (هەر کەسێک لە٢٣ی ئۆگوستی ١٩٢٤ەوە لەعێراق نیشتەجێ بووبێت، جنسیەیعێراقیی پێ دەدرێت)، (بڕوانە خاڵی١٢ی ئەو یاسایە). لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کوردی فەیلی تووڕ درانە ئەو دیو سنوورەوە. سەرکردەکانی شۆرشی کورد گەلەک جار لەو بارەوە ناڕەزایی خۆیان دەربڕیوە. دوا جار پارتی دیمۆکرات، توانی بەعس رازی بکات[742] کە جنسیەی عێراقی بە کوردە فەیلییەکان بدەن. بەڵام ئەو بڕیارە نووسراوە تا ئەورۆ لەلایەن رژێمەوە پشت گوێ خراوە.

هەوڵدانی کوشتنی بارزانیی لە ٢٩ی سێپتەمبەری ١٩٧١دا، گرژی نێوان کورد و رژێمی بەغدای توند کرد[743]. بەتایبەت چونکە ئەو تاوانکارانە یەکسەر لەبەغداوە هاتبوونە کوردستان. بەسواری دوو ئۆتۆمبێل هاتبوون، کە پڕ لەبۆمبا و ئامرازی تەقینەوەی تەوقیت کراو بوو. ئەو ئۆتۆمبێلانە لەبەغداوە تا کوردستان بە ١٠ نوختەی

---

(×) ئەمانە بۆ داگیرکەرانی کوردستان مەسەلەی لاوەکین. هەر کات دەردە کورد زۆریان بۆ بهێنێت، ئامێز بۆ یەکدی دەکەنەوە و نێوچەوانی دژوێنی یەکدی رادەمووسن، وەکوو دیتمان صەدام و شا لە جەزائیر کردیان.

پشکنینی رژێمی عێراق دا تێپەڕیون، وەکو بارزانیی لەبروسکەکەیدا بۆ سەرۆکی حیزب و رژێمی عێراقی نووسیبوو[٧٤٤]. جگەلەوە ئەو بەڵگەنامانەی شۆڕشی کورد لەتاوانکارەکانی گرتووە، دەری دەخەن کە رژێم بەرەسمیی و راستەوخۆ تێیدا بەشداربووە. یا بەلای کەمەوە بە ئاگاداری و رەزامەندیی رژێمی بەغدا کراوە.

یەکێک لەبەندە هەرە گرنگەکانی رێکەوتنی ١١ی ئازار کە هێشتا جێ بەجێ نەکراوە، سەر ژمێرەکەی دانیشتوانی شاری (کەرکوک)ە. رژێم بە ئاگایانە و بە ئارەزوو دوای خست[٧٤٥].

بە پێی رێکەوتنەکە دەبێت یەکێک لەجێگرەکانی سەرەک کۆماری عێراق کورد بێت. وەزیری کار و نیشتەجێ کردن (نوری صدیق شاوەیس) کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دێموکراتە، لە مایسی ١٩٧٠دا گوتی کە پارتی دێموکرات پاڵێوراوێکی کوردی بۆ جێگرێتی سەرەک کۆمار دەست نیشان کردووە[٧٤٦]. بەڵام پارت بۆیە هێشتا جێگری سەرەک کۆماری نێو نەبردووە، چونکە پێی وایە کابینە هیچ جۆرە دەستەڵاتێکی نییە. کوردەکان لەکۆتایی ١٩٧٠دا داوایان کرد نوێنەرێکیان بخرێتە تاکە هێزی دەستەڵاتداری عێراق، "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش"ەوە[٧٤٧]. بەڵام تا ئێستا بێ سەر ئەنجام بووە.

لەدێسەمبەری ١٩٧١دا ئاڵۆزی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و رژێمی عێراق، گەیشتە ترۆپکی، پاش ئەوەی رژێم ئەو داوایەی بارزانیی دایە دواوە، کە هێزە جێگیر کراوەکانی نێزیکی کەرکوک و ئەو ٣٠ هەزار خانەوادە عارەبەی کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە لەکەرکوک نیشتەجێ کراون، بکێشنەوە[٧٤٨]. لەپاڵ ئەوانەشدا رژێم گەلەک کوردی بەتاوانی (پیلانی تیرۆری سیاسی و خراپەکاریی)[٧٤٩] دەستگیر کرد. ئەو تاوانانە لە لایەن کوردەوە درانە دواوە.

شەڕە دەستەڵات لەنێوان سەرکردەکانی بەعس دا بووە هۆی لابردنی (صالح مهدی عماش)ی ئەندامی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) و کرایە باڵوێزی عێراق لە مۆسکۆ. ئەم پەت پەتێنە، بارەکەی بە سوودی (صدام حسین تکریتی) وەرگێڕایەوە، کە لەکێشەی کورد دا وای نیشان دەدا لەهاورێکانی واقیعانە تر بیر دەکاتەوە. بەهەر حاڵ ناتوانرێت پێشبینی بکرێت لە داهاتوو دا چ روو دەدات. رژێم ئێستا لەهەوڵی دروست کردنی (بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتوو)دایە، بە فەرماندەیەتی حیزبی بەعس، کە بە

نیازە هەموو "هێزە پێشکەوتنخوازەکانی عێراق بگرێتە خۆ[٧٥٠]. تا چ رادەیەک پارتی کۆمۆنیستی عێراق ئامادەی کارکردنە لەگەڵ بەعسداو چەند متمانەی پێ دەکات، هەڵسەنگاندنی زۆر گرانە. هێندە هەیە پارتی کۆمۆنیستی عێراق، وەکو هەموو حیزبەکانی دیکەی عێراق، تەجرەبەی دڵخۆشکەری لەگەڵ حیزبی بەعسدا نی‌یە.

هاریکاری‌ی نێوان پارتی دیمۆکرات و بەعسیش، پێوەندە بەجێ بەجێ کردنی رێکەوتنەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ەوە. ئاخۆ رژێمی بەعس، ئەو بەڵێنانەی بەکوردی داوە، دەیانباتە سەر؟؟؟ چاوەڕوانی‌ی وەرام دەداتەوە... رووداوەکان تا ئەورۆ وا دەگەیەنن کە تای دوو دڵی و خانە گومانی سەنگین تر بێت(*).

## توێژینەوەیەکی ئەم شۆڕشە لەبەر رۆشنایی شۆڕشەکانی رابووردوو دا

پاش ئەم تێڕوانینە پەلەیەی شۆڕشەکانی کورد و بزووتنەوە سیاسی‌یەکانی پێشوو، پاش سەرنجدانێکی ووردی باری ئەورۆ، کاتی ئە وە هاتووە هەندێ سەرئەنجام پوختەکەین. پاشان دەمەوێت چەند ووشەیەک دەربارەی شۆڕشەکەی ئەورۆی کوردستان بڵێم. ئەم بزووتنەوە شۆڕشگێڕانەیە لەمێژووی بزووتنەوەکانی گەلەکەماندا کەم وێنەیە. لەزۆر لایەنەوە لەشۆڕشەکانی دیکەمان جوداوازە:

١ - زۆربەی شۆڕشەکانمان بەرێبەرایەتی سەرۆک هۆزە تەقلیدی‌یەکان بەرپا بوون، کە لە رێکخستنی سیاسی و تاکتیکی سوپایی مۆدێرن سەریان دەرنەکردووە. ئیدیۆلۆژی‌یەکی جەماوەری‌ی نەبۆتە بنچەی یەکێتی و سەرچاوەی جماندنیان. تەنها گوێ رایەڵی‌یەکی کوێرانەی سەرۆکە تەقلیدی‌یەکان ماکی بزووتنیان بوون. هەر سەرۆکەکە مردووە، یا لەبەر هەر هۆیەک کۆڵی داوە، یاخود (خیانەتی کردووە)، جەنگاوەران جڵەوی هۆش و کاریان لەدەست داوە و بەرەو ماڵ کشاون.

---

(*) ئەم گوتارە ساڵێ پێشتر پێشکەش کرا. ئێستا لە ١٩٧٢ داین و سەرقاڵی ئامادەکردنی دەستنووسەکەین بۆ چاپ. تا ئێستا شەڕ هەڵنەگیرساوەتەوە. ئەو هەواڵەی (Georg Alexander) "کە نێوێکی خواستراوی نوێی Alexander von Sternberg)ە" لەبەرلینی رۆژئاوا، لە رۆژنامەی (Frankfurter Rundschau)دا لە ١٦ی فێبریوەری ١٩٧٢دا بڵاوکراوەتەوە، زۆر سۆزاوی و بێ پەروا و بێ باکانە دەربارەی "هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەکوردستاندا" نووسیویەتی. ئەوە تەنها لەساز و ئاواز و داهێنانی خۆیەتی.

٢- هەندەک شۆڕشی کوردیش بوون، کە لەلایەن حیزبێکەوە ڕێبەری کراون، بەڵام ئەمانە لە ڕێبازدا حیزبی بۆرژوا بوون، کە لەسیاسەتدا ساکار و لەڕێکخستن دا بێ شیرازە بوون. ئیدیۆلۆژی‌یەک کە لەناخی میللەتەکەوە هەڵقوڵابێت و لەگەڵ بەرژەوەندی‌ی نەتەوەکەدا هاوتەریب بووبێت، لە ئارادا نەبووە. وورده بۆرژوا بزووتنەوەی کوردایەتی‌یان بەرەو ئۆپۆرتونیستی بەکێش کردووە. جڵەویان بەسۆز داوە، بێ ئەوەی بتوانن نەخشە و پرۆگرامێکی دیار و ئاشکرا پێش چاو بگرن. باوەڕیان بەوە نەبووە کە و وزەی لەبن نەهاتوو لەیەکێتی و قاڵب بەستنی خواستەکانی گەل دایە. لەبریتی وی پشتیان بەگفتی پووچی ئەم و ئەو بەستووە.

بۆ نموونە حیزبی (خۆیبوون)[٧٥١] لەکوردستانی تورکیادا لە ١٩٢٧دوە تا ١٩٣١ شۆڕشێکی چەکدارانەی نایابی ڕێبەری‌ی کرد. بەڵام مەخابن پشتیان بە ویژدان و بەزەیی هێزە ڕۆژئاواییەکان بەست. هێزەکانی ڕۆژئاواش بەپێچەوانەوە، کۆمەکیان بەتورکیا کردو و لەو ڕێگەیەوە زیانێکی بێ سنووریان بەکورد گەیاند. هەموو ئەوەی لە١٩٣٠دا ئەنجومەنی (سۆسیال ئینتەرناسیۆنال) کە بە (ئینتەر ناسیۆنالی دووهەم) ناسراوە، لە کۆبوونەوەی (زیوریخ)دا بۆ کوردیان کرد، ئەوە بوو بەنێوی (ئەنجومەنی کرێکارانی سۆسیالیستەوە) ناڕەزایی‌یان دەربارەی قڕانی کورد لەکوردستان دا دەربڕی[٧٥٢]. بەپێ‌ی تەبیەتە ئۆپۆرتونیستە بۆرژوایی‌یەکەیان. لەو ناڕەزایی‌یەدا گوتبووشیان (دژی هەموو زەبر و زۆر و هێز بەکار هێنانێکین بۆ سەندنی مافی کورد). هەرچەندە چاکیشیان دەزانی کە کورد قەتڵ و عام دەکرێت و هیچ بەربەستێک نی‌یە ژیانیان بپارێزێت.

کۆمەڵەی (ژێ-کاف)(*). نموونەیەکی دی‌یە. تەنها یەک دەستکەوتی بوو، توانرا شوورەوی‌ی ڕازی بکرێت کە کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی‌یداری کورد تەحەمول بکات. (ژێ کاف) چونکە پارتێکی شۆڕشگێڕی خاوەن ئیدیۆلۆژی‌ی نەبوو، پاش دامەزراندنی کەوتە هەڵەوە. لەنێو خۆ دا بۆ سەرکردەیەک نەگەڕان، بەڵکە لەدەرەوەی حیزبەکە بۆ نێو و شۆرەت دارێک دەگەڕان. ئەوە بوو (قازی محەمەد)یان پەیدا کرد. قازی‌ی زانایەکی ئیسلامەوانی چاک بوو. بەڵام سیاسەتمەدارێکی چاک نەبوو. پشتی بە بەڵێنی کۆمەکی سەرکردەکانی ئەو دەمەی شوورەوی‌ی بەست و بایەخی نەدا بەوەی هێزێکی جەنگاوەری بەتوانا و کۆک ڕێک بخات. کۆماری مەهاباد لەڕاستی‌یدا لەلایەن دەرەبەگ و مەلاکانەوە فەرمانڕەوایی

---

(*) بۆ کۆمەڵەی (ژێ کاف) بڕوانە لاپەڕە (٨٩-٩٠)ی ئەم کتێبە.

دەکرا. فیۆدالەکان لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان، ڕێگەی چارەسەرێکی شۆڕشگێڕانەی مەسەلەی زەوییان نەدا. هەر لەگەڵ خۆشگوزەرانیی خۆیان لەخەتەردا دیت، سووک و ئاسان خیانەتیان لەکۆمارەکە کرد. بەر بەرەکانیی پێشمەرگەکانی بارزانیی و کوردە عێراقییەکانی دییان دەکرد کە پەنایان بۆ کۆمارە کۆرپەکە بردبوو.

دەڵێن ژەنەراڵ بارزانیی کە سەرکردەی هێزی سوپایی کۆمارەکە بوو، بە پێچەوانەی قازییەوە، هەوڵی داوە لەشکرێکی مۆدێرن، سەربەخۆ و بەهێز و دیسپلین دامەزرێنێت.

هەرچەندە رژێمی ستالین بەڵێنی چەکی قورسی بەکورد دابوو، بەڵام تەنها ووشەی پێ دان[٧٥٣]. کاربەدەستانی شوورەویی وایان ئارەزوو دەکرد کە کورد توند بە (کۆماری ئازربایجان)ەوە شەتەک دەن. زۆر هەوڵیان دا مەسەلەکە لەو ڕێچکەیە بخزێنن[٧٥٤]. کورد نەدەبوو متمانەی تەواو بە (کۆماری ئازربایجان) بەسەرکردایەتی (جەعفەر پێشەوەری) بکات، چونکە ئەوان لەپشتی کوردەوە کەوتنە مامەڵە لەگەڵ تاران دا. هەرچەندە لەپەیمانەکەی نێوان کورد و ئازربایجان دا بڕیار وابوو، بێ راوێژکاری یەکدی، هیچ لایەک گفتوگۆ لەگەڵ تاران دا نەکات[٧٥٥].

هەڵەیەکی دی ئەوە بوو کە هیچ هاریکارییەک لەنێوان چەپییەکانی ئێران، (حیزبی تودە)و قازی محەمەد دا نەبوو[٧٥٦].

پاش کشانەوەی سوپای سۆڤیەت لەکوردستان، کۆمارەکە بێ پارێزەر مایەوە، یانی کۆتایی پێ هات.

حیزبی (هیوا) ١٩٣٨-١٩٤٥، هەمان شێوە کەوتە هەڵەوە. نەیتوانی شۆڕشی کوردستانی عێراق ڕێک بخات. ئەمیش حیزبێکی بۆرژوایانە بوو. نەرەخنە لەخۆ گرتن و نە لێ پرسینەوە هەبوو. جڵەویان دابووە دەست سۆز نەک هۆش. دەسندەخۆرانی ئینگلیز لەنێو کورد دا، توانییان سوود لەو لاوازی و شل و پەیتییەی حیزبەکە وەرگرن و خۆ تێهەڵکێش کەن و ببنە ئەندامی، هەتا بگەنە پلە باڵاکانیشی.

ئەو بەکرێ گیراوانە کارێکی وایان کرد و سیاسەتی حیزبەکەیان بەجۆرێکی وا وەرچەرخاند کە وا بیر بکرێتەوە گوایە هیچ شۆڕشێکی کورد بێ کۆمەکی بەریتانیای مەزن، سەرناکەوێت.

کاتێک ژەنەراڵ بارزانیی شۆڕشی ٩٤٣ی بەرپاکرد و چەند سەرکەوتنێکی عەسکەری بەدەست هێنا، حیزبی هیوا دەستی تێکەڵ کرد[٧٥٧] و کەوتە سەودا و مامەڵە. کاتێک

شەهیدانی کورد گیانیان دەبەخشی، هەندێ سەرکردەی حیزبەکە، وەکو (ماجد مستەفا) خیانەتیان لەشۆڕشەکە کرد. لەبەرامبەر ئەوە دا کورسی وەزیری لەرژێمی بەغدادا پێ بڕا. بارزانیی و هەڤاڵەکانیشی رەدوو نران.

هەموو حیزبەکانی دی کە لە کوردستانی عێراق دامەزران، وەکو: زەردەشت ۱۹۲۸، یەکێتی ۱۹۳۷[۷۵۸] برایەتی ۱۹۳۸[۷۵۹] پێشکەوتن، پشتیوانی، شۆڕش، پارتی دیموکراتی کورد و... ئەوانی دی... جوداوازی‌یەکی ئەوتۆیان لەگەڵ هیوا دا نەبوو. هەموو دامەزران و هەڵوەشانەوە، بێ ئەوەی جێ پەنجەیەکی دیار لەپاش خۆیان بەجێ بهێڵن.

لەکوردستانی سوریا دا، لەسەر وەختی ئینتیدابی فەرەنسییدا سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردایەتی لەچنگی فیوٚدالەکان و هەندەک بوٚرژوای رووناکبیر دا بوو. ئەو رووناکبیرانە خزمەتی زوٚریان بەزمان و وێژەی کوردی‌ی کرد. بەڵام هەوڵیان نەدا بزووتنەوەیەکی کوردانەی جەماوەری‌ی بهێننە کایەوە. پێ‌یان وابوو ئاغای ئیمپریالیزمی فەرەنسی کە هەندێ مافی رۆشنبیری‌ی کوردی دان پێدانا بوو، ئیدی هەموو مافەکانی دیکەی کورد دەستەبەر دەکات. کاتێک فەرەنسی‌یەکان لە ۱۹٤٦دا سووریایان بەجێ هێشت و هەموو وولاتەکەیان -بە بەشەکەی کوردستانیشەوە- دایە دەستی عارەبەکان(*). ئەوجا ئەو رێبەرە بوٚرژوا و ئوٚپوٚرتونیستانە تێگەیشتن ئیمپریالیزم یانی چی!!!

ئاغا و دەرەبەگی کورد وەک یاسایەکی هەمیشەیی، هەر دژی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد کاریان کردووە. لەسوریاش بەو جوٚرە بوو. ئەو فیوٚدالانە هەمیشە عەوداڵی بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یەکانی خوٚیان بوون. کاتێک ئیمپریالیزمی فەرەنسی خوٚیان ناچار دیتەوە جوٚرە ئوٚتوٚنوٚمی‌یەک بە کوردی سوریا بدەن، پرسیاریان لە (کوٚر رەشید پاشا)ی دەرەبەگ کرد، ئایا رای چی‌یە؟ ئوٚتوٚنوٚمی بەکوردی سوریا بدەن؟ پاشا پرسی ئاخوٚ نێوچەی (حەلەب)یش دەکەوێتە سنووری ئەو ئوٚتوٚنوٚمی‌یەوە؟ هەر بە نەء وەرامیان دایەوەو

---

(*) جگە لەوە ئیمپریالیزمی فەرەنسی لەسەروەختی ئینتیدابی سوریا دا، گەلەک جار یارمەتی تورکیایان دژی کورد داوە. لە ۱۹۲۵دا فەرەنسی‌یەکان (خەتی ئاسنی حەلەب)یان هەتا نێو تورکیا خستە بەردەستی تورکەکانەوە، تابتوانن باشتر شۆڕشی کورد سەرکوت کەن. بروانە لاپەڕە (۷۳-۷۵)ی ئەم کتێبە. لە۲۳ی ژوئنی ۱۹۲۳دا فەرەنسا پەیمانێکی لەگەڵ تورکیا دا بەست و بەو پێ‌یە شاری ئەسکەندەروونەی کورد و ئەرمەن و عارەب درا بەتورکیا. ئەوڕۆ ئەو شارە پارێزگەیەکی تورکیایە.

گوتیان (حەلەب) نێوچەیەکی عارەبی‌یە! پاشا گوتی: دژی ئەو ئۆتۆنۆمی‌یە دەجەنگێت کە (حەلەب)ی تێدا نەبێت! چونکە (حەلەب) مەڵبەندی حەواندنەوەی خۆی و خانەوادەکەیەتی) و «لەگەڵ کیژانی (حەلەب)دا نێوانیان زۆر خۆشە». دە کەواتە داگیرکەرانی ئەوڕۆی سوریا دەبێت سەناگۆی (کیژە شۆخەکانی حەلەب) بن. لەشاباشی ئەوانەدا ئەمان ئەوڕۆ ئەو بەشەی کوردستانیان لەژێر دەستەڵات دایە.

٣- چونکە حیزبێکی جەماوەریی خاوەن ئیدیۆلۆژیی ڕێکخراو نەبووە، تانەتەوەکە یەکخات و هوشیارانە ڕێبەریی بکات. نەتوانراوە نەتەوە هاودەردەکان و هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئەو وڵاتە داگیرکەرانە بەلای خۆدا رابکێشرێت و وەکو هاوکارێک دژی دوژمنە هاوبەشەکە بەگەڕ خرێن. لە ئەنجامی هەوڵدانی حیزبی (خۆیبوون)دا، پەیمانێک لەنێوان کورد و گەلی ئەرمەنی برا دا، بەسترا. بەڵام هەلی راستەقینە تازە لەدەست چوو بوو. قەتڵ و عامە نێوزڕاوەکەی تورکیا دەستی درایە و ١٠٠ هەزار ئەرمەنی‌ی تێدا کوژرا.

هاریکاریی کورد و گەلی ئاسووری برا کە بۆ هەر دوولا زۆر پڕ سوود و پێویست بوو، نەهاتە دی.

٤- هەموو ئەو شۆڕش و راپەڕینە میللی‌یانە لەپاش دابەش کردنی کوردستان بەرپا بوون، پاش ئەوەی هێزە زەبەلاحەکان پەیمانەکانی خۆیان لەگەڵ وڵاتە داگیرکەرەکاندا ئەنجام داوە و سنوورەکانیان لەسەر ئاستی جیهانی‌ی دانی پێدا نراوە. لەوەو پاش ئیدی خەبات بە تەنها دژی ئەو وڵاتانە نەبووە، بەڵکە ناڕاستەوخۆ دژ بەزل هێزەکان بووە. جگە لەوە ئەو وڵاتانە کەوتنە خۆو هەموو پێکڕا بەرەنگاری بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردیان کردووە. لە ١٩٣٢/١٢/٦دا پەیمانی نێوان عێراق و ئێران مۆر کرا، تا «لە کاتی پێویستی‌یدا پێکڕا ئاسایش و هێمنی‌ی نێوچە سنووری‌یەکانی نێوان هەردوو لا بپارێزن". لە ٨ی تەموزی ١٩٣٧دا تورکیا و ئێران و عێراق و ئەفغانستان پەیمانی (سەعد ئاباد)یان مۆر کرد. بڕیار وابوو هەر راپەڕینێکی کورد ڕووی دا بەهەموو لایەکیان دژی بوەستنەوە، (بڕوانە بەندی حەوتەمی پەیمانەکە). پەیمانی ١٩٤٦ی نێوان تورکیا و عێراق نموونەیەکی دیکەیە. هەروەها پەیمانی سەنتۆ (کە پەیمانی بەغداشی پێ دەگوترا)و لە ١٩٥٥/٢/٢٤دا بەسترا، هەمان بابەتە.

دیتمان چۆن کورد ئەو هەلە هەڵکەوتووانەی هەردوو جەنگە جیهانی‌یەکەی لەکیس دا.

بەڵام ئەوی چوو، چوو. دەمانەویت چەند ووشەیەک دەربارەی ئەو شۆڕشەی ئەوڕۆی کورد بڵێین:

بەڕای ئێمە تاکە یەکێکە لەو بزووتنەوە چەکدارانەی مێژووی کورد، کە مرۆ دەتوانێت بەشۆڕشی نێوبەرێت. ئەم شۆڕشەی ئەوڕۆ سەرەتا وەکی راپەڕینێکی چەکدارانە دەستی پێ کرد. تەنها بەهێزی کورد و ویستەی کورد و رێکخستنی کورد بووە. بێ هیچ یارمەتی‌یەکی بێگانە. هەر هەوڵێک بۆ بوختان پێ کردنی کە گوایە "وازی‌یەکی ئیمپریالیزم" بووە، چ رۆژهەڵات و چ رۆژئاوا، درۆی پەتین، بوختان و هەڵبەستن.

لەگەلەک رووەوە لەبزووتنەوە چەکدارەکانی لەوەو بەر جوداوازە. تەنها شۆڕشێکە کە بنەچەیەکی جەماوەری هەیە و راستەوخۆ پشت بەستوو بەهێز و ووزەی چینی جوتکارانە. بەنێزیکە هەموو رێکخراو و هێزە کوردی‌یەکانی لەپشتە، وەکو پارتی دیمۆکرات، کاژیک و کۆمۆنیست لەو شۆڕشەدا بەشدارن. شۆڕشەکە هێز و توانایەکی سوپایی حسێب بۆ کراوی هەیە و بەردەوام هەوڵی مۆدێرن کردنی دەدرێت. پێوەندی بەهێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی نێوەوە و دەرەوەی وولات پتەوە. حسێبی باری سیاسی جیهان تێ دەخوێنێتەوە. شۆڕشەکە تەنها خەبات بۆ داخوازی و مافەکانی گەلی کورد ناکات، بەڵکە بۆ مافی هەموو ئەو کەمە نەتەوەییانەش کە لە کوردستاندا دەژین. ئەو مافانەی رژێم ئێستا بەکەمە نەتەوەییەکانی وەکو (تورکمان و ئاسووری)داوە، بەرهەمی رێکەوتنەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ن.

شۆڕشی کورد هەوڵی نەهێشتنی نەخوێندەواری و چارە سەرکردنی زەوی دەدات. تەنها داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان ناکرێت، بەڵکە رژێمێکی دیموکراسیش بۆ عێراق. چونکە ئاشکرایە گەر رژێمێکی فاشستی لەبەغدا دا فەرمانڕەوا بێت، ئۆتۆنۆمی کوردستان ناچەسپێت.

دەبێت ئەوەش بڵێین کە گەلەک جار لەهەڵگرانی بیری دۆگما و ئیدیۆلۆژی‌یە گێرەکان دەبیستین، کە گوایە شۆڕشی کورد بزووتنەوەیەکە تەنها بۆ (ئامانجە نەتەوەییەکان) تێ دەکۆشێت. ئەو بیر و ئیدیۆلۆژی‌یە دوور لە واقیعانە، ناتوانن بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵگەیەکی نامۆ و دوور لێیانەوە هەر بەقاڵەی دەم هەڵسەنگێنن. هەموو شۆڕشێک جۆرە بزووتنەوەیەکی میللی‌یە کە لەگەڵ هەموو بزووتنەوە میللی‌یەکانی دیدا بنەچەی هاوبەشی هەیە و هەمان کات تایبەتمەندێتی خۆشی هەیە. بۆ هەڵسەنگاندنی جۆر و چەشنی شۆڕشێک پێویستە ئەمرۆ لەشتە گشتی‌یەکانەوە دەست پێ بکات و

بەمەسەلە تایبەتی‌یەکاندا تێپەڕ بێت و هەڵزنێت. بەو هووردی و قووڵی‌یە تێ نەڕوانرێت، ناتوانرێت تایبەتمەندێتی و دژایەتی‌یە سەرەکی و لاوەکی‌یەکانی نێو شۆڕشەکە دەست نیشان بکرێت. شۆڕشی کورد ئەو مەرجە سەرەکی‌یە گشتی‌یانەی تێدایە کە لەشۆڕشە میللی‌یە پێشکەوتنخوازەکانی گەلانی دیدا هەیە. بۆ نموونە ئەویش دژی ئیمپریالیزم و دیکتاتۆرێتی و فیۆدالیزمە. بەڵام تایبەتمەندێتی خۆشی هەیە، کە لەگەڵ ئاوات و ئامانجەکانی کۆمەڵگای کوردەواری دا دەگونجێت. زەحمەتە نەتەوەیەکی دی هەبێت کە بارودۆخێکی سیاسی تایبەتی وەکو نەتەوەی کوردی هەبێت. نەتەوەی کورد بەسەر پێنج وولاتدا بەخشراوەتەوە. لە هەر وولاتێکیاندا جۆە سیستەمێکی جودا لەوی دی فەرمانڕەوایە. شۆڕشی کورد دەخوازێت زۆر لێ کردنی ڕەگەزایەتی و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بەمافی مرۆڤانە و ئازادی‌ی نەتەوایەتی بگۆڕێت.

کە ئێمە لایەنە گەشەکانی شۆڕشەکە پێش چاو دەخەین، ئیدی مانای ئەوە نی‌یە کە شۆڕشەکە هیچ کەم و کووڕیەکی نی‌یە و بێ خەوشە. هێشتا نوقوستانی‌ی زۆرە. تازە لەسەرەتای ڕێگەیەکی دوور و درێژ و پڕ قۆرت داین. دەبێت پێ لەو ڕاستی‌یانە بنێین و خۆمان لە لووت بەرزی بۆرژوایانە بپوێرین.

ئەرکی هەموو مرۆڤێکی پێشکەوتنخواز و گشت کوردێکە بەهەموو جۆرێک پشتگیری ئەم شۆڕشە بکەن. کوردەکانی پەرێدەی ئەوروپا، بەتایبەت پزیشک و تەکنیکی‌یەکان، ئەرکێکی نەتەوایەتی مەزنیان لەسەر شانە. سەدان پزیشکی کورد لە ئەوروپا دان، پێشمەرگەی کورد و هەموو دانیشتوانی نێوچە ئازاد کراوەکان، کە سەرجەم زیاد لەیەک ملیۆن مرۆڤ پێک دێن، تەنها دوو پزیشکیان هەیە. ئەو ژمارە کەمە شوورەیی‌یە کە تەوێڵی ئەو بۆرژوایانە دەگرێتەوە کە ژیانی پڕ ناز و نیعمەتی ئەوروپا و پارە پەیداکردن، پێش بەتەنگەوە هاتنی کوردە گوند نشینە هەژارەکان دەخەن.

## تێڕوانینێکی کورتی بیر و بزووتنەوەی کاژیک

دەبێت پێ لەو ڕاستی‌یە بنێین کە ئێمەی کورد تا ماوەیەکی کورت لەمەو بەر حیزبێکی خاوەن ئیدیۆلۆژیی شۆڕشگێڕمان نەبووە، کە مەسەلەی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی میللەتەکەمان، لەقالبێکدا دارێژێت و نەتەوەکەمان بە ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانە و نێوەڕۆکێکی سۆسیالیستانە دا بخاتە سەر ڕێچکەی ئامانجێکی دیاری کراو و چەسپاو. مرۆ دەتوانێت بڵێت کە حیزبی (کاژیک) تاکە حیزبێک بووە، کە بۆ یەکەم جار لەمێژووی

کورد دا هەوڵی داوە کێشە کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی‌یەکانی میللەتەکەمان زانستانە هەڵسەنگێنێت و لە قەوارەیەکی ئیدیۆلۆژی‌یدا دایڕێژێت، لەیەکەم نوسراویدا کە بە (کاژیکنامە) ناسراوە، ستراتیژ و تاکتیکی، بنەچە و بناغەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردی داڕشتووە. بۆیە بەپێویستی دەزانم بەرکورتێک لەبارەی ئیدیۆلۆژیی (کاژیک)ەوە بڵێم:

کاژیکنامە مەسەلەی (نەتەوایەتی) شی دەکاتەوە. حیزب وەکو ڕووداوێکی گشتی‌ی و سروشتی لەمەسەلەی (نەتەوایەتی) دەڕوانێت، کە لەگەڵ پەیدا بوونی نەتەوەدا سەرهەڵدەدات. گەر بێتو بەئارەزوو دەستی ئەنقەست هەڵنەگێڕدرێتەوە و خراپ هەڵنەسووڕێندرێت، ئەوا (نەتەوایەتی) ووزەیەکی لەبن نەهاتووە، کە مرۆ بەرەو گەشەکردن و پێشکەوتنێکی بەرچاو و ئەرێتی ڕێبەری‌ی دەکات. مێژوو ئەوەمان نیشان دەدات کەناسیۆنالیستە ئەوروپایی‌یەکان، پێش هەموو لایەک، لایەنە گەشەکانی بیری نەتەوایەتی‌یان با پێداوەتەوە و خراپ هەڵیانسوڕاندووە و بەجۆرێکی نەرێتی سوودیان لێ وەرگرتووە. ناسیۆنالیزمیان کردۆتە ئامرازێک بۆ دنەدانی مرۆڤ دژی مرۆڤ، بۆ دادۆشین و چاوچلێسی‌ی ئیمپریالیزمانە، بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ و چەوساندنەوەی ڕەگەزایەتی و زۆر لێ کردنی نەتەوەکانی دی. ئەمانە لایەن و ڕووە ڕەش و بەد و دژوێنەکانی بیری (ناسیۆنالیزم).

بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئەوڕۆکە، لەگەلەک وولاتانی گەشە نەکردوو و ژێردەستە و کۆلۆنی دونیای سێهەم و چوارهەم دا، (بیری نەتەوایەتی) بیر وڕێبازێکە بۆ ڕزگارکردن و ئازاد کردنی نەتەوەکان لەکۆتی دیلێتی ئیمپریالیزم و فیۆدالیزم و کەپیتالیستە چاو چنۆکەکان.

بەلای کاژیکەوە (نەتەوایەتی) ڕووداوێکی سروشت کردە، کە بەدرێژایی مێژوو بەجۆرەها شێوە و شێواز، پێ بەپێ‌ی هەل و دەرفەتی هەڵکەوتوو، گەلەک جار بە ئاگایانە و جاریش بووە بێ ئاگایانە، سەروەختێک بەتین و گوڕ، ساتێکیش لاواز و هێدی، لێرە بەئەرێتی و لەوێ بەنەرێتی، سەری هەڵداوە. لەکۆن دا، بزووتنەوەی نەتەوایەتی، گەلەک جار لەشێوە و قالبی ئاینێک دا هاتۆتە کایەوە. بەباوەڕی کاژیک، ئاین، لە بێ ئاگایی یاخود لە ئاگایی‌یەوە، هەمیشە قۆناغ و سەردەمی سەرهەڵدانی بیرێکی نەتەوەیی‌یانە بووە. دیارە لێرەدا مەبەست لەبیری (نەتەوەیی) بە پێوانەی کاژیکانەیە، نەک

ناسیۆنالیزمی ئەوروپایی.

سەرهەڵدانی بیر و بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی، بەلای کاژیکەوە، چ دەخلێکی بەسەر پەیدا بوونی سەرمایەداریتی و بۆرژوازیتی‌یەوە نی‌یە، وەکو مارکسیستەکان بۆی دەچن. بیری نەتەوەیی پابەندی هۆکار و تین و تاوی چینێکی تایبەتی نی‌یە. کەواتە ئەم بیرە بە لە نێو چوونی سەرمایەداریتی و بۆرژوازیتی، خەسڵەتی خۆی لەدەست نادات و لەنێو ناچێت. تەنها بەنەمانی نەتەوەکە لەبەین دەچێت.

کاژیکنامە چەندین نموونە لەمێژووی کورد و نەتەوەکانی دیکە هەڵدەهێنجێت و دەیانکاتە بەڵگە و پشتگیری ئەو بۆچوونانەی. بۆ نموونە لەمێژووی کورد دا شاعیری مەزن (ئەحمەدی خانی ١٦٥٠-١٧٠٦) لەرێگەی هۆنراوەکانی‌یەوە هەوڵی داوە هەستی نەتەوایەتی کورد بهوروژێنێت و لەو رێگەیەوە بە ئاگایان بێنێتەوە، تا خۆیان لەتەوق و کۆتی دیلێتی و ژێر دەستەیی ئیمپراتۆریتی عوسمانی‌ی رزگار کەن(*). هەرچەندە لەسەردەمی ئەو دا، واتە لەسەروەختی کۆمەڵگەی فیۆدالیزمی کوردەواریدا، هیچ دیاردە و بۆن و بەرامەیەکی سەرمایەداریتی و بۆرژوازیتی، لەئارادا نەبووە.

(شاهنامە) شاکارە بەنێوبانگەکەی (فیردەوسی ٩٣٤-١٠٢٠) نموونەیەکی دی‌یە.

کەواتە بەو پێ‌یە دەتوانین بڵێین لەگشت قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤایەتی دا، هەست و خورتی نەتەوایەتی لە ئارادا بووە، بێ ڕوانینە قاڵب و قەوارە جۆربەجۆرەکانی، بێ تێروانینی پلەی کاریگەریتی و تین و تاوی. هەر بۆ نموونە چ لە قۆناغی دەرەبەگایەتی و چ لەسەرمایەداریتی و چ لە سۆسیالیزم دا، بیر و هەستی نەتەوایەتی دیاردەیەکی ئاشکرا و بەرچاوە. بەڵام دیارە بە چەندایەتی و چۆنێتی‌یەکی جوداوازەوە.

هەر گۆڕانکاری و گەشەکردنێکی سیستەمی رژێم و جۆری رێبەری کردن، کاڵایەکی نوێ بە باڵای بیر و بزووتنەوەی نەتەوایەتی دا دەبڕێت، یانی ووزە نەتەوایەتی‌یەکە بەجۆر و شێوازێکی دیکە دەگۆڕێت. بەڵام ئەو ووزەیە هەردەم بەزیندوێتی دەمێنێتەوە.

وەک روونمان کردەوە، بیری نەتەوایەتی بەلای کاژیکەوە، رووداوێکی خۆڕسکی سرووشت کردە، کە لە مێژووی ژیان و بوونی هەر نەتەوەیەکدا سەرهەڵدەدات. بەو پێ‌یە

(*) Ahmad-i Chani: "Mam & Zin" oder ein Kurdishes Romeo und Julia", deutsche Übersetzung von Jemal Nebez, Publikation der NUKSE, München 1969.

"مەم و زین" یاخود رۆمیۆ وژولیێتی کورد. نەبەز کردوویە بەئاڵەمانی

مافی نەتەوایەتیش مافێکی سروشتی و خۆڕسکە و لەو ڕووەوە گشت گەلانی جیهان چوون یەکن و ئەو مافەیان دەکەوێت. بۆیە هەر زۆرلێ کردن و زۆر بۆ هێنان و چەوساندنەوەیەکی نەتەوایەتی، لەسەر هەر گەلێک، بەکردارێکی ناسروشتی و ناجۆر دادەنرێت.

لەو ڕووەوە، کاژیک حیزبێکی نەتەوەیی‌یانەی مرۆ پەروەرە، کە بۆ دەستەبەرکردنی ئەو مافە سروشت کردەی کورد دەکۆشێت. دیارە ئەو مافەش تەنها بەکورد ڕەوا نابینێت، بەڵکە بەسەرپاکی گەلانی دونیا. بۆیە کاژیک بەو پەڕی توانایەوە پشتگیری‌ی خەباتی ئازادیخوازانەی گشت گەلانی بن دەست دەکات، بەمەرجێک ئەو مافە سروشتیانەیان لەسەر حسێبی کورد و گەلانی دی تەواو نەبێت. بۆ نموونە لەکاتێکدا کەکاژیک پشتگیری خەباتی گەلانی عارەب لە پێناوی مافی چارەنووس و ژیانی ئازاد و یەکێتی‌یەکی نەتەوایەتی دا دەکات، هەمان کات دژی ئیمپریالیزمی عارەبی دەجەنگێت.

کاژیک پشتگیری‌ی خەباتی ئازادیخوازانەی ئەرمەن، ئاسووری‌ی، بیافرایی، باسکی‌ی، پاتانی‌ی، فەلەستینی‌ی، جوولەکە، پێست ڕەشەکان، ڤیتنامی‌ی، یۆنانی‌ی، گەلانی باشووری سودان، بەنگالی‌ی، ئێرلەندی‌ی، گەلانی ئەفریقیای باشوور، تیرۆلی خواروو، هیندی‌یە سوورەکان و گشت گەلانی دی دەکات.

بەڵام کاژیک پێی وایە، گەلی کورد، کاتێک دەتوانێت یارمەتی بەرچاو و کاریگەرانەی گەلان بدات، کە خۆی لەکۆت و پێوەندی دیلێتی‌ی ئازاد بووبێت. کورد دەڵێت: (کوێر ناتوانێت ببێتە چاوساغی کوێر). هەروەها زیندانی‌یەک ئەو توانا زۆرەی نی‌یە زیندانی‌یەکی هاوڕێی ئازاد کات. بۆیە هەنگاوی یەکەم بەلای کاژیکەوە، ئازادی کوردستان و گەلی کوردە و دەبێت لەوێوە دەست پێ بکرێت. ئەو کاتە دەتوانرێت کۆمەکی تەواو و پێویست بەگەلانی دیکە بکرێت.

ئالێرەدا، کاژیک، بەپێچەوانەی بیری مارکسیزمەوە لەراستی‌یەکان دەڕوانێت. ئەوان لە (سەرجەم)ەوە بۆ (بەش) دەست پێ دەکەن. بەڵام کاژیک لە (بەش)ەوە بۆ (سەرجەم) هەڵدەزنێت. بەلای کاژیکەوە، سەرجەمی گۆڕانکاری‌ی تەنها لە (بەش)ەوە شێوای دەست پێ کردنە و پێچەوانەکەی هەڵەیە. دیارە هەر (بەش)ێکیش کەرتێکە لە (سەرجەم). کەواتە شۆڕشێکی جیهانی‌ی، تەنها لەرێگەی شۆڕشی نێوچەیی، یانی شۆڕشێکی نەتەوایەتی‌یەوە شێوای کردنە.

جگە لەوە، کاژیک پێی وایە کە بەرژەوەندی و خواستەکانی چینێکی تایبەتی ی نەتەوەیەک، مەرج نی‌یە پڕا و پڕ وەکو بەرژەوەندی و خواستەکانی هەمان چینی نەتەوەیەکی دی چوون یەک بن، مادامێکی گەشەکردنی وولاتانی جیهان چوون یەک و بەیەک پلە نین. چونکە هێزە سیاسی‌یەکانی نێو ئەو وولاتە و جۆری سیستێمی رژێمەکەی، دەورێکی کاریگەر لەسەر پەرەپێدان و گۆڕینی بەرژەوەندی و خواستەکانی ئەو چینە دەبینێت. هەر بۆ نموونە خواست و ئاواتەکانی کرێکارێکی سویدی‌ی، کە لەلایەن (پارتی کرێکاران)ی سەر بە سۆسیال دێموکراتە ئۆپۆرتونیستە کەپیتالیستەکانەوە چەشە دەکرێت، هەرگیز لەگەڵ خواست و ئاواتی کرێکارێکی کورد یا فەلەستینی دا چوون یەک نین. کرێکارانی وولاتانی کۆلۆنی کراو و ژێر دەستە، هیچ کات لەگەڵ کرێکارانی ئەو وڵاتانە دا کە سۆسیال دێموکراتەکان تێیدا فەرمان ڕەوان، نایەنە بەراورد کردن.

دەربارەی دەست پێ کردن لە (بەش)ەوە، وەک رێبازێک بۆ گەیشتن بە (سەرجەم) دواین، یانی ئازاد کردنی (سەرجەم). بەڵام چۆن بەو ئامانجە دەگەین؟ کرۆک و نێوەرۆکی ئەو رزگاری و ئازادی‌یە چی‌یە؟

بە بڕوای کاژیک، بۆ ئازاد کردنی گەل، پێویستە پارتێکی خاوەن ئیدیۆلۆژی‌ی شۆڕشگێڕ بزووتنەوەکە دەست پێ بکات. ئەو پارتە دەبێت توانای ئەوەی هەبێت کە کێشە بنەڕەتی‌یە تێک چرژاوەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، کێشە نەتەوەیی وکۆمەڵایەتی وئابووری‌ی و ئاینی‌یەکان و... تاد، وەکو یەکەیەکی لێک دانەپچڕا و هەڵسەنگێنێت و شی‌یان بکاتە وە. نابێت مرۆ ئەو کێشانە لێک هەڵبوێرێت. هەر بۆ نموونە چیدی ئەو بیانووە پووچە بەسەرچوو کە بڵێن (ئێمە جارێ کوردستان رزگار دەکەین، ئەوجا کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری‌یەکان چارەسەر دەکەین).

بە بڕوای کاژیک، کوردستان تەنها بەکردە و کۆشەی نەتەوەکە خۆی رزگاری دەبێت. بۆیە دەبێت هەر لە سەرەتاوە، لەگەڵ دەست پێ کردنی بزووتنەوە ئازادیخوازەکەدا، دەست بەچارەسەرکردنی کێشە و تەنگ و چەڵەمەکانی ئەو جەماوەرە بکرێت، کە لەو بزووتنەوەیەدا بەشداری دەکەن. چونکە رزگاری بەتەنها مانای رزگارکردنی کێو و تەلان نی‌یە، بەڵکە بەپلەی یەکەم ئازاد کردنی مرۆڤە. ئازادی مرۆڤیش یەکەیەکی لێک نەترازاوە و گشت رووەکانی ژیان دەگرێتەوە، نەک تەنها نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری. کەواتە قەوارەی ئیدیۆلۆژی حیزبەکە، دەبێت سەراپای کێشە سەرەکی‌یەکانی

کۆمەڵگە بگرێتە خۆ. یانی پێویستە ئیدیۆلۆژیی ئەو پارتە لەجەرگەی کۆمەڵگەکە خۆیەوە هەڵقولابێت. تەنها ئەو کاتە دەتوانرێت تاکتیک و ستراتیژ، شان بەشانی یەک، بخرێنە خزمەتی مەسەلەی نەتەوەکەوە.

پارتە نامۆکان، ئەوانەی ئیدیۆلۆژیی‌یەکی ئاوەکی و نامۆیان هەیە و لە جەرگەی کۆمەڵگەیەکی دیکەوە سەریان هەڵداوە، ناتوانن ئەو رۆڵە ببینن. ئا بەو جۆرە کاژیک جوداوازی لەنێوان ئیدیۆلۆژی (رەسەن) و ئیدیۆلۆژی (نارەسەن) دا دەکات.

ئیدیۆلۆژیی (رەسەن) ئەو ئیدیۆلۆژیی‌یانەن کە (لەجەرگەی ئەزموون و تەجرەبەی کۆمەڵگەکەی خۆیانەوە سەر هەڵدەدەن) و خواست و ئامانجیان پراو پری خواست و ئامانجی کۆمەڵگەکەیە).

بە تێڕوانینێکی کۆمەڵگەی کوردەواری، ئەم راستی‌یانەمان بۆ روون دەبێتەوە:

جوتکاران پشکێکی هەرە مەزنی کۆمەڵگەی کوردەواری پێک دێنن. ئەم توێژاڵە، پرۆلیتاریای زەوی پێک دەهێنن و لەبارێکی گەلەک دەردناک و دواکەوتوو دا دەژین. لە لایەن دەرەبەگی کورد و داگیرکەرانی بێگانەوە دەرەتێندرێن و دادەدۆشرێن.

دەرەبەگی کورد، زۆربەیان لەدەرەوەی شارەکان، لە گوندەکان دەژین. چینێکی هێزدارن. تا ئەو کاتەی داوای سەربەخۆیی‌یەکی هەرێمی نەکەن، لەلایەن کۆنەپەرستان و داگیرکەرانی کوردستانەوە پشتگیریی دەکرێن و دەلاوێندرێنەوە. چینێکی گچکە، کە خەریکی پەرە ئەستاندن و هێز و گوڕ پەیدا کردنە، چینی بۆرژوای بچوکە، کە سەنگ و قورسایی‌یان لەشارەکاندایە.

چینێکی تەواو گچکەی کەپیتالیستی کوردیش هەیە. بەشی زۆریان لەدەرەوەی کوردستاندا دەژین و زۆربەی زۆری سەرمایەشیان هەر لەوێ بەگەڕ خستووە. ترسی زۆریان لە "ئاژاوە" و "بەرژەوەندی تێکدەر"ە.

هەرچەندە کارخانە و شیرکەتی گەورە نین و کوردستان زۆر لەگەشەکردن و بوژاندنەوە دواکەوتووە، چونکە داگیرکەران بە ئارەزوو پشت گوێی دەخەن و بەهەژاری دەیهێڵنەوە و دەیانەوێت گەشەکردنی ئابووریی لەمەودای کشتوکاڵ دا رابگرن، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی شیرکەتەکانی نەوت و چیمەنتۆ و جگەرەوە، کە لە هەندەک لەشارە گەورەکانی کوردستاندا هەن، پرۆلیتاریای کارخانەکان بەهەمان شێوە لەپەیدا بوون و گەشەکردن دان.

لێرەدا گەرەکمانە هەڵوێست و رۆڵی هەرچینێک لەمانە، لە شۆڕشی ئازادیخوازانەی کورد دا، لەباری سەرنجی کاژیکانەوە، هەڵسەنگێنین:

فیۆدال وەکو چین، (نەک وەکو تاکە کەسان، کە هەندێکیان هەڵوێستی ئەرێتی‌یان هەبووە)، هەمیشە خیانەتیان لەشۆڕشی ئازادیخوازانەی گەلەکەمان کردووە. زۆربەی کات دەستکێش و مقاشی دەستی ئیمپریالیزم و تالان کەرانی کوردستان بوون. نوێنەرانی ئەم چینە زێتر سەرەک هۆزەکانن کە گەلەک جار مەکانەیەکی ئاینی‌یشیان هەیە. بەپێی جەوهەر و مەوقیعی چینایەتی‌یان، بەهیوا و چاوەچاوی کۆمەڵگەیەکی گەورە و فراوانتری کوردەواری نین. بە بڕوای کاژیک، شۆڕشی کورد، بەهیچ جۆرێک ناتوانێت پشت بەم چینە ببەستێت و هیوای لەسەر هەڵچنێت. هەرچەندە هەندەک ئاغا و دەرەبەگ هەبوون، کە لە پێناوی بەرژەوەندی‌ی میللەتەکەیاندا دەستبەرداری بەرژەوەندی‌ی چینایەتی‌یان بوون، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی بکرێنە پێوانە و کێشانەی ئەم چینە.

بۆرژوای بچووک گەلەک جار دەم لە ئازادی و سەربەخۆیی کوردەوە دەژەنن، بەڵام تا ئەو کەوشەن و سنوورەی کە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی میللەتەکە بەرژەوەندی‌یەکانیان نەخاتە مەترسی‌یەوە. لە رووی پەیوەندی‌ی ئابووری‌یەوە وا بەستە و پابەندی پێتەختەکانی ئەو دەوڵەتە مەرکەزی‌یانەن کەکوردستانیان داگیر کردووە. ئەم چینە پێویستی‌یان بەئاسایش و ئارامی هەیە، تا بازاڕی بازرگانی‌یان لەبرەو و پایەداری‌دا بێت. شۆڕشی کورد، نا ئارامی دێنێتە کایەوە و ئاسایش دەشڵەقێنێت. کەواتە بەرژەوەندی‌یە ئابووری‌یەکانیان دەخاتە غەرغەرەوە. بەبڕوای کاژیک، لەمەودایەکی بەرتەسک و کەوشەنێکی سنوور بۆ دانراودا، دەتوانرێت ئەم چینە بۆ سوودی بزووتنەوەکە هەڵبسوڕێندرێت. بەڵام نابێت بەهیچ جۆرێک جڵەوی سەرکردایەتی شۆڕشەکە بدرێتە دەستیان، دەنا مەسەلەکە لەدەست دەچێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە سوود لە ووزە و توانای ئەم چینە وەردەگیرێت، بەڵام پێویستە بەردەوام گەل لە هەڵوێست و ئامانج و جەوهەری ئەم چینە هوشیار کرێتەوە.

پرۆلیتاریای کارخانەکانی کوردستان، هێشتا لەو پلەی تواناو رادەی هوشیاری‌یەدا نین کە مەترسی و خەتەری تەماع وچاو چڵێسی‌ی دادۆشێنەرانیان هەست پێ بکەن. بۆیە ئەرکی گرنگ و پێویست ئەوەیە کە بانگی ئیدیۆلۆژی‌یەکی رەسەن بەگوێیاندا هەڵبدرێت و چاویان بکرێتەوە. دەبێت هوشیار بین و رێگە نەدەین بە بیری چەواشە و لەخشتەبەر کە

بەنێوی (برایەتی و هاریکاری ئینتەرناسیۆنال)انەی ساختەوە فریویان دەن (وەکو هەڵگرانی هەندەک بیری نامۆ و دۆگما، کنە دەکەن)، دەنا ئەو کاتە لەبەرژەوەندی‌یەکانی شۆڕشی کورد دوور دەخرێنەوە و ووزەیان لەخزمەتی هێزە زەبەلاحەکاندا بەهەدەر دەدرێت.

تاکە چینێک کە شۆڕشی کورد دەتوانێت تاسەر پشتی پێ ببەستێت، پرۆلیتاریای گوندەکانە، یانی(جوتکاران)، کە ٨٠٪ی سەرپاکی گەلەکەمان پێک دێنن. ئەم چینە بە پێی واقیع و هەڵکەوتە چینایەتی‌یەکەیان، چینێکی شۆڕشگێڕن. بۆیە پێویستە بە بیرێکی رەسەن گۆش کرێن. هەزاران ساڵە لەلایەن ئاغا و دەرەبەگ و هێزە داگیرکەرە بێگانەکانەوە دەچەوسێندرێنەوە و چاویان بەو واقیعە تاڵەدا هەڵهێناوە. بۆیە هەست و گیانی شۆڕشگێڕێتی تێکەڵ بەخوێنیان بووە، لەگەڵ شیردا چەشتوویانە و بەو بیرە فرچک دراون.

کەواتە مەسەلەی کورد، چارە سەرکردنی کێشەی نەتەوەیەکە، کە کرۆک و نێوەرۆکی بەرژەوەندی‌ی و خەون و خواستی جوتکارانی کوردستان پێک دێنێت. بە پێی باوەڕی کاژیک، بەرژەوەندی وخواستی جوتکاران تەنها بەرژەوەندی‌یی ئابووری‌یەکان نین، بەڵکە لەپاڵ ئەوەشدا، ئامانجی نەتەوەیی‌یانە و خواستە کۆمەڵایەتی‌یەکانن. ئەو خواست و ئاواتانە یەکەیەکی لێک دانەپچڕاون، چونکە جۆتکارانی کورد لەیەک کاتدا جوتکاریش و کوردیش و چەوساوە و زۆر لێ کراویشن.

بەرژەوەندی جۆتکارانی کورد، بەو خاکەوە بەندە کە لەسەری دەژین، بەکوردستانەوە پەیوەستە. بەڵام کوردستان داگیر کراوە. بۆیە مەسەلەی ئازادی‌ی جۆتکارانی کورد، مەسەلەی رزگاری‌ی و سەرفرازی‌ی ئەو خاکەیە. بەوپێیە، مەسەلەی نەتەوایەتی و چینایەتی، لەگەڵ یەکدا پێکەڵ پێکن.

کاژیک بڕوای وایە کە ئازادی کوردستان، تەنها لەرێگەی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەوە بە ئەنجام دەگات. هیچ بزووتنەوەیەکیش بێ تێ خوێندنەوەی ویستەی ئازادانەی جوتکارانی کورد، ناتوانێت بەردەوامی‌ی و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. بەڵام نابێت ئەوەش لەیاد کرێت، کە گۆش کردن ورێکخستنی چینی جۆتکاران، کارێکی هەروا سانا و ئاسان نی‌یە. جوتکارانی کورد، (ئەوانەی لەدەرەوەی سنووری نێوچە رزگار کراوەکاندا دەژین)، لە ژێر بار و فشاری سیستێمێکی چاوچنۆک و دادۆشێنەری دەرەبەگایەتی‌دا درەتێندرێن. لەلایەن هەندەک رێبەرانی ئاینی بێ ویژدانەوە، بەبیری

دۆگما و ڕزیو تەڵقین دەدرێن و لە ووزە دەخرێن و فریو دەدرێن. وولاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، هەتا ئەوڕۆ، لەهەوڵی ئەوەدان ئاینی ئیسلام لەدژی شۆڕشی کورد هەڵسوڕێنن و بیکەنە دارەدەستێک بۆ خەفەکردنی خواستی ئازادانەی نەتەوەکەمان. وەک نموونەیەک ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێڕمەوە: پاش یەکگرتنی سوریا و میسر لەفێبریوەری ۱۹۵۸دا، ناصر زەبرێکی توندی لەسیستێمی دەرەبەگایەتی میسر و سوریا دا. بەو پێ‌یە دەستەڵاتدارانی عارەبی سوریا، یەکێک لەدارەدەستە گرنگەکانیان بۆ بەربەرەکانی‌ی کێشەی کورد لەدەست دا. بەڵام دەست بەجێ لەگەڵ تورکیادا وەخۆ کەوتن، تا پێکڕا بەر بە بزووتنەوەی کوردایەتی بگرن. تورکیا، (مەلا)یەکی ریشداری، تازە پێدا کەوتووی، کورد زمانی نارده نێوچە کوردی‌یەکانی سوریا وە، تا لەژێر چارشێوی ئیسلام دا بەربەرەکانی بیری کوردایەتی بکات. مەلای ریشداری تەڵەکەباز، لە ماوەیەکی کوردت دا گەلەک ساکار و دڵپاکی لەخۆ کۆکردەوە و زۆر کەسی لەسیاسەت دوور خستەوە، تا رۆژێک کوردێک بە پرتاو خۆ بە ماڵی مەلا دا دەکات. دەبینێت جەنابی مامۆستا (دەخواتەوە)! عارەقیش لەئیسلام دا حەرامە، کابرای کوردە کەللەیی دەبێت. خۆی زۆر بە فریودراو و لەخشتە برا و دێتە پێش چاو، بۆیە دەست بەجێ مەلا بەر گوللە دەدات.

کاتێک پۆلیس دێن و ماڵی مەلا دەپشکنن، چەندین قاپی دیکەش عارەق دەدۆزنەوە. لێکۆڵینەوە و پشکنین و گەڕانی زێتر بەدەری دەخات کە (ڕدێن)ەکەشی ساختەیە.

ئەم بەسەرهاتە دەری دەخات کە داگیرکەرانمان چ داو و پیلانێکی ئەهریمەنانە دەچنن و چۆن گشت رێگەیەکی ساختە و تەڵەکەبازیمان بەرامبەر وەبەر دەگرن.

جوتکارانمان ئەزموون و تەجرەبەی تاڵیان تەنها لەگەڵ (ڕدێن داری) ساختەدا نی‌یە. گەلەک جار لەلایەن بۆرژوا کەڵەک بازەکانیشەوە لەخشتە براون. لەگەڵ (چەپ ڕەوە) قسە قیتەڵەکانیشدا، تەجرەبەی دڵخۆشکەریان نی‌یە. زوو بۆیان ئاشکرا بوو کە ئەو (چەپی)یانەش لەووشەی قەبە و ئاڵ و والا زێتریان پێ خەلات نەکردوون. هەرچەندە جۆتکارانمان بێ سەواد و نەخوێندەوارن، بەڵام بە تەجرەبە فێر بوون، کە زۆربەی زۆری ئەو قسە زل و دەم هەراشانەش وەکو بۆرژواکان، تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆیان هەڵپە دەکەن. بۆیە جوتکاران لەزۆر خاوەن شەهادە و خوێندەوار بەد گومانن و بە (شلە شاری) و (سەرچەور) نێویان دەبەن.

ئا لەو بارە دەردناکەدا، لەو هەل و دەرفەتە سەختە دا، رێکخستن و فێر کردنیان،

یەکێکە لەئەرکە هەرە گران و دژوارەکان.

شۆڕشی کورد، کە بە پلەی یەکەم پشتی بە جوتکارانی کورد بەستووە، دەیتوانی گەلەک خزمەت بە جوتیاران بکات، گەر ڕێبەرێتی و سەرکردایەتی شۆڕشەکە جۆرێکی دیکە بایە. مەبەستم ئەوەیە. گەر سەرکردایەتی‌یەکەی کەمێک لەو ئۆپۆرتونیست وخۆ پەسەند و هەلپەرستانە پاکژ کرابا. ناشڵێم سەرکردایەتی شۆڕشەکە هەر هیچی بۆ جوتکاران نەکردووە، بەڵام گۆڕانکاری‌یەکی بەرچاوی ئەوتۆش بەسەر باری ژیانیاندا نەهاتووە.

کاژیک بڕوای وایە، لەسەر شۆڕشی کورد پێویستە کە بە پلەی یەکەم بەرژەوەندی‌ی و خواست و ئاواتەکانی جوتکارانی کورد دەستەبەر بکات. ئەمە یانی (هەر سەرکەوتنێک لەجەنگی رزگاری‌یدا، ئازاد کردنی هەر نێوچەیەکی کوردستان، دەبێت و پێویستە هێز و گوڕێک بە جوتکارانی کورد ببەخشێت. بە واتایەکی دی، هاوئاهەنگ لەگەڵ رزگارکردنی هەر بستێکی خاکی کوردستاندا، وا پێویست دەکات، رژێمی گەندەڵی دەرەبەگایەتی هەڵقەندرێت و ریشەکێش کرێت).

کاژیک پێ‌ی وایە کە چارە سەرکردنی زەوی‌ی بەرێگەیەکی سۆسیالیستانەی شۆڕشگێڕانە، دەبێت هاوکات لەگەڵ شۆڕشی رزگاری خوازانە دا پێڕەوی‌ی لێ بکرێت. بێ ڕاڕایی و گوێ دانە دڵی ئەم ئاغا، یا ئەو دەرەبەگ و کولە کوێخا، بێ ئەوەی بیر لەوە بکرێتەوە لەم کاتەی ئێستا دا چ دەسکەوت و سوودێکی بۆ شۆڕش تێدایە.

بە بڕوای کاژیک، وەبەر گرتنی هەڵوێستێکی ئاوها، لە دوولاوە پێویست و بایەخدارن.

١- لەڕووی ستراتیژی‌یەوە هەڵوێستێکی راست و گونجاوە، چونکە بەرژەوەندی‌ی گەورەترین چینی کۆمەڵگەکەمان دەستەبەر دەکات.

٢- لەڕووی تاکتیکیشەوە لەبارە، چونکە جوتکاران بەتەجرەبە بۆیان ئیسپات دەبێت، کێ بۆ بەرژەوەندی‌یەکانیان دەکۆشێت و دەیپارێزێت. جگە لەوەش، جوتکاران کە کۆڵەکە ونێرگەی پتەوی شۆڕشەکەمانن، بەرەبەرە لەمەودای بەردەوامی شۆڕشە ئازادیخوازەکەماندا، دەتوانن جڵەو و ڕێبەری‌ی شۆڕشەکە بگرنە دەستی خۆیان.

ئەمە مانای ئەوە نی‌یە ئیدی پرۆلیتاریای کارخانەکان، کە تا ئێستا لاواز و کەم هێزن، بە جڵەو خستنە دەستی جوتکاران، پشت گوێ خرێن.

پرۆلیتاریای کارخانەکان، بەردەوام لەهێز و گوڕ پەیدا کردندان. دەبێت ئەوانیش بۆ

سوودی شۆڕشەکە وەگەڕ خرێن. چونکە بێ بوون و دامەزراندنی کارخانە و شیرکەتی گەورە و مەزن، کوردستان بە پابەندی هێزە زەبەلاحەکان و داگیرکەرانی دەمێنێتەوە. لێرەشدا وا پێویستە کێشە ئابووری و کۆمەلایەتی و نەتەوایەتی‌یەکان پێش چاو بگیرێن.

بە بڕوای کاژیک، دامەزراندنی کارخانە و کارگەی ئەوتۆ، کە کوردستان بە پابەندی و کلکایەتی‌ی وولاتە داگیرکەرەکانەوە بهێلێتەوە، لە بەرژەوەندی‌ی کورد نی‌یە. داگیر کەران هەمیشە لەهەولی ئەوەدان کە کوردستان. زێتر و زێتر بەسەرمایەی بێگانەوە، گرێ بەند کەن.

جگە لەوە، بەردەوام خەریکن بەنێوی کارخانە سازیی کوردستانەوە، کەمە نەتەوەیی دیکە بێننە کوردستانەوە، تا بەو شێوەیە واقیعی نەتەوایەتی نیشتمانەکەمان بگۆڕن. کارخانە سازیی کوردستان، تا بەو شێوە و شێوازە کە کوردستان بەسەرمایەی پێتەختی وولاتە داگیرکەرەکانەوە دەبەستێتەوە و چەپۆکی ئیستعمارانەیان فراوانتر و هێزدارتر دەکات، بەلای کاژیکەوە نا شایستە و ناپەسندە و لەئاستی بێ دەنگ نابێت.

ئا بەو پێ‌یە، کاژیک پارتێکی سۆسیالیستانەیە، کە لەداڕشتنی دینگە جەوهەری‌یەکانی سۆسیالیزم دا، جوداوازی نەتەوەی‌ی و کۆمەلایەتی‌ی گەلانی جۆر بەجۆر، تێ دەخوێنێتەوە.

کاژیک پێ‌ی وایە، هیچ رێبازێکی سۆسیالیزمانە نی‌یە کە پڕا و پڕ بۆ گشت نەتەوەکانی جیهان گونجاو و شیا و بێت، بێ گوێ دانە باری کۆمەلایەتی و ئابووری، بێ بایەخ دان بە مێژوو، بەباری دەروونی و پلەی هۆشمەندی ئەو نەتەوەیە.

بەلام چەشنە جۆربەجۆرەکانی سۆسیالیزم، خالێکی نێوکۆیی‌یان هەیە، ئەویش ئەوەیە (لەسەرجەمی بیرە سۆسیالیزمەکاندا، دەبێت "هی خۆیی تاکی" سنوور و مەودایەکی وای بۆ دانرێت، کە بەر بە دادۆشین بگرێت).

جگە لەوە بەبڕوای کاژیک، سۆسیالیزم خۆی لەخۆی دا ئامانجێک نی‌یە، کە بەخەباتی شۆڕشگێرانەی چەکدارانە پێ‌ی بگەیت، بەلکە هۆ و ئامرازێکە بۆ گشت کەسێک، بۆ گشت گەلێک، تا ووزە و توانای خۆی لە پێناوی ئازادی و خۆ بەخۆیی دا وەگەڕ بخات.

کاژیک بڕوای بەدەستەلاتی تاکە چین نی‌یە و پێ‌ی وایە کۆمەلگەی فرە چین، کۆمەلگەیەکی نەخۆش و کەنەفتە.

بەلای کاژیکەوە، مرۆ تەنها لەبواری توانا و ژیریتی‌یدا لێک جوداوازن.

ئەوەش بۆهاتنە کایەی کۆمەڵگەیەکی هاو ئاهەنگ، جوداوازی‌یەکی پێویستە. بۆ ئەوەش پێویستە هەمووان مافی چوون یەکیان هەبێت. چونکە کۆمەڵگە وەکو لەشێک وایە و تاکە تاکەی مرۆڤیش بەشە جوداوازەکانی ئەو لەشە پێک دێنن. (مرۆ ناتوانێت بڵێت چاو لە گوێ پڕ بایەخ ترە بۆ لەش. هەردووکیان گرنگ و پڕ بایەخن. تەنها ئەرکیان جوداوازە)، بۆیە پێویستە ئامرازی بەرهەم هێنان ئازادانە بخرێتە بەردەستی هەر کەسێکەوە کە توانای بەکارهێنانی هەبێت و دەرفەت بۆ هەر یەکێک بڕەخسێندرێت کە ئارەزووی فێر بوونی بکات.

کە کاژیک پشتی جوتکاران دەگرێت و پشتیان پێ دەبەستێت، لەبەر ئەوەیە کە لەم سەردەمەی کۆمەڵگەی کوردەواریدا، شۆڕشگێرترین چینن. دەنا کاژیک بڕوای بە کۆمەڵگەیەکی یەکسانی بێ چینە، کە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان ئازادانە بۆ گشت کەس فەراهەم بکرێن. گشت تاکێک بۆی هەیە سەربەستانە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان بەکار بەرێت، بەمەرجێک ئەو سەربەستی‌یە نەگاتە ئەو پلەیەی چینێکی دادۆشێنەر بهێنێتە کایەوە. دیارە بەکار هێنانی سەربەستانەی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان مۆنۆپۆل دەرسکێنێت، بۆیە پێویستە بەردەوام چاودێری بکرێت ۆ بەر بەهاتنە کایەی مۆنۆپۆل بگیرێت، ئەو دەزگایەی بە ئەرکی ئەو چاودێری‌یە هەڵدەستێت، (دەوڵەت)ە، کە لە بواری نێوخۆ دا ڕێگە لە دادۆشین دەبەستێتەوە و نەتەوەکە بەو بیر و باوەڕە گۆش دەکات، لە ئاستی دەرەوەش دا پارێزگاری لەوولات دەکات. کەواتە دەوڵەت ئامرازێکە لەدەستی ئیدیۆلۆژی‌یەکەدا. ئەو ئامرازە هەم یەکەیەکی نەتەوەیی یەکگرتوو دێنێتە کایەوە و هەم کۆمەڵگەیەکی بێ چین و یەکسان. چونکە بە بڕوای کاژیک، گەل کاتێک یەکەیەکی نەتەوایەتی پێک دێنێت، کە گەیشتبێتە پلەی تەفر و توونا بوونی چینایەتی.

بەوپێ‌یە کاژیک گیانی ئیدیۆلۆژی‌یەکی نوێ بە بەری نەتەوەی کورد دا دەبرێت.

کاژیک بە پێچەوانەی حیزبە کوردی‌یەکانی بەر لەخۆی، لەسەر ئاستێکی نەتەوایەتی دامەزراوە، کە هەموو کورد دەگرێتە خۆ. چونکە گشت کوردێک، لە هەر کوێ کە هەن، هەمان کێشەیان هەیە. هەمووان بێ جوداوازی‌ی، بەهەمان هۆ و بیانووەوە، لە لایەن دوژمنان و داگیرکەرانەوە، دەچەوسێندرێنەوە و دەرەتێندرێن و دادەدۆشرێن.

کەواتە کاژیک یەکەم حیزبێکی کوردە کە لەسەر ئاستی هەرێمایەتی ئەو سنوورە

دەستکردانە دانەمەزراوە و چەکی بیروباوەڕی داوەتە دەست تێکۆشەرە ئازادیخوازەکان. ئەوانی دی، هەر چەندە ئازادی کوردستانیش ئارەزوو بکەن، پێی ناگەن. چونکە یاخود بێ ئیدیۆلۆژین، یا بیر و باوەڕێکی ڕەسەنیان نییە. بیرو باوەڕی ڕەسەن بەلای کاژیکەوە ئەو بیر و باوەڕەیە کە لە جەرگەی خواست و ئاواتەکانی کۆمەڵگەکەوە سەریان هەڵداوە. بۆیە کاژیک گشت بیرێکی دۆگما و ئاوەکی دەداتە دواوە، ئەو بیرانەی دەیانەوێت یاسا و دەستوور و پێوانەی کۆمەڵگەیەکی نامۆ، بێ تێ ڕامان، بەسەر کۆمەڵگەیەکی دیکەدا بسەپێنن. هەر بۆ نموونە کاژیک دژی ئەو مارکسییە تەقلیدییانەیە کە کوێرانە نووسینەکانی مارکس و ئینگلز و هاوبیرەکانیان بە چاکترین (ڕەچەتە)ی دەردی کورد تێ دەگەن. بەلای کاژیکەوە ئەو کەسانە کۆنەپەرستن، نابینا و ناواقیعی و نا شۆڕشگێڕن.

کاژیک لە توێژینەوەی مێژووی سیاسیی کورد دا گەیشتۆتە ئەو سەر ئەنجامەی کە ماکی سەرەکیی نا بەکامیی و سەرنەکەوتنی بزووتنەوە سیاسییەکانی کورد، نەبوونی ئێدیۆلۆژییەکی ڕەسەن بووە.

بە بڕوای کاژیک لەسروشت دا بۆشایی نییە، هەر کە بوو بە ماتریالێک پڕ دەبێتەوە، چاک یاخراپ. بۆ نموونە گەر ژوورێکی کپی بێ هەوا، دەروازەیەکی چکۆلەی تێکرا، دەست بەجێ هوروژمی هەوای بۆ دەچێت و پڕ دەبێتەوە. خۆ ئەگەر بێتو هەوای پاکژ لەئارادا نەبێت، ئەوا بەهەوایەکی دژوێن پڕ دەبێتەوە. ئەم یاسایە لە ژیانی ئادەمییشدا بەر قەرارە. کە بیرو ژیانی مرۆ، بۆشایی تێ کەوت، ئەویش دەست بەجێ پڕ دەبێتەوە. بەڵام بەر لەوەی ئەو بۆشاییە بە ئیدیۆلۆژییەکی نارەسەن پڕ بێتەوە، دەبێت ئێدیۆلۆژییەکی ڕەسەنی بۆ فەراهەم کەین. مەخابن لەبەر ئەوەی لەژیانی سیاسیی کورد دا ئێدیۆلۆژیی ڕەسەن نەبووە، ئەوا ئێدیۆلۆژیی ئاوەکی و نارەسەن هوروژمیان هێناوە. بەهەمان دەستوور، بزووتنەوەکانیشیان ناڕاست و نارەسەن بوون. بۆیە سەر ئەنجامیان نا بەکامیی بووە. ئەو ڕاستییانە پێویستیی بوونی کاژیک، چ وەک ڕێکخراو و چ وەک ئیدیۆلۆژییەکی فەلسەفی، دەسەپێنێت.

هاووڵاتی و دۆست و برادەرە ئازیزەکان!

لەسەر هەر یەکەمان پێویستە بیر و هۆشی تەواومان لای کێشەی نەتەوەکەمان بێت. لەخۆ بپرسین لە چ ڕێگە و ڕێبازێکەوە دەتوانین خزمەتی زێتر بەمەسەلەی میللەتەکەمان بکەین و سەرکەوتنی پاشەڕۆژی مسۆگەر بکەین.

به بڕوای من، لەسەر گشت کوردێک پێویستە، لەهەر کوێیەکی ئەم دونیایەدایە، لەچوارچێوەی ئێدیۆلۆژی‌یەکدا خۆی ڕێک بخات و خۆی ساغ کاتەوە و خۆ بۆ ئامانجی نەتەوەکەی تەرخان کات. ناشتوانین لەوە زێتر بەهیوا بخوازین، هەر کەسێک، کە مەسەلەی مرۆڤایەتی بەلاوە پیرۆز و بایەخدارە، پشتی هەق و ڕاستی بگرێت و لەخەباتماندا پشتیوانیمان لێ بکات. بە دڵنیایی‌یەوە دەڵێم، هەرکاتێک، ئامانج و خواستی خۆمان دیاری کرد و ڕێک و لەبار و پڕا و پڕ هەوڵمان بۆ داو دژی زوڵم و ستەم وەستاینەوە، ئەو کاتە سەردەکەوین. ئەو ڕۆژەی کە خۆ بدۆزینەوە و هێز و دەستەڵاتی ڕەشی داگیرکەرە زۆردارە خۆسەپێنەکان تووڕ دەینە سەرە نوێلکی مێژووە وە، بە دوور نی‌یە. بۆیە نابێت ڕێگە بە دوور و ناهەموار تێ بگەین. ئێمە ئاوات و ئامانجێکی روون و دیارمان لەپێش چاوە، ئامانجێک کە گشت مرۆڤێکی ڕاستەقینە پێی ڕازی‌یە و پشتگیری‌ی لێ دەکات. دیارە باوەڕمان بە ئامانج و توانای خۆمانە، بۆیە لەگەڵ (هەژار)ی هێژا دا دەڵێینەوە:

### هەر کوردم(*)

به دەربەدەری، یان لە ماڵی خۆم
لەخاکی عارەب، لە ئێران و ڕۆم
کۆک و پۆشتە بم، ڕووت و ڕەجاڵ بم
کۆشکم دەقات بێ، وێرانە ماڵ بم
ئازا و ڕزگار بم ، شادان و خەندان
یان زنجیر لە مل لە سووچی زیندان
ساغ بم، جەحێڵ بم، بگرم گوێسوانان
یان زار و نزار لە نەخۆشخانان
دانیشم لە سەر تەختی خونکاری
یان لە کۆلانان بکەم هەژاری
کوردم و لە ڕێی کورد و کوردستان
سەر لەپێناوم، گیان لەسەر دەستان

(*) شاعیر و هونەرمەندی ئالەمانی، خاتوو (DORIS FEYERABEND) ئەم هۆنراوەی هەر بەشیعر کردۆتە ئالەمانی.

بەکوردی دەژیم ، بەکوردی دەمرم
بەکوردی دەیدەم وەرامی قەبرم(*)
بە کوردی دیسان زیندوو دەبمەوە
لەو دنیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە

***

(*) موسڵمانان پێیان وایە کەمرۆ پاش مردن، دوو فریشتە دێنە سەری و لە کرداری ژیانی دەپرسنەوە. ئەو پرسیارانە دەبێت بەزمانی عارەبی وەرام بدرێنەوە. شاعیر دژی ئەوە دەوەستێتەوە وسوورە لەسەر ئەوەی بەکوردیی وەرام دەداتەوە.

# پاشکۆکان

١- کوردستان، خاک و گەلەکەی.

٢- کورد لەگۆشەنیگا و باری سەرنجی بێگانەکانەوە.

٣- سەرنجەکانی نووسەر.

٤- لیستەیەکی بەرهەمەکانی نووسەر.

٥- نێوەرۆک.

## کوردستان، خاک و گەلەکەی

### ١- پوختەیەکی جوگرافیایی

کوردستان کە بەواتای "وولاتی کوردان" دێت، نێوێکی مێژوویی و جوگرافیایی دێرینە. بۆ یەکەم جار لەسەدەی دوازدەهەم دا بەکار براوە. ئەو کاتەی سولتان (سنجار)ی سەلجوقی، بەشێکی ئیمپراتۆرێتەکەی دەداتە کورەکەی و بەرەسمی ئەو بەشە بە کوردستان نێو دەبات. کوردستانی ئەو کاتە، سنوورەکانی بەم شێوەیە کۆتایی هاتووە: لەخۆر هەڵاتەوە هەمەدان و دینەوەر و کرماشان، لەخۆرئاواوە زاگرۆس و شارەزوور (سلێمانی ی ئەورۆ) و سنجار[٧٦٠].

یەکەم نووسەرێک کە نێوی کوردستانی بەکار هێناوە، مێژوونووسی فارس، (حەمدوڵلا مستەوفی قەزوێنی)یە. لەکتێبە نووسراوەکەی ٧٤٠ ک دا، (نزهة القلوب)، سنووری کوردستان بەم جۆرە دەست نیشان دەکات:

لەخۆرهەڵاتەوە عێراقی عەجەم، لە باکوورەوە ئازربایجان، لە خۆرئاواوە عێراقی عارەبی ی، لە باشوورەوە خوزستان. بە پێ ی نووسینەکەی قەزوێنی کوردستان ئەو کاتانە شازدە باژێڕ بووە. هەندەک لەو باژێڕانە ئەورۆ چیدی هەوارگەی کورد نەماون.

دێرینترین نەخشەیەک کە نێوی کوردستانی لەسەر تۆمار کرابێت، ئەو نەخشەیەیە کە لەساڵی ١٥٦١دا (A. Lafreri) لەڕۆما لەژێر سەردێڕی (La Descrittine delle prima parte dell' ASia) دا کێشاوێتی[٧٦١].

تا ئەورۆکە نەخشەیەکی وا لەبەر دەست دا نی‌یە کە پڕاو پڕ خاکی کوردستانی نەخشەکێشا بێت. کەم و کووڕیی نەخشەناسی‌یە ڕەسمی‌یەکان و بێ سەر و بەری سەرژمێری ژمارەی دانیشتوان، ئەو کارەیان گران کردووە.

لەو بارەوە پرۆفیسۆر (G. Fochler-Hauke) دەڵێت: ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر دا بەخشراوەتەوە، یا بەهەڕەمەکی‌ی ژمارەی کورد دەقسرێنن، یا بەجۆرەها تەڵەکە و فێڵ ژمارەیەکی زۆر دوور لەڕاستی‌ی پێش چاو دەخەن"[٧٦٢].

کوردەکان خۆیان رووپێوی خاکەکەیان بەنێزیکەی ٥٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشە دەقسرێنن. دەوڵەتانی تورکیا و سوریا و عێراق هەمیشە سیاسەتی تواندنەوەی کوردیان وەبەر گرتووە. تا ئەورۆکەش ئەو بەزۆر گواستنەوەیەیان بەنێوی دامەزراندنی (کێڵگەی دەوڵەتی‌ی)یا (پشتێنی عارەبی) و(تورکی)یەوە بەردەوامە[٧٦٣].

ئەو سیاسەتی رەو پێ کردنە، زۆر نێوچەی کوردنشینی لێک دابڕیوە و گەلەک نێوچەی کوردنشینی لەدەرەوەی خاکەکەیاندا دروست کردووە.

هەوارگەی کوردان ئەورۆکە بەنێزیکە ئا بەم جۆرەیە: گۆلی وورمێ لەسەرووی رۆژهەلاتەوە، تا مەلاتی‌یە لە خوارووی رۆژئاواوە[×]. لە رۆژئاواوە کەنارەکانی زەریای نێوەڕاست، لەوێوە تا داوێنی خوارووی کرماشان شۆڕ دەبێتەوە[٧٦٤].

کوردستان وولاتێکی شاخاوی‌یە، تەنها داوێنەکانی خوارووی رۆژئاوای گردۆلکە و تەختانی‌یە. خاکەکەی دەکەوێتە نێوان هێلی ٣٤-٣٩ پانایی و هێلی ٣٧-٤٦ی درێژایی‌یەوە. خاکەکەی بە پیت و بەرەکەتە. گەلەک رووبار و چۆمی لێ هەڵدەقوڵێت و پێیدا تێپەڕ دەبێت. بۆ نموونە دیجلە یەکێکە لە سەرچاوە ئاودێری‌یە هەرە گرنگەکانی نێوچە ووشک و قاقڕەکانی خوارووی عێراق. گەلەک چۆمی دیکەی وەکو زێی گەورە و زێی گچکە و سیروان و ئاراز کوردستان ئاودێر دەکەن و وولاتەکەیان کردۆتە خاکێکی پڕ فەڕ و بەرهەم دار. جگە لەوانە، دوو گۆلی دەستکردی گەورەشی لێ‌یە، دوکان و دەربەندیخان. گەلەک تاڤگەی خوڕی واشی هەن، کە دەتوانرێت بۆ بەرهەم هێنانی ووزەی کارەبا سوودیان لێ وەرگیرێت. ئەوانە و دووگۆلە مەزنەکەی (وورمێ) و (وان) لە کوردستانی ئێران و تورکیا، دەتوانن سەرپاکی وولاتەکە پڕ کارەبا کەن.

(×) دەبێت ئەمە سەرووی رۆژئاوا بێت نەک خوارووی رۆژئاوا.

تا ئێستا ئەو دیمەنە شیرنە سەرنج ڕاکێشانەی کوردستان و ئەو سروشتە خۆرسکە عـیللەت پەرێنەی، بۆ مـەبەسـتی گـەشت و گـەڕان و چاک بوونەوەی دەردەداران نەقۆزراوەتەوە و سوودی لێ وەرنەگیراوە. بەهەق هەندەک ئەورووپایی کوردستانیان بە (سویسرا)ی خۆرهەلات ناو بردووە(*).

ئەو کاتانەی هەوای ووشکەرۆی نێوچەکە و گەرمای پروکێنەری ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست پلەی گەرمای وولاتانی عارەب دەگەیەنێتە ٥٠ پلە، لە کەژ و کێوەکانی کوردستاندا پلەی گەرمای ١٨-٢٥، دەروون فێنک دەکاتەوە. مرۆ دەتوانێت لەساڵ دا ٦-٧ مانگ تیشکی زێرینی خۆر بچێژێت.

لە لێرەواری چڕو پڕەکانی باکووری خۆرهەلاتی کوردستاندا، گەلەک گوند و هەواری دلگیر هەن. بە پێچەوانەی ئەوەوە، نێوچە سنوورییەکانی نێوان تورکیا و عێراق لەبەردی ڕەق و خاکی ئاگرپژێن دروست بوون، کە بەکەلکی کشتوکاڵ نایەن. بەلام لەڕووی ستراتیژی سوپایی‌یەوە بایەخێکی زۆریان هەیە.

## ٢- باری ئابووری خاکەکە

ئابووری کوردستان زێتر لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێو کردن بەندە. کشتوکاڵ بە جۆر و شێوازێکی زۆر سەرەتایی‌یانە و دواکەتوو بە بەرهەم دێت. لەگەڵ ئەو دەوڵەمەندی و پڕ خێر و بێری‌یەی وولاتەکەدا، دانیشتوانی زۆر هەژارن، چونکە کان و سەروەت و سامانی خاکەکەی لە لایەن داگیرکەرانەوە بەتالان دەبرێت.

لەکوردستاندا جۆرەها میوەی هەمە چەشنەی وەکو شاتوو، توو، گوێز، هەنجیر، زەیتوون، سێو، هەنار، هەرمێ، قۆخ، کشمیش، گێلاس، قەیسی، ترێ، شووتی و کاڵەک بە بەرهەم دێن.

ئەو میـوە جـۆر جـۆرانە و ئەو ئاو و هەوا هەلکەوتووە چاکەی بۆ ترێ ڕەخساوە، دەتوانرێت چاکترین خواردنەوە و ئاوی میوەی لێ بەرهەم بهێنرێت.

ئاوو هەوای هەلکەوتووی بوارێکی چاکیش بۆ بەخێو کردنی کرمی ئاوریشم و هەنگ دەڕەخسێنێت. نێوبانگی هەنگوینی پڕ تام و چێژی کوردی، سنووری وولاتەکەی بەزاندووە.

(*) Muller, Gottfried Johannes:" Im brennenden Orient", Stuttgart, 1959.

بە هۆی سیلاح شۆری و چەک ئەندازی‌یەوە، کورد ڕاوکەری چاکن. نێچیرەکانی وەکو (پڵنگ، وورچ، ڕێوی، دەڵەک، سمۆرە)، پێستە و کەوڵی زۆر بەنرخیان هەیە.

ئاژەڵداریی، بازرگانی‌یەکی پڕ برەوی لەگەڵ وولاتانی هاوسێ دا خولقاندووە. مەڕ، بزن، گا، مانگا، ئێستر، کەر و ئەسپ وەکو ئاژەڵی ڕەسەن و بۆ چاک کردن دەفرۆشرێن. جگە لەوانە کوردستان، گۆشت و باڵندە و پێستە و پەڕ و کەوڵی زۆریش دەنێرێتە دەرەوە. هەندەک بەرهەمی سروشت کردیش بایەخێکی چاکیان بۆ برەو پێدانی کارخانەسازی‌ی هەیە، وەکو جەوت و مازوو، کە بۆ پێستە خۆش کردن بەکاردێن. فەرش چنین، تا ڕادەیەک، پیشەیەکی نوێ‌یە. لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لەبەرهەمە پیشەسازی‌یە گرنگەکانی وولاتەکە و گرێ چنی‌ی پیشەیەکی دێرینە. تا ئەوڕۆکەش ژنانی کورد لە زستاندا جوانترین و پڕ بەهاترین فەرش دەچنن. فەرش ناسی شارەزا دەست بەجێ فەرشی ڕەسەنی کوردی‌ی بە نەخش و نیگار ورەنگەکەیدا دەناسێتەوە، دەشتوانێت بڵێت لەکام پارچەی کوردستان دروست کراوە. هەرچەندە کارخانەی ئامێری‌ی فەرش چنینیش دامەزراون، بەڵام شارەزایی صەدان ساڵەی فەرش چنین، لەنەخش و نیگاری ئەوانیش دا بۆتە سەرچاوە و ڕەنگی داوەتەوە.

زیو و زێڕەنگەری‌ی کوردستان بە نێوبانگە و لەلایەن خەڵکیشەوە زۆر بایەخی پێ دەدرێت. هونەری هەڵکۆڵین و نەخش کێشان لەکوردستاندا پێش کەوتووە و لەبرەو دایە، بۆ نموونە خەنجەر و چەقۆ و دەمانچە و تفەنگی ڕازاوە زۆرن(*).

بازرگانی‌ی توتن لەسەدەی پێشووەوە پاڵپشتێکی چاکی بۆ ئابووری‌ی کوردستان پێک هێناوە. بۆ نموونە تەنها کارگەی جگەرەی سلێمانی، گەر هەل و بواری لەباری بۆ بڕەخسێت، بەرهەمی بەشی سەرپاکی عێراق دەکات. هەر لە سلێمانی کارگەیەکی گەورەی چیمەنتۆشی لێ‌یە. ئەویش بەرهەمێکی فرە و بەرچاو دەخاتە بازاڕەوە.

چونکە خاکەکە هەل و دەرفەتێکی سروشتی چاکی بۆ چەوەندەری شەکر هەیە، وا خەریکن لە کوردستانی عێراق دا کارگەیەکی شەکر دابمەزرێنن.

---

(*) Berliner, R. und Borchardt, P.: “Silberschmidearbeiten aus Kurdistan”, Berlin, 1922.

بەشێکی دیار و بەرچاویش صابون و گوڵاو و پێڵاو و جل و بەرگ بەبەرهەم دێن.

### ٣- سامانی ژێر زەوی

بەروبوومی کانەکانی کوردستان، دەتوانن ئەم نێوچەیە بکەنە یەکێک لە دەوڵەمەندترین وڵاتەکانی جیهان. بەشێک لەو کانانە هێشتا بەرهەم نەهێنراون. بەشێکیشی لەسەر حسێبی دانیشتوانی کورد، لەلایەن داگیرکەرانی وڵاتەکە و هێزە زەبەلاحە ئیمپریالیستەکانەوە تاڵان کاری دەکرێت. کوردستان یەکێک لەدەوڵەمەندترین سەرچاوەکانی نەوتی جیهانی تێدایە، بەتایبەت چاوگەکانی کەرکوک و موسڵ لە عێراق، کرماشان لە ئێران، قەرەچوغ لە سوریا، سیفەرک و باتمان لە کوردستانی تورکیا، لە لایەن شیرکەتە ئیمپریالیستەکانەوە بە تاڵان دەبرێن.

ئەو کانانەی هێشتا بە بەرهەم نەهێنراون، وەکو مس لە (پالۆ، تورکیا). خەڵووزی بەرد لە (جزیرە و سیلڤان، تورکیا). ئاسن لە (پێنجوین، عێراق). کرۆم و قورقوشم و کبریت لە (وان و سیعەرت، تورکیا)[٧٦٥].

### ٤- ئارخیۆلۆژی و ژیۆلۆژی

خاکی کوردستان پاشماوەی گەلەک شارستانی کەونارا و کولتوری دێرینی لێ بەجێ ماوە، بۆ نموونە وەکو پاشماوەی میدییەکان و ساسانییەکان و ئاسوورییەکان و میتانییەکان و... تاد.

خاکەکەی لە باری سەرنجی بەردناسییەوە (بۆ نموونە گۆلی نیشتوو و بەردی جۆش خواردوو) بایەخێکی زۆری هەیە[٧٦٦].

### ٥- گەلەکەی

بە پێی داب و نەریت، زۆربەی خەڵکەکەی موسڵمانن. پێڕەوانی ئاینزای سوننی لەنێو کورد دا تا ئەندازەیەک لەشیعە زێترن. لەبەر ئەوەی کوردەکان هەر لە کۆنەوە بڕوایان بە (هەرکەس بۆخۆیی) بووە، بۆیە بەنابەدڵ دەستبەرداری ئاینی کۆنی خۆیان بوون و ئیسلامیان بە زۆر بەسەردا سەپاوە. هەر لەبەر ئەوە لەنێو کورد دا گەلەک رێچکەی ئاینی پەیدا بوون، کە بەهەق بە موسڵمانی ساختە نێو دەبرێن، وەکو ئەهلی هەق. لەپاڵ ئەوانەشدا گەلەک تەریقەتی ئاینیی و دەروێشگەری هەن، وەکو قادری و نەقشبەندی و

عەلەویی. ناموسڵمانەکانی کوردستان بەزۆری یەزیدیی و دیانن. یەزیدیی‌یەکان گەلەک جار بەشەیتان پەرست نێو دەبرێن. ئاینەکەیان تێکەڵەیەکی دەستووری ئاینەکانی ئێرانی کۆن و دیان و ئیسلامە. ئەمانە نەشەیتان پەرستن و نەموسوڵمانی دەستکرد. دیانەکانی کوردستان لە ئاینزاکانی رۆمی کاتۆلیکی و پرۆتستانتی و ئۆرتۆدۆکسی پێک هاتوون. لە پاڵ ئەوانەشدا هەندەک زەردەشتی و بەهائی هەن. بەشێک لەجووەکانی کوردستان پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، بۆ "أرض الميعاد" رەویان کرد. لەکوردستاندا لە پاڵ مزگەوتی موسڵمانان‌اندا گەلەک کلێسە و دێری دیانەکان و پەرستگەی جووەکان هەن. ئاینزا جۆر جۆرەکان، ئازادانەتر داب و نەریتی خۆیان پێڕەوی دەکەن وەک لە وولاتانی هاوسێ دا. بەلای کوردەوە ئەوە گرنگ نی‌یە چ باوەڕێکی ئاینی‌یان هەیە، گرنگ ئەوەیە لەگەڵ ئازادی کوردستان دان یان نا(٧٦٧).

گرنگترین کەمە نەتەوەیی‌یەکانی کوردستان بریتین لە: ئاسووری‌یەکان ١٠٠هەزار کەسێکن. ئەرمەن ٥٠ هەزار. خالیدی‌یەکان ٣٠ هەزار. تورکومانەکان ٢٠ هەزارێکن.

### ٦- باری کۆمەلایەتی‌ی

شاری گەورە تا ئەندازەیەک لە کوردستاندا کەمن(٧٦٨). ٨٠٪ دانیشتوانی گوند نشینن. دانیشتوانی شارەکان، زۆربەیان بۆرژوای بچووکن، دوکانداری بچووک و فەرمانبەرن. بۆرژوای گەورە لە کوردستاندا زۆر کەمن. بەهۆی بەرژەوەندیی ئابووری‌یانەوە، زێتر لە پێتەخت و شارە گەورەکانی وولاتە داگیرکەرەکاندا نیشتەجێن، چونکە سەرمایە و سەودا و مامەڵەیان بەو وولاتانەوە بەندە.

لە شارەکانی کوردستاندا چینێکی کەم هێز و لاواز هەن، کە بە پیشە دەستی‌یەکانەوە خەریکن، (لەو شوێنانەی کە کارخانەی لێ‌یە) لەکارگەکاندا کار دەکەن. ئەمانە کرۆکی چینی پرۆلیتاریا پێک دەهێنن.

گوند نشینەکان دوو دەستەن، جوتکار و شوانکار. جوتکاران نیشتەجێن. ئەمانە یا سەر بە هیچ تیرە و هۆزێک نیین، یاخود بەهۆی نیشتەجێ بوونی صەدان ساڵەیانەوە رەچەڵەکی خێڵەکی خۆیان لە یاد کردووە.

بەرهەمە کشتوکاڵی‌یەکان فرە و جۆرا و جۆرن. جوتکاران زێتر لەگەڵ شارەکاندا خەریکی ئاڵ و وێڵ و مامەڵەن.

لەبەر ئەوەی شوانکارەکان بەدووی لەوەڕگە دا دەگەڕێن، بۆیە بە ناچاریی خەریکی کۆچ و ڕەون. ئەمانە خێڵەکین و خێڵەکانیشیان لەکاتی پێویست دا بەهانایانەوە دەچن و دەیانپارێزن. هەر ئەمان پێداویستی‌یەکانی ژیانیشیان بۆ مسۆگەر دەکەن. بەهۆی ئەو ژیانە ووشک و ڕەقەوە، شوانکارەکان ئازا و بەدەست و کارامەن.

لەراستی‌یدا مرۆ دەتوانێت هەر بەسەر و هەیکەل و جلک و بەرگ دا، شوانکارە لەجوتکار و وەرزێرەکان جودا کاتەوە. هەر ئەمە وای لەهەندەک ئەورووپایی کردووە، ئەوانەی لەسەدەکانی پێشوو دا چوونەتە کوردستان، کە واتێبگەن گوایە دوو تیرەی جودان، یانی جوتکارەکان کە ڕەشەخەڵکە رەسەنەکەن و شوانکارەکان کە بێگانەن[٧٦٩].

بەهۆی جواداوازی‌ی باری گوزەران و ژیانی کۆمەڵایەتی‌یانەوە، لەکۆندا مل ملانێ‌ی زۆر لە نێوان جوتکاران و شوانکارەکان دا هەبوو. یەکدی‌یان بە (گۆران) یانی (نیشتەجێ کان) و بە (کۆچەر)[×]. نێو دەبرد. لەساڵی ووشکە ساڵ و بێ بارانی دا، ئەو کاتانەی چیدی لەوەڕگە چنگ نەدەکەوتن، کۆچەرەکان بەخۆیان و مەڕ و مالات و گا و گۆتاڵیانەوە، دەیاندا بە سەر مەزرا و خەلە و خەرمان و شینایی جوتیارەکان دا[××].

پاش یەکەم جەنگی جیهانی، حاڵ و بارەکە تەواو گۆڕا. گەلەک لە کۆچەرەکان نیشتەجێ بوون و دەستیان دایە کاری وەرزێری و ئاژەڵداری‌ی.

لەزۆر شوێن بەجوتکار دەڵێن (مسکێن)[٧٧٠]، یانی کرێکاری زەوی‌ی.

ئەمانە پرۆلیتاریای گوندەکانن و لە فیۆدال و ملکدارەکان جوداوازن کە بە (ئاغا) یا (دەرەبەگ) نێو دەبرێن.

## ٧- پلە و پایەی ژنان

ژن لەکۆمەڵگەی کوردەواری‌یدا پلە و پایەیەکی چێتری هەیە، وەک لای گەلە هاوسێکانی رۆژهەلات. گەلەک لێکۆڵەرەوە و گەڕیدەی ئەورووپایی، گەواهی‌ی ئەوەیان

---

(×) یاخود زێتر بە (کورد) نێو دەبران. ئەمانە خۆیان بەکوردی رەسەن دەزانی و دەیانگوت (ئەوا کورد کوردە، گۆرانە ترە تۆ چیت؟!).

(××) کە جوتکارە بێ چارەکان زریکەیان لێ هەڵدەستا، کوردە کۆچەرەکان دەیانگوت (گاڵتێ بگوێزەوە!).

داوە، کە ئافرەتانی کورد لەگەڵ پیاواندا هاوشانن و ڕێزیان لێ دەگیرێت. ژنانی کورد، شان بەشانی پیاوەکانیان لەکۆشش دان[*]. لەکار و فەرمانی ڕۆژانە دا یارمەتی‌ی پیاوەکانیان دەدەن.

لەمێژووی کورد دا گەلەک جار ژنێک سەرۆکایەتی هۆزەکەی گرتۆتە دەست و مەزنایەتی‌ی پێ براوە.

## ٨- باری ڕۆشنبیری‌ی

فێرگە و قوتابخانە لەکوردستان دا کەمن. زۆربەی وڵاتە داگیرکەرەکانی هەوڵ دەدەن کورد بەبێ سەوادی و نەخوێندەواری بهێڵنەوە. تا تواندنەوەیان ئاسانتر بێت.

باری ڕۆشنبیریی کورد لە شوورەوی و عێراق، لەچاو ئێران و تورکیا و سوریا دا چێترە. لە هەردوو وڵات دا هەندە ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری‌ی هەن. هەتا لەکوردستانی عێراق دا، زانستگەیەک لەسلێمانی هەیە و چەند فێرگەیەکی باڵاش هەن.

لەو قوتابخانە کەمانەی کە لە تورکیا و ئێران و سوریا دا هەن، منداڵی کورد ناچار دەکرێن زمانی دەستەڵاتدارە داگیرکەرەکان فێر بن، نەک زمانی زگماکی خۆیان. دیارە لەڕووی پەروەردە و فێرکردنەوە، ئەم بارە گەلەک تەنگ و چەڵەمە و دژواری خولقاندووە. گەلەک جار ئەو منداڵانە هیچ زمانێک بەتەواوی فێر نابن، نە زمانە زگماکەیان و نەزمانە بێگانەکە. ئەمە کار و ئەرکی مامۆستاکانیش گەلەک گران دەکات.

## ٩- باری لەش ساغی‌ی

وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، لایەنی لەش ساغی‌ی و تەندروستی‌ی و دەرمانسازی‌یان لە نێوچە کوردی‌یەکاندا، تەواو پشت گوێ خستووە.

لەڕاستی‌یدا پێویستی‌یەکانی لەش ساغی‌ی، زۆر بە دەردی سەری دەست دانیشتوان دەکەون. لەزۆر شوێن، نە پزیشک و نە داو و دەرمان نیین. تەنهـا ئاو و هەوا سازگارەکەی کوردستانە کە کوردی بەشێوەیەکی گشتی لەش ساغ و پتەو کردووە.

هەندە نەخۆشی‌یەک، بۆ نموونە هەندێ پەتای سێکسی‌ی، لە کوردستان دا ڕوونەداو و نەناسراون. شێرپەنجە کەمە. دیارە بەهۆی بێ پزیشکی‌یەوە ڕێژەی مردنی منداڵان، باڵایە. جگە لەوە، کەمی خۆراک و خواردەمەنی‌ی پێویست، لەم ساڵانەی دوایی جەنگدا، گەلەکی

(*) Hamilton, A.M.:"Road through Kurdistan", London, 1958, p.206.

تووشی سیل کردووە:

## ١٠- کەسایەتی و ئاکاری کورد

کورد بەشێوەیەکی گشتی روو خۆشن. زۆریان حەز لەگاڵتە و نوکتە و پێکەنین و کۆڕ و بەزمە. پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت (تەنهایی هەر بۆ خودا باشە). کورد حەزی لە مۆسیقا و هەڵپەرکێ و سەمایە. زوو خۆیان دەگونجێنن. بەڵام خۆ وون ناکەن و کەسایەتی خۆیان لەدەست نادەن. کەم رێک دەکەوێت بەرامبەر بێگانە بەدگومان بن.

کورد توانایەکی چاکی فێربوونی زمانی هەیە. لەهەل و باری گونجاو دا زۆر بەخێرایی فێرە زمانی بێگانە دەبن و گەلەک جار زۆر چاکیش گۆ دەکەن.

زۆر شاعیر و نووسەرانی نێوداری وولاتانی هاوسێ کورد بوون و کوردن.

زۆربەی کورد ماتماتیک و زانستییە پەتییەکان خێرا و هاسان فێر دەبن. میوان دۆستیی بەلای کوردەوە ئەرکێکی پێویست وپیرۆزە. ئەوروپاییەکان لەدەست و دڵ والایی کورد سەرسامن. پیسکە و دەست رژد لەنێو کورد دا حاڵیان شرە. ئاوها باس دەکرێن: (ناری بۆ ئەوەی برسیی نەبێت).

دابێکی دیکەی کورد، بەڵێن بردنە سەر و پەیمان نەشکاندنە.

ژنی دوو گیان لە کوردستان دا بەشانازییەوە خۆ دەردەخات. ئەمە بە پێچەوانەی وولاتەکانی رۆژئاواوەیە کە ژنی ئاوسیان پێیان شەرمە خۆ دەرخەن. لە کوردەوارییدا منداڵان زۆر ئازیزن. بە دیاری و نیعمەتی خودا دەزانرێن.

کورد جەنگاوەر و قارەمانن. ئەوانەی لەدەرەوەی شارەکان دەژین، هەر لە منداڵییەوە فێری سواری و چەک ئەندازی دەبن. کورد شانازی بە رەچەڵەک و خانەوادە و نەتەوەکەیەوە دەکات. بێ حورمەتی قەبوڵ ناکەن ودەست بەجێ بێ لێک دانەوە تۆڵەی دەستێننەوە. بەلایانەوە شوورەییە دەست لە دوژمنی کە نەفت و لاواز بوەشێنن و تۆڵەی لێ بستێننەوە.

سادە و ساکاری و راستگۆیی، یەکێک لەخەسڵەتە دیارەکانی کوردە. بەلووت بەرزی و خۆ بەزل زانین رازی نابن، بەڵام باوەڕی تەواو بەخۆ نەبوون یەکێکە لەخەسڵەتە بەدەکانیان. بەداخەوە متمانە و باوەڕکردنی کوێرانەیان گەلەک جار خراپ سوودی لێ وەرگیراوە و لەژێر چارشێوی دۆستایەتی و برایەتی و رێزی درۆ دا، لەخشتە براون.

## ۱۱- خەسڵەتە ئەنترۆپۆلۆژی‌یەکان

بەشێوەیەکی گشتی کوردەکان کەڵەگەت و لاوازن. قەڵەوی وتەنگە ئەستووری جێ‌ی پێکەنین و نێو و ناتۆرەن. کوردەکان دەموچاوێکی درێژکۆلەی باریکەلە و دەمێکی چکۆلەو لووتێکی کەوانی‌یان هەیە. ردێنیان پڕ و زبرە، بۆیە زوو زوو دەیتراشن. بەڵام حەزیان لەسمێڵ بەردانەوەیە. پێستیان زەردباو و موویان خورمایی و ڕەشە. زۆربەیان چاویان مەڕی‌یە. قژ زەرد و چاوشینیش کەم نیین.

جلکی میللی وا دەپۆشن، کە بۆ ژیانی نێو کەژ و کێوانیان لەبار و گونجاون. ئەو جلکانە لەنێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەکی دیکەو لەتیرە و هۆزێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێن. بەتایبەتی جلکی ژنانیان هەر زۆر دڵگیر و جوانن(*).

## کورد لە گۆشەنیگا و باری سەرنجی بێگانەکانەوە

(بەداخێکی زۆرەوە کوردستانم جێ هێشت، نەتەوەی کوردم تا ڕادەیەکی چاوەڕوان نەکراو، بەچێترین نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات هاتە پێش چاو. گەلێکی دۆستم پەیدا کرد. بەدڵ و گیان و سۆزێکی بێ سنوورەوە میوانداری‌ی کرام. یادگاری ئەو هەڵس و کەوتە کوردانەیە، هەتا هەتایە لەیادم ناچێت).

زانا و دیبلۆماسی ئینگلیزی کلاودیس ج. ریچ
"Narrative of a Residence in Koordistan"
Vol. 1, London, 1836-37,P.326-327.

(بەشێوەیەکی گشتی‌ی کوردەکان ژیکەڵەن، بەهێزن، تێگەیشتوون و دەچنە دڵەوە. ئەگەر هەلی ژیاری‌یان بۆ هەڵکەوێت، توانای پێشکەوتنیان لە دراوسێکانیان زۆر زێدەتر دەبێت).

Henri Binder
"Au Kurdistan, en Mesopotamia
et en Perse", Paris, 1887, P. 110.

(ئەگەر کەسایەتی کورد هەڵبسەنگێنین، ئەوەی لای ئەورووپایی‌یەکان بەکاری چاکە نێو

---

(*) Hans Lajta: "Der Traum von Kurdistan" in "Neue Illustrierte Wochenschau", Nr.1,3. Januar, 1965. :هەروەها بڕوانە: "خەونێک بەکوردستانەوە".
Gerald Reitlinger:" A Tower of Skulls, a Journey through Persia and Turkish Armenia", London, 1932 P.205.

دەبرێت، ئەوا لەنێو کورد دا شتێکی خۆرسک و ئاسایی‌یە. ئەمەک، پەیمان پەرستی، ناسکی‌ی لە هەڵس و کەوتدا بەرامبەر ئافرەت، هەست ناسکی‌ی و دۆستایەتی شیعر و ئەدەب، گیانی قوربانی دان بۆ هۆز و شانازی کردن بەخاک و نەتەوەوە، لە ئاکارەکانی ئەم گەلەیە).

Major E.B. Soane
"To Mesopotamia and Kurdistan
in Disguise", London, 1912, S. 394-395.

(مرۆ دەتوانێت بەمانای ووشە کوردەکان بە شۆڕە سوارانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست نێوبەرێت. پەیمان نەشکێن و میوان دۆستێکی بێ وێنەن).

نووسەری ئەرمەنی‌ی بەنێو بانگ
"ئابوڤیان"
لەکتێبی "کوردەکان"ی مینۆرسکی یەوە
پێترۆگراد ١٩١٥

(گەر بڵێم کوردەکان نەتەوەیەکی وان کە کولتوری ئەوروپایی ئاسان وەردەگرن، رەنگە هەبێت بەرپەرچم بداتەوە. بەڵام ئەو بێگانانەی بەکوردستاندا گەڕاون، لەو باوەڕەدان، کە نەتەوەی کورد، لەژێر ئەو توێکڵە رەقەیانەوە، دنیایەک بیری وورد و هەستی قووڵیان حەشار داوە. زۆر هەن گەواهی ئەوە دەدەن کە کوردەکان ژیری‌یەکی خۆرسکانە و توانای شی کردنەوە و تێگەیشتنێکی خێرا و رەوشتێکی بەرزیان هەیە).

زانای ئاڵەمانی‌ی
Martin Hartmann
"Fünf Vorträge über Islam",
Leipzig, 1912"
"پێنج راپۆرت دەربارەی ئیسلام"

(لەگەڵ ئەوەدا کە کوردەکان شەڕانی و خۆ بە دەستەوە نەدەرن، بەڵام دەتوانن بە ئاشتی و هێمنی لەگەڵ کەمە نەتەوەیی و ئاینی‌یەکانی هاوولاتی‌یان دا هەڵ بکەن. ئێمە دەتوانین گەواهی‌ی ئەوە بدەین کە کوردەکان لەهەموو نەتەوە موسڵمانەکانی دیکە، چێتر لەگەڵ دیانەکان دا رەفتار دەکەن).

لە راپۆرتێکی "عصبة الامم"دا
لە ١٩٢٤دا دەربارەی باری عێراق

(کورد مرۆڤی ڕاست گۆ و سەر ڕاستن، ڕقیان لەدرۆ و تەڵەکەبازی‌یە. گەر جارێک

پێویستی کرد درۆ بکەن، نازانن چۆنی پینەکەن). «ژنەکەی مێجەرسۆن»

Mrs. Linfield Soane: "A recent journey
through Kurdistan" in " Journal of RoyaL
Centarl Asian Society", Vol. 22, 1935.

(کوردەکان کەژ و کێو نشینن، شتێکی جوداوازن لە عارەب. تارادەیەک خۆگرن. زێتر لەسکۆتلەندی‌یەکان دەکەن. لەعارەب کەمتر بەتەنگ ژیانەوەن. حەزیان لەگاڵتە و نوکتەبازی‌یە، بەتایبەت گەر مەسەلەکە بەخۆیان و گەلەکەیانەوە پێوەندی‌یدار بێت. تا ئەندازەیەک باوەڕیان بە ئاین و فەلسەفە و چارەنووس زۆرە. هەر توانیت بیانکەیتە دۆست، ئیدی دۆستایەتی‌یان تا سەرە و لەدۆستایەتی‌یدا لە عارەب سەر ڕاستترن. ڕێژگاوو گێل نین. بەهوردی لەبوون و ژیان دەڕوانن. بە پێچەوانەی دواکەوتوویی و سەرەتایی وولاتەکەیانەوە، گەلەک حەزیان لەزانستی نوێ و پێشکەوتن و پیشەسازی‌یە).

Hamilton, A.M.:"Road through Kurdistan",
London, 1937, S. 197.

(ئەوی تووشی کوردێکی ڕاستەقینە بێ، ئیدی ئەو کەسە کوردی خۆش دەوێت، کوردستانی خۆش دەوێت. کورد مرۆڤی چاوگەشن، بەهۆش و کەللەڕەقن و خاوەنی هێزێکی بەکار نەهێنراون).

G.J. Müller:" Im brennenden Orient",

Stuttgart, 1959, S. 109. "لەرۆژهەلاتی گرگرتوودا"

(سەربازێکی لاوی پۆلۆنی‌ی، کە کارەساتەکانی جەنگ گەیاندبوویە عێراق، پێ‌ی گوتم، لەنێو هەموو گەلەکانی رۆژهەلات دا کە ئەو دیتوونی، کوردی لە هەموویان پێ چێترە. من پێ لەسەر ئەوە داناگرم بزانم هۆکەی چی‌یە، چونکە پێم وایە ئەو قسەیە لەبێ تەجروبەیی‌یەوە ناکات).

رۆژهەلات ناس و زانای لاهووت و دەروون ناسی
فەرەنسی‌ی "تۆماس بووا"
کە بەم نێوە خوازراوە ئەم کتێبەی نووسیوە:

Rambout, L. "Les Kurdes et le Droit, Paris, 1947. (بڕوانە پێشەکی ئەو کتێبە)

(ڕاستی، کراوەیی، جەنگاوەری‌ی و بێ فیزی گرنگترین ئاکارەکانی کوردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە موسڵمانن، کە چی ژن لای ئەمان هەر لەکۆنەوە پلە و پایە و سەربەستی‌یەکی

زۆر زێدەتری هەبووە وەک لای گەلانی دەور و بەریان).

جوگرافی ناسی ئاڵەمانی
Prof. Dr. G.Fochler-Hauke: "Die Kurden,
Volk ohne Staat" in "Die aktuelle JROLandkarte",
Ausgabe B, Nr. 224, August 1966.

"کوردەکان، گەلێکی بێ دەوڵەت"

(گەر وەک دۆست بچێتە لای کوردەکان، ئەوا میوان دۆستێکی بێ هاوتان. هەر بۆ ئوتێل گەڕایت، داوەتی ماڵەوەت دەکەن. چەندە لە دوژمنایەتی‌یدا خەتەرناکن، هێندە لە دۆستایەتی‌یدا کەم وێنەن).

Helga Klamer:"Die Kurden Schiessen
Schneller als sie trinken" in" 7 Tage",
Nr. 36, 5. September 1970.

"کوردەکان لەتەقەکردن دا خێراترن، وەک لە ئاو خواردنەوەدا"

(ووشەی "کینە" لەزمانی کوردی‌یدا نی‌یە)

Cumberland, R.C.: "The Kurds",
in "The Muslim World",
Vol. 16. 1926, p.152.

(بەڕاستی کوردەکان سەربازی نەناسراون. گەلەک جار بەناهەق بەخراپە باس دەکرێن. کورد رووخۆشن، دڵپاکن، بەخشندە و لێ بوردەن، خێزانی خۆیان خۆش دەوێت، وولاتەکەیان دەپەرستن. زۆر بەنەتەوەکەیان دەنازن).

د.شاکر خصباك
"الكرد والمسألة الكردية"
بغداد ١٩٥٩. ص ٧٢و٧٩

(بوونی کوردم قەبووڵە، بەڵام نێوی کوردستان "کارل مای" دایهێناوە).

فەرمانبەرێکی شاری "بۆن"لە "H. Kraemer"
"Kurdish Facts", Organ of the "International Society Kurdistan", 1962/63, Nr.15,
März Juni 1962. P.8.

(هەموو ئەوانەی چوونەتە کوردستان و لەوێ ماونەوە، گەواهی ئەوە دەدەن کە کوردەکان زۆر میوان دۆستن).

Basil Nikitine: "Les Kurdes,
étude sociologique et historique" Paris, 1956, P.78.

(کە کوردەکانم دیت، شتێکی دیکەم هەست پێ کرد. هەستم کرد لەو گێژەنی رۆژهەڵاتە

دا، لە پڕ ڕوو بەرووی کەسانێک دەبمەوە کە بەتەواوی پشتیان پێ دەبەسترێت).

Horst Brünig: "Kurdistan is nicht mehr Wild",
in "Allgemeine Zeitung", Freiburg, Nr. 123.29. Mai 1963.

"کوردستان چیدی دڕندە نی‌یە"

(وا بوونی مەسەلەی کورد ئینکاریش کرا، خۆ کێشەکە هەر بەردەوام دەبێت و دەمێنێت).

Arfa, Hassan: "The Kurds",
London, 1966, P.160.

(بەرهەڵستی کردنی خەباتی کورد لە پێناوی ئازادی‌یاندا لەم دوو سەدەیەی دوایی دا، بەو شێوە دڕندانەیە، بۆتە لاپەڕەیەکی دزێن و لەکەدار لەمێژووی مرۆڤایەتی‌یدا. زۆر گەڕیدە و دۆستی کورد، باوەڕیان بەوە هێناوە، کە مەسەلە "کێشەی کەمە خەڵکێکی کۆچەری دواکەوتووی سەرەتایی" نی‌یە، بەڵکە مەسەلە تێکۆشانی نەتەوەیەکە کە لەباری ووریایی و ڕێک و پێکی‌ی نێوخۆوە هیچی کەمتر نی‌یە لە خەڵکی).

Erlendur Haraldsson: "Land im Aufstand...
Kurdistan", Hamburg, 1966, S.28-29.

"کوردستان... وولاتێک لە ڕاپەڕین دا"

(دیتم ئافرەتانی کورد ژیرن، پێشکەوتوون و هەوڵی ڕزگاربوونی خۆیان لە زۆر کۆت و پێوەند دەدەن... باشترین نموونەن بۆ ئەوەی ئافرەتانی وولاتەکەم چاویان لێ بکەن. ئاواتمە ئافرەتانی عارەب بەلای کەمەوە بە بەشێک لەو سەربەستی‌یانەی ئافرەتانی کورد بگەن).

چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ئەکتەری عارەبی‌ی خاتوو "زەینەب"دا
لەرۆژنامەی "النور" العدد ٢١٨، بغداد، ١٩٦٩/٧/٩دا

(صەدان ساڵ تورکە عوسمانی‌یەکان جەزرەبەی هۆزە کوردەکانیان دا. پەنجا ساڵیشە کۆلۆنیالیستەکان، ئیمپریالیستەکان و هێزەکانی نەتەوە داگیرکەرەکانیان، کوردە یاخی‌یەکان جەزرەبە دەدەن. پەنجا ساڵیشە کوردەکان بۆ خواستی نەتەوەیی و کولتووری‌ی و خۆبەخۆ بوونیان لەخەباتی بێ پرینگانەوە دان. ئەو خواستەی بەڵێنیان پێ دراوە، بەلام نەهێنراوەتە دی).

Jürgen Richter: "Napalm gegen Dörfer",
in "Deutsche Allgemeines Sonntagsblatt",
Nr.5. Hamburg 1. Februar 1970, S.6.

"ناپاڵم بەسەر گوندەکان دا"

(بەشێکی زۆر لەسەرچاوە رۆژئاواییی‌یەکان، کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەربارەی کورد نووسیویانە، کورد بە "دز و جەردە" نێو دەبەن. بەڵام ئەو جۆرە نێو و نەتۆرانە بەهیچ جۆرێک لەگەڵ راستی‌یدا یەکانگیر نابن).

نووسەری سۆڤیەتی‌ی"ن . ئا. خالفین"
"تێک بەر بوون لەسەر کوردستان"
مۆسکۆ ۱۹٦٣، لاپەرە ۲۲

(کورد نەتەوەیەکە زۆر جێی بایەخە. گەلەک جار لەخوێندا شەڵاڵ کراون، بەڵام سەر لەنوێ گوڕ و تینیان پەیدا کرۆتەوە و بەهێز بوون، چونکە دلێرن و باوەڕیان بەخۆیان بەهێزە)

Bernard Kimberly in “The Daily Telegraph”, 5.3.1966.

(نەتەوەی کوردم زۆر لا پەسەندە. نەتەوەیەکی رەوشت بەرزن. ئەم گوتەیەم لەخۆوە نالێم، بەڵکە لە زۆر سەرچاوەوە هەڵم گۆزیوە. ئەم رەوشتە بۆتە هۆی ئەوەی لەگەڵ هەموو دژواری‌یەکی باری جەنگی و ئابووری و جوگرافی‌یدا هێشتا خۆ ڕاگرن و خۆ بناسێنن. ئەمەش نیشانەی رێک و پێکی و هەست کردنیانە بە لێ پرسینەوە).

ئێلۆن ئالبیک
ئەندامی سەرکردایەتی‌ی پارتی سۆسیالیستی سویدی‌ی
رۆژنامەی "التآخي"، ژمارە ٤٧٦ لە ۱/۷/ ۱۹۷۰دا.

(بە پێوانەی بۆ چوونی ئەوروپایی‌یەکان بێت، کوردەکان گەلەک ژیر و ووریان. جوداوازی نێر و مێ‌یان نی‌یە. ژنانیان چارشێو ناگرنەوە. ئەمانە بۆ ئەو کەسەی گەشتێکی رۆژهەڵات دەکات، رووداوێکی رۆمانتیکانەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە نێوبانگیان بە چاکی نەڕۆیشتووە، کەچی گەلەک سەرنج راکێشن).

Gerald Reitlinger: “A Tower of Skull, a journey through Persia and Turkish Armenia”, London, 1932, P.205.

## سەرنجەکانی نووسەر

(١) لە ل١٥دا باسی سەرژمێری کوردم کردووە و لەوێ دا سەرژمێری کوردم بە ١٠-١٢ ملوێن داناوە. جا وەک گوترا، ئەم ووتارە ١٥ ساڵ لەمەوبەر خوێندراوەتەوە و لەو دیاریکردنەشدا پشتم بەو سەر ژمێرانە بەستووە کە لە نیوەڕاستی شەستەکاندا لەبەر دەستمدا بووە و لەوەشدا زۆرم هەوڵداوە کە لایەنی هەرە کەمی سەرژمێری کورد بگرم. ئەوجا لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ نێزیکەی بیست ساڵێک تێپەڕ دەبێ بەسەر ئەو ئامارە کۆنەدا کە کاتی خۆی کردوومە و هەروەها لەبەر رۆشنایی ئەو زانیاری‌یە تازانەی کە لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا دەستم کەوتوون، دەتوانم بێژم سەرژمێری کورد لە ٢٠ەوە تا ٢٥ ملوێنێک دەبێ. ئەمەش پڕبەپڕی ئەو تیۆری‌یەی Thomas Robert Malthus (١٧/٢/١٧٦٦-٢٣/١٢/١٨٤٣)ە کە دەبێژێ هەموو بیست ساڵێک گەلێک دەبێتە دوو هێندە. تەماشای

Th.R.Malthus: An Essay on the Principle of Population 1798.

ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی دیکەوە، وەنەبێ زۆری و کەمی ژمارەی تاکە تاکەی گەلێک هێندە گرنگ بێ. ئەوەتا سویدی‌یەکان ٨ ملوێن و نەرویجی‌یەکان ٥ ملوێن و پاکستانی‌یەکانیش لە ١٠٠ ملوێن پترن. بەڵام ئەوان ٨ ملوێن و ٥ ملوێنی تێر و تەسەل و سەربەستن، و ئەمانیش ١٠٠ ملوێنی برسی و رەشوڕووت و کەنەفتن. دڵنیاشم لەوەی کە ئەگەر رۆژێک لە رۆژان کوردستانێک دروست بوو، ئەوا هەر لە ساڵی یەکەمی‌یدا، کورد چەند ملوێنێک زیاد دەکات لەسەر حسێبی ئەو (بەسەزمانانە)ی کە جاران نەیانزانیبوو کوردن، چونکە ئیمپریالیزمی جادووکەر و نۆکەرە تەلیسمبازەکانی نەیانهێشتبوو ئەو (بەدبەختانە) چاوێک هەڵبهێنن و دەورووپشتی خۆیان ببینن و فەرقی پێ بکەن کە کوردن. ئەوجا کە نوشتەکەی ئیمپریالیزم و دەسندەخۆرەکانی بەتاڵ بووەوە و ئەوانەی سڕکرابوون هۆشیان هاتەوە بە بەر خۆیاندا؛ هێندە تامەزرۆی کوردایەتی دەبن، یەکێکی وەکو هاوبیر کوردۆ دەبێ بەختیار بێ ئەگەر بێتو جاروبار حەپولکی بدەن دوو قسە بکات.

(٢) لە پەراوێزی ل٧٢دا وەرگێڕ نووسیوێتی کەیحیا خەششاب لە پێشەکی شەرەفنامەدا نووسیوێتی کە رۆژی هەڵگیرسانی شۆڕشی دیاربەکر ٢٦ی مارتی ١٩٢٥بووە، کەچی لەلای من ٢١ی مارتی ١٩٢٥ نووسراوە. راستی‌یەکەی من ئەم زانیاری‌یەم لە

پەنجاکاندا لەسلەیمانی لەبەهەشتی ئیسماعیل حەققی شاوەیس وەرگرت. ئەوجا دەمێنێتەوە سەر ئەوەی بزانین ئایە ئیسماعیل حەققی شاوەیسێک کە خۆی لە ڕۆژانی شۆڕشی دیاریەکردا ئەفسەرێکی کورد بووە، لەم ڕووەوە پتر جێی باوەڕە یا یەحیا خەششاب کە نازانم پشتی بە چ سەرچاوەیەک بەستووە. لەگەڵ ئەمەشدا مەسەلەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیە.

(٣) لە ل٩٠دا باسی ئەوەم کردووە کە بەهەشتی شەهید قازی محەممەد لەرۆژی ١٩٤٦/١/٢٢دا بانگی کۆمارێکی کوردستانی ئۆتۆنۆمی داری هەڵداوە. ئەمە - وەک لەسەرەتاوە لەنێو خەڵکدا باو بووە- ڕاستە، بەڵام ڕێبازی ڕووداوەکانی کۆماری کوردستان و لێکۆڵینەوەکانی ئەم چەند ساڵەی دوواییم دەریانخستووە بۆم، کە کۆماری کوردستان هیچ جۆرە پێوەندی‌یەکی گوێڕایەڵکەرانەی بە مەرکەزەوە نەبووە و هەڵسوکەوتەکانی هەڵسوکەوتی دەوڵەتێکی سەربەخۆبووە، هەر بۆ نموونە بەستنی پەیمانی بەرگری دووقۆڵی لەگەڵ کۆماری ئازربایجاندا.

(٤) لە ل١٠٠دا وەرگێڕ لە پەراوێزدا ڕەخنە لەو بیر و ڕایە دەگرێ کە بەرامبەر هەڵسوکەوتی بەهەشتی شێخ مەحموود دەرمبڕیوە و گوتوومە شانازی بەوەوە ناکەم کە مرۆڤ بچێ بەرامبەر دوژمنێکی ترسنۆکی فێڵبازی بێ ویژدان، کاری ڕۆستەمانە بنوێنێ و ڕێ بدا بە دوژمنەکەی لەرێی تەڵەکەوە بەسەری دا زاڵ ببێ و هەروەها گوتوومە دوژمنانی کوردستان بە ڕۆستەمی کوردستانیان داگیر نەکردووە، تا مافی ئەوەیان ببێ چاوەڕوانی ڕۆستەمی بن لە ئێمەوە بەرامبەریان...

بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستم لەوەی سەرەوە؛ ناچارم کەمێک لەسەر مەسەلەی شێخ مەحمود بدووم:

گومان لەوەدا نی‌یە کاتێک شێخ مەحموود بەدیل گیرا و کەوتە ئەوەی چووە بەردەم دادگەی کۆلۆنیالیستەکانی ئینگلیز لەبەغدا، کە بە دڵنیایی‌یەوە دەیزانی فەرمانی کوشتنی دەدات، هەر دەبوو ئەو هەڵوێستە ئازایانە و بەجەرگانەی بنواندایە. کەسیش نەیگوتووە دەبوو بچێ بپاڕێتەوە، بەڵام ئەوەی ئەز دڵم پێی خۆش نی‌یە و سەرم پێی بەرز نی‌یە؛ ئەو هەڵسوکەوتە چەوتانەیە کە بوونە هۆی ئەوەی شێخ مەحموودی مەرد بکەوێتە نێو داوی نامەردانەوە، ئەو داوەی کە لێی دەرنەچوو - جارێ بەر لە هەموو شتێک و بە تەواوی لەگەڵ وەرگێڕدا لەوەدا یەک دەگرینەوە کە دەبێژێ نابێ دەورانی شێخ

مەحموود بە "پێوانەی ئەمڕۆ بپێورێ. ئەمە زۆر راستە، بەڵام بابێین هەر بە پێوانەی ئەو سەردەمە لە هەڵسوکەوتی شێخ مەحموود و سەرکردەکانی دیکەی کورد بکۆڵینەوە.

کە کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا و... هتد پەلاماری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌یان دا، ئامانجی بەرو دووایان بەشکردنی میراتی "پیاوە نەخۆشەکە" بوو لەخۆیان و هیچی دی. ئەوەتە لە ساڵانی ١٩١٦ بەدوواوە و بە پێ‌ی پەیمانی سایکس پیکۆ و سان ریمۆ کوردستانْ و وولاتی عەرەب و ناوچەی فارس و تورکیان لە خۆیان دابەشکرد و ئیدی بیری دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ عەرەب و تورک و فارس و کورد لە کایەدا نەبوو. ئەوەی ناچاری کردن لە ١٩٢٣دا و پێنج ساڵی تەواو دووای بڕانەوەی شەڕ، دان بەسەربەخۆیی‌ی "تورکیای تازەدا، بنێن، سەرکەوتنی ناسیۆنالیستە تورکەکان بوو بە سەرۆکایەتی‌ی ئەتاتورک، ئەو ئەتاتورکەی کۆلۆنیالیستەکانی رۆژاوا هێندە رکیان لێ‌ی بوو نێویان نابوو "گورگە بۆر". دوایی ئەوەبوو پاش ئەوەی زانیان کە سەرکردە عەرەبەکانیش داوای دەوڵەتێکی یەکگرتوو دەکەن و پێ دادەگرن، ئەگەرچی وەک ئەتاتورک لەبارياندا نی‌یە بەزۆری کوتەک داخوازی‌یەکەیان بەسەر کۆلۆنیالیستەکاندا بسەپێنن، ئەوجا ناچار بوون ئەم چەند دەوڵەتە تەپکە تەپکەیان بۆ دابمەزرێنن. ئەوە بوو دوواییش کە دی‌یان شای قاجار گوێڕایەڵی‌یان ناکات، هاتن رەزاخانیان هاندا لێی و لە ساڵی ١٩٢١دا کودەتایەکیان پێکرد لە دژی شای قاجار، ئەویش ماوەیەک دۆستایەتی پێشاندان تا کردیانە شای "ئێران" و توانی دوژمنەکانی نێوخۆی لەنێو ببا و دەوڵەتی ناسیۆنالی فارس دروست بکات. ئەمجا بای دایەوە و بوو بە دۆستی ئەڵمانیای نازی.

ئەوجا بۆچی تورک بە دەوڵەتی سەربەخۆ و عەرەب و فارس بەدەوڵەتی نیوە سەربەخۆ گەیشتن و کورد بەهیچ کامیان نەگەیشت، سەبارەت بەوە بوو کە بزووتنەوەکانیان بەحسێب بوو. سەرکردەکانی تورک و فارس و عەرەب دوژمنی سەرەکی خۆیان بەجوانی دیاری کردبوو و هەر لە دژی ئەو دوژمنە دەجەنگان... تورکە ناسیۆنالیستەکان دوژمنی سەرەکی خۆیان لە سوپای وێناندا دەدی، لەبەر ئەوە زۆربەی هێزی خۆیان بۆ ئەوە تەرخان کردبوو. ئەگەرچی هاوپەیمانەکانی وێنان؛ وەک بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و هەروەها ئەو گەلانەی داوای مافی خۆیانیان دەکرد وەک کورد و ئەرمەنی و عەرەبیان لەبیر خۆیان نەبرد بووەوە، بەڵام بەڕاستی دوژمنی سەرەکی‌یان وێنان بوو کە لەدژی هەموو جۆرە دەسەڵاتداری و ژیانەوەیەکی تورک بوو. عەرەبەکان ناسیۆنالیزمی تورکیان بەدوژمنی سەرەکی خۆیان دەدایە قەڵەم. لەبەر ئەوە سەرکردەکانیان بە هەموو جۆرێک خۆیان

لەبەیەکدادان لەگەڵ کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیا و فەرەنسا دوور خستەوە، ئەگەر چی لەژێریشەوە میللەتیان هان دەدا بۆ ئاژاوە نانەوە. دەوری شەریفی مەککە و فەیسەڵی عێراق و عەبدوڵڵای ئەردەن نموونەیەکن بۆ ئەمە. ناسیۆنالیزمی فارسیش دوژمنی سەرەکیی خۆی لەبزووتنەوەی کورد و عەرەبدا دەدی، بە تایبەتی بە سەرۆکایەتیی سمکۆ و شێخ خەزعەل، کەئەمیان دەیویست کوردستانێک لەتەنیشت وڵاتی فارسەوە دابمەزرێنێ و ئەویشیان دەیویست خۆزستان لە ئێران جیا بکاتەوە. ئەوانە وابوون، بەڵام بزووتنەوەی کوردایەتی بە پێچەوانەی ئەوانەوە سەر لێ شێواو بوو. نە شێخ مەحموود خۆی، و نە سەرکردە کلاسیکی‌یەکانی دی وە نە دەستەی هوردە بۆرژوای رۆشنبیر (تاک و تەرای لێ دەرچێ) ئەو دەمە دوژمنی سەرەکی کوردیان دەستنیشان نەکردبوو. شێخ مەحموود و سمکۆ لەباتی ئەوەی هەموو هێزێکیان ئاراستەی تێکشکاندنی بزووتنەوەی ئەتاتورک بکەن، نەک هەر لێی بێ دەنگ بوون، بەڵکو پێوەندیی دۆستانەشیان هەبوو لەگەڵی. سەیید تەهای شەمزینی وەک پاداشتێک بۆ بەربەرەکانێی ئەتاتورک، داوای لە ئینگلیزەکان دەکرد، لە پێشدا بچن کوردستانێکی بۆ دروست بکەن لەویلایەتی موسل (خوارووی کوردستان) و رۆژهەڵاتی کوردستان، ئەوجا ئامادەیە دەست بداتە شمشێر. زۆر لە رۆشنبیرانی ئەو دەمە کە بە "منەووەر" نێویان دەرکردبوو بە "جلخوارێتی"یەوە شانازی‌یان دەکرد، و پێوەندیی نێوان شێخ مەحموود" و کەمالی‌یەکانیان بەهێزتر دەکرد، و شێخ مەحموودیش دەیگوت: باشە، ئەگەر ئینگلیزەکان راست دەکەن فەرموو با بێن سنووری کوردستانم بۆ دیاری بکەن، ئەوجا بەسەر چاو دەچم دوژمن دەردەکەم لێی. ئابەم جۆرە رۆژ لە دووای رۆژ سوپای ئەتاتورک بەهێزتر بوو و توانی سوپای وێنان بشکێنێ و لە ئەنادۆڵ بیکاتە دەرێ و ئەرمەنی‌یەکانیش تا یەریڤان بەرە دووا بنێ و لەو ماوەیەشدا دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتی تازە دامەزراوی سۆڤێت بگرێ و بەریتانیا ناچار بکات سەر بۆ داخوازی‌یەکانی شۆڕ بکات. کاتێک کە سەرکردەکانی کورد هۆشیان هاتەوە بەخۆیاندا، تازە درەنگ بوو بوو.

ئەگەر شێخ مەحموود هەموو هەوڵ و تەقەللای خۆی بۆ بەربەرەکانێی دوژمنی سەرەکی کورد ئەتاتورک تەرخان دەکرد و خۆی لەگەڵ سەرکردە کوردەکانی دیکەدا رێک دەخست و مەسەلەی مەلیکێتیی خۆی تا ماوەیەک دووا دەخست، ئەوا بە دڵنیایی‌یەوە ئینگلیزەکان لەبەربەرەکانێی ئەتاتورکدا یارمەتی‌یان دەدا، نەک لەبەر خاتری خۆی یا کورد، لە سیاسەتدا خاتر و خۆتر نی‌یە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوانیش ئەتاتورکیان بە دوژمنی

سەرەکی خۆیان دەزانی. ئەوی رۆژنامەی "تێگەیشتنی راستی" و "پێشکەوتن" بخوێنێتەوە کە ئینگلیزەکان دەریاندەکرد؛ ئەم راستی‌یە دەکەوێتە قولی مستیەوە. ئێمە کە لەمێژووی خۆمان دەکۆڵینەوە دەبێ بە چاوێکی بابەتانە تەماشای بکەین. شێخ مەحموودمان خۆش دەوێ و هەزاران چرا لەسەر گۆڕی. بەڵام نابێ بەموو لە (واقیع) لابدەین. چونکە رابوردوو دەرزێکە بۆ ئەمڕۆ. ئەوەتا ئەمرۆش دەبینیت کە زۆربەی زۆری سەرکردە کوردەکان دوژمنی راستەقینەی کوردیان دیاری نەکردووە، هەر یەکەیان دژی لایەک شەڕ دەکات، و دوژمنە سەرەکی‌یەکە کە ناسیۆنالیزمی عەرەبی عەفلەقی‌یە گەلێک سەرکردەی کوردی کردووەتە "دۆستی" خۆی، ئەگەر بمەوێ لە سنووری ئەدەب دەرنەچم. دووایی ئێمە نابێ ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە یەکەمین بەرێوەبەرێتی‌یەک کە کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیا لە رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا دانیان پێدانا، حوکمدارێتی کوردستان بوو بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩١٨دا. ئەو حەلە نە عیراقێک هەبوو، نە ئێرانێک و نە تورکیایەک و نە سووریایەک. ئەگەر ئەو رۆژە شێخی بەهەشتی و سەرکردەکانی دیکەی کورد، کارێکی وایان دەکرد بزووتنەوەی ئەتاتورک هەرەس بهێنێ یا بێ هێز ببێ، ئەوا لەبەردەم خستنەکاری پەیمانی سێڤەردا بەرهەڵستێکی ئەوتۆ نەدەما، چونکە حکوومەتی ئەستەمووڵ هیچ دەسەلاتێکی نەمابوو و وێنانی‌یەکانیش کە هێزی داگیر کەربوون داوای بە جێهێنانی پەیمانی سێڤەریان دەکرد.

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کە گوتوومە دوژمنانی کورد، کوردستانیان بە رۆستەمی داگیر نەکردووە ومافی ئەوەیان نی‌یە چاوەڕوانی رۆستەمی بن لە ئێمەوە. بەڵێ... پێم وایە مرۆڤ نابێ لەگەڵ فێڵباز و درۆزن و ساختەچی و دەستبڕ و قورمساغ، راست و رەوان و دڵپاک و بێ باک بێ، چەند ناشیرینە مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤێکی پاکی راستدا پیس و چەوت بێ، ئەوەندەش نەفامی‌یە لەگەڵ ناپاکێکی ناڕاستدا، پاک و ڕاست بێ. مەردایەتی نابێ بەرامبەر نامەردێک بخرێتە کار، چونکە نامەرد هەر نامەردانە دەکەوێتە کار. ئەو لە رۆناکی دا ناوەستێ و دەست بداتە شیر و شەڕە شیر بکات لەگەڵت، بەڵکو لە تاریکی دا دەوەستێ و تۆ نایبینیت و بەرد دەگرێتە چاوت و کوێرت دەکات، خۆ ئەگەر بۆی چوویتە تاریکی‌یەکەوە خۆی وون دەکات. لەبەر ئەوە تۆ دەبێ هێندە بیخافڵێنی تا دێتە بەر رووناکیەکە و رووبەڕووت دەوەستێ.

بەڕاستی بەرەئی من مەردایەتی کردن بەرامبەر نامەردێک وەک نامەردی کردن وایە

بەرامبەر مەردێک. دەبوو شێخ مەحموودی ئازا و مەرد و بە ناموس بیزانیایە ئینگلیزەکان بەشەڕ و لەشکر و ئازایەتی و ڕۆستەمی‌ی چلکا و خۆرە هیندۆکەکانیان چیاکانی کوردستان داگیر ناکرێ بۆیان، بەڵکو بەفێڵ و درۆ و کەڵەک و خۆ گۆڕین. شێخ مەحموود دەبوو بە پێی ڕەوشتی خۆیان هەڵسوکەوتی بکردایە لەگەڵیان، نەک مەسەلە بگەیەنێتە ئەوەی لەدەربەندی بازیاندا بەدەستی نامەردێک بریندار بکرێ.

(٥) لە ل ١١٥دا گوتوومە "هیچ ڕژێمێک نەیتوانیوە تا ئێستە بارزانی‌یەک بکڕێت و بیکاتە داردەستی خۆی". وەرگێڕ نموونەی هێناوەتەوە کە هەر لە خێزانی بارزانی دا هی وا هەڵکەوتوون بوونە دەستوپێوەندی ڕژێمی عێراق". ئەمەی وەرگێڕ دەبێژێ ڕاستە. بەڵام من لە دەقە ئەڵمانی‌یەکەدا ووشەی تا ئێستە "bis jetzt" م بەکارهێناوە. ووشەی (تا ئێستە) ئەوە دەردەخات کە بە پێی ئەو زانیاری‌یانەی تا ساڵی ١٩٧١ لەبەر دەستمدا بووە، نۆکەریان هێشتا تێدا هەڵنەکەوتووە. ئەوانەی وەرگێڕ وەک نموونەیەک لە پەراوێزی ل ١٦٧ دا باسی کردوون هەموو پاش ١٩٧١ ڕوویان داوە، واتا پاش خوێندنەوەی ووتارەکانی من.

(٦) لە ل ١١٧دا نووسیومە؛ بەهەشتی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە ١٩٦٠/١٠/٣٠دا مردووە، ڕاستی‌یەکەی مامۆستا لە ١٩٦٠/٨/٤دا کۆچی دوایی کرد.

(٧) لە ل ١٢٥دا نووسیومە کە حیزبی کۆمۆنیستی عێراق و پارتی دێمۆکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٥٣دا لیستەی هاوبەشی‌ی هەڵبژاردنیان پێکەوە دەرکرد، ڕاستی‌یەکەی ساڵی (١٩٥٤)ە.

(٨) لە پەراوێزی ل ٣٣٧دا وەرگێڕ ڕۆژنامەی ئیسرائیلی Jedioth Chadaschot (یدیۆت خەدەشۆت)ی بە "هەواڵەکانی جوولەکە "کردووە بەکوردی. لێرەدا وەرگێڕ ووشە ئەڵمانی‌یەکانی لەدەقەکەوە ڕاست وەرگێڕاوە، بەڵام مانا ڕاستەقینەکەی هەردوو ووشە عیبری‌یەکە"هەواڵە تازەکان"ە.

(٩) لە ل١٤٩دا (پەراوێز) وەرگێڕ ڕەخنەیەکی هەقی گرتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ١٩٦٢/٤/٢٨ ڕاستە. ئەوەی کە ڕاست نی‌یە ئەوەیە کە لە ل٢١٩دا دەڵێ بەعسی‌یەکان لە کۆتایی‌ی ١٩٦٢دا و پێش کودەتاکەیان پێوەندی‌یان بە کوردەوە بەستووە. ڕاستی‌یەکەی ئەو پێوەندی‌یە لە بەهاری ساڵی ١٩٦٢دا بووە.

(١٠) لە پەراوێزی ل ١٥٤دا وەرگێڕ قسەکەی عەمماشی بە "نزهة عسكرية" تۆمار

کردووه، دەقی قسەکەی عەمماش بە عەرەبی "نزهة وطنية للجيش العراقي" بوو.

(١١) لە ل ١٦٨دا (پەراوێز) وەرگێر ڕاست بۆی چووە کە دەبێژێ دەستکێشانەوەی (تایەر یحیا) لە ١٣/٩/١٩٦٥دا و بوونی عارف عەبدولڕەززاق بە سەرۆک وەزیران لە تەمووزی ١٩٦٥دا لەگەڵ یەک ناگونجێن، یەکێک لەو دوو مێژووە ڕاست نی‌یە، کە دوورنی‌یە هەڵەی چاپ بێ.

(١٢) ل ٢٥٣ (پەراوێزی ژمارە٤٧٧) سەرنجەکەی وەرگێر ڕاستە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لەسەر گۆڤاری (صدی کردستان) بەهەڵە کانوونی دووەمی ١٩٦٥ نووسراوە، ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە وەرگێر نووسیوێتی، واتە کانوونی دووەمی ١٩٦٦.

(١٣) لەلاپەڕە ٢٠٥دا وەرگێر باش بۆی چووە Information Bulletin لە ٣٠/٢دا نەبووە، بەڵکو لە ٣٠/٣دا بووە و ئەمەش وەک خۆی گوتوویەتی "هەڵەیەکی چاپە.

(١٤) لە ل ٢١٣دا (پەراوێزی ٧٢١) وەرگێر ڕاست دەکات کە نیوەڕاستی مایسی ١٩٧٠ ڕاست نی‌یە، بەڵکو نیوەڕاستی ئابی ١٩٧٠ ڕاستە.

(١٥) ل٢١٦ وەرگێر لە پەراوێزی (٧٣١)دا نووسیوێتی کە ئەو ووتارەی (التآخي) بەرپەرچی ووتاری (الجمهورية) نی‌یە یاخود مێژووەکەی بە هەڵە نووسراوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو مێژووە بەهەڵە نەنووسراوە و ڕاستە. بەڵام چ لە (التآخي) و چ لە (الجمهورية)دا زنجیرەیەک ووتار دژی یەکدی و هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە و لە چەند کاتێکی جیاوازدا دەرچوون. ئەو ووتارەی (التآخي) وەرامی یەکێک لەو ووتارانەی (الجمهورية)یە.

(١٦) لە پەراوێزی ل ٢١٨دا وەرگێر نووسیوێتی ئەو ناکۆکی‌یانەی لە نێوان شای ئێران و سەددامی عێراقدا هەن "ئەمانە بۆ داگیرکەرانی کوردستان مەسەلەی لاوەکین، هەرکات دەردە کورد زۆریان بۆ بهێنێ ئامێز بۆ یەکدی دەکەنەوە و نێوچەوانی دژوێنی یەکدی رادەمووسن؛ وەکو دیتمان صەددام و شا لە جەزائیر کردیان". ڕاستە ئەمە وایە؛ بەڵام ئەوەتا لە دێڕی یەکەم و دووەمی ل ٣٣١دا نووسیومە "بەڵام لە پاشەڕۆژێکی وا نێزیکدا هاریکاری ئێران و عێراق زۆر زەحمەتە..." هاتنە سەرکاری بەعسی‌یەکانی سەر بەسەددام لەساڵی ١٩٦٨دا بوو، ڕێکەوتنی شا و سەددام لە مارتی ١٩٧٥دا، واتە پاش ٧ ساڵ. بێ گومان حەوت ساڵ بە پاشەڕۆژێکی نێزیک نادرێتە قەڵەم. ووتارەکەی من لە ١٩٧١دا بوو و یەکگرتنیان چوار ساڵ پاش ووتارەکەی من پێکهات.

## لیستەیەکی بەرهەمەکانی نووسەر

### (١) بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

(١) کیف تتعلم اللغة الکردیة، زنجیرەیەک ووتار بوو بۆ فێرکردنی زمانی کوردی، لە یەکەمین ژمارەی گۆڤاری (صدی المستقبل)ەوە کە لە بەغدا لە ١ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٥٣دا دەرچوو دەست بە بڵاوکردنەوەی کرا. بەڵام هەر پاش دەرچوونی چەند ژمارەیەکی کەمی، گۆڤارەکە لەلایەن کاربەدەستانی عێراقەوە داخراو بەوە رێ لە بڵاوبوونەوەی ووتارەکانیش گیرا. خاوەنی گۆڤارەکە نێوی رەسمی العامل بوو، لاوێکی چەپی‌ی عەرەب بوو. ووتارەکان بە نێوی خواستەمەنی (ج .ا. کلۆڵ)ەوە دەنووسران "صدی المستقبل" لەبەغدا لەکتێبخانەی مۆزەخانە (مکتبة المتحف) دەستدەکەوێ.

(٢) سیاسة تتریك الاکراد في ترکیا، ووتارێک بوو بە نێوی خواستەمەنی‌ی (کلۆڵ)ەوە لە ساڵی ١٩٥٤دا و لە رۆژنامەی (صوت الاهالي)دا کە زمانی حاڵی پارتی دێمۆکراتی‌ی نیشتمانی‌ی عێراق بوو (الحزب الوطني الديمقراطي) و لە بەغدا دەردەچوو، بڵاوکرایەوە. ووتارەکە بەرپێچدانەوەی جەلال بەیار سەرکۆماری ئەو دەمەی تورکیا بوو کە لە ئەمریکا گوتبووی "لە تورکیا هەر تورک هەیە و هیچ کەمە نەتەوەیەک نی‌یە. ئەم ووتارە و نامەیەکی مامۆستا جەمیلی رۆژبەیانی کە لە کەرکووکەوە بۆ پشتگیری‌ی ووتارەکەی من ناردبووی، وایان لە باڵوێزخانەی تورکیا کرد کە شکات لە رۆژنامەکە و حیزبەکە بکات. هەرچەندە رۆژنامەکە لە دادگەی یەکەمدا رزگاری‌ی بوو، بەڵام لە دادگەی تەمییزدا ٦٠٠٠ دینار سزای خرایە سەر بە تۆمەتی ریسواکردنی سەرۆکی دەوڵەتێکی دراوسێ‌ی عێراق.

(٣) چیرۆکی گەرداوەکە، نووسینی شێکسپیر، وەرگێڕان لە ئینگلیزی‌یەوە بۆ کوردی، چاپخانەی مەعارف - بەغدا ١٩٥٥.

(٤) سەرەتای جەبر، تەنێ ١٠٠ دانەی لێ چاپ کرا بە رۆنیۆ بۆ قوتابیان. کەرکووک ١٩٥٦.

(٥) کفاح الاکراد، هاوینی ١٩٥٦. نامیلکەیەکە بە نێوی خواستەمەنی‌ی (صامد الکردستاني)یەوە لەدیمەشق لە چاپخانەی کەریم کەرەم (کریم کرم) بەدزی‌یەوە چاپکراوە، باسی تێکۆشانی گەلی کورد دەکات و هەوڵی پێکهێنانی دۆستایەتی دەدات

له نێوان بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی عەرەب و کورد دا. نامیلکەکە پیشکێش کراوە بە جەمال عەبدولناسری بەهەشتی، و هەزار دانەی بە خۆڕایی لێ بڵاوکراوەتەوە.

(٦) بنچینەکانی لینینیزم، هاوینی ١٩٥٦ لە دیمەشق لەچاپخانەی کەریم کەرەم بەدزی‌یەوە چاپکراوە. لە عەرەبی‌یەوە کراوە بە کوردی و بە تیپی لاتینی نووسراوە. نێوی وەرگێڕی لەسەر نەنووسراوە.

(٧) سەیرە لەکۆیە، گۆڤاری هەتاو، ژمارە ٦٣و٦٤ ساڵی ٣، مایس و حوزەیرانی ١٩٥٦/هەولێر. ووتارێکی رەخنە گرانەیە لە بەکار نەهێنانی زمانی کوردی لە خوارووی کوردستاندا لە لایەن خەڵکەوە، بەتایبەتی لەکاروباری نارەسمی دا وەک تابلۆی دوکان وشوێنە گشتی‌یەکان و... هتد.

(٨) چیرۆکی لالۆکەریم، چاپخانەی کوردستان/هەولێر. ئەم چیرۆکە تا ئێستە گەلێک نووسەر و رەخنەگر لێ‌ی دوواون و لە کۆتایی هەفتاکاندا لەلایەن هونەرمەند ئەحمەد سالارەوە کرا بە فلیم و لە تەلەفیزیۆنی کەرکووکەوە بڵاوکرایەوە، بێ ئەوەی نێوی نووسەرەکەی بهێنرێ.

(٩) خوێندەواری بەزمانی کوردی، چاپخانەی (النور) بەغدا ١٩٥٧/٢٥٦٩. ئەم نووسراوە دوو بەشە، بەشی یەکەم باسی هۆی بڵاونەبوونەوەی زمانی کوردی دەکات؛ وەک بەربەرەکانێ‌ی زمانی کوردی لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە و گیروگرفتی جیاوازی شێوەکانی زمانەکەو نەبوونی هۆی چاپکردن و بڵاوکردنەوە، و بەشی دووەمی نامیلکەکە باسی ئەو هەنگاوانە دەکات کە نووسەر پێشنیازی کردوون لە ساڵی ١٩٥٧دا؛ وەک دامەزراندنی پێوەندی‌یەک لە نێوان ئەدیب و نووسەرە کوردەکاندا بە نێوی (دەستەی نووسەرانی کوردەوە)، دامەزراندنی کۆڕێکی زانستانەی زمانەوانی، واتە ئەکادیمیای کوردی و دەرکردنی گۆڤارێکی زانستانە و وەرگێڕانی زاراوەکان (المصطلحات العلمیة) بۆ سەر زمانی کوردی و دانانی کتێبخانەیەکی گشتی بۆ کورد و کردنی کەرکووک بە بنکەی ئەو کتێبخانەیە و دەرکردنی زنجیرەک کتێب بۆ فێربوونی زمانی کوردی و بڵاوکردنەوەی رێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی و دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار و چاپ کردنەوەی دیوانی شاعیرەکان و پێشخستنی چیرۆکی کوردی بە تایبەتی چیرۆکی (واقیعی و تەمسیلی) و پێشەمی دان بە وەرگێڕان لە زمانی بێگانەوە بۆ کوردی ووەرگێڕانی شاکاری ئەدەبی کوردی بۆ سەر زمانە بێگانەکان و دروستکردنی

فەرهەنگێکی یەکگرتوو بۆ زمانی کوردی کە هەموو شێوە و زاراوەکان بگرێتەوە و دانانی ڕێزمانێکی یەکگرتوو بۆ زمانی کوردی وکردنی زمانی کوردی بە زمانێکی زانستانە.

ئەم نامیلکەیە وەک لەسەر بەرگەکەی نووسراوە، بە قازانج و مایەوە بۆ لێقەوماوانی لافاوی سالّی ١٩٥٧ی سلەیمانی بوو. سەرجەمی پارەکە (٥٠) دیناری ئەو کاتەی گرتەوە و درا بە مامۆستا شێخ محەممەدی خالّ کە سەرۆکی لیژنەی کۆکردنەوەی پیتاک بوو بۆ لێقەوماوان.

(١٠) نووسینی کوردی بە لاتینی، چاپخانەی مەعارف/بەغدا ١٩٥٧/٢٥٦٩. ئەم نامیلکەیە بریتی‌یە لە هەولّدانێک بۆ بلاّوکردنەوەی ئەلفو بێ‌ی لاتینی لە نێوەڕاست و خواروی کوردستاندا لەسەر بنچینەی ئەلفو بێ‌ی بەدرخانی‌یەکان و گونجاندنی لەگەلّ شێوەی کرمانجی‌ی نێوەڕاستدا بەتەواوکردنی ناتەواوی‌یەکانی.

(١١) یاری کردن بە ئاگر، سلەیمانی هاوینی سالّی ١٩٥٧. ووتارێکە باسی گەشتێکی نووسەر دەکات بە ڕۆژهەلاّتی کوردستاندا بە تایبەتی کرماشان و سنە و مەهاباد وسیاسەتی کۆلۆنیالیستانەی دەولّەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دەزرێنێ بەرامبەر بەکورد؛ بە تایبەتی رژێمی شای ئێران. ئەم ووتارە لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بلاّوکراوەتەوە.

(١٢) بۆچی خراینە پشت گوێ؟، گۆڤاری هەتاو ژمارە (١٠٩) سالّی ٤، ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٥٧/هەولێر. ووتارێکە لەکەرکووکەوە نێرراوە بۆ گۆڤاری هەتاو، ڕەخنە لەسەر ژمێرەکەی سالّی ١٩٥٧ی عێراق دەگرێ کە زمانی کوردی و بوونی کوردی لە کەرکووکدا بەجارێک خستبووە پشت گوێ.

(١٣) الحقوق الثقافية للمواطنين الاكراد، بیرخەرەوەیەکە کە نووسەر لەگەلّ ١٠ مامۆستای قوتابخانە نێوەندی و سەرەتایی‌یەکانی خواروی کوردستان، چەند ڕۆژێک دووای کودەتای تەمووزی ١٩٥٨ داوێتی بە ژەنەرالّ عەبدولکەریم قاسم و وەزیری زانیاری ئەو دەمە جابر عومەر، بۆ دانانی بە مافی ڕۆشنبیری کوردی و کردنی بە زمانی خوێندن لە خوێندنگەکانی کوردستاندا و دامەزراندنی بنکەیەکی بەڕێوەبەرێتی بۆ زانیاری کوردستان لەکەرکووک. بیرخەرەوەکە لە لایەن نووسەرەوە لە بەشی کوردی وێستگەی رادیۆی بەغدا دا خوێندراوەتەوە و لە ٢٦ی تەمووزی ١٩٥٨دا ڕۆژنامەی

(البلاد) لەبەغدا بلاوی کردووەتەوە. بەلام هەر دەستبەجێ ڕۆژنامەی (البلاد) لەلایەن عەبدولسەلام عارفی جێگری قاسم و وەزیری نێوخۆی عێراقەوە داخرا و فەرمانی گرتنی ئیمزاکەرانی بیرخەرەوەکەش دەرچوو. ئەم بیرخەرەوەیە بەشێوەی نامیلکەش دەرچوو، و لەبیرەوەرینامەکانی تەبەقچەلی دا پێشان دراون. وەک نموونەیەک بۆ بزووتنەوەی "جیابوونەوە خوازانەی "کورد...و "تەماع کردنە" کەرکووک!!

(١٤) وەرگێڕان هونەرە، سلێمانی، چاپخانەی (ژین)، ١٩٥٨/ ٢٥٧٠. نامیلکەیەکە بەکورتی باس لە هونەری وەرگێڕان دەکا لەزمانی بێگانەوە بۆ کوردی و لە کوردی‌یەوە بۆ زمانی بێگانە. ئەم نامیلکەیە لە حەفتاکاندا لە لایەن بەشی کوردی زانستگەی بەغداوە جارێکی دی چاپ کراوەتەوە و وەک سەرچاوەیەک بۆ خوێندن بەکار هێنراوە.

(١٥) هەندێک زاراوەی زانستی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی ٢٥٧٢/ ١٩٦٠. فەرهەنگۆکێکی گچکەیە بۆ زاراوە زانستی‌یەکان وەک هی فیزیک و ماتماتیک و ژیانناسی و... هتد. ئەم فەرهەنگۆکە تا ئێستە بووەتە سەرچاوەیەک بۆ گەلێک فەرهەنگی دی کە پاش ئەوە نووسراون.

(١٦) سەرەتای میکانیک و خۆماڵەکانی مادده، بەغدا، چاپخانەی مەعارف ١٩٦٠، نووسەر ئەم بەرهەمەی لە ساڵی ١٩٥٦دا لە کەرکووک تەواوکردووە، بەلام چوار ساڵ پاش ئەوە توانیویتی بە چاپی بگەیەنێ. ئەم کتێبە یەکەمین کتێبێکی زانستە بە زمانی کوردی. فەرهەنگۆکێکی لەگەڵە کە زاراوە زانستی‌یەکانی فیزیکی بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی تێدایە. ئەو فەرهەنگۆکە کە لەساڵی ١٩٥٦دا نووسراوەتەوە یەکەمین فەرهەنگی کوردی‌یە بۆ زاراوەی زانستی. چاپکردنی کتێبەکە ئەرک و گیروگرفتێکی زۆری هێنایە پێشەوە و (٥٠٠) دینارێکی ئەو دەمەی عێراقی تێ چوو. بۆ زاتنانە بەر قوتابیان کە هێشتا ڕانەهاتبوون بە خوێندنی زانست بەزمانی کوردی؛ چەند سەد دانەیەکی بەسەر قوتابیانی قوتابخانەکانی کوردستاندا بە خۆڕایی بلاوکرایەوە.

(١٧) الابجدية الكردية اللاتينية بين دعاتها ومعارضيها- رد على تخرصات جريدة اتحاد الشعب. بەرپێچدانەوەی ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب)، زمانی حاڵی پارتی کۆمۆنیستی عێراقە کە پەلاماری نووسەری دابوو سەبارەت بەوەی هەوڵی بلاوکردنەوەی ڕێنووسی کوردی‌ی لاتینی دەدا. ئەم بەرپێچدانەوەیە بە ٥٠ ووتارێک

لە ڕۆژنامەی (صوت الاكراد)دا کە لە بەغدا دەردەچوو بڵاوکرایەوە، پاش ئەوەی ڕەقابەی عێراق کە بەدەست لایەنگرانی کۆمۆنیستەکانەوە بوو، ڕێی نەدا لە شێوەی نامیلکەدا بڵاوبکرێتەوە. ڕۆژنامەی (صوت الاكراد) لە ساڵی ١٩٦٠ دا بە زنجیرە بڵاوی کردەوە.

(١٨) زاراوەکانی لیژنەی (ریاضیات) لە ژێر ووردەبینی لێکۆڵینەوەدا، لە گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)دا، ژمارە ٦ و ٧ و ٨ی ساڵی ١٩٦٠ و ژمارە ١١ی ساڵی ١٩٦١. ئەم گۆڤارە یەکێک بوو لە گۆڤارە باشەکانی کورد، مانگی جارێک لە سلەیمانی دەردەچوو. لەنێوەڕاستی ساڵی ١٩٦١دا لەلایەن حکوومەتی قاسمەوە داخرا. خاوەنی گۆڤارەکە پارێزەر جەمال شاڵی بوو.

(١٩) الاكراد المفترى عليهم، ڕۆژنامەی (صوت الاهالي)، بەغدا پایزی ١٩٥٨. ئەم ووتارە وەرام و بەرپێچدانەوەی (رياض طه)یە کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی حیزبی بەعسی عەرەب و لەیەکێک لە ڕۆژنامەکانی لوبناندا کەوتبووە بوختان و درۆ و دەلەسە لە بارەی کوردەوە. ئەم ووتارە لەلایەن مامۆستا محەممەدی مەلا کەریمەوە کرا بەکوردی و لە گۆڤاری (هیوا)دا کە لە بەغدا (یانەی سەرکەوتنی کورد) دەری دەکرد بڵاوکرایەوە.

(٢٠) حول مفاهيم خاطئة في القومية الكردية، چەند ووتارێک بوو لە ساڵی ١٩٦٠دا و لە ڕۆژنامەی (صوت الاكراد)دا بڵاوکرایەوە، وەک بەرپێچدانەوەیەکی ئەو ووتارانەی کە مامۆستا مەسعوود محەممەد لە ڕۆژنامەی (الحرية)ی بەغدادا لەبارەی کوردەوە دەینووسین.

(٢١) کوردایەتی، لە چاپدان و پێشەکی نووسین بۆ کۆمەڵە هۆنراوەیەکی مامۆستا کامیل ژیر بەنێوی (کوردایەتی)یەوە. ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە یەکەمین هەنگا و بوو بەرەو بەرهەمهێنانی ئەدەبیاتی بیری نەتەوەیی. چ دار و دەستەی قاسم و چ لایەنگرانی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق نەیانتوانی لێی بێ دەنگ بن. کۆمۆنیستەکان لە ڕێی مامۆستا محەممەدی مەلا کەریمەوە کەوتنە پەلاماردانی ئەو نامیلکەیە و نامیلکەیەکی شەش پەڕەیی‌یان بەنێوی (کوردایەتی کامیل ژیر لە ژێر نەشتەری یەکالا کردنەوەدا) بڵاوکردەوە.

(٢٢) کوردایەتی - بزووتنەوە و بڕوا و ڕژێمە، نەشتەرە کوڵەکەی حەمەی مەلا کەریم لە

ژێر ووردەبینی لێکۆڵینەوەدا، بەغدا، چاپخانەی (نەجاح) ۱۹٦۰. ئەم نامیلکەیە وەک بەرپێچدانەوەیەکی نامیلکەی کۆمۆنیستەکان (سەیری پەراوێزی ژمارە ۲۱بکە) بەنێوی خواستەمەنیی زەردەشت)ەوە بڵاوکرایەوە.

(۲۳) چیرۆکی پاڵتۆ، نوسینی نیکۆلای گۆگۆڵ، وەرگێران بۆ سەر زمانی کوردی بە یارمەتی تەرجەمەی فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی، چاپخانەی (دار السلام) بەغدا ۱۹۵۸/۲۵۷۰.

(۲٤) فەرهەنگۆکی زانستی، هەولێر ۱۹٦۰/۱۹٦۱- ئەم بەرهەمە بریتی‌یە لە فەرهەنگێکی ٦٥ لاپەڕەیی لە قەوارەی درێژ و ژمارەیەکی زۆر زاراوەی فیزیک و ماتماتیک و کیمیا و زانستی ژینداران وئابووری و... هتد لەخۆی دا کۆ دەکاتەوە. کاتی خۆی ۳۰۰ دانەی بە رۆنیۆ لەچاپ درا بۆ قوتابی‌یەکانی قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتاییی هەولێر. نووسەر لەو ساڵانەدا مامۆستای ماتماتیک و زمانی کوردی بوو لەهەولێر.

(۲۵) زمان و ئەدەبیاتی کوردی، هەولێر ۱۹٦۰/۱۹٦۱ ئەم بەرهەمە بریتی‌یە لەو وانانەی کە نووسەر لە قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی هەولێر گوتوونی‌یەوە. بەرۆنیۆ ۳۰۰ دانە چاپکراوە لێ‌ی. هەمووی ۸ وانەیە و ٦٦ لاپەڕەیە لە قەوارەی گەورە و بەدەستی نووسەر خۆی نووسراونەتەوە، چونکە بەکارهێنانی مەکینەی نووسین بۆ نووسەر قەدەغە بوو. سەبارەت بەم کارانە و دامەزراندنی لیژنەی زمانی کوردی لە هەولێر، بەڕێوەبەرێتیی زانیاریی هەولێر هەشت مانگ لەسەر یەک مانگانەی مامۆستایەتی نووسەری بە بیانووی پڕوپووچ و ئەمڕۆ سبەی دوواخست، هەتا نووسەر ناچار بوو مان بگرێ لەدەرزگوتنەوەی رەسمی، و بەتایبەتی دەرز بە قوتابی‌یەکان بڵێتەوە. هەر ماوەیەکی کەم دووای ئەوە، بەجارێ دەستی خۆی لەکار کێشایەوە.

(26) La Question Kurde — دۆز (مەسەلە)ی کورد

ووتارێک بوو لە ساڵی ۱۹٦۲دا لە ژنیف بۆ هێندێک لە خوێنکاران و رۆشنبیرانی سویسرەیی خوێندرایەوە. ووتارەکە نێزیکەی بیست لاپەڕەیەک دەبوو، بە رۆنیۆ چاپکرا بوو.

(27) Lalo Karim, mit Illustrationen von Doris Feyerabend, München 1968, (لالۆکەریم)، وەرگێرانی چیرۆکی لالۆکەریم (بڕوانە پەراوێزی ژمارە ۸) بۆ سەر زمانی

ئەڵەمانی، لەگەڵ نەخش و نیگاری دۆریس فایەر ئابندا، مۆنیخ ١٩٦٨.

(28) Kurdische Schriftsprache, eine Chrestomathie moderner Texte, Helmut Buske Verlag, Hamburg 1969.

"زمانی نووسینی کوردی" چەند دەقێکی هۆنراوە و پەخشانی نوێ (بۆ قوتابیان)، هەمبورگ- بنکەی چاپەمەنیی هیلموت بوسکە ١٩٦٩.

(29) Mam und Zin, Publikation der NUKSE 1969.

مەم و زین، شاکاری ئەحمەدی خانی، بڵاوکراوەی (یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا) (نوکسە)، مۆنیخ ١٩٦٩.

(٣٠) حول المشكلة الكردية، بڵاوکراوەی نوکسە ١٩٦٩/٢٥٨٠. نامیلکەیەکی ٦٠ لاپەڕەییە بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتانە لە باری سەرنجی حیزب و کۆمەڵە کوردی و عەرەبییەکان لە چاویلکەی نووسین و قسەکانیانەوە. شیکردنەوەیەکی مێژووی کورد بە شێوەیەکی زانستانە و کورتەیەکی فەلسەفەی هێزە نەتەوەییەکانی کوردستانیش خراونەتە بەرچاو.

(31) Der Kurdische Fürst Mir-i Kora im Spiegel der morgenländischen und abendländischen Zeugnisse Ein Beitrag zur Kurdischen Geschichte, Hamburg 1970.

میری کورد پاشای کۆرە لە ئاوێنەی بەڵگەنامە رۆژهەڵاتی و رۆژئاواییەکاندا. بەشدار بوونێک لە لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد دا، هەمبورگ ١٩٧٠.

(32) Sprichwörter und Redensarten aus Kurdistan, Publikation der NUKSE, München 1970.

پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لەکوردستانەوە، بڵاوکراوەی نوکسە، مۆنیخ ١٩٧٠.

(33) Kurdische Marchen und Volkserzahlungen, Publikation der NUKSE, München 1970.

ئەفسانە و چیرۆکی گەلەمپەری کوردی، لەگەڵ نەخش و نیگاری دۆریس فایەر ئابند، بڵاوکراوەی نوکسە ١٩٧٢.

(34) Kurdistan und Seine Revolution, Vortrag gehalten im Jahre 1971 für die Kurden und Freunde Kurdistans, Publikation der NUKSE 1972.

کوردستان و شۆڕشەکەی، زنجیرە ووتارێک بوو لە ساڵی ١٩٧١دا لە بەرلینی رۆژئاوا خوێنرانەوە بۆ کورد و دۆستەکانی کوردستان، بڵاو کراوەی نوکسە ١٩٧٢.

(35) Ein Kurdisches Mond - Observatorium aus neuerer Zeit, in ZDMG, Nr. 122, 1972, S.140-144.

روانگەیەکی کوردی بۆ تەماشاکردنی مانگ، لەگۆڤاری کۆمەڵەی ڕۆژهەڵات ناسیی ئەڵماندا، ژمارە ٢٢/١٩٧٢، ل ١٤٠-١٤٤. ئەم ووتارە بە هاوکاری ئەستێرە ناسی ئەڵمان پرۆفیسۆر ڤۆڵفهارد شلۆسەر نووسراوە، باسی ئەو روانگەیە دەکات کە ئەستێرەناسی کورد شێخ حەسەنی گڵەزەردە دروستی کرد بوو و ئێستە هەتەر و پەتەری نەماوە.

(٣٦) کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئە ڵمانیادا. گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەشی یەکەم، بەرگی دووەم، بەغدا ١٩٧٤، ل ٤١٣-٤٩٨.

(37) Jeziden in: Lexikon der Islamischen Welt, Kohlhammer Verlag, Stuttgart 1974,S. 67-68.Bd.I.

ئێزیدییەکان، لێکسیکۆنی جیهانی ئیسلام.

بنکەی چاپەمەنیی کۆلهامەر، شتوتگارت ١٩٧٤، ل٦٧-٦٨. ئەم ووتارە باسی ئێزدییەکان و ئاینەکەیان دەکات.

(38) Kurden, in: Lexikon der Islamischen Welt, Kohlhammer Verlag, Stuttgart 1974, Bd. I, S. 114-115.

کورد، لێکسیکۆنی جیهانی ئیسلام، بەندی یەکەم، بنکەی چاپەمەنیی کۆڵهامەر، شتوتگارت ١٩٧٤، ل. ١١٤-١١٥. ئەم ووتارە باسی مێژووی کورد دەکات هەر لە کۆنەوە تا کۆتایی شەستەکان زۆر بە کورتی.

(39) Kommentar zu Otto Spies' Artikel "Kurdische Märchen im Rahmen der orientalisch vergleichenden Märchenkunde", in "Fabula" Zeitschrift für Erzählforschung, 15.Bd., Heft 3, S. 245-249, walter de Gruyter Verlag, Berlin. New york 1974.

لێدوانێکی ووتارەکەی ئۆتۆشپیس

(ئەفسانە کوردییەکان لەسنووری ئەفسانەناسی ڕۆژهەڵاتییانەی بەراورد کارانەدا)، گۆڤاری لێکۆڵینەوەی چیرۆک (فابولا)، بەندی ١٥، بەرگی ٣، ل٢٤٥-٢٤٩، بنکەی چاپەمەنیی دی کرۆیتر، بەرلین و نیویۆرک ١٩٧٤. ئەم ووتارە وەرامدانەوەیەکی بەهەشتی پرۆفیسۆر ئۆتۆشپیس (١٩٠١/٤/٥-٢٩/١٠/١٩٨١) بوو کە هەر لەو گۆڤارەدا و بە بۆنەی دەرچوونی (ئەفسانە و چیرۆکی گەلەمپەری کوردی)یەوە (بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٣٣) ووتارێکی نووسیبوو و لەوێ دا گوتبووی کوردەکان ئەفسانە و چیرۆکەکانیان لەعەرەب و تورک و فارسەوە وەرگرتووە، هەروەها گوتبووی زۆربەی هەرە زۆری کورد کۆچەرن. پاش بڵاوبوونەوەی

ووتارەکە، لە (بۆن) نووسەری دیبوو، زۆر بەڕێزەوە پێشوازی کردبوو، و لە قسەکانیدا دەرکەوتبو کە ڕەئیی گۆڕاوە بەرامبەر بە کورد. ئەمجارە بۆ نووسینەوەی پێشەکییەک بۆ کۆمەڵێک ئەفسانەی کوردی کە بە زمانی ئەڵەمانی دەرچوون، بە جۆرێکی دیکە باسی کوردی کردبوو، و زۆر سوودیشی لەکتێبی (کوردستان و شۆڕشەکەی) نووسەر وەرگرتبوو. هەزاران ڕەحمەت لەوانەی پێ لەسەر هەڵەی خۆیان داناگرن و سەربەرزانە خۆیان ڕاست دەکەنەوە.

(40) Die Schriftsprache der Kurden, in: Acta Iranica, Monumentum H.S. Nyberg, deuxiéme série, volum II, Difussion E.J. Brill, Leiden 1975, S.97-122.

زمانی نووسینی کوردی، ئەکتا ئیرانیکا، یادنامەی هـ.س. نیبیرگ، زنجیرەی دووەم. بڵاوکراوەی بریل، لایدن ١٩٧٥، ل ٩٧. ١٢٢ ئەم ووتارە لە یادنامەی زانای ئێراننا سی بە نێوبانگ نیبیرگدا نووسراوە.

(41) Some characteristrios of Kurdish mythology.

هێندێک لە تایبەتکارەکانی میتۆلۆژیای کوردی. ئەم ووتارە ئامادە کرابوو بۆ خوێندنەوە لە ڕۆژی ١٥/٣/١٩٧٥دا لە زانستگەی لەنکیستەر Lancaster لە ئینگلیستان بە بۆنەی ٢٣ هەمین کۆنگرەی کۆمەڵەی ئینتەر ناسیۆنالیی مێژووی ئاینەوە لە لەنکیستەر لە ١٥-٢٢ی ئابی ١٩٧٥. تەماشای پرۆگرامی ٢٢ هەمین کۆنگرە بکە کە لیژنەی کۆنگرە دەری کردووە.

(٤٢) خوێندنی کوردەواني لە زانستگەی ئازاد لە بەرلین.

گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات/زانستگەی بەغدا، ژمارە (١٩) ساڵی ١٩٧٦، ل ١٧٥-١٩٣. ئەم ووتارە لایەنێکی ئەو هەوڵ و تێکۆشانە باس دەکا کە نووسەر لەسەرەتای حەفتاکاندا دای بۆ هێنانە کایەی خوێندنی کوردەواني و ڕێکوپێک کردنی خوێندنی ئێرانیستیک لە زانستگەی ئازاد لە بەرلین. ئەم کارە گرنگە درێژەی کێشا هەتا لە کۆتاییی هەفتاکاندا و لە ئەنجامی گەلەکۆمەی خراپەکاراندا تێک درا، کە بێگومان باسکردنی ئەم مەسەلەیە بە درێژی و شێوەیەکی بابابەتانە جێی ئێرە نییەو وەکو (کنگر و ماستەکە) کاتی خۆی هەیە.

(٤٣) ڕەخنەی زمانەوانی و لیسی کۆیرانە هاویشتن. گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (٩) ساڵی دووەم، تەمووزی ١٩٧٨، ل ٨٦-٩٢. ووتارێکی زمانەوانی ڕەخنە

گرانەیە.

(٤٤) بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی (١٧٨٧-١٩٧٥) نووسینی نەریمان. گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆیی)، ژمارە (٤) کانوونی دووەمی ١٩٧٨، ل ٨٩-٩١ ئەم ووتارە دووانێکە لەسەر ئەو بیبلیۆگرافیایە.

(٤٥) سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکار هاتوو و کۆڕی زانیاری کورد. گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات/ زانستگەی بەغدا، ژمارە ٢٢، ١٩٧٨ ل٧٩-١٠٥. ئەم ووتارە ئەو زاراوانە شی دەکاتەوە کە "کۆڕی زانیاری" دروستی کردبوون و قورسی و سووکی‌یان بە شێوەیەکی زانستانە دەخاتە بەر چاو.

(٤٦) مامۆستا گیوی موکریانی لە تای تەرازووی خزمەتدا، ئەم ووتارە لە ١٢/٩/١٩٧٧دا نووسراوە بە بۆنەی کۆچی دوایی‌ی گیوی موکریانی‌یەوە لە ٢٤/٧/١٩٧٧دا و لە "لە یادی گیوی موکریانی" دا بلاوکرایەوە کە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٧٨دا چاپکرا، بڕوانە ل ٤٧-٥١.

(٤٧) كلمة حول المؤتمر العالمي القادم للمستشرقين، مجلة (شمس كردستان)، العدد ٥٤، آذار ١٩٧٩. باسی ئەو کۆنگرەیەیە کە لە ساڵی ١٩٧٩دا لە لایەن ڕۆژدا اسەکانەوە لە بەرلین بەسترا.

(48) Über die Religion von Haqqa, Orientalisten Tag, Berlin 1979.

لەبارەی ئاینی هەققەوە، ووتارێک بوو لە کۆنگرەی ڕۆژدا اسەکاندا لەبەرلین لەساڵی ١٩٧٩دا خوێندرایەوە و دەمەتەقێ‌ی لەسەر کرا.

(49) Der arabische Nationalismus in Irak und Syrien und die Nationalitätenfrage im Vorderen Orient, Dipl. - Arbeit, FU-Berlin 1979.

ناسیۆنالیزمی عەرەب لە عێراق و سووریادا و مەسەلەی ناسیۆلیتەکان لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستدا، دیپلۆمنامەی پۆلیتۆلۆژی، زانستگەی بەرلین ١٩٧٩.

(50) Buchbesprechung: Joyce Blau: Manuel de Kurde (dialecte Sorani), Paris 1980 in: Zeitschrift der Deutschen Morgenländischen Gesellschaft, Band 131, Heft 2 (1981), S.413.415.

ئەم ووتارە لێدوانێکی بابەتانەیە لەو کتێبەی کە جوێس بلۆ بۆ فێربوونی زمانی کوردی (شێوەی سۆرانی)، لە پاریس لە ساڵی ١٩٨٠دا بلاوی کردووەتەوە. لێدوانەکە لە گۆڤاری ڕۆژدا اسەکانی ئەلمانداو و لەسەر داخوازی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە نووسراوە، بەرگی ١٣١، بەشی٢ ساڵی ١٩٨١، ل ٤١٣-٤١٥.

"Preuves", Paris le 2.Octobere 1962.

(348) Dana Adams Schmidt: "Journey among Brave Men", Little, Brown, and Company, Boston, Toronto. 1964.

(349) David Adamson: "The Kurdish War", London, 1964.

(350) "Daily Telegraph", 30.12.1962.

(351) "Le Monde", Paris, 27.9.1962

هەروەها بڕوانه.Robert Stephens:" They too have rights" in The Observer", 30.12.1962

(352) "The Sunday Telegraph", 23.12. 1962. "Daily Telegraph" 2.11.1962. und 10.1.1963. هەر هەمان سەرچاوە

(353) The Times", London, 23.6.1963.

(354) "La Nation Francaise", Paris 16.1.1963.

"Le Monde", Paris, 17. Août 1962. :هەروەها بڕوانه

(٣٥٥) بڕوانه رۆژنامەی (العهد الجديد)، العدد ٤٧٨، بغداد، ٩٦٢/٧/٢٠ (گوتەکانی قاسم له ئەکادیمی سوپایی بەغدا). هەروەها هەمان سەرچاوە: ژ. ٦٠٠، ٩٦٢/١٢/١١. هەروەها بڕوانه رۆژنامەی (الايام)، العدد ٥٩، بغداد، ٢٢ حزيران ١٩٦٢. هەروەها بڕوانه:

"Le Monde", Paris, 19-20 Août 1962: " Succés Kurdes en Proche-Orient". "Daily Telegraph", 30.12.1962. Christian Sulser: "Le Pouvoir du général Kassem ébranlé par les Succes Kurdes", in "Gazette de Lausanne", Nr. 201, 28. Août 1962.

(٣٥٦) بڕوانه رۆژنامەی (العهد الجديد)، العدد ٥١٠، بغداد، ١٩٦٢/٨/٢٧. هەروەها هەمان سەرچاوە، ژ. ٥٤١، ١ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٢.

(٣٥٧) بڕوانه رۆژنامەی (الثورة)، الاعداد ٩١٩، ١٩٦٢/٦/١٤، ١٠١٤، ١٩٦٣/١٠/٧.

(358) "La Nation Française", Paris, 16.1.1963

(359) " Kurds' Revolt ended, but fight goes on" in "New york Herald Tribune", 24.5.1962

(360) "New York Times", 19.2.1963.

(٣٦١) بڕوانه کۆپییەکی بەیاننامەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق له رۆژنامەی (الجماهير)دا، بغداد، ١٩٦٣/٢/١٢.

(362) "Daily Telegraph", 18.2.1963, 11.3.1963.

"Le Combat". 13.2.1963. "Newyork Times" (Internation Edition, 18.2.1963.

(٣٦٣) بڕوانه ئەو گوتەیەی "عەفلەق" له ١٩٦٦/٢/١٨دا له رۆژنامەی (الحياة)دا، ژ. ٧٠٠، بیروت، ١٩٦٦/٢/٢٥.

(364) “Sunday Observer”, 23.6.1963.

(365) Rolf W. Schloss: “Ein neuer Traum vom Kurdenstaat”

خەونێکی نوێ بە دەوڵەتێکی کوردەوە"،

in “Publik” Nr. 12, Frankfurt, 20. März 1970, S . 7.

بڕوانە لاپەڕەکانی (٢٣-٢٤)ی ئەم کتێبە..

(366) “The Sunday Times”, 24.2.1963. “daily Worker”, London, 18.6.1963. Richard Scott: “The Kurds Struggle” in “The Guardien”, 15.5.1963.

(٣٦٧) بڕوانە "اراء حول المشكلة الكردية"، من منشورات جريدة النور، لسان حال جماعة جلال الطالباني، بغداد ١٩٧٠، ص٤٦.

(٣٦٨) ئەم زانیارییەم ڕاستەوخۆ لەکەسێکی باڵادەستی پارتی دیمۆکراتەوە وەرگرتووە.

(٣٦٩) بڕوانە سەرچاوەی دەست نیشان کراو لە پەراوێزی (ژ٣٦٧,)ی ل ١٤٨دا.

(370) “Kurdish Terms for Autonomy” in “The Times”, London. 29.4.1963.

(371) “Le Monde”, Paris, 8.3.1963.

(٣٧٢) ڕاستی یەکەی ١١/٩/١٩٦١ە.

(٣٧٣) بڕوانە امين سامي الغمراوي: "قصة الاكراد في شمال العراق"، قاهرة، ١٩٦٧، ص ٢٧٧.

(374) “The Daily Telegraph”, 12.3.1963.

هەروەها بڕوانە هەموو ڕۆژنامە عێراقییەکان لە ١٢/٣/١٩٦٣دا.

(375) Richard Beeston “Kurds plan fresh revolt if autonomy is refused” in “The Daily Telegraph”, 2.3.1963. 27.2.1963.

(٣٧٦) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو لە ٢٢/٢/١٩٦٣دا.

(٣٧٧) بڕوانە جلال الطالباني: "كردستان والحركة القومية الكردية"، بغداد، ١٩٦٩/ ١٩٧٠، ص ٢٠٧و٢٠٨.

(٣٧٨) دەقی ئەو پلانە لەم سەرچاوەیەدا بڵاوکراوەتەوە:

“Kurdish Facts”, Organ der “International Society Kurdistan”, Nr. 10, Amsterdam, 10. Juli 1963. P.9-10.

هەروەها بڕوانە محمود الدرة: "القضية الكردية" بيروت، ١٩٦٦، ص ٣١٨-٣٢٤.

(379) Dana Adams Schmidt: “Journey among brave men”, London, 1964, P. 263.

(380) “Daily Express”, 17.6.1963.

(٣٨١) بڕوانە ڕۆژنامەی "الاهرام"، العدد ٢٧٩٤١، قاهرة، ١١ ژونی ١٩٦٣.

(382) “Le Combat”, Paris, 4.Juillet 1963.

(383) “De Volkskrant”, Nr. 1, Amsterdam, 19.6.1963.

"Daily Worker", London, 18.6.1963.

(384) Richard Beeston: "Iraki Troops massing in case of Kurdish war" in "Daily Telegraph", 20. 5. 1963.

(٣٨٥) بڕوانە گشت ڕۆژنامەکانی عێراق لە ١٦/٦/١٩٦٣دا.

(386) "Le Soir", Beirut, 11.6.1963.

(٣٨٧) بڕوانە "مساهمة في تقيم سياسة حزبنا بين تموز ١٩٥٨ وانقلاب شباط ١٩٦٣"، (ص١٥٧. حاشية ٤-٥).

(388) "Kurdish Facts", Organ of the "International Society Kurdistan", Nr. 16, Amsterdam, 10.7.1963.

(389) "Die Welt", Hamburg, den 12.7.1963.

(390) "The Times", London, 24.5.1963.

(391) "Sunday Express", 30. 6.1963.

(392) "Newsweek", 23. 6. 1963.

(393) "Sunday Express", 30.6.1963.

(394) "Newsweek", 23.6.1963.

(395) Fuad al-Rawi (charge d'Affaires d.i. Embassy of the Republic of Iraq): "The Kurds" in "the Observer", 30.6.1963.

(٣٩٦) بڕوانە پرۆتۆکۆلی کۆبوونەوەی ١٢٧٨ هەمین، (دانیشتنی ٣٦ هەمین)ی ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە جنێف، ١١ی ژولی ١٩٦٣.

(٣٩٧) (حسەین)ی شای ئەردەن گفتی بە عێراق دابوو کە لە دژی کورد، یارمەتییان بدات.

بڕوانە:

"The Times", London, 12. 7.1963.

(398) "Kurdish Facts", Organ der "International Society Kurdistan", Nr. 17, Amsterdam, 15.7.1963, S.5

(399) "Le Monde", Paris, 18. Août 1963.

(400) "The Jewish Observer and Middle East Review", 19.7.1963.

(401) Mao Tse Tung: "Über den Widerspruch", Verlag fur Fremdsprachige Literatur, Peking, 1968, S.26.

(٤٠٢) هەمان سەرچاوە. ل٤٨.

(٤٠٣) هەروەها هەڵوێستی دوژمنکارانەی دەستەڵاتدارانی چین بەرامبەر تێکۆشەرە ئازادیخوازەکانی گەلی بەنگلادیش و یارمەتی و کۆمەکیان بە کۆمۆنیست و فیۆداڵەکان لە ڕێگەی پاکستانی

داردەستی سەنتۆ و ناتۆ وە، رەفتارێکی زۆر شەرم هێنەر بوو. بۆیە سەیر و سەمەرە نی‌یە کە پیاو دەبینێت ماو ئامێزی بۆ (شێرە پەڕۆکە)، یانی نیکسۆن ئاواڵە دەکات.

(404) "Le Monde", Paris, 30. Août 1963.

(405) "Abend post", Nr. 161, 16. Juli 1963.

"Bild am Sonntag", 21. Juli 1963, S. 9.

(٤٠٦) بڕوانە محمود الدرة: "القضية الكردية"، بیروت، ١٩٦٦، ص ٤٠٦. هەروەها بڕوانە رۆژنامەی (IZVESTIA) لە ١٩٦٣/٧/٤دا.

(٤٠٧) بڕوانە رۆژنامەی "پارس"، شمارە ٣٣٤٣، شیراز، ١٦/١٠/١٩٦٩ص٢.

(٤٠٨) بڕوانە رۆژنامەی (Milliyet)ی تورکی، ١٩٦٣/٦/١٤.

(٤٠٩) لە نامەیەکی نهێنی فەرماندەی بەندەری (کەراچی)یدا. ژمارە جوبار سەفرە ١٢٧٩/٨٦ لە ١٩٦٣/٨/٢٦دا کە بۆ نوێنەری سوپایی عێراق لە (کەراچی) نووسیویە.

(٤١٠) بەنگلادیش پاشان ئازادی خۆی بەدەست هێنا و لە پاکستان جویٚ بووەوە.

(411) "The Times", London, 24.5.1963.

(٤١٢) بڕوانە "بیانات سیاسیة"، نامیلکەیەکی (کاژیک)ە بە زمانی عارەبی، لە ١٩٦٩دا لقی ئەوروپا بڵاوی کردەوە، ل ١٥.

(413) "Die Welt", Hamburg, den 13.6.1963.

(٤١٤) براونە رۆژنامەی "البعث"، دمشق، ١٩٦٣/٦/١٤.

(415) "The Times", Londun, July 18, 1963.

(416) " The New York Times" 1.7.1963.

هەروەها بڕوانە

Khadduri Majid: "Republican "IRAQ", London, 1969. P.207.

(417) " Algemeen Handelsblad" Amsterdam, 4.7.1963.

" L' Aurore", Pris.4.7.1963.هەروەها

(٤١٨) بڕوانە رۆژنامەی "الجريدة"، بیروت، ١٩٦٣/٧/٢٣.

(419) " Daily Telegraph", 28.12.1963.

(٤٢٠) بڕوانە نامیلکەی "ازمة حزب البعث العربي الاشتراكي من خلال تجربته في العراق"، منشورات الجناح اليساري من حزب البعث. (جماعة علي صالح السعدي). ص ١١٧-١١٨

(421) " The Guar 13.6.1963. dian"Manchester-London, 118-117 "De Telegraph", Amsterdam, 13.6.1963.

(٤٢٢) لە بەیاننامەیەکی پارتی دیٚموٚکراتەوە وەرگیراوە، کە لە ١٩٦٤/٤/١٩دا بڵاوکراوەتەوە. (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە).

(٤٢٣) بڕوانە ڕۆژنامەی "الوقائع العراقية"، بغداد ١٩٦٤/٣/٢٣.

(٤٢٤) بڕوانە محمود الدرة، القضية الكردية، بيروت، ١٩٦٦، ص ٣٥٧.

(٤٢٥) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٢٦) بڕوانە " بيانات سياسية"، من منشورات حزب كاژيك، ١٩٦٩/٢٥٨١.

(٤٢٧) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو "بيانات سياسية".

(٤٢٨) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٢٩) مەبەست لە (موشیر عەبدولسەلام عارف)ە، دەقی ئەو نامیلکەیە لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٣٠) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٣١) ئەو زانیاری‌یەم لە یەکێک لە ئامادە بووانی ئەو دانیشتنە وەرگرتووە.

(٤٣٢) بڕوانە "بين كاژيک والبارزاني"، منشورات حزب كاژيک، ١٩٦٩/٢٥٨١ ص٤-١٨.

(٤٣٣) دەقێکی هەواڵەکانی ئەو دانیشتنە نهێنی‌یە لە ئەرشیفی نوکسە دایە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە (شاوەیس) زۆر شتی دیکەشی گوتووە کە بڵاوکردنەوەی لەم کاتەدا بەچاک نازانین.

(٤٣٤)و(٤٣٥) دەقەکانیان لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٣٦) ئەمە ڕاست نی‌یە. بەشێک لە کورد دیان و بەشێکیان یەزیدین. جگە لەوە لە کوردستاندا هەندێ کۆڕ و کۆمەڵی ئاینی دیکەش هەن.

(٤٣٧) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(438) “Zwiespalt im lager der Kurden” in “Neue Zürcher Zeitung”, Fernausgabe, Nr. 296, 27. Oktober 1964, S.3.

(٤٣٩) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٤٠) سەرچاوەی پێشووتر، (دووبەرەکی لە ڕیزی کوردەکان دا).

(٤٤١) دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٤٢) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٤٣) بڕوانە نامیلکەی "بين كاژيک والبارزاني"، من منشورات حزب كاژيک، ١٩٦٩/٢٥٨١، ص٢٠.

(٤٤٤)و(٤٤٥) بڕوانە ئەو بەیاننامەیەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە نێوەڕاستی ئەیلولی ١٩٦٤دا. (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە).

(٤٤٦) ڕۆ نووسێکی ئەو نامیلکەیە لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٤٧) ٤٨ کەس نەبوون وەک ڕۆژنامەی (Süddeutsche Zeitung) لە ٦و١٩٦٥/٢/٧دا نووسیبووی. هەروەها بڕوانە ژمارە ٢٥٨ی ڕۆژنامەی (Frankfurter Allgemeine Zeitung) لە ٥ی نۆڤەمبەری ١٩٦٤دا.

(٤٤٨) بڕوانە ئەو بەیاننامەیەی پارتی دیمۆکرات لە ١٩٦٤/١٠/٢٥دا. (دەقەکەی لە ئەرشیفی

نوکسه دایه).

(٤٤٩) بڕوانه ڕۆژنامــەی "خــەبات"، ئۆرگــانی (پ.د.ک)ی بارزانی، ژ. ٤٨٨ حــوزەیرانی ١٩٦٦. هەروەها بڕوانه ئەو یاسایەی (ئەنجـومەنی سـەرکردایەتی شۆڕشی کورد) به عارەبی بلاوی کردەوە، ل٨. (دەقەکەی له ئەرشیفی نوکسه دایه).

(٤٥٠) بڕوانه أمين سامي الغمراوي: "قصة الاكراد في شمال العراق"، قاهرة، ١٩٦٧، ص٣٢٣-٣٣٥. هەروەها بڕوانه محمود الدرة: "القضية الكردية". بيروت، ١٩٦٦، ص ٣٦٠-٣٧١.

(٤٥١) بڕوانه محمود الدرة: سەرچاوەی پێشوو. ل ٣٧٢.

(٤٥٢) دەقەکەی له ئەرشیفی نوکسه دایه.

(٤٥٣) دەقەکەی له ئەرشیفی نوکسه دایه.

(454) “ Süddeutsche Zeitung”, München, den 6. und 7. Februar 1965.

(٤٥٥) بڕوانه ئەو بەیاننامــەیەی پارتی دیمــوکــرات له ١٩٦٥/٢/٦. (دەقــەکــەی له ئەرشــیــفی نوکسەدایه).

(٤٥٦) دەقەکەی له ئەرشیفی نوکسه دایه.

(٤٥٧) بڕوانه محمود الدرة: "القضية الكردية" بيروت، ١٩٦٦، ص ٣٨٤.

(٤٥٨) بڕوانه محمود الدرة، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨٤-٣٨٥.

(٤٥٩) بڕوانه ڕۆژنامەی "الثورة العربية"، العدد ١٩٠، بغداد، ٢٨ شباط ١٩٦٥.

(460) “ Handelsblatt”, 22. März 1965.

(٤٦١) بڕوانه ڕۆژنامەی "الحياة"، بيروت ١٧ ابريل ١٩٦٥.

(462) “Quick”, 17. Jahrg. , 1. April 1965.

(463) “Kurdenkrieg”, in “Christ und Welt, Nr. 22. XVlll. Jahrg., Stuttgart, 28.5.1965. "جەنگی کوردان"

(464) “Nasser für Ende des Kurdenkriegs”, in “Süddeutsche Zeitung”, Nr. 84, München, 8. April 1965.

ناصر لەگەڵ کۆتایی هێنانی جەنگی کوردان دایە".

(٤٦٥) بڕوانه سەرچاوەی پێشوتر "Kurdenkrieg"

(٤٦٦) لەتیف عـەلی چەند ســاڵێک پێشـمـەرگە بوو. پاشان تووشی سـیل بوو. له ســاڵی ١٩٦٤دا بۆ چارەســەریی هاتە مــۆنیـخ. له ١٩٦٨/٣/٨دا کــۆچی دوایی کــرد وله مــۆنیـخ له گــۆڕســتــانی (گاوتینگ) نێژرا. بڕوانه Kurdistan Information ئۆرگانی (نوکسه). ژ: ٨، ٢٠ /١٩٦٨/٤. (هەروەها بڕوانه بەیاننامەی کۆتایی دووهەم کۆنگرەی (خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد له ئەوروپا "سۆکســە" له ١٩٨٣/١٠/٤دا. هاوبیــرانی بەشـداری کـۆنگرە. له ٢٥ ئۆگـوسـتی ١٩٨٣دا بۆ یادکردنەوەی ئەو هاوبیرە شەهیدە چوونە سەر گۆڕەکەی و چەپکە گوڵیان له سەردانا). -کوردۆ-

(467) Vanly, Ismet Cheriff: “Le Kurdistan Irakien Entite Nationale”, Neuchatel

1970, S.388.

Kurdistan Information", Organ der NUKSE, Nr. XV, 16. November 1970.

(٤٦٨) بروانه گۆڤاری "خوێندکاری کورد"، ئۆرگانی "نوکسه"، ژ ١، ١/٢/٩٦٦ (سەرگوتار دەربارەی وانلیّ نوسراوە).

(٤٦٩) بروانه شەونم: "٤ی نیسـان"، له گـۆڤـاری "دەفتـەری کـوردەواری"یدا، ب٣، بەغـدا، مـایس و ئۆگوستی ١٩٧٠، ل ٢١-٢٥.

(470) "Süddeutsche Zeitung", Nr. 102, München, 29.4.1965.

(٤٧١) بروانه رۆژنامەی "التآخي"، العدد ٢٦٠، بغداد، ١٤/٤/١٩٦٨.

(٤٧٢) بروانه بەیاننامەی پ.د.ک (دەستەی تالّەبانیی)، لقی ئەوروپا، ١١/٥/٩٦٥ (دەقەکەی له ئەرشیفی نوکسه دایه)

(٤٧٣) بروانه هەموو رۆژنامەکانی عێراق له ٩و١٠/٩/١٩٦٥دا.

(٤٧٤) بروانه رۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٣٩٤، بغداد، ٣٠/١/١٩٦٥.

(٤٧٥) بروانه محمود الدرة: "القضية الكردية"، بيروت، ١٩٦٦، ص٣٥٨.

(٤٧٦) بروانه رۆژنـامـەی "خـەبات"، ئۆرگـانی پ.د.ک (دەسـتـەی بارزانیی)، ژ. ٤٨٣، دیسـەمبـەری ١٩٦٥.

(٤٧٧) بروانه رۆژنامەی "صدى كردستان"، بڵاوکراوەی پارتی دیموکرات له ئەوروپا، کانوونی دووهەمی ١٩٦٥. (دەبێت ئەم مـێـژووە ١٩٦٦ بێـت. چونکه ناشـێت له کـانوونی دووهەمی ١٩٦٥دا سـەر ژمێری کوژراوەکان هەمان ساڵ کرابێت)

-کوردۆ-

(478) "Kurdistan Information", Organ der NUKSE, Nr. 1, 24.4.1966.

Internatianale Presseschau", Nr. 22, Stuttgart, 3.6.1966, S.12 :هەروەها

(٤٧٩) سەرچاوەکانی پێشوو.

(٤٨٠) بروانه رۆژنـامـەی "خـەبات"، ئۆرگـانی پ.د.ک (دەسـتـەی بارزانیی)، ژ. ٤٨٣، دیسـەمبـەری ١٩٦٥.

(٤٨١) لەفەرمانێکی نهێنی (قائد قوات الميدان للعمليات الحربية) له ١٧/٨/٩٦٥دا، ژماره ١٠٦٠ لەژێر سەردێڕی (قەدەغـەکردنی دەرمـان بردن بۆ گـوندەکـانی کـوردسـتـان). هەروەها بروانه رۆژنامـەی "خەبات"ی ژ. ٤٨٣.

(482) "Süddeutsche Zeitung", Nr. 74, München, 28. 3.1966.

(٤٨٣) بروانه رۆژنامەی "خەبات"، ژ. ٤٨٣، دیسەمبەری ١٩٦٥، ل ٢-٤.

(484) Horst Brunig: "Stille Front (am Tigris)", in "Presse", 8. März 1966.

"بەزەیەکی ئارام لە کەناری دیجلەدا"

(٤٨٥) بڕوانە امين سامي الغمراوي: "قصة الاكراد في شمال العراق، قاهرة، ١٩٦٧، ص ٣٩٤.

(٤٨٦) بەڵێنی بلفۆر ئەو بەڵێنە بوو کە ئینگلیز بە زایۆنیزمەکانی دا و بەو پێیە دەوڵەتێکی لە فەلەستین دا بۆ جوولەکان دامەزراند.

(487) "L" Express", Paris, 29.7.1968.

(٤٨٨) بۆ نموونە بڕوانە نشأة التغلبي "اسرائيل على حدود العراق"، مجلة الحوادث، بيروت، العدد ٦٣٩، السنة ١٣، ٧ فبريور ١٩٦٩.

(٤٨٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "الثورة العربية"، بغداد، ٥ كانوني الثاني ١٩٦٦.

(٤٩٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، بغداد، ١٩٦٦/١/١٣.

(491) " Süddeutsche Zeitung", München, 27.5.1966.

(٤٩٢) سەرچاوەی پێشوو، ژ. ٣١٠، ١٩٦٥/١٢/٢٨.

(٤٩٣) دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسە دایە.

(٤٩٤) بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، العدد ٣٢٧٣، بغداد، ١٩٦٦/١/١٠.

(٤٩٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "صوت العرب"، العدد ١٤٥، بغداد، ١٩٦٦/١/١١ هەروەها "المنار"، العدد ٣٢٦٩، بغداد، ١٩٦٦/١/٦.

(٤٩٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "Hürriyet"ی تورکی، ١٩٦٦/٥/١٨.

(٤٩٧) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، بغداد، ١٩٦٦/٤/٢٣.

(٤٩٨) بڕوانە ڕۆژنامەی "اخبار كردستان"، بەشی ڕاگەیاندنی پارتی دیموکرات، ژ١٧، ١٩٦٦/١/٢٨.

(499) "Kurdish Facts", Organ der "International Society Kurdistan", 66/3, Amsterdam,1.3.1966.

(500) Richard Beeston in "Daily Telegraph", 8.2. 1966.

(٥٠١) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ١٥٢، بغداد، ١٩٦٦/١/١٩.

(502) "Kurdish Facts", Organ der "International Society Kurdistan, Nr. 66/4, Amsterdam, 15.3.1966. P.2.

(٥٠٣) هەمان سەرچاوە.

(٥٠٤) بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ئۆرگانی پ.د.ک (دەستەی بارزانیی)، ژ. ٤٨٦، مارتی ١٩٦٦.

(٥٠٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٥٧١، بغداد، ١٩٦٦/٢/٧.

(٥٠٦) هەمان سەرچاوە، ژ. ٧٥٦، ١٩٦٦/٢/١٣.

(507) "Kurdish Facts", Organ der "International Society Kurdistan", Nr. 66/5, Amsterdam, 8.4. 1966. P.5.

(٥٠٨) بڕوانە ڕۆژنامەی "صوت العرب"، العدد ١٨٥، بغداد، ١٩٦٦/٣/٢.

(٥٠٩) "البلد"، العدد ٥٥٣، بغداد، ١٩٦٦/٣/١٨.

(٥١٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٧٣٦، بغداد، ١٩٦٦/٢/٢٠.

(511) “No arms for Iraqi Arabs from UAR” in “the Guardian”, London and Manchester, 23.2.1966.

(512) “Süddeutsche Zeitung”, München, 22.2.1966. “The Times”, London, 22.2.1966.

(٥١٣) بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، بغداد، ١٩٦٦/٢/٢٨. هەروەها ئاژانسی دەنگ و باسی میسری "مینا"، ١٩٦٦/٢/٢٧.

(٥١٤) بڕوانە "محمود الدرة": "القضية الكردية"، بيروت، ١٩٦٦، ٤٠٧.

(٥١٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "صوت العُرب"، العدد ١٤٣، بغداد، ١٩٦٥/١/٩. (ئەم میژووە ناشێت ڕاست بێت، چونکە بەزاز خۆی لە ١٩٦٥/٩/٢١دا بووە سەرەکی وەزیران.-کوردۆ-)

(٥١٦) بڕوانە گوتاری (Richard Beeston) لە ڕۆژنامەی “The Daily Telegrahp”, LONDON, 8.2.1966.

(517) “Frankfurter Allgemeine Zeitung”, Nr. 90, 19. April 1966.

(٥١٨) دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە.

(٥١٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "النهار"، العدد ٩٣٤٤، بيروت، ١٩٦٦/٥/٢٢.

(٥٢٠) سەرچاوەی پێشوو.

(521) “Süddeutsche Zeitung”, München, 9-11. April 1966.

(٥٢٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "البلد"، بغداد، ٩٦٦/٢/٤. هەروەها "الجمهورية". العدد ٧٥١، بغداد، ١٩٦٦/٢/٧.

(523) “Süddeutsche Zeitung”, Nr. 99, München, 29.4.1966.

(٥٢٤) بڕوانە "النضال السياسي والعسكري للاكراد"، مجلة الصياد، العدد ١٣٣٢ السنة ٢٧، بيروت، ٢٦ اذار - ٢ ابريل ١٩٧٠.

(٥٢٥) بڕوانە لاپەرە (١٧٢)ی ئەم کتێبە.

(526) “Frankfurter Allgemine Zeitung”, Nr. 90.19.4.1966

(٥٢٧) بڕوانە هەموو ڕۆژنامەکانی عێراق لە ١٩ی ئاوریلی ١٩٦٦دا.

(528) “Frankfurter Allgemeine Zeitung”, 19.4.1966.

(٥٢٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٨١٩، بغداد، ١٩٦٦/٤/٢٠.

(٥٣٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، بغداد، ١٩٦٦/٤/٢١.

(٥٣١) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٨٢٢، بغداد، ١٩٦٦/٤/٢٣.

(٥٣٢) سەرچاوەی پێشوو.

(533) "Frankfurter Allgemine Zeitung", 5. August 1966.

(٥٣٤) بڕوانە امین سامي الغمراوي: "قصة الاكراد في شمال العراق"، قاهرة، ١٩٦٧، ص ٣٨٤.
هەروەها بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ئۆرگانی پ.د.ک، (دەستەی بارزانیی)، ژ. ٤٨٨، ژونی ١٩٦٦.

(535) "René Mauriés: "Le - Verdun Kurde", in", La Dépéche", Nr. 6545. Paris, 21. Juni 1966.

(٥٣٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ژ. ٤٨٨، ژونی ١٩٦٦. (ئەوە یەکەم جارێک نەبوو کە سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان دەست بەسەر چەکی قورسی سۆڤێەتی و ناسۆڤیەتیی دا بگرێت).

(537) Rudolph Chimelli: "Krieg gegen die Kurden vor der Entescheidung" in "Süddeutsche Zeitung", Nr. 124.25. Mai 1966.

(جەنگی دژ بەکورد لەبەردەم بڕیار دایە).

(٥٣٨) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٥٨١، بغداد، ١٩٦٦/٥/٢٥.

(٥٣٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "الصفاء"، العدد ١٢٦٤، بیروت، ١٩٦٦/٥/٢٠.

هەروەها ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٥٧٧، بغداد، ١٩٦٦/٥/١٩. هەروەها ڕۆژنامەی "الجريدة"، العدد ٤١٢٤، بيروت، السنة ١٤، ١٩٦٦/٥/٢١.

(٥٤٠) (René Mauriés) سەرچاوەی پێشوو، لەپەراوێزی ژ. (٥٣٥)دا.

(٥٤١) بڕوانە ڕۆژنامەی "النهار"، العدد ٩٣٣٧، بیروت، ١٣و١٥ی مایسی ١٩٦٦.

(٥٤٢) سەرچاوەی پێشوو، ژ. ٩٣٤٨، بیروت، ٩٦٦/٥/٢٧.

(٥٤٣) سەرچاوەی پێشوو.

(٥٤٤) بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ئۆرگانی پ.د.ک (دەستەی بارزانی)، ژ. ٤٨٨، ژونی ١٩٦٦، ل٨.

(٥٤٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "اطلاعات"، تهران، ٣٠ / ٥ / ٦٦ هەروەها ڕۆژنامەی "کیهان"، تهران، ٣٠ مایسی ١٩٦٦. هەروەها ڕۆژنامەی "النهار"، العدد ٩٣٥١، بیروت، ١٩٦٦/٥/٣١.

(546) Neue Zürcher Zeitung", 13. Juni 1966.

(٥٤٧) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٦٠١، بغداد، ١٩٦٦/٦/١٦.

(٥٤٨) سەرچاوەی پێشوو.

(٥٤٩) سەرچاوەی پێشوو.

(٥٥٠) بڕوانە لاپەڕە (١٧٥)ی ئەم کتێبە.

(٥٥١) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٨٢٢، بغداد، ١٩٦٦/٤/٢٣.

(٥٥٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٦٠١، السنة الثالثة، بغداد، ١٩٦٦/٦/١٦.

(553) Rudolph Chimelli: “Geheimverhandlung mit den Kurden”, in “Süddeutsche Zeitung”, München, den 25/26.6.1966. "گفتو گۆی پەنهانی لەگەڵ کورد دا"

(٥٥٤) مەبەستی تەواوی لەئێران بوو.

(٥٥٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، کە لەسەرەوە دەست نیشان کراوە.

(٥٥٦) سەرچاوەی پێشوو.

(٥٥٧) بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، بغداد، ١٨ حزيران ١٩٦٦.

(٥٥٨) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، بغداد، ٢٠ حزيران ١٩٦٦.

(٥٥٩) سەرچاوەی پێشوو.

(٥٦٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "الاخبار"، العدد ٨٥، بغداد، ٣٠ تموز ٩٦٦. هەروەها
“Aussicht auf Frieden in Kurdistan” in “Süddeutsche Zeitung”, 13. Juli 1966.
هەروەها بڕوانە ئەو گوتارەی (Rudolph Chimelli) لە ل.٤ی هەمان ڕۆژنامەدا.

(٥٦١) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٨٨٧، بغداد، ١٩٦٦/٦/٣٠.

(٥٦٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ئۆرگانی پ.د.ک (دەستەی بارزانیی)، ژ. ٥٠٣ حوزەیرانی ١٩٦٨، ل٢.

(٥٦٣) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٦٢٠، بغداد، ١٩٦٧/٧/٢.

(٥٦٤) بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، العدد ٣٤٣٣، بغداد، ١ تموز ١٩٦٦.
هەروەها “Süddeutsche Zeitung”, 1. und 4 Juli 1966
هەر هەمان سەرچاوە لە ٦ی ژوئی ١٩٦٦دا.

(٥٦٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٨٩٠، بغداد، ٣ تموز ١٩٦٦.

(٥٦٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٦٠١، بغداد، ١٦ حزيران ١٩٦٦.

(٥٦٧) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٨٩٠، بغداد، ٣ تموز ١٩٦٦.

(٥٦٨) سەرچاوەکانی پێشوو.

(569) Friedrich- Wilhelm Fernau: “Lösung des Kurdischen Knotens”
کردنەوەی گرێ کوردییەکان"
”in der Zeitung “Handelsblatt”, Nr. 143. 29/30. Juli 1966. S.2.

(٥٧٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٤٧٣، بغداد، ١٩٦٦/١/١٢.

(571) “Le Monde”, Paris, 24. März 1966.

(٥٧٢) سەرچاوەی پێشوو.

(573) “Die Presse”, Wien, den 2.Mai 1966.

(574) “Frankfurter Allgemeine Zeitung”, Nr. 173. 1. August 1966.

(٥٧٥) سەرچاوەی پێشوو، ٨ی ئۆگوستی ١٩٦٦.

(576) “Süddeutsche Zeitung”, den 11,13. und 28.8.1966.

(577) Georg von Huebbent: “Burgfrieden mit Kurden steht auf dem Spiel”

"قەڵای ئاشتیی لەگەڵ کورد دا دێتە بازیی"

"Die Welt”, Hamburrg, 27. September 1966.

هەروەها بڕوانە

"Neue Spannungen zwischen den Kurden und Bagdad” in “Neue Zürcher Zeitung” vom 1.7.1966.

"گرژییەکی نوێ لەنێوان کوردەکان و بەغدا دا".

(٥٧٨) بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، العدد ٢٧٩٤، ١٩ اب ١٩٦٦.

(٥٧٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ئۆرگانی تاقمی تاڵەبانیی، ژ. ٤٧٦، سێبتەمبەری ١٩٦٦ .

(٥٨٠) سەرچاوەی پێشوو.

(٥٨١) بڕوانە ئەو بەیاننامەی لقی ئەورووپای تاقمی تاڵەبانیی لە دێسەمبەری ١٩٦٦دا، (بەزمانی عارەبیی)، (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسەدایە).

(٥٨٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، العدد، ٢٢١٠، بغداد، ١٩٦٦/١٠/٣٠ .

(٥٨٣) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، العدد ٧١٦، بغداد، ٩٦٦/١٠/٢٩ .

هەروەها بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار"، العدد ٣٥٤٦، بغداد، ١٩٦٦/١٠/٣٠.

(٥٨٤) بڕوانە بڕیارەکانی حەوتەمین کۆنگرەی پارتی دێمۆکرات. لە بڵاوکراوەکانی لقی ئەورووپا، (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسەدایە).

(٥٨٥) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

(٥٨٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "الحياة"، العدد ٦٣٥٩، بیروت، ١٩٦٦/١٢/٣١.

(587) “Le Monde”, Parise, 22. Décembre 1966.

(٥٨٨) بڕوانە ڕۆژنامەی «صوت العرب»، العدد ٤٩١، بغداد، ١٢ اذار ١٩٦٧ .

(٥٨٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "پارس"، شمارە ٣٩٠٢، شیراز، ١٩٦٧/٣/١٦.

(٥٩٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "خەبات"، ئۆرگانی تاڵەبانییەکان، ژ. ٤٧٩، ئاوریلی ١٩٦٧.

(٥٩١) بڕوانە بڕیارەکانی شەشەمین کۆنگرەی تاڵەبانییەکان، (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسەدایە).

(٥٩٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "العرب"، بغداد، ٢٧ ابريل ١٩٦٧.

(٥٩٣) سەرچاوەی پێشوو، ڕۆژی ١٩٦٧/٥/٣.

(٥٩٤) سەرچاوەی پێشوو، ژ. ٨٠٦، ٥ ابريل ١٩٦٧.

(٥٩٥) سەرچاوەی پێشوو، ڕۆژی ١٩٦٧/٥/٣.

(٥٩٦) بڕوانە ڕۆژنامەی ئیسرائیلیی "Judit Chadaschot"، تەل ئەبیب، ١٩٦٧/١/٢٨. هەروەها بڕوانە:

Khadduri Majid: "Republican' IRAQ, London, 1969, P. 276.

(597) "Neue Zürcher Zeitung", Nr. 135, 19. 5. 1967.

(٥٩٨) ئاژانسی دەنگوباسی عێراقی لە ١٩٦٧/٦/٢٩.

(٥٩٩) بڕوانە گۆڤاری "الاسبوع"، العدد ٢، بغداد، ١٩٦٧/٧/٢٩.

(٦٠٠) سەرچاوەی پێشوو.

(٦٠١) بڕوانە رۆژنامەی "البلد"، العدد ٩٩٥، ١٧ ايلول ١٩٦٧.

(٦٠٢) بڕوانە رۆژنامەی "التآخي"، بغداد، ٢ تموز ١٩٦٧.

(٦٠٣) بڕوانە رۆژنامەی "التآخي"، العدد ٦٢، بغداد، ٢ تموز ١٩٦٧.

(٦٠٤) سەرچاوەی پێشوو، ژ. ١٧٤، بغداد، ١٩٦٧/١٠/٢٢.

(٦٠٥) سەرچاوەی پێشوو.

(٦٠٦) کۆتایی ١٩٦٧ رژێمی عارف رۆژنامەی "التآخي" قەدەغە کرد.

(٦٠٧) بڕوانە رۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٣٩، بغداد، ١٩٦٨/١/١٨.
هەروەها هەمان سەرچاوە لە ١١ی دیسەمبەری ١٩٦٧دا.

(608) Rudolph Chimelli: "Arif hält muhsam das Cleichgewicht" in"Süddeutsche "Zeitung", Nr.22 München, den 23.1.1968.
"عارف بە ئەستەم هاوسەنگیی خۆی بۆ رادەگیرێت"

(٦٠٩) بڕوانە رۆژنامەی "الثورة"، العدد ٣٤، بغداد، ١٩٦٨/١/١٤.

(٦١٠) بڕوانە کامل الچادرچي: "نظرة في اتفاقية ايراب النفطية"، جريدة التآخي، العدد ٢٥٩، بغداد، ١٢ نيسان ١٩٦٨.

(٦١١) سەرچاوەی پێشوو، (رۆژنامەی التآخي)، العدد ٥٠٠، شباط ١٩٦٨ (ژمارەی ئەو رۆژنامەیە ناشێت راست بێت. چونکە لە پەراوێزی لاپەڕەی پێشوودا تا ١٢ی ئاوریلی ١٩٦٨ ژمارە ٢٥٩ دەست نیشان کراوە) -کوردۆ-

(612) "Barzani's open letter to pres. De Gaulle" in "The Times", London, 8.2.1968.

(613) "Kurdish Facts", organ der "International Society Kurdistan", 68/2,P.7.
هەروەها بڕوانە:

"L, Aurore". Paris, 6.2.1968.

"Le Figaro", Paris, 9.2.1968.

(٦١٤) بڕوانە رۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ١٣١، بغداد، ١٣ مايس ١٩٦٨. هەروەها رۆژنامەی "الانوار"، بيروت، ١٢ مايس ١٩٦٨.

(٦١٥) بڕوانە خواجە سعدالدين: "تاج التواريخ"، هەروەها بڕوانە: الامير شرف خان البدليسي: "تاريخ الدول والامارات الكردية" الترجمة العربية لـ(ملا جميل بندى الروژبيانى)، بغداد، ١٣٧٢-

۱۹٥۳، ص ۲٦.

(616) “Frankfurter Allgemeine Zeitung”, 18.7.1968.

(٦۱۷) بەکر لە ٩٦٦دا هەلی ئەوەی لەکیس نەدا کە بروسکەیەکی پیرۆزبایی بەبۆنەی سەرکوت کردنی کودەتاکەی (عارف عبدالرزاق)ی ۳۰ ژونی ٩٦٦وە بۆ عارفی دووهەم بنێریت. (بڕوانە ڕۆژنامەی "المنار" العدد ۳٤٤٤، بغداد، ۱ تموز ٩٦٦).

(618) Rudolph Chimelli: “Reformprogramm im Irak”, in “Süddeutsche Zeitung”, Nr. 174, 20/21. Juli 1968.

(٦۱٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "النور"، العدد ٤۲، بغداد، ۱۹٦۸/۱۱/۲۸، (المقال الافتتاحي).

(٦۲۰) دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە.

(٦۲۱) بڕوانە ڕۆژنامەی "ڕاپەڕین"، ژ. ۲۰۱، ساڵی پێنجهەم، ۲۳/۱۰/۱۹٦۸.

(٦۲۲) بڕوانە ڕۆژنامەی "النور"، بغداد، ۲٦/۱۰/۱۹٦۸.

(٦۲۳) بڕوانە ڕۆژنامەی "النور"، العدد ۳٤، بغداد، ۱۹/۱۱/۱۹٦۸. (المقال الافتتاحي). العدد ٤٩، ۷/۱۲/۱۹٦۸، (المقال الافتتاحي). العدد ۲٥، ۹/۱۱/۱۹٦۸.

(٦۲٤) هەمان سەرچاوە، ژ. ۲٤٥، ۱٤/۸/۱۹٦۹.

(٦۲٥) دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە.

(٦۲٦) بڕوانە "حول المسالة الكردية"، من منشورات اللجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي، بداية اوكتوبر ۱۹٦۸، (دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە).

(٦۲۷) سەرچاوەی پێشوو. ل۱.

(٦۲۸) سەرچاوەی پێشوو.ل٥.

(٦۲٩) سەرچاوەی پێشوو. "حول المشكلة الكردية" ل ٦.

(٦۳۰) سەرچاوەی پێشوو، ل ۷-۸.

(٦۳۱) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٤۲۰، بغداد، ٤ ابريل ۱۹٦۹.

(٦۳۲) بڕوانە ڕۆژنامەی "النور"ی تاقمەکەی تاڵەبانیی. العدد ۱٤۲، بغداد، ۸ ابريل ۱۹٦۹.

(٦۳۳) بۆ ئەو تاوان و خوێنڕێژیەی بڕوانە:

“Die Furche”, Nr. 50, Dezember 1969.

“Frankfurter Allgemeine Zeitung”, Nr. 293,18.12.

1969. und Lord Kilbraken in “Evening Standard”,

28.2.1969.

(634) “Daily Telegraph” London, 10.3.1969.

(٦۳٥) لەهەواڵنامەیەکی پ.د.ک دا بەزمانی ئینگلیزی لەژێر سەردێڕی (Defenceless)دا. (دەقەکەی

لە ئەرشیفی نوکسە دایە). هەروەها:

"Hamola", Pressedienst GMBH (Orient Press), Nr.13 Hamburg, November 1969.

(636) "Süddeutsche Zeitung", München, den 13.3.1969 S.7.

(637) "Le Monde", Paris, 21. März 1969.

"New york Times" March 30, 1969.

(٦٣٨) بڕوانە رۆژنامەی (Néw Out look)ی ئیسرائیلی‌ی، تەل ئەبیب، ١٩٦٨/٩/١.

(639) "Kurdish Affairs Bulletin", Published by "The Kurdish Journal",

(دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە).

(640) "Jewish Observer and Middle East Review", November 14, 1969.

هەروەها بڕوانە ئەو بلاوکراوەیەی لیژنەی مەرکەزیی (ڕێکخراوی دیمۆکراتی ئاسووریی)، ١٩ سێبتەمبەری ١٩٧٠، (دەقەکەی لە ئەرشیفی نوکسەدایە).

(٦٤١) و(٦٤٢) بڕوانە رۆژنامەی "النور"، العدد ٢٩٧، بغداد، ١٩٦٩/١٠/١١.

(643) "Süddeutsche Zeitung", Nr.6, 7.1.1970. S.5.

هەروەها بڕوانە گوتەکانی دارا تۆفیق لە گۆڤاری "الاحرار"ی ئۆرگانی پارتی بەعس دا، بێروت، ژ. ٦٧٣، ٢٠ مارت ١٩٧٠، ص ٨.

(٦٤٤) و(٦٤٥) بڕوانە رۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٧٠٤، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٢.

(٦٤٦) و(٦٤٧) بڕوانە رۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٧٠٤، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٢.

(٦٤٨) سەرچاوەی پێشوو.

(٦٤٩) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، رۆژنامەی الجمهورية. هەروەها بڕوانە:

"Süddeutsche Zeitung" Nr 61,12. März 1970.

(٦٥٠) سەرچاوەکانی پێشوو.

(٦٥١) بڕوانە گۆڤاری "الصياد"، العدد ١٣٣٢، بيروت، ٢٦ اذار-٢ ابريل ١٩٧٠.

(٦٥٢) بڕوانە رۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٧٠٧، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٥. ص ٢-٣.

(653) "Neue Zürcher Zeitung", 2.August 1968.

(٦٥٤) بڕوانە رۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٩٦، بغداد، ٩٧٠/٤/١٤، ص٨.

(655) Edouard Saab: "La Fin de I' Insurrection Armee?" in "Le Monde", Paris, 27. Janvier 1970, P.3.

(٦٥٦) بڕوانە رۆژنامەی "النور"، العدد ٣٧٧، بغداد، ١٩٧٠/١/١٢،ص٦.

(657) "Hinrichtungswellen im Irak vorest beendet" in "Süddeutsche Zeitung", Nr. 22, München, den 26.1.1970, S.5.

(٦٥٨) بڕوانە رۆژنامەی "پارس"، شمارە ٣٣٧٦، شیراز، ١٩٧٠/٢/١٦.

(659) "Spannungen zwischen Irak und Iran verschärfen sich" in "Frankfurfter All-

gemeine Zeitung", 10.2.1970.

(گرژی‌ی نێوان عێراق و ئێران توند تر دەبێت).

(٦٦٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "النور"، العدد ٣٩٨، بغداد، ١٩٧٠/٢/٥.

(661) "The Times", London, 7.2.1970.

(٦٦٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٨١، بغداد، ١٩٧٠/٣/٢٩.

(٦٦٣) بڕوانە گۆڤاری "الاحرار"، العدد ٦٧٣، بیروت، ٩٧٠/٣/٢٠، ص١٠.

(٦٦٤) و (٦٦٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "النور"، العدد ٤٢٣، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٦.

(٦٦٦) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، العدد ٤٢٤، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٧.

(٦٦٧) بڕوانە ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٧٢، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٧.

(٦٦٨) سەرچاوەی پێشوو، العدد ٤٧٣، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٨.

(٦٦٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٧٥، بغداد، ١٩٧٠/٦/٣٠.

(٦٧٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٧٢٢، بغداد، ١٩٧٠/٤/١.

(٦٧١) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، بغداد، ١٩٧٠/٥/١٨، ل٢.

(٦٧٢)و(٦٧٣)و(٦٧٤) بڕوانە عزيز السيد جاسم: "مناقشة مع البيان الصادر عن الوحدويين الاشتراكيين في سوريا حول المشكلة الكردية، في جريدة الثورة، العدد ٥١٦، بغداد، ١٩٧٠/٥/٧، ص٣.

(٦٧٥) بڕوانە ڕۆژنامەی "الحياة"، بیروت، ١٩٧٠/٣/١٦.

(٦٧٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٧٣، بغداد، ١٩٧٠/٣/١٨.

(٦٧٧) هەمان سەرچاوە. العدد ٤٨٣، ١٩٧٠/٣/٣١.

(٦٧٨) بڕوانە ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٧٧، بغداد، ١٩٧٠/٣/٢٤.

(٦٧٩) بڕوانە ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٩٣، بغداد، ١٩٧٠/٤/١١.

(٦٨٠) هەمان سەرچاوە. العدد ٤٣٧. ١٩٧٠/٣/١٨.

(٦٨١) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٩١، بغداد، ٢١ تموز ١٩٧٠.

(٦٨٢) سەرچاوەی پێشوو.

(٦٨٣) بڕوانە ڕۆژنامەی "پارس"، شمارە ٣٣٨٤، شیراز، ١٦ مارس ١٩٧٠.

(٦٨٤) بڕوانە گۆڤاری "اطلاعات"، تهران، ١٩٧٠/٣/١٢.

(٦٨٥) بڕوانە ڕۆژنامەی"آيندگان"، تهران، ١٩٧٠/٣/١٢.

(٦٨٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "خاک وخون"، تهران، ١٩٧٠/٣/١٢.

(687) "The Jerusalem Post", 13.3.1970

(688) Edmonds, Cecil John: "Kurds, Turks and Arabs", Political travel and research in North Estern Iraq (1919-1925), London, 1957.

(689) Edmonds, C.J: "The Kurdish War in Iraq": "A Plan for Peace", in" Journal

of the Royal Central Asian Society", vol. 54 (1967), PP. 10-23.

(٦٩٠) بڕوانه (ئەدمۆنس)، سەرچاوەی پێشوو. هەروەها بڕوانه: ڕۆژنامەی "بانگی کاژیک"، ژ. ١، ١٤ی ئاوریلی ١٩٦٨.

(691) "Die Zeit", Hamburg, den 20.3.1970.

(692) "KURDISTAN INFORMATION", Organ der NUKSE, Nr, XIV, 21, März 1970.

(693) "Time", 23.3.1970.

(694) "De Tijd", Amsterdam, 12.3.1970.

(٦٩٥) بڕوانه لاپەڕە (٢٠٢-٢٠٣)ی ئەم کتێبە.

(696) "Not Westward but Eastward" in "The New York Times", 15.3.1970.

(٦٩٧) بڕوانه سعد قاسم حمودي: "دلالات ثورية اكدها الحدث التاريخي"، مجلة الف باء، العدد ٨٦، بغداد، ١٨/٣/١٩٧٠، ص٩.

(698) A.H. Hamilton: "Road through Kurdistan", London, 1958.

(699) A.H.Hamilton:" British help is needed by the Kurds" in "The Daily Telegrapg", 19.3.1970

(٧٠٠) بڕوانه ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٧٩، بغداد، ٢٦/٣/٩٧٠، ص١.

(٧٠١) بڕوانه ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٩٩، بغداد، ١٧/٤/١٩٧٠.

(٧٠٢) سەرچاوەی پێشوو. العدد ٤٧٣، ١٨/٣/١٩٧٠.

(٧٠٣) سەرچاوەی پێشوو. العدد ٥١٤، ٥ مايس ١٩٧٠.

(٧٠٤) سەرچاوەی پێشوو. العدد ٤٨٠، ٢٧ اذار ١٩٧٠.

(٧٠٥) بڕوانه ڕۆژنامەی "الجمهورية"، العدد ٤٧٣، السنة الثالثة، بغداد، ٢٥/٤/١٩٧٠.

(٧٠٦) بڕوانه ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٤٨٢، بغداد، ٣٠ اذار ١٩٧٠.

(٧٠٧) سەرچاوەی پێشوو. العدد ٥٢٠، ١٢/٥/١٩٧٠.

(٧٠٨) سەرچاوەی پێشوو. العدد ٤٧٥، ٢٢ اذار ١٩٧٠.

(٧٠٩) سەرچاوەی پێشوو. العدد ٤٨٧، ٥ ابريل ١٩٧٠.

(٧١٠) بڕوانه ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٤٨، بغداد، ٢٨ مايس ١٩٧٠.

(711) "Le Monde", Paris, den 12.10.1968.

"Jewish Observer And Middle East Review", 18.10.1968. هەروەها

(٧١٢) بڕوانه هەموو ڕۆژنامەکانی عێراق لە ٢١/٤/١٩٦٨دا.

(٧١٣) بڕوانه ڕۆژنامەی "التآخي"، بغداد، ١١/٢/١٩٧١.

(٧١٤) بڕوانه ڕۆژنامەی "النور"، بغداد، ١١/٨/١٩٦٩، (المقال الافتتاحي).

(٧١٥) دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە.

(٧١٦) بڕوانە لاپەڕە (١٩٠-١٩١)ی ئەم کتێبە.

(٧١٧) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٨٠، بغداد، ٦/٧/١٩٧٠.

(718) Rudolph Chimelli: "Bagdad vergleicht sich mit den Kurden" in "Süd deutsche Zeitung", Nr. 24, 28.1.1970,S.27.

(بەغدا خۆی لەگەڵ کورد دا ڕێک دەخات)

(٧١٩) و(٧٢٠) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٧٧، بغداد، ٢/٧/١٩٧٠.

(٧٢١) لەبەیاننامەیەکی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە. نێوەڕاستی ئۆگوستی ١٩٧٠؟؟، (دەقەکەی لەئەرشیفی ئوکسە دایە). هەروەها بڕوانە ڕۆژنامەی "الاخبار" مناقشة صريحة مع حزب البعث في العراق، بيروت، ٢٣/٨/١٩٧٠.

(٧٢٢) بڕوانە دارا تۆفیق: "عام آخر من الكفاح والانجارات"، جريدة "التآخي"، العدد ٤٨٧، بغداد، ١٤/٧/١٩٧٠ . هەروەها بڕوانە: هەمان سەرچاوە. العدد ٧٧٩، ٨/٧/١٩٧١ .

(٧٢٣) هەمان سەرچاوە.

(٧٢٤) بڕوانە ئەو بەرنامەیەی لەچوارهەم کۆنگرەی پارتی دیمۆکرات دا لە٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٩دا بڕیاری لەسەر دراوە. (دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە).

(٧٢٥) بڕوانە ڕۆژنامەی (Tercüman)ی تورکی، ئەستەموڵ، ٢٠/٤/١٩٧٠.

(٧٢٦) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، بغداد، ١٢/٧/١٩٧٠.

(٧٢٧) هەمان سەرچاوە. العدد ٤٨٩، بغداد، ١٧/٧/١٩٧٠ .

(٧٢٨) هەمان سەرچاوە.

(٧٢٩) بڕوانە گۆڤاری "الصياد"، العدد ١٣٣٢، بيروت، ٢٦ اذار-٢ ابريل ١٩٧٠.

(٧٣٠) بڕوانە ئەو بەیاننامەیەی حیزبی کاژیک بەزمانی عارەبی، "حول اتفاقية ١١ اذار ايضا"، لە ١١ی سێبتەمبەری ١٩٧٠دا. (دەقەکەی لەئەرشیفی نوکسە دایە).

(٧٣١) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٣٥، بغداد، ١٣ مايس ١٩٧١. "الجمهورية والاقلام الخبيثة". (دیارە ئەمەیان بەرپەرچی ئەو گوتارەی "الجمهورية" نییە، یاخود مێژووەکەی بەهەڵەنووسراوە. چونکە لەپەراوێزدا دەردەکەوێت کە گوتارەکەی "الجمهورية" لە ١٩/٥/دا نووسراوە و ئەوەکەی "التاخي" لە ١٣/٥/دا). -کوردۆ-

(٧٣٢) بڕوانە ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٤٣٥، بغداد، ١٣ مايس ١٩٧٠.

(٧٣٣) هەمان سەرچاوە، العدد ٤٥١، ١ حزيران ١٩٧٠.

(٧٣٤) بڕوانە "یاسای کۆڕی زانیاریی کورد، (یاسای ژ. ١٨٣. ساڵی ١٩٧٠، بڕیاری ژ. ٩٩٦) لەڕۆژنامەی ڕەسمیی (الوقائع العراقية)دا، ژ. ١٩١٧، بغداد، ٨ی سێبتەمبەری ١٩٧٠.

(٧٣٥) دواهەمینیان (مەبەست یەکێتی نووسەرانە)، لە ٢٣/٣/١٩٧٠دا ڕێگەی کارکردنی پێ درا.

بڕوانه ڕۆژنامەی "الثوره"، العدد ٤٧٧، بغداد ٢٤/٣/ ١٩٧٠.

(٧٣٦) بڕوانه ڕۆژنامەی "هاوکاری"ی، ژ. ٢٣، ساڵی دووهەم، بغداد، ١٠ی تەموزی ١٩٧١.

(٧٣٧) بڕوانه گۆڤاری "الحوادث"، العدد ٧٦٢، بیروت ١٨ حزیران ٩٧١ . ص ١٨ - ٢٠ (العاصفة قادمة من بغداد).

(٧٣٨) بڕوانه ڕۆژنامەی "کیهان"، شماره ٣٨٤٢، تهران، ١٦/٢/١٩٧١ هەروەها ڕۆژنامەی "پارس"، شماره ٣٤٧٣و ٣٤٧٤، شیراز، ١١و ٢٠/٢/١٩٧١.

(٧٣٩) بڕوانه ئەو نامەیەی (بەختیار) بۆ (بەکر)، لەڕۆژنامەی "النور"دا، العدد ٢٠١، بغداد، ١٩/٦/١٩٦٩.

(٧٤٠) بڕوانه ڕۆژنامەی "پارس"، شماره ٣٤٢٦، شیراز، ٢٤/٨/ ١٩٧٠.

(٧٤١) هەمان سەرچاوە. شماره ٣٤١٨، ٢٧/٧/ ١٩٧٠.

(٧٤٢) بڕوانه ڕۆژنامەی "التآخي"، العدد ٧٣٧، بغداد، ١٩/٥/١٩٧١.

(743) "Attentat auf den irakischen Kurdenführer" in "Neue Zürcher Zeitung", Fernausgabe Nr.296, 2.10.1971.

(هەوڵ دانی دەست کێشانە گیانی سەرکردەی کوردی عێراق)، هەروەها:

"Spannungen zwischen Irak und den Kurden", in "Die Welt", Hamburg, 4.10.1971

(ئاڵۆزی نێوان کورد و عێراق).

(٧٤٤) بڕوانه ڕۆژنامەی "التآخي"، الاعداد ٨٥٠، ٨٥١ و ٨٥٢، بغداد، ٢و٣و٤/ ١٠/١٩٧١.

(٧٤٥) بڕوانه گۆڤاری "الحرية": (صدامات بين السلطة والاكراد)، العدد ٥٨٠، بیروت، ١٦/٨/١٩٧١، ص٦.

(٧٤٦) بڕوانه ڕۆژنامەی "الثورة"، العدد ٥١٥، بغداد، ٦مايس ١٩٧٠.

(747) "Kurden fordern mehr Recht" in "Telegraph", Berlin, 20.12.1970.

(کوردەکان داوای مافی زێتر دەکەن).

(748) "Bagdad weist Kurdische Forderung züruck", in "Süddeutsche Zeitung", München, 24. 11.1971.

(بەغدا داخوازی‌یەکانی کورد دەداتە دواوە).

(749) "Verhaftungswelle gegen Irak-Kurden"in "Tagesspiegel", Berlin, den 27.11.1971.

(750) "Frankfurter Allgemeine Zeitung", Nr.254, 2.11.1971.

(٧٥١) بۆ حیزبی (خۆیبوون) بڕوانه لاپەڕە (٧٤-٧٥)ی ئەم کتێبە.

(٧٥٢) بڕوانه د. بلەچ شێرکۆ: "القضية الكردية"، قاهرة، ١٩٣٠، ص٩٨.

(753) Eagelton, William Jr.: "The Kurdish Republik of 1946", London, 1963, P.84

(٧٥٤)و(٧٥٥) هەمان سەرچاوە.
(٧٥٦) بڕوانە بڕیارەکانی دووهەمین کۆنگرەی پارتی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران، لەرۆژنامەی نهێنی (توفان)دا، شمارە ١٥، ١٩٦٥.
(٧٥٧) بڕوانە لاپەڕە (١١٦)ی ئەم کتێبە.
(٧٥٨) و (٧٥٩) بۆ زانیاری زێتر دەربارەی حیزبەکانی (یەکێتی) و (برایەتی)، بڕوانە: موحەرەم محەمەد ئەمین:"لەگەڵ شەهیدی نەمر محەمەد قودسی دا" گۆڤاری رۆژی نوێ"، ژ.٣، ساڵی یەکەم، سلێمانی، حوزەیرانی ١٩٦٠، ل٣٩-٤٦.
(760) Nikitine, Basil: “Les Kurdes”, Paris, 1956,P.23.
(761) “Kurdish Facts”, Organ der” “international Society Kurdistan”, Amsterdam, Nr, 16/10.7.1963. P.6.
(762) Fochler Huke, G.:' Die Kurden, Volk ohne Staat”, Die aktuelle JRO Land Karte. Ausgabe B, Nr. 224, München, 1966 "کوردەکان، گەلێکی بێ دەوڵەت".
(٧٦٣) بڕوانە لاپەڕە (٨٥و٩٥)ی ئەم کتێبە.
(٧٦٤) بڕوانە نەخشەی کۆتایی ئەم کتێبە.
(765) Dr. Bonif Platz: “Die Völker der Erde, Asien”, herausg . von Gustav Ritter, Berlin, o.j.S. 197-198.
(٧٦٦) جگە لەوە لە کوردستاندا گەلەک شوێنی لەبار بۆ شاخەوانی و بەفرە خلیسکێ هەن.
(767) Karl Breyer und Peter Leukefeld in “Quick”, Nr. 17. Jahrg, April 1965.
(٧٦٨) لە شارە گەورەکانی کوردستان: دیاربەکر، مووش، بەتلیس، وان، دەرسیم (تونجەلی)، سیعرد، سیفەرک، حەکاری (لە کوردستانی تورکیا). کرماشان، سنە، مەهاباد، بۆکان، قەسری شیرین (لەکوردستانی ئێران). کەرکوک، هەولێر (اربیل)، سلێمانی، دهۆک، خانەقین، زاخۆ، کۆیە، رەواندز، سنجار، چەمچەماڵ (لەکوردستانی عێراق). قامیشلی، حەسەکە (لەکوردستانی سوریا). لەکوردستانی شوورەویی شاری گەورەی ئەوتۆ نییە.
(769) Rich, C.J:"Narrative of a Residence in Koordistan”, London, 1836, P.230.
هەروەها Harris, Walter: “Wandering Persian Kurdistan”, in “Blackwoods Magazine”, Vol. CL VIII, Decce, Nov. 1895.
(٧٧٠) ووشەی مسکێن، چ پەیوەندییەکی لەگەڵ ووشەی (مسکین)ی عارەبیدا نییە.

## نێوەڕۆک

***

**مامۆستای پایەبەرز و خۆشەویست**

**د. جەمال نەبەز**

ئەم کاتەتان باش

بەبۆنەی سەری سالّی نوێ و دەسپێکی سەدساڵەی تازەوە پیرۆزباییتان لێ دەکەم و هیوای لەشساغی و تەمەندرێژیتان بۆ دەخوازم. خۆشحاڵ دەبم ئەگەر دەرفەتم بدەن رێز و پێزانینی خۆم بۆ رەنج و ماندووبوونی ئێوە لە بواری زمان و کولتووری نەتەوایەتی و رەسەنی کوردی دەربڕم، ئەو خەرمانە مەزنەی ئێوە بۆ میللەتی خۆتان پێشکێش کردووە گەورەترین سامان و گەنجینەیە بۆ نەوەی ئێستە و داهاتوومان.

من حەز دەکەم ئێوە سەردانێکی کوردستان بکەنەوە. زۆر شت هەیە پێویستە ببینن و زۆر پرۆژە و پێشکەوتنی نوێ هەیە پێشنیار و بیر و بۆچوونی زانایانی کوردی لە وێنەی بەڕێزتانی پێ دەوێ. ئەگەر بۆ پرسی هاتنەوەتان هەست بەبوونی گیروگرفتی رێگە دەکەن ئەوا هەرکاتێ چ لەرێگەی سووریا یان تورکیا بێنەوە، ئێمە دەتوانین ببین بە دەستەبەر بۆ لابردنی هەر گرفت و لەمپەرێک لە پێش هاتنەوەتان و گەڕانەوەشتان بۆ ئەورووپا.

لەبارەی بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی ئێوەوە، زۆرمان پێ خۆش دەبێ ئەگەر دەرفەتمان بدەن ئێمە لە کوردستان چاپیان بکەینەوە و بیانخەینە بەردەستی خوێنەرانی کورد. کتێبخانەی کوردی، ئەمڕۆ لە هەموو رۆژێ زیاتر پێویستی بەنووسراوی باش و رەسەنی زانایانی کوردە. ئەگەر ئەم پێشنیارە پەسند بکەن ئەوا من دەتوانم یەکێک بنێرم بۆ لای ئێوە بۆ وەرگرتن و هێنانەوەی دەستنووسەکان بۆ کوردستان.

لە کۆتاییدا هیوا و پێشنیاری خۆم بۆ سەردانەوەتان لە وڵات دووبارە دەکەمەوە و، رێز و سڵاوی گەرمم پەسند بفەرموون.

دڵسۆزتان

**نێچیرڤان بارزانی**

٢٠٠٠/١/١

# پاشگۆتنێکی پێویست
# بۆ چاپی نوێی سەمیناری
# «کوردستان و شۆرشەکەی»

نێوئاخنی ئەم بەرهەمە، کە خوێنەرەوە، بەهۆی پێشەکییەکەیەوە لێی ئاگاداردەبێ، بریتییە لە کۆکردنەوە و خستنەسەریەکی زنجیرەیەک گۆتاری سەمیناری، کە بەدرێژاییی چەند مانگێک، لە ئێوارانی رۆژانی هەینی سالّی ١٩٧١ دا لە بەرلین، بەزمانی ئەلّمانی، لەبەردەم ژمارەیەکی زۆر، لە کورد و دۆستانی کورد و کەسانی ئارەزوومەند بۆ بابەتەکە، پێشکێشمکردوون، کە کۆرێکی ئینتەرناسۆنالییان پێکهێنابوو، لە ئەلّمان و فەلەستینی و ئیسرائیلی و ترک و فارس و عەرەبی جۆربەجۆر و یۆنانی و هیندی و پێوەندیدارانی هێندەک نەتەوەی دیش، کە زۆربەیان سەر بە زانستگەکانی بەرلین بوون. هەموو ئەم گۆتارانە، دەمەتەقێی خەستوخۆلّ دەکرا لەسەریان و، هەر پاش چاپ و بلاوکردنەوەشی لە بەرگێکدا، لەلایەن "یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا NATIONAL - UNION OF THE KURDISH STUDENTS IN EUROPE" (نوکسە NUKSE) ەوە، لەسالّی ١٩٧٢ دا و، هەتا ئێستەش، بووە بە سەرچاوەیەکی ناسراو و بەکارهێنراو، بۆ گەلێک لەو ئەوروپایی و کوردانەی، کە دوای کەوتنەرووی ئەم بەرهەمە، لەسەر کورد و کوردستان شتیان نووسیوە و، هێندێکیان، نێوی سەرچاوەکەیان بردووە و، هی واش هەبوون، کە بە ئاشکرا لێیانوەرگرتووە، بەلام بێدەنگییانلێکردووە.

دوانزە سالّێک، پاش بلاوکردنەوەی دەقی ئەلّمانیی سەمینارەکەم،

ئەوجا کرا بە کوردی و، لە سوێد چاپکرا و، هەر لەو ساڵەشدا؛ ١٠-١٢ دانەیەکم، بە هەوڵ و تەقەلایەکی یەکجار زۆر، گەیاندەوە کوردستان، کە ئەمدەست و ئەودەستیاندەکرد و بە دزیی رژێمی بەعس و ئیسلامییەوە دەخوێندرانەوە. چەند دانەیەکیشی کەوتبووە نێو ئەو حیزبانەی کە هەریەکەیان لە خرِی نێوزەنگ، کۆمەڵێک چەکداری لەخۆی کۆکردبووەوە و، هەر یەکەشیان، خۆی بە "پێشرِەو" دادەنا و، ئەوانیدیکەشی، بە ''پاشرِەو'' و ''کۆنەپەرست'' و ''بەکرێگیراو'' و، سەرکەوتنی خۆی، لەژێرکەوتن و نەمانی ئەویدیکەدا دەبینی و، هی واشیان تێدا بوو، کە خۆی لە مارکس بە "مارکسیتر" دەزانی، بەلام ئەگەر پێویستیشی بکردایە، ئەوا گوێرِایەڵترین دەروێشی فەرمانەکانی "ئیمام خومەینی" بوو. دیارە، ئەم جۆرە ''پێشرِەوانە''، رێنادەن بە خەڵکەکەی بەردەستیان، بچن باسێکی وەک ''کوردستان و شۆرشەکەی'' بەهوردی بخوێننەوە و لێیفێربن، بەڵکو، هەر کە بیستبوویان، ئەو پەرتۆکە گەیشتووەتە ئەوێ، کونبەکون گەرِابوون بۆ پەیداکردن و تووناکردنی. شایانی باسە، لە هەفتاکاندا و، کە هێشتا سەمینارەکە نەکرابوو بە کوردی، جارێکیان بەرِێکەوت، لە نامەخانەی ناسیۆناڵی شاری ڤیەننا، تووشم بوو بە تووشی کاک نەوشیروان مستەفای جێنشینی ئێستەی مام جەلال لە سەرکردەیەتیی ''ی. ن. ک.'' دا، کە لەوێ، وەک خۆی گوتی، خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بوو، بۆ نووسینی دیپلۆمنامەیەک لەمەرِ باسێکی سەر بە مێژووی بزووتنەوەی رامیاری لە کوردستاندا. جا، لەبەر ئەوەی ئەز لەوسەردەمەدا، لە زانستگەی ئازاد لە بەرلین، وەک ASS پرۆفیسۆر کارمدەکرد و، ئەو مامۆستایەی کە کاک نەوشیروان، دیپلۆمنامەکەی بە سەرپەرشتیی وی دەنووسی، پێویستی بە مامۆستایەکی دیکە هەبوو، کە پسپۆرِی ئەو بابەتەبێ و، بتوانێ رادەی زانستانەی کارەکە

بنرخێنێ، کاک نەوشیروان روویلەمنا، کە ئەگەر رازیبم، ئەوا ئەو نێوی من بدا بە مامۆستایەکەی، بە مەرجێک، کارەکەی بە خراپ نەدەمەقەڵەم، هەر لەبەر ئەوەی لە بیروڕێبازدا لەیەکجیاوازین. بە کاک نەوشیروانم گوت، باوەڕبکە، ئەگەر تۆ فاکتەکانت بەڕاستی خستبێتەڕوو، بەلام جۆری لێکدانەوە و توێژینەوەکانت بۆ ئەو رووداوانە، ١٨٠ پلەش لەجۆری لێکدانەوە و توێژینەوەی من جیاوازبێ، ئەوا کارەکەت بە خراپ دانانێم، چۆنکە بۆچوون بەرامبەر کێشەیەک، لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ و، ئەوەش بەلای منەوە شتێکی ئاساییە و دەبەخشرێ بە سەربەستیی بیروڕا، نموونەشم هێنایەوە بۆی و گوتم: ئەگەر یەکێک بێژێ، بەپێی قورئانی موسڵمانان، کەسێک دزیبکا، سزای ئەو کەسە بڕینەوەی دەستییەتی و، هەر لەو کاتەشدا بێژێ کە ئەو، ئەو سزایە بە رەوا دەزانێ، ئەو دەمە ئەو قسەیە دەبێتە بیروڕای وی، نەک بیروڕای من، کە بیروڕا بەلای منەوە، هەرچۆنێک بێ، دەربڕینی سەربەستە، بەلام ئەگەر بێژێ نا، لە قورئاندا شتی وانییە و، ئەوەی لە قورئاندا لەو بارەوە هاتووە، مەبەست لەوە دەستبڕین نییە، ئەو دەمە قسەکەی بە ساختەدادەنێم. تۆش ئەگەر بێژیت لەساڵی ١٩٦٤ەوە تا مارتی ١٩٧٠، ئێوە لەگەڵ بەعسییەکان بوون و، بە چەکی بەعسییەکان شەڕی پێشمەرگەکانی مەلامستەفاتان دەکرد و، پشتگیریی نەخشەی بەعستان دەکرد لە کوردستاندا و، تۆ ئەو هەڵوێستەی ئەودەمەی خۆتان، بەڕاست دەزانیت، دەبێژم ئەوە بیروڕای خۆتە و، لەکارەکەتدا هیچ جۆرە زیانێکت بۆ ئەوە بەرناکەوێ. بەلام ئەگەر بێژیت "ئێوە لەگەڵ بەعسییەکان نەبوون و نەخشەی بەعسییەکانتان لە کوردستاندا نەدەبرد بەڕێوە، ئەودەمە تۆ فاکتەکانت گۆڕیوە و، ئەز لەدژی دەوەستم، بێجگە لەمەش، ئەوەشم بۆ کاک نەوشیروان رۆنکردەوە، کە بۆ دیپلۆمنامە و ماجستێرنامە،

بەپێچەوانەی دوکتۆرنامەوە، لێکۆڵینەوەیەکی نوێ پێویست نییە، بەڵکو تەنێ ئەوە بەسە، کە کورتەیەکی ئەو کارانەی کە تا ئەوکاتە لەو بارەیەوە نووسراون، بەشێوەیکی رەخنەگرانە بخرێتەبەرچاو. بەلام کاک نەوشیروان ئیدی هیچ دەنگی نەبوو، وەک بیستم گەڕابووەوە کوردستان و، کە جەلالی حاجی حسێنی کەلۆش، ئەو کوردەی کە هاوبیری "کاژیک" بوو و، لەکاتی نێوبژیکردنی شەڕەقۆچی سەرکردەکانی پارتی و یەکێتیدا لە نەوەتەکانداکوژرا، جارێکیان لە کاک نەوشیروانی پرسیبوو، لە نەمسا باوەڕنامەی لەچیدا وەرگرتووە؟ کاک نەوشیراون بە پێکەنینەوە گوتبووی: "باوەڕنامەی لەمەلاییکوژیدا وەرگرتووە!" ("مەلایی" زاراوەیەک بوو بۆ پێناساندنی ئەوانەی سەر بە مەلا مستەفای بارزانی بوون، بەرامبەر "جەلالی" ، واتە ئەوانەی سەر بە مام جەلال تاڵەبانی بوون).

شایانی باسە، کەلەو قسانەدا بووم لەگەڵ کاک نەوشیروان، باسەکەمان هاتەسەر باسی "کوردستان و شۆرشەکەی"، کە گوتی زۆر بەباشی خوێندوویەتەوە، کە لێمپرسی سەرنجی چۆنە بەرامبەری، گوتی، "ئەگەر تەماشای ئەوە نەکەین، تۆ هیچ لایەنێکت نەهێشتووەتەوە، رەخنەنەگریت لێی، ئەوا ئەو کتێبە ئینسکلۆپیدیایەکی کێشەی کوردە". گوتم : "ئەگەر یەکێک ویژدانی هەبێ و، شارەزای بابەتەکەبێ، دەزانێ کە ئەز لەخوتوخۆڕایی رەخنەم لەکەس نەگرتووە، ئەوەتا رۆژنامەنووسی بەنێوبانگی نەمسایی، دوکتۆر هاینتز گستراین کەکاتی خۆی گەلێک تۆمەتی ناڕەوای نابووە ئەستۆی کورد، پاش ئەوەی دانەیەک لەو کتێبەم ناردبۆی، بەنامەیەکی زۆرشیرین داوای لێبوردنی کرد و، ئەوجا پەرتۆکێکی لەسەر کورد و دۆزەکەی نووسی لەژێرنێوی "گەلێکی بێ پارێزەر (محامی) دۆزی کورد لە

ڕۆژهەلاتی ناڤیندا" (*) و، لەوێدا، زۆر بە گرنگی و ڕێزەوە باسی "کوردستان و شۆڕشەکەی" دەکا و ئەمجارە پشتگیریی مافی کورد دەکا. ئەوەش هەر نموویەکە لە ژمارەیەکی زۆر نووسەر و زانستکار، کە لەو سەمینارەوە سەرنجیان بۆکێشەی کورد راکێشراوە. کاک نەوشیروان گوتی ئەو پەرتۆکەی دوکتۆر گسترایینی خوێندووەتەوە.

سەرەڕای ئەم وتووێژە لەگەڵ کاک نەوشیروان لەبارەی "کوردستان و شۆڕشەکەی" یەوە، بەداخەوە، "پێشڕەوەکان"ی بزووتنەوەی کوردایەتیی مارکسییانە، کە کاک نەوشیروان خۆیشی یەکێک بوو لەوانە، چاویان بەو چەنددانە پەرتۆکە هەڵنەهات و، تەفروتوونایانکردن و، هەڕەشەشیان لەوانە کردبوو کە بە دزییەوە خوێندبوویانەوە، کە لەنێو خۆیاندا باسینەکەن، بەلام وەک کوردەکە دەبێژێ، "قسە، کە کەوتە زارێ، دەکەوێتە شارێ" و، ئەز لێرەدا دەبێژم: " کە بیرێکی رەسەن کەوتە مێشکێ، گڕ دەگرێت و دەبێتە تیشکێ، هێزی تاریکی خۆی لەبەردا ناگرێ و دەشکێ". ئەوە بوو رژێمی تاریکپەرستی سۆڤێت و پاشکۆکانی لەرۆژهەلاتی ئەورووپادا، وەک شێرەبەفرینە توانەوە و، دەهۆڵلێدەر و زوڕناژەنە کوردەکانیشیان، دەهۆڵیان دڕاو و زوڕنایان شکا و، ئەوجا کە لە ئەنجامی راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ ی باشوور و، کۆڕەوی ملیۆنیی ئەو بەهارە و، هەڵکەوتنی گەلێک بارودۆخی لەبار بۆ کورد، کە بوونە هۆی دامەزراندنی "هەرێمی نەفرین"، بە پێشنیازی فەرەنسا و پشتگیریی بەریتانیا و ئەمریکا، کۆنەشایەرەکانی سۆڤێت، مالی خۆیان لە گەڕەکی "خالە یوسفەوە" (**) گواستەوە بۆ گەڕەکی شێخ کلینتن و حاجی بوش و، چوونە سلاوی پارتی و، بوونە نووسەرانی رۆژنامەی "خەبات" و "التآخي" و، سەرزلەکانی دوو زلحیزبە کوردییەکەش (پارتی و یەکێتی) هاتنەسەر خوانی ئامادەکراو و،

دەستیان بەسەر خێروبێری "هەرێم"دا گرت و، ئەوانی دیکەیان فتکرد و، هێندێکیش لە کۆمۆنیست و، گوایە نەتەوەییەکانی سەر بە پاسۆکیش، دیشکەمیان لە رابوردوویانکرد و، خۆیان بە یەکێتی و پارتی فرۆشت.

لەسەروبەندی شەڕ و کوشتاری دڕندانەی نێوان پارتی و یەکێتی، بە ئامانجی دەستگرتنی تاکوتەنێ بەسەر دەسەلاتدا لە ''هەرێمی نەفرین'' و، ئەززی، بەهەستی بەرپرسیاریم بەرامبەر خەڵکی کوردستان و، بەهیوای ئەوەی کورد لەرێی ئاشتیی نەتەوەییەوە، سووت لە دەرفەتی هەڵکەوتووی دوای جەنگی کوێت وەربگرێ و، سەرەڕای هەموو دوژمنایەتییەکی ئەو دوو زلحیزبە بەرامبەر بە من، سالانێک هەوڵی ئاشتکردنەوەی ئەم دوو حیزبەم دا و، هەموو جۆرە رەخنەیەکی توندوتیژم لەدژیان وەستاند، بەنیازی ئەوەی کەمێک هۆش بێننەوە بەرخۆیان و، ئەو گۆڕانە بەرچاوەی، کە لە رامیاریی ئەمریکا و بەریتانیا و رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا هاتووەتەپێش، بۆ دەسکەوتی خەڵکی رەشورووتی کوردستان بخەنەکار. ئالەم ماوەیەدا، کە دەسەلاتی بەعس لە سێ ستانی هەولێر، سلێمانی و دهۆک نەمابوون و، بۆ رۆشنکردنەوەی بەرچاوی جەماوەر و، لەبەر ئەوەی پۆستە بۆ ئەو نێوچانە نەبوو، نەچار بەدەستی هاتوچوکەراندا، کە بە دەگمەن هەڵدەکەوت یەکێکیان ملبدا بۆ بردنی یەک دوو دانە پەرتۆک لەگەڵ خۆی، چەند دانەیەکی سەمینارەکەم، لەگەڵ چەند بەرهەمێکی دیکەی خۆم، ناردەوە بۆ نامەخانەگشتییەکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆک و چەمچەماڵ و کۆیە و هێندەک شوێنانی دیکەی باشوور، تاکو ژمارەیەکی زۆر خەڵک بتوانن بیانخوێننەوە، ئەوجا کە خەڵکەکە بیستبوویان ئەو کتێبانە دراون بە پەرتۆکخانەکان، چووبوون بۆ خوێندنەوەیان، بە تایبەتیی لە سلێمانی، بەلام، کاربەدەستانی

نامەخانەکان پێیانگوتبوون، ئەو پەرتۆکانە نەماون و نازانین کێ بردوونی، ئەوەش لەکاتێکدا بوو، کە وەک گوتم، بەوپەڕی نیازپاکییەوە هەوڵمدەدا بۆ ئەوەی شەڕکەرانی یەکێتی و پارتی ئاشتبکەمەوە و بیانخەمە سەرڕێی یەکگرتن.

لەگەڵ بلاوبوونەوەی هێندەک لە وتارەکانم لە رۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا و، هەروەها وتووێژی چەند رادیۆ و تەلەڤیزیۆن لەگەڵم لەبارەی بارودۆخی کوردستان و، چوونەوەی ژمارەیەکی دیکە لە نووسینەکانم بۆ کوردستان، جەماوەرێکی فراوانی خەڵکی کوردستان بەدوای نووسینەکانی مندا دەگەڕان و دەستیاننەدەکەوت، یان هەر دانەیەک و سەتان دەستیدەکرد، کاک نێچیرڤان بارزانی، لە ١/١/٢٠٠٠ دا نامەیەکی نارد بۆم و، لەوێدا تکایکردلێم کە رێیانبدەم، پەرتۆکەکانی من لە کوردستان چاپبکەنەوە، بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک بتوانن بیانخوێننەوە و، بۆ گەیاندنەوەی دەستنووسەکانیش، ئەوانەی کە هێشتا چاپنەکراون، ئەوا یەکێک دەنێرێ بۆلام، کە بیاندەمەدەستی و، لەگەڵ خۆی بیانباتەوە بۆ هەولێرو، منیش بە فەرمانی هەستی بەرپرسیاریم بەرامبەر رێنەگرتن لە بلاوبوونەوەی بەرهەمی رۆشنبیری، وەرامێکی شیرینم دایەوە و، گوتم باشە فەرموون چاپیبکەن، بەلام بە مەرجێک نووسینەکانم هەروەک خۆی بێدەستکاری چاپبکرێنەوە و، بۆ ئەوەش دەبێ رەشنووسەکانیان، بەرلە چاپکردن بنێرنەوە بۆم، تاکو تەماشایانبکەم و هەڵە چاپییەکانیشیان سەرراستبکەم، ئەوجا لە چاپبدرێن. لە وەرامدا کاک نێچیرڤان نووسیبووی، کە ئەز چۆنم بوێ، بەرێزیان وادەکەن و، کارەکەش بەرەورووی کاک بەدران ئەحمەد حەبیب کرایەوە، کە پاش ئەوەی بوو بە پارتی، بەرپرسیارێتیی بنکەی چاپەمەنی ''ئاراس'' دراوەتە دەستی. لە پێوەیندیکردنێکدا لەگەڵ کاک

بەدران، ئاگـــادارمکرد، کـــە جـــارێ دوو پەرتۆک چاپبکرێنەوە:
''کـوردسـتـان و شـۆرشـەکـەی'' و '' بـیـری نەتەوەیی کـوردی، نەبـیـری قـەومـیـیـەتی رۆژهەلاتـی و نەبـیـری ناسـیـونالیـزمی رۆژاوایییە'' و لەسەر ئەوە رێککەوتین.
بەڕاستی نامەوێ لێرەدا سەری خوێنەرەوە بیەشێنم و باسی ئەو هەموو دەستێدەستیکردن و درۆودەلەسە و ''ئەمرۆناسبەی'' بگێرمەوە، کە لەماوەی چوارساڵدا لە دەستگەی ''ئاراس''ی سەر بە پارتی و حکوومـەتی هەولێـر بـــە سـەرۆکـایەتیی کـاک نێـچـیـرڤـان بـارزانـیـم دی، کـە هـەردەمـە بە بیـانووی شـتـێکەوە کـارەکـەیان دوادەخـست و راسـتـیـیـان لەمن دەشـاردەوە، بێئـەوەی هیچ شـەرم بیـانگرێ، چۆنکە ئەوان خـۆیان تکایان لـەمن کـرد، رێیـانبـدەم بەرهەمـەکانم چاپبکەنەوە و، ئەوەتا هەر بۆ بەڵگەی قسـەکانم، نامـەکەی کـاک نێـچـیـرڤـان بلاودەکـەمـەوە. بەلام پاش ئەوەی گـوشـارم خسـتـە سـەریان، کە رەشنووسـەکە بنێرنەوەبۆم، تا چاوێک بگێڕمـەوە پێیدا، ئەوجا ناچارمان، رووی راستینەی خۆیان دەربخەن و، گوتیان دەبێ ئەو دێڕانـەی کـە پێـوەندییـان بەوەوە هـەیە کـە عوبێـدوڵلا و لوقـمـان، کوڕانی مـەلا مستەفای بارزانی، لەگەڵ رژێمی بەعسی سەددامیدا کـاریـانکردووە، لەدەقی نووسـینەکـە لابـبـرێ. هێـژای گـۆتنیـە، من لە سـەمـینارەکـەمدا گـوتبووم، کـە هیچ رژێمـێک نەیتـوانیوە، تا ئێسـتـە بارزانییـەک بکڕێ و بیکاتە داردەسـتـی خـۆی (ل ١٦٧ چاپی سـوید)، بەلام وەرگـێـڕی سـەمـینارەکـە بۆ زمـانی کـوردی، کـاک سـەروەت (کوردۆ) لە ژێدەردا نووسیبووی کە ئەو زانیارییە راست نییە، چۆنکە ''لەم سـالانەی دواییدا، هەر لە خودی خـانـەوادەی بارزانی خـۆی، چەند کـوڕێکی خـۆیان بە رژێم فـرۆشـت و، دژی بابیـان وەسـتـانـەوە، وەکـو لوقمان و عوبێدوڵلا، کە ئەمەی دواییان هەرلەو سەرەڕۆییەیدا گیانیشی

لەدەست دا و، رژێمی عێراق سەرنگوومیان کرد، پاش ئەوەی ماوەیەک پلەیەکی ساختەی وەزیرییان دایە و، دژی بابی هەڵیاندەسووڕاند" (ل ١٦٧ چاپی سوێد).

کە بەدران ئەحمەد حەبیب، بە تەلەفۆن ئەو قسەیەیکرد و، داوای دەرهێنانی ئەو چەند دێڕەیکرد، کە هێڵی هانیبوو بە ژێریاندا، زۆر سەرمسووڕما، چۆنکە لەگەڵیان رێککەوتبووم، کە هیچ گۆڕانێک لە چاپکردنەوەدا نابێ بکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا گوتمپێی "کاکە ئەو قسەیە قسەی من نییە، چۆنکە کاتێک من سەمینارەکەم گرتووە، ئەوشتە روونەداوە، ئەوە قسەی وەرگێڕ، کاک کوردۆیە و، منیش تێبینیی خۆم بەرامبەر بەوە نووسیوە، بەلام ئەو قسەیەی کاک کوردۆ، قسەیەکی راستە و، ئەززی لە تێبینییەکەمدا نووسیومە: "ئەمەی وەرگێڕ دەبێژێ راستە، بەلام من لەدەقە ئەڵمانییەکەدا، وشەی «تائێستە Bis jetzt» م بەکارهێناوە . وشەی "تا ئێستە" ئەوەدەردەخا، کە بەپێی ئەو زانیارییانەی ساڵی ١٩٧١ لەبەردەستمدابوون، نۆکەریان هێشتا لێهەڵنەکەوتبوو. ئەوانەی وەرگێڕ، وەک نموونە، لە پەراوێزی ل ١٦٧ دا باسیکردوون، هەموو پاش ١٩٧١ روویانداوە، واتە پاش خوێندنەوەی وتارەکانی من (چاپی سوید ل ٣٩١- ٣٩٢)

ئەوجا کاک بەدران گوتی: "ئێمە خۆمان کاک کوردۆ رازیدەکەین و دڵنیاشم رازیدەبێ". گوتم: "ئەویش رازی ببێ، ئەز لاینابەم، چۆنکە ئەو پەرتۆکە پەرتۆکی منە و، چاپی یەکەمی بەوجۆرە دەرچووە و، شتەکەش راستە". هەروەها گوتم "ئەوەش لەبەر خاتری کاک کوردۆ ناکەم، بەڵکو لەبەر خاتری بابەتەکە دەیکەم، ئەگەنا کاک کوردۆ باشدەناسم کە، سالانی ساڵ درۆی لەگەڵ من کرد، کاتێک خۆی بە بێلایەن دەدایە قەڵەم، بەلام دوایی دەرکەوت کە نوێنەری "پاسۆک" بووە لە ئەورووپا و، هەر بە فەرمانی

،محەمەد مستەفای پاسۆک دیشکەمی لە رێکخراوی سۆسیالیستی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا (سۆکسە SOKSE) کرد، ئەو سۆکسەیەی کە هاوبیر بروسک ئیبراهیم و من دروستمانکرد بۆی و، بەهەوڵ و تەقەلای ئێمە، نێزیکەی ٦٠٠ لایەنگری هەبوو لە ئەوروپا و، کوردۆشمان کرد بە سکرتێری گشتیی سۆکسە، ئەویش لەپڕ و تەنێ بەفەرمانی محەمەد مستەفا، کە ئەویش لەبەر خاتری جەلالییەکان کە هێندەک بەڵێنی درۆیان دابووپێی، بەرامبەر بەوەی لەرێی کوردۆوە سۆکسە لەنێوببا، چۆنکە لە هێزی گەلەمپەریی سۆکسە ئەترەشیان چووبوو. کەچی کاک کوردۆ لە شەووڕۆژێکدا، دەستی لە سۆکسە بەرەڵلا کرد و، هێندە خیرەت و ئازایەتیی تێدا نەبوو کە تاکە بەیانێک لەوبارەوە دەربکا. هەزاران جنێوی دەدا بە پارتی و یەکێتی لە تەلەڤیزیۆنی "مێد تێ ڤێ" دا، کەچی بەرامبەر بە پێبەخشینی کارێک و مووچەیەک لەلایەن "یەکێتی" وە، خۆی بە یەکێتی فرۆشت و، خۆفرۆشتنەهەرزانەکەشی گەیشتە رادەیەک کە لە رۆژنامەی "کوردستانی نوێ" شدا، بەوپەڕی بێشەرمییەوە حاشای لە رابوردووی خۆی کرد و، خۆی بەبێ ئەقڵ دایەقەڵەم. (***) جا ئێستە ئەگەر بێم و، دەستکاریی ئەو شتانە بکەم کە رۆژێک بووە، بە بلاوکردنەوەیان لە پەرتۆکی مندا، رازیبووم، دیارە ئەززی یەکێک دەبم وەک کوردۆ عەلی قەڵەمفرۆش. کاک بەدران گوتی: " ئاخر ئێمە ناتوانین ئەو پەرتۆکە واچاپبکەین، چۆنکە کوڕەکانی کاک لوقمان ئێستە لای کاک نێچیرڤان کاردەکەن، گوتم، باشە چاپیمەکەن. کاک نێچیرڤان خۆی تکایکرد لە من، رێ بە چاپکردنەوەی پەرتۆکەکانم بدەم، بەلام کە کارەکە وایلێهات، رێنادەم چاپی بکەن. گوتی: ''ئەی پەرتۆکەکانی دیکە چی؟'' گوتم ''ئەوانیش هەروا. نەخلەتابن، هیچ شتێکی من چاپبکەن!'' بەمەش کۆتاییم بە قسەهێنا.

